چاپی سێیەم

چارلز تریب

# چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی عێراق

لێکۆڵینەوەیەکی بەڵگەنامەییە لە مێژووی عێراقی نوێ
لەوەتای دروستبوونی دەوڵەتی نوێ تا ناوەڕاستەکانی ٢٠٠٢

وەرگێڕانی

محەمەد حوسێن ئەحمەد    عەبدولقادر کەلهور

پێداچوونەوەی

د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسور

هەولێر ٢٠١٣

# چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی عێراق

لێکۆڵینەوەیەکی بەڵگەنامەییە لە مێژووی عێراقی نوێ

لەوەتای دروستبوونی دەوڵەتی نوێ تا ناوەڕاستەکانی ٢٠٠٢


## چارلز تریب

وەرگێڕانی

محەمەد حوسێن ئەحمەد عەبدولقادر کەلهور

پێداچوونەوەی

د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسور

سەرۆکی بەشی مێژوو لە کۆلێژی ئاداب (ئێواران)

زانکۆی سەلاحەددین



چاپی سێیەم ٢٠١٣

✓ ناوی کتێب : چەند لاپەرەیەك لە مێژووی عێراق
✓ ناوی نووسەر : چارلز تریب
✓ وەرگێڕان : مەحەمەد حوسێن ئەحمەد – عەبدولقادر کەلهـــور
✓ پێداچوونەوەی: د.مەحەمەد عەبدوڵلآ کاکە سوور
✓ دیزاین و بەرگ : خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
✓ نرخ: ( ٦٠٠٠ ) شەش هەزار دینار
✓ نۆرەی چاپ : چاپی سێیەم ٢٠١٣
✓ شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلآت–هەولێر
✓ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردن (٢٢٩٦ ) ساڵی ٢٠١٠

✓ بەڕێوەبەری هونەری دەزگا
✓ سەلام محەمەد رەسول

راوێژکاری دەزگا بۆ بەشی مێژوو
د. محمد عبدالله کاکە سوور

# بەرایی

وەکو هەر هەموو مێژوو، مێژووی عێراقیش چۆن دەنووسرێتەوە دروست دەکرێت، لەبەر ئەوە مێژووی بەدوایەکهاتنی رووداوەکان کەم بایەخترە لەو گێڕانەوەی کە بەشێك لەو رووداوانە پێکدەهێنێت، لەو گێڕانەوەیە دا نموونەکانی رابردوو جێهێڵراون بەقسە نەکردنیان لە سەر ئێستا، هەروەها تێیدا دەتوانرێت یاریکەرە مێژووییەکان ببیندرێن لەبەر رۆشنایی ئەو سنوورەی کە کاریان تێیدا دەکرد، هەروەها لە کاتێکدا کە گەلی ئێراق و دەوڵەتی ئێراق بەرووداوی زۆر مەترسیدار داتێدەپەڕن باشتر وایە بیر لەوە بکرێتەوە ئەو رووداوانە دەکرێ چیمان پێ بڵێن لەبارەی ئەو هێزانەی کە مێژووەکەی دادەڕێژن.

لە هاوینی (٢٠٠٢) هەندێك لە خەسڵەتەکانی حکومەتەکەی سەدام حوسێن هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکرد کەببنە هۆکاری رووخانی، بەروو وەستانی کردەیی سەدام حوسێن دژی سستمێکی جیهانی کە ئەمریکا بەسەریدا زاڵە.

هەروەها ئەو هێزو توندوو تیژییە دیارەی کە رژێمەکەی پێی ناسرابوو، سەرباری بازنە داخراوەکانی هەژموون لە نێو دەسەڵاتدا هەمووی کۆبوونەوە بۆ ئەوەی ئەمریکا بوروژێنن ئەمە لە کاتێکدا کە رژێم لە بەرگریەکانی داماڵرا بەرووی رەشەبایەکی دادیّ. بۆیە دوایی چەندین دەیە لەسەر کوتکردن وایلێهات هەڕەشە لەناوەوە نەمێنێت بەڵکو لەدەرەوە بێت، ئەوەی مایەی تێرامانیشە ئەوەیکە هەمان سستەمەکانی خۆ پڕ چەك کردن کە سەدام حوسێن بۆ بەر پەرچدانەوەی هەر هێرشێك بۆ سەر ئێراق و رژێمەکەی بنیاتی نابوون وایلێهات ئێستا کاردانەوەیەکی پێچەوانەیی هەبێت چونکە مەسەلەی پرسی چەکە کۆکوژەکانی ئێراق ناواخنی ئەو فشارە بەرەبەرە لەزێدە بوونەی پێکدەهێنا کە ئەمریکا

بەتایبەتی ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکانیش دەیانکردە سەر ئێراق و هۆکاری دیاریشی ڕێگە دان بوو بە تیمی گەران و پشکنین بەدوای چەکدا سەر بە لیژنەی چاودێری و لێکۆڵینەوەو پشکنینی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان بوو بگەڕێنەوە ئێراق دوای ٤سالْ لە دواکەوتن و دوور کەوتنەوەیان بەلام حکومەتی ئەمریکا هەر ئەوەتە نیازی خۆی و هاوپەیمانە نزیکەکانی خۆی دەشاردەوە بۆ ڕووخانی ڕژێمەکەی سەدام حوسێن

دواتر کە وەلامەکەی ئێراق بۆ داواکاریەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بەگەڕانەوەی پشکێنەران بەپچڕ پچڕی هات سەرۆك بوش و هەندێك لەئەندامانی دیکەی ئیدارەی ئەمریکا هەڕەشەی جوولەی سەربازیان کرد بەو پێیەی بەشێکە لە بنەمای (پەلاماردانی خۆ پارێزی) کە پتر فراوانەو زۆر بەروونی و بەئاشکرا داوای گۆڕینی ڕژێمی ئێراقیان کرد.لەبەر ئەوەی ئەم کارەش لەناوەخۆی ئێراقدا مومکین نەبوو تەنیا لەڕێگای کودەتایەکی سەربازی چاوەڕوان نەکراو بۆیە هیچ ڕێگە چارەیەك نەما جگە لەدەست تێوەردانی سەربازی دەرەکی و بەهانەی ئیدارەی ئەمریکاش ئەوە بوو کە بەتەنیا ئەو گوڕانکاریە بنەڕەتییە لە حکومەتی عێراقدا دەبێتە هۆی لێك هەڵوەشاندنەوەی ڕژێم و کۆتایی چەکە کۆکوژەکان و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیکەی کەمتر مەترسی دار بۆ سەر سیستەمی دەولەت و بۆ ئەم مەبەستەش ئەمریکا دەستی بە خۆ ئامادەکردن کرد بۆ هێرشکردنە سەر ئێراق.

لە ڕاستیدا بیرۆکەی شەڕی ئەمەریکا دژی دەولەتێکی چەوسێنەر و بێ بەزەیی بەرای زۆران– بەلام کەم کەس مەترسییەکی نزیکی لێ دەبینن بۆ سەر ئاسایشی نێو دەولەتی– ترسێکی گشتی لە نەتەوە یەکگرتووەکان و لەلای هاوپەیمانانی ئەمریکا نایەوە بۆیە سەرۆك بوش لە ئەیلوولی ٢٠٠٢ لەسەر داوای ئەوان و بەهاندانی هەندێك لایەن لەنێو ئیدارەی ئەمەریکا بەوە رازیبوو لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هەولی چارەسەرێکی ئاشتیانە بدرێت بۆ قەیرانە هەلچووەکە لەگەل ئێراقدا لەگەل ئەوەش ئامادەکارییە سەربازییەکانی ئەمریکا بەردەوامبوو و

سوربوونی ئیدارەی بوش لەسەر چارەسەرکردنی پرسی چەك داماڵینی ئێراق روون و ئاشكرا بوو، جا بەبەكارهێنانی هەر رێگا چارەیەك بێت.

لەو كەش و هەوایەدا ئەنجوومەنی ئاسایش بەكۆی دەنگ بڕیاری بڕیاری ژمارە ١٤٤١ی لە تشرینی دووەم دەركرد و بڕیارەكە روونی كردەوە كە پێویستە لەسەر ئێراق داواكارییەكانی چەك داماڵین كە لەنەتەوە یەكگرتووەكانەوە دەرچووە بەتەواوەتی جێبەجێ بكات وەكو كەلە و بڕیارانەدا هاتووە كە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی ١٩٩١ نەك هەر ئەمەش بەڵكو بڕیارەكە ماوەیەكی دیاریكرد بۆ گوێڕایەڵی تەواو و ئەگەر ئێراق گوێڕایەڵ نەبێ ئەوە دەرئەنجامەكانی ترسناك دەبن.

لە بەرامبەر كۆ دەنگی ئەنجوومەنی ئاسایش لەسەر داواكاری گەڕانەوەی پشكێنەران هەروەها دەستپێكردنەی ئامادەكارییە سەربازییە چڕوپڕەكانی ئەمەریكا لەناوچەكەدا حكوومەتی ئێراق رەزامەندی لەسەر رێگە دان بە ئاژانسەكەی سەر بە نەتەوەیەكگرتووەكان بۆ گەڕان و پشكنین بەدوای چەكدا واتا لێژنەی چاودێری و لێكۆڵینەوەو پشكنین دەربڕی دەست بە چالاكییەكانی بكات لە ئێراقدا و ئاوەها تیمەكەی un بە سەركردایەتی هانز بلێكس و هاوڕێیەتی محەمەد بەرادعی ئەمینداری گشتی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی دەستیان كردەوە بەكاری دڵنیابوون لەوەی كە ئایا ئێراق بەكردەیی تواناكانی خۆی بۆ بەرهەمهێنان و بڵاوكردنەوەی چەكی ئەتۆمی و كیمیاوی و بایلۆژی خاپوور كردووە یا نا وەكو كە حكومەتەكەی ئیدعای ئەوە دەكات.

لە سەرەتاكانی كانوونی یەكەمدا حكوومەتی عێراق دۆسێیەكی دا بە دەست كە لە ١٢.٠٠٠ لاپەڕە پێكهاتبوو.. كە دەبوایە راپۆرتێك بێت دەربارەی چەكە كۆكوژەكان كە لە رابردوو و ئێستا هەیەتی هەروەها ئەو مادانەی كە دوو لایەن بەكار دەهێنرێ كە دەكرێت بەكاربێت لە دروستكردنیان هەستكردنی سەدام حوسێن بەوەی كە (ئەمەریكا) موكوڕە و داگیركردنی عێراق نزیك بووە وای لێكرد كە هاوكارییەكی زیاتر لەگەڵ ئەمریكا بكات.. و لەگەڵ زلی قەبارەی ئەو دۆسییە

کە بە ڕوونی ناوەڕۆکەکەی دیاریکرابوو بەڵام نەیتوانی ڕەزامەندی لێژنەی چاودێری و لێکۆڵینەر و پشکنێرەکانی UN بەدەست بێنی لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو پرسیارانەی کرابوو لەساڵی ١٩٩٨ دەربارەی بوونی چەکی کیمیاوی و چەندین چەکی قەدەغەکراو بێ وەڵام بوو.

داکۆکی کردنی ئەمریکا و UN بەتایبەتی سەرچاوە سیخوڕییەکانی بەڵگەدارن کە عێراق توانای دروستکردنی چەکی کۆکوژی هەیە.

بەڵام ئەمەریکا و بەریتانیا نەیانتوانی یاخود نەیاندەویست ئەو بەڵگانە ئاشکرا بکەن بۆ رای گشتی جیهانی لەسەر بەرنامە فێلاویەکانی عێراق و بەردەوام بوونی ئەو مەترسیەی کە عێراق هەیەتی لەسەر ئاسایشی نێودەوڵەتی لەگەڵ ئەوەش ئەمەریکاو UN بە یەکەوە بەشێکی زۆری زانیارییان دا بۆ هاوکاری کردنی لێژنەی چاودێری و لێکۆڵینەوەو پشکنین بۆ گەڕان بەدوای ئەو چەکە قەدەغە کراوانە بەڵام بەڵگەکان هاوکار نەبوون بۆ دۆزینەوەی ئەو چەکانە هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ نا پوختەیی زانیاریە سیخوڕییەکان یان توانای دەسەڵاتی عێراقی لەسەر شێواندنی جوولەی پشکێنەرەکان.

لەگەڵ ئەوە لە کۆتایی کانوونی دووەمی ٢٠٠٣ هەندێك لە راستییەکان دۆزرانەوەو (هانز بلێکس) بەدەست هێنانی هەندێك پێشکەوتنی راگەیاند هەرچەندە دەسەڵاتی عێراقیش وەکو پێویست هاوکار نەبوون ، راستە کە دەسەڵاتی عێراقی هیچ بەرهەڵستکارییەکی دروست نەکرد لەبەردەم لێژنەی چاودێری و لێکۆڵینەوو پشکێنەران بەڵام هاوکارێکی باشیش نەبوو.

پێشکەشکردنی زانیاری لەلایەن عێراق و لەبەر سروشتە نهێنییەکانی رژێمی عێراق و ترسی ئەفسەرانی عێراقی لە یەزاندنی ئەو سنوورەی کە بۆیان دەستنیشان کراوەو هەروەها ئەو تۆڕە نهێنیانەی کە دەسەڵاتی عێراقی لە رێگایەوە دەیویست پاراستنی بەرنامەی چەکە قەدەغەکراوەکان بکات بۆیە دۆزینەوەو ئاشکرا کردنی زانیارییەکان زۆر سست بوو.

پاشان زنجیرەیەك لە راپۆرتەکانی (هانز بلیکس) کە دەربارەی چۆنیەتی و شێوەی کارکردنی تیمەکەی پشکەش بە ئەنجوومەنی ئاسایشی کردبوو لە شوبات و ئاداردا بوونە پاڵپشت و بەڵگە بۆ دوو بەرەکی کە دروستبوو لەنێوان کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەلایەك، داوای ئەمەریکا و بەریتانیا و ئیسپانیا و چەند دەوڵەتێکی ئەورووپی تر ئەوە بوو ئەو راپۆرتانە روون و ئاشکرایە کە عێراق بریاری ١٤٤١ کە لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەرچووە بەزاندوویەتی و پەیرەوی ناکات بەشێوەیەکی راست و دروست لەلایەکی ترەوە رووسیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا و زۆربەی دەوڵەتەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی وایدەبینن کە ئەو راپۆرتانە بەڵگەنە لەسەر هاوکاریکردنی عێراق هەرچەندە لەژێر فشاریش بێت و بەباشیان زانی کاتی زیاتر بدەن بە پرۆسەی پشکنین و گەران بەدوای چەکدا.

بلاوبوونەوەی سەدای ئەو دووبەرەکییە نەك هەر لە UN بەڵکو لەهەموو یەکێتی ئەورووپا دەوڵەتانی (پەیمانی ناتۆ) و جامیعەی عەرەبی بووە هۆی دڵەراوکێیان کە دەبێتە ( ئەمادەکاری سەربازیی ئەمەریکا)لە ناوەندی مانگی شوبات ژمارەی سەربازە ئەمریکییەکان لەناوچەکە گەیشتە (٢٠٠,٠٠٠) هەزار سەرباز لەگەڵ بوونی (٢٥٠,٠٠٠ هەزار سەربازی بەریتانی) و دانانی خشتەیەکی کاتی سەربازیی بووە توندبوونی قەیرانەکانی عێراق و بۆ زۆر کەس دەرکەوت کە ئەمریکا دەمێکە بریاری داوە شەر بۆ لەناو بردنی رژێمی سەدام حوسێن بکات نەك تەنها بۆ داماڵینی چەکی قەدەغە کراو لە راستیدا نەبوونی یەك دەنگی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەسەر ئەو ئامانجە و پەنا بردن بۆ جەنگ بۆ جێبەجێکردنی بووە هۆی زۆربوونی نارەزایی دژی ئەمریکاو.. دەرکەوت کە ئیدارەی بوش پەنای بردە بەر ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ ئەو شەرکردنە کە بە پێویستی زانی بۆ بەرژەوەندی نیشتیمانیی ئەمریکا سەرۆك بوش ئەو ئامانجەی تەئکید کردەوە کاتێك کە رایگەیاند ئەمریکا ئەو شەرە دەکات بە رەزامەندی UN یان ناڕازی بوونی.. لەو روانگەیەوە ئەمریکا هەڵسا بە دروستکردنی هاوپەیمانییەك کە سەرۆك بوش ناوی نا (هاوپەیمانی ئارەزوومەندان – تحالف الراغبین) کە پێکهاتبوو لە بەریتانیا و

ئوستراڵیاش حەزی دەکرد بەشداری سەربازی پێشکەش بکات لە دژی عێراق جگە لەهەندێ لەدەوڵەتە عەرەبییەکان کە حەزیان دەکرد ئاسانکاری بکەن بۆ دروستکردنی بنکەیەکی سەربازی بۆ هێزەکانی ئەمریکا.

لەگەڵ زیاد بوونی ئامادەکاری سەربازی بۆ داگیرکردنی سەرجەم عێراق هەندێك پرسیار هاتنە ئارا ئەویش پاش لەناو بردنی سەدام حوسێن چی دێت! هەروەها ئەوەی پەیوەست بوو بە هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێراقی لە دەرەوەی وولات ئەوە کاتێکی گونجاوە بوو کە بۆیان دەرەخسێ، پاش ئەوەی حزبە سەرەکیەکان کۆبوونەوەیان بەست لە لەندەن لەکانوونی یەکەم نوێنەرانی حزبەکان دووبارە لە مانگی شوبات لە سەلاح الدین لەناوچەی کوردەکان کۆبوونەوە لێرەوە هەندێك ئاکار دەرکەوتن دەربارەی پرۆسەی دووبارە بنیاتنانەوەی سیاسی لە عێراق. سەرباری ئەو پرسیارە کراوەی کە تا چ رادەیەك ئەوانەی بەشدارن لەو کۆبوونەوەیە نوێنەرایەتی دانیشتوانی عێراق دەکەن کە دەگاتە ٢٢ملیۆن جگە لەو جیاوازیە پان و بەرینەی کە لە بیر کردنەوەیاندا هەبوو بۆ داهاتووی عێراق و هەروەها گرفتی پەیوەندیان بە دەسەڵاتی ئەمریکا سەری هەڵداو زۆربەی ئەو کەسایەتییانەی بەشدار بوون لە کۆبوونەوەکە تاکو ئێستاش حکومەتی ئەمریکا پاسداریان دەکات و پاڵپشتیان دەکات لایان خۆش نییە لێرە بەدواوە نوێنەرایەتی داواکاریەکانی ئەمریکا بکەن و پاشکۆیەتی دەسەڵاتی ئەمریکا بکەن بەهەر جۆرێك لەپاش جەنگ.

هاوکات هەندێ لە لایەنە کوردیەکان سکاڵایان لەوەهەبوو کە داهاتوویان لەنێوان ئەمریکا و تورکیا دیاری دەکرێت بەبێ ئەوەی پرسیان پێ بکرێ.. هەندێك لەو دەوڵەتانەی دژی شەریش بوون مەترسی ئەوەیان هەبوو کە ئەو ئیدارە سەربازییەی ئەمریکا کە پێشنیار کراوە لە ئیدارەی دەوڵەتی عێراقی پێ باشتر بێت بۆ مسۆگەر کردنی سەقامگیری و دەسەڵات و لێپرسراوەتی نەداتە دەست ئەوانەی هەردەم روو بەرووی سەدام حوسێن وەستا بوون. لەو کات و ساتانەدا رژێم لە بەغدا بەشێوەیەکی سەیر بێ جووڵە بوو و واهەستدەکرا کە بارو دۆخێك

هاتبێتە ئاراوە سەدام حوسێن و دارو دەستەکەی کەوتبنە نێوان دوو بۆچوونی جیاواز دەربارەی بارو دۆخەکە..لە لایەك بۆیان ئاشکرا بوو کە ئەمریکا شەڕەکە دەکات بۆ داگیرکردنی عێراق ئەگەر هەرچی رووبدات و حکومەتی عێراق توانای دوورکەوتنەوەی لەو جەنگە نییە، تەنها خۆ ئامادەکردن بۆ پاراستنی خاکی عیراق بەو هیوایەی کە رژێم بەسەلامەتی لێی دەربچێ هەروەك چۆن لە ململانێکانی دیکەدا. و بەو ئاواتە بوون کە دوو بەرەکی کۆمەلگای نێودەولەتی دووریان دەخاتەوە لەو جەنگە بۆیە حکومەتی عێراق دەستی کرد بەزیاتر هاوکاری کردنی لێژنەی چاودێری و لێکۆلینەوە و پشکنینی سەر بە UN بۆ ئەمەش هەلسا بە پارچە پارچە کردنی ئەو مووشەکانەی UN رێگای پێ نادات سترا تیژیەکەش لەسەر دواخستن بنیاتنرابوو لەگەل تەنازول کردنی پێ بەپێ بۆ دەربرینی ئەوەی کە گوایە حکومەتی عێراق بریارەکانی UN جێ بەجێ دەکات .

هاوکات زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش گومانیان لەوە هەبوو کە رەوشەکە پێویستی بەجەنگ هەبێ و سەرۆك شیراك رایگەیاند کە فەرەنسا بەرهەلستکاری هەر بڕیارێك دەکات کە رێگا بەجەنگ بدات.

بەلام ئەو بەر بەستانە نەبوونە لاواز بوونی هەلوێستی سەرۆك بوش بۆ دامالینی چەکەکانی عێراق و رووخاندنی رژێمی سەدام حوسێن. هەربۆیە لەناوەراستی ئاداردا ئەمریکا ٢٢٥,٠٠٠ هەزار سەربازی لەناوچەکە کۆکردەوە بۆ ئامادە بوون بۆ جەنگ لەگەلّ عێراق و جەنگ لە ٢٠ی ئاداردا دەستی پێ کردو بەهاتنی مانگی نیسان بەغدا داگیرکراو رژێمی سەدام حوسێنیش رووخا.

مێژووی عێراقی نوێ دوو داگیرکردنی دەرەکی گەورەی بەخۆوە دیوە یەکەمیان لەلایەن بەریتانیای مەزنەوە لەسەرەتای سەدەی بیستەم، دەولەتی دامەزراندو ژیانی سیاسی بەرێوەبرد کە ئەو رەنگە جودایەی خستەسەر چیرۆکە بەیەکەوە گرێدراوەکەی مێژووی عێراق . تیروانین و بەرژەوەندیەکانی بەریتانیاش دەستی لە دروستکردنی ئەو چیرۆکەدا هەبوو، بەلام توانای کۆنترۆلکردن و زانینی

پێشوەختەی دەرەنجامی ململانێی ئەو هێزانەی نەبوو کە خۆی هاریکار بوو لە دەرکەوتنیان . ئەمانەش بەناوی دیدی رکابەر کەوتنە ململانێ و ناکۆکی بۆ بردنەوەی نێچیرە گرانبەهاکە: پێگەکانی هەژموونی دەولەتی عێراق سەربازی و ئابووری و کارگێری. بەمەش ، داب و نەریتەکانی تایبەت بە کۆمەلگەی سیاسی عێراقی پەرەی سەند و ئارەزووە تاکەکەسی و بەکۆمەڵەکان و تۆرەکانی پشت پێبەستن و مەحسوبیەتی گرتەوە سەرباری توندی بێ بەزەییانە بەرامبەر هەر کەسێك کە بەنامۆ یا رێگر لە چیرۆکی ئەو کەسانەی لە هەوڵی دەست بەسەراگرتنی شانۆی سیاسی هەژمار کرابوون. ئەو پرسیارەش هەر دەمێنێ کە لەبارەی دوارۆژی عێراق خۆی دەخاتە روو ، ئایا ئەگەر داگیرکردنێکی گەورەی دیکە رێگە بە سەر لەنوێ دامەزراندنەوەی رێرەوی دەوڵەتی عێراق و پەیوەندیە پشێوەکانی بە کۆمەلگەی عێراقی دەدات ، یا ئەوەتە مەنتقی ئیمپراتۆریەت و داب و نەریتی سیاسی کە هەردەم بە سەرکردایەتی ناوەندی سەرکوتکارەوە بەندە رێگە لە دۆزینەوەی هەر پانتاییەك دەگرێت بۆ پەیرەوکردنی سیاسەتێکی پتر فرەیی و وەك جێبەجێکردنێکی پێداویستیەکانی گەل.

❑

# پێشەکی

مێژووی عێراقی نوێ مێژوی رێگاکانی سەرنجراکێشانی ئەو کەسانەیە کە خۆشیان دیتەوە ژیان لە دەوڵەتی عێراقی نوێ بەسەر دەبەن، لەچوار چێوەی خۆی و دروست کردنی دەوڵەتێك کە سەنتەرەکەی لە بەغدا بێت، ساڵی ١٩٢٠-١٩٢١ بەسنوو داری و بیرو کراتیەتەکەی و سیستەمی باجی تایبەت بەخۆی چوارچێوەیەکی نوێی سیاسی داڕێژرا کە بیرو بۆچونی تازە بگرێتە خۆی لەسیاسەت. ئەو دەوڵەتە کە لەسەرەتاوە کەوتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیەکان و دواتر فەرمانبەرە عێراقیەکان بارگرانیەکی نوێی خستە ئەستۆی هاوولاتیان و وای لە گەل کرد سەر لەنوێ بیر لەناسنامەو داب نەریت و بەرژەوەندییە سیاسییە دروست کراوەکان بکەنەوە و لە هەندێ کاتدا میللەت ناچارکرا بۆ خۆگونجاندن لەگەل خزمەتکردنی دەولەت و دەسەلاتدارەکان و هەندێ جاریش میللەت سەرکوت دەکرا بۆیە مێژوی عیراق بووە ئەو مێژووە ستراتیژیەی هاوکاری و تێکدان و بەرهەڵستکاری کە زۆرینەی عیراقیەکان پەیڕەویان دەکرد بە مەبەستی تێگەیشتن بۆ رێك کەوتنێك لەگەڵ ئەو هێزەی نوێنەرایەتی دەوڵەتی دەکرد، وە هەروەها ئەو مێژووە بووە رێگا چارەیەك کە دەوڵەت توانی ئەو کەسانە بەکار بهێنێ..وە ئەو شێوە جیاوازانە لە دەست بەرداری بە درێژایی ساڵەکان بووە دارشتنی سیاسەتی عیراق وە بووە هاوبەش بۆ هۆناندنەوەی مێژووی عیراقی تازە.

لەو پرۆسەیەدا دوو دیاردەی بنەڕەتی سەریان هەڵدا، یەکەمیان خۆی لە دەسەلاتی دەوڵەتدا بینییەوە، کە خۆی وا لێکرد ببێتە سەنتەری سەرنج راکێشان و بەستنەوەی خەڵك بە بواری سیاسی عێراق کە پەیوەندی بە دیاردەی دووەم هەیە ئەویش چیرۆکی عیراقیەکانە کە بەکاریان دەهێنا بۆ خۆبەستانەوەیان بە

سیاسەت بە درێژایی کات و لێرە مەبەستمان لە (چیرۆك) واتە ئەو دەنگ و باسانەی کە خەڵك دەیگواستەوە لەسەر خۆیان و ئەوانی تر بە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت و هەوڵەکانیشیان بۆ ئەوە بوو کە مێژوی دەوڵەت والێبکەن لەگەڵ شێوەی خۆیانبگونجێ ئەوەش خۆی لەخۆی دا بنیاتنانی خەیاڵێك و بنەمای ڕێکخستنێك بوو خۆی لە ڕێگەی بەکارهێنانی دەسەلأت لەلایەن ئەو کەسانەی کەلە سەنتەری فەرماندەیی بوون دەدیتەوە، دەربارەی ئەوان و ئامانجەکانیان ئەوە بوو زۆرینەی خەونەکانیان بچەسپێ دەربارەی عێراق کە ببێتە ئاوێنەیەك کە عێراقیەکان خۆیان تێدا ببینن و ببێتە شێوەیەك بۆ بەکارهێنانی دەسەلأت لەسەر فەرماندەکان لەو ساتەی کە لە بیستەکانی سەدەی رابردوو کە دەوڵەت دامەزرا لەسەر چەند بیرو بۆچوونێکی جیاجیا سەری هەڵدا دەربارەی داهاتووی عیراق. بەلأم گۆڕانی سنووری یەك لاکەرەوەی نێوان ئەو بۆچوونانە لە سەرتاسەری ولأت بەگشتی سەرەڕای هەوڵدانی ئەو لایەنە جیاجیانەی کە دەسەلأتی جۆراو جۆریان هەبوو هەوڵیان دەدا کە بیرو بۆچونی خۆیان بچەسپێنن و دەسەلأتدار بن بۆ ناچارکردنی خەڵکی تر بۆ ملکەچ کردن بۆ تێڕوانینی تایبەتی خۆیان لەسەر دەوڵەت. وە ئەو تێڕوانین و ململانێیانە بەدرێژایی مێژووی عێراق بەردەوام بوو دەسەلأتی ئینتیدابی بەریتانیی لە بیستەکان، سەرۆك هۆزەکان لە ژێر سێبەری پادشایەتی و کۆماری، نەتەوەخوازە عەرەبەکان بەلایەنی کەم لە سیەکانەوە، هەروەها زانایانی ئاینی شیعە لەو ماوەیەدا و حزبی شیوعی عێراقیش لە لوتکەی ڕووداوەکانی پەنجایەکان و سەرەتای شەستەکان و حزبە کوردیەکانیش کەلە ناکۆکی دابوون لە نێوان خۆیان و لەگەڵ دەسەلأتی ناوەندا و سەدام حوسێن دارو دەستەکەشی لەماوەی ئەو سی ساڵەی رابردوودا هەموویان جێ پەنجەی خۆیان لەسەر مێژووی عێراق جێ هێشت.

ئەو قۆناغە لە مێژوی عیراق بە ئارەزوویەکی توند ناسرابوو بەو ئاراستەیەی کە سیاسەت بکرێتە ڕێگا چارەیەك بۆ سزادانی گەل و مسۆگەر کردنی ملکەچی بۆ تێروانینی دەسەلأتداران بۆ سستەمی سیاسی و هەروەها ئەوانەی بەربەرەکانی

رژێمیشیان دەکرد ئەوانیش هەروەها سیاسەتێکی خۆسەپاندنیان بەکار دەهێناهەرچەندەکە زۆربەی عێراقیەکان هەوڵیان دەدا ئەو جۆرە هەڵسو کەوتانە رەشکەنەوە لەسەر بنەمای ئەوەی کە سیاسەت مەدەنیەتە و بانگەوازی چەسپاندنیان لە چوارچێوەی یاساوە بۆ دەکردو داوای بوونی هەلێکیان بۆ بەشداریکردن لە چالاکییە سیاسیەکان دەکرد. بەڵام ئەوە بۆچونی کەمینە بوو لە مێژووی سیاسی عێراق بەڵام سەرکەوتن بۆ زۆرینەی ئەوانە بوو کە گوایە دروست بوونی کۆمەڵگا لەو جۆرە هاووڵاتیانە دروست نابێ بەڵکو لە خێزان و رۆڵەی هۆزەکان و ئەوانەی بەشداریان کردووە لە کودەتاکەدا و دەوڵەتیان بە زەمانەتێك بۆ بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان دەزانی.

لێرەدا چەندین بیرو بۆچونی جیاجیا پەیوەست بە مێژوی سیاسی عێراق دێتە پێش و دەرکەوت چۆن زۆربەی گروپەکان دەست نیشانی ناسنامەی خۆیان کردوەو روناکی دەخاتە سەر دیارترین ناکۆکیەکان لەسەر دەسەڵاتداری لەناو وولات لەگەڵ سەرکەوتنی جۆرێك لە جۆرەکانی دەوڵەتی عیراقی بەسەر ئەوەی تردا لە عێراق هەر وەك لە زۆربەی دەوڵەتانی تر پێویستە لەسەر دەسەڵات کە بناغەیەکی براگماتی تایبەت بەخۆی بدۆزێتەوە کە رەزامەندی پێبەدەست بێنێت هاوکات ئەگەر کاتیش گونجاو بێت بنەمایەکی پێوەری تایبەت بەخۆی بدۆزێتەوە کە شیاوی رەزامەندی بێت..وە رەنگە شتێکی وا لە مێژوی عێراق دا هەبێت.

نمونەیەك لەو بارەیەوە گۆرانی بیرۆکەی (هۆز) و (سەرۆك هۆز) لە مێژوی عیراق کە ئەوانە رۆڵی جۆراو جۆریان گێڕا لەژێر سێبەری رژێمە جۆراو جۆرەکاندا کە هەندێکیان هەولی ئەوەیان دا بخرێنە ناو ئەو بەرنامانەی کە دایان نابوو بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی کۆمەلایەتی کە گوایە ئەوان دامەزراوەییەکی سەرەکین لە پرۆسەی بلاو بونەوەی هەژموون و کۆنترۆلکردنی ناوەند. لەژێر سایەی ئەو بارو دۆخەدا هەڵسان بە دروست کردنی تایبەتمەندی ناسراو لە چیرۆکی رژێمی مایەی مەبەست هەرچەندە ئەو تایبەتمەندیانە گۆراوبێ چ لە عێراقی هاشمی کاتی پادشایەتی یان چ لە عێراقی سەدام حوسێن دا و چەند رژێمێکی تر هەولی

روخاندنی ئەو دەسەڵاتانەیان دا کە درابووە سەرۆك هۆزەکـان و تۆمارکردنیـان لـە دەرەوەی چـێرۆکی عێـراق. لەگـەڵ ئـەوەش و لـە زۆربـەی حاڵەتـەکان ئـەو بایـەخ دانەی درابوو بە مەسەلەکانی نەسەب و پلەو پایەی ناسنامەی هۆزگەری لە عێـراق هاوکار بوو لە گۆرانی ئەو لایەنانە خۆیان. زۆربەی ئەو گۆرانکاریانە و کێشەکان کە پەیوەستن بە چیرۆکی (کۆمەڵگا)ی عێراقی کە زۆرینـەی شـیعەن و هـەروەك چـۆن مێـژووی عێـراق دەریـدەخات کـە شـیعە زۆرینـەی دانیشـتوانی عێـراق پێکـدێنن و کۆمەڵگایـەکی سیاسـی نـین لەگـەڵ ئـەوەش تێگەیشـتنی چـالاکیە سیاسـیەکانی زۆرینەی شیعە لە دەرەوەی چوار چێوەی ئەو دەوڵەتەی هەیمەنەی لە سـەر هەیـە زەحمەتە. هەروەکو لە سەرەتاکانی دروستبوونی عێراقیش وابووە چەند گروپێکی بەر تەسکی هەڵقولاوی کەمینەی عەرەبی سوننە لە عیراق. هەر ئەوە بوو وای کـرد بۆ دانانی ستراتیژیەکی بەرهەڵستکاری کـە بـووە رەگـەزێکی بەرچـاو لـە رەگـەزی سیاسـەتی پێشـووی شـیعە لـە بیسـتەکان و سـییەکان و ئـەوە ئـەو قۆناغـە بـوو کەبەرژەوەندیەکانی موجتەهیدەکانی نەجەف و کەربەلا و کازمیە تێکەڵ بـوون بـە بەرژەوەندیەکانی گوندەکان و هۆزەکان لە باشوری عێراق کە بووە دروست کردنی رێگا چارەیەك بۆ ئامادەکردنی ژمارەیەکی زۆر لە شـیعەکان لـە دانیشـتوانی شـارو دێهاتەکان بۆ کارکردن بەیەکەوە.

بـەلام لـەو کاتـەو لەگـەڵ ئـەو هـەموو گۆرانکاریـە ئـابووری و کۆمەلایەتیانـەی لـە دەوڵەت روویدا چەند رەوتێکی جۆراوجۆری بەرهەڵستکاریی لە سیاسـەتی شـیعەدا سەریانهەڵدا هەندێکیان نزیك بوون لە نەتەوایەتی عەرب کـە بروایـان وابـوو نێـوانی ئەوان و عەرەبی سوننە پردەکاتەوە کە دەبێتە هەڵ و مەرجێك بۆ شـیعەی عێـراق کە بەیەکسانی بەشداری بکەن، رەوتەکانی تر پێیان وابوو باشترین رێگا چارە بـۆ بەدەست هێنانی ئەو ئامانجە دەبێ لـە رێگـای نەتەوەیـەکی عێراقـی جیـاوازدا بـێ لەگەڵ ئەوەش کە ئەو دەسەلاتداریە گەورەی چیرۆکی نەتەوەی عەرەبی وای کـرد زۆربەی زۆری شیعەکان پچرپچر بن لە نێوان رێز گـرتن لـە سـەرۆکی تایفـەکان کـە زۆربەیان بەرەگەز ئێرانین و لە نێوان ئارەزویاندا کە دەیانویست رۆڵێکـی تـەواویان

هەبێ لە ژیانی دەوڵەتی عێراق..بۆیە لە هەر لایەك نزیك دەبوونەوە لایەنەکەی تر تاوانباریان دەکردن.

سەبارەت بە هەندێکیان بووە هۆی رەتکردنەوەی بە ئەنقەستی دەسەلاتی موجتەهیدەکان و روویان کردە هەندێك شێوازی عەلمانی رادیکالی سیاسەت .

هەندێکیان وایان دەزانی چارەسەریەکە لەوەوە خۆی دەنوێنێ کە هەڵوێستی سیاسی ئیسلامی ناسراو وەربگرن کە ئەو هەڵوێستە بە زۆری پاراستنی رادیکالیەتە سەبارەت بە موجتەهیدینی شیعە کە لە حەفتاکان دا بووە درووست بوونی دەنگێکی بەتین و بەرز لە ناو شیعەی عیراق و لەو کاتەدا رێگە چارەی سیاسی کردەیی سەبارەت بە زۆر لە شیعەو زۆرینەی عێراقیەکان بووە هەوڵدان بۆ خۆ راهێنان لەگەڵ دەسەلاتدارانی دەوڵەت و لە کۆتاییدا وایکرد رازی بن بە پاشکۆیەتی ئەوان کە ئەوەش تا رادەیەك دەبێتە کزی ناسنامەی شیعەگەری وە هەروەها بووە هۆی دروست بوونی چەند بازنەیەکی بەرتەسکی دەسەلات بۆ ئەو کەسانەی لە سەرو چاوەی دەسەلات بوون. ئەو شێوە ئاڵوگۆریە لە هەست و ستراتیژیەت بووە نیشانەیەکی دیاری گۆڕاو لەمانای پەیوەندی بە تایەفەی شیعە لە سیاسەتی عێراقی و زۆر چیرۆکی جۆراو جۆر سەری هەڵدا کە زۆربەی شیعەکان بە درێژایی کات پەیرەویان دەکرد بۆ رێکخستنی پەیوەندی سیاسیان . مێژووی دەوڵەت تەنها مێژوویێکە لە نێوان چەندین مێژوو کە هەوڵی روونکردنەوەی سیاسەتی عێراق و عێراقیەکانی لەسەدەی بیستەم دا داوەو لەو خوێندنەوەیەدا بەردەوام تیشك دەخەینە سەر لایەنە بنەرەتیەکان بەلام مێژوەکانی دیکە دەربارەی کەسایەتی و خێزان و گروپ و تایەفەو حزبە سیاسیە جۆراو جۆرەکان کە گەلی عێراق پێکدەهێنن گرنگیان کەم نیە بەلام بۆ خزمەت کردنی ئامانجی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەگێرانەوەی ئەو کەسانەوە دەست پێدەکات کە هەولیان داوە دەست بەسەر دەوڵەتدا بگرن وەکو دەزگاو وەکو هزر.

لە راستیدا هەندێك لە دەسەلاتدارانی عێراق بوونی خۆیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەت دەگەڕێننەوە وەك ئەو ئەفسەرانەی خزمەتیان دەکرد لە ژێر فەرمانی (شەریفی

مەککە) لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا کە بوونە کۆڵەگەی سوپای عێراقی نوێ لە بیستەکاندا..بەڵام هەندێك لەدەرەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕە ئابووریانەدا سەریان هەڵدا کە باڵیان کێشابوو بەسەر هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگای عێراق لەسەدەی بیستەم. وەکو گەورە ئاغاکان لە کاتی پادشایەتیدا و هەندێك لە رەگەزە بەناو بانگەکانی کۆمەڵگا کە لە کۆنەوە بونیان هەبوو وەك سەرۆکە کوردەکان و شیعەو هۆزە دێهاتیەکان ئەوانەی باڵیان کێشابوو بەسەر هێزی ئاسایشی عێراقی و ئەوانەی راکێشران بۆ سەر شانۆی سیاسەتی عێراق بەڵام چەندین جار دەوڵەت کەوتە دەستی هەندێ گروپی جۆراو جۆر لە عێراقیەکان بەڵام رۆڵی هەبوو لە دووبارە دروست بوونەوەی ناسنامەی کۆمەڵایەتی لە کاتی دەسەڵاتداری دەوڵەتدا. بەڵام پرۆسەکە لەهیچ حالەتێکدا تەواو نەبوو و هەرگیز روون نەبووە ئایا بنەمای دەوڵەت یاخود بنەمای گروپ زاڵ بووە. لێرەوە شاراوەیی پەیدا دەبێت لە مێژووی پەیوەندیەکاندا کە مێژووی عێراقی نوێی پێدەناسرێت. ئەوەی ئاشکرایە نە دەوڵەت بە مانای دەوڵەت و نە گروپ و کەسایەتیەکانی حوکمدار نەیانتوانی ئەو هەموو مێژووە زۆرەی عێراقیەکان بخەنە چوار چێوەی چیرۆکێك بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت..لەگەڵ بوونی ئەو هەموو داهاتە مادیانەی هەیانبوو لە رێگای توندرەوی کە هەندێجار دەسەڵاتدارانی عێراق پەنایان دەبردە بەر، زۆر بەکەمی توانیان وا بکەن کە مێژووە جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگای عێراقی رێك بکەوێ لەگەڵ خشتەی کات و ئامانجەکانیان. لە خستنە رووی ئەو چیرۆکە ئاڵۆزەی ئەو دەوڵەتە سێ هۆکاری پێکەوە بەستراو سەر هەڵدەدات وئاماژە بەگۆرەپانی جیاوازی کاری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات هۆکاری یەکەم نەرمی نواندن لە سستەمی میرات لەخۆ دەگرێت لەگەڵ ئەو هەموو رێکخستنەی لە دەسەڵات و پەیوەندی نێوان ژێرخانی کۆمەڵایەتی و شێوەی دەسەلات لە دەوڵەت لە خۆ دەگرێ. تۆرەکانی سەردەستەکان و پیاوەکانیان رۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان لە مێژووی سیاسی دەوڵەت هەبوو، هەرلەو کەسانەی هاوکاری رژێمی هاشمییان دەکرد لە ساڵەکانی یەکەم وتا ئەو گروپانەی لەدەوروبەری رژێمی سەدام حوسێن ی گەمارۆدراو. ئەو

پرۆسەیە بەسەر کەوتنی سیاسەتی (هۆزگەری) ناسراوە کە سەردەکەوت ودەرووخاو دووبارە سەردەکەوتەوە هەروەها پرۆسەی هاتنی دانیشتوان لە دێهاتەکانەوە بۆشارەکان کەدواتر بەگوندی کردنی سیاسی بەدواوەهات . چەندین گروپی دڵنیای یەك لە دوای یەکی دروست کرد بەڵام لە ژێر ترس و خۆ پاراستن لە گروپەکانی تر کە وەك خۆیان بوون لە گۆرەپانی ململانێی سیاسی و دارشتنی یاسای بەهێزتریان لە ژێر سێبەری ئەو بارو دۆخەدا سستەمی میراتگەری بووە رێگا چارەیەك بۆ مسۆگەر کردنی یەککگرتوویی چیرۆکەکە چونکە ئەو کەسانەی سەربە ناسنامەی دەسەلاتدارو بروا پێکراو بوون تا رادەیەکی زۆر بەشداریان لەهەمان چارەنووسی ئەودا دەکرد. ئەوە بۆ مان دەردەخات کە بەگەر خستنی ئەو هەوڵە زۆرانە بۆ پاراستنی ئەو پەیوەندیە و مسۆگەرکردنی سەرنەکەوتنی بیروڕای تر بوو، هەروەها بەشدار دەبێت لە سەلماندنی ئەوەی کە سیاسەتی ناسنامە لەسەر بنەمای پێوەریی نیە بەڵکو لە بنەڕەتەوە پەیوەستە بە هەڵ و مەرجی بنەرەتی جۆراوجۆری ژیاندا کە هۆکارە براگماتیەکان پشتراستدەکاتەوە بۆ قبول کردنی یەك لەو چیرۆکانە لەسەر حیسابی ئەوی تر.

بەڵام هۆکاری دووەم هاوکار بوو لەزێدەبوونی توندبوونی ئەو پرۆسانە تا رادەیەکی زۆر کە پەیوەست بوو بە بنەمای گۆڕاوی ئابووری سیاسی لە عیراق لەگەڵ زیادبوونی گرنگیی داهاتی نەوتیی کە بووە هۆی بوونی داهاتێکی دارایی زۆر لە ژێر دەستی دەسەلاتدارانی دەوڵەت لە هەمان کات بووە توند کردنی بیرو بۆچونەکانی تایبەت بە دەوڵەت کە ئەو داهاتانە یان بەکارهێنا بۆ دروست کردنی دەوڵەت خۆی، بگرەهەر لە نوری سەعیدەوە لەسەردەمی پادشایەتیدا و هەتا کۆتایی سەردەمی سەدام حوسێن...هەر بۆیە بنەما ئابووریەکانی دەسەلات لە عێراق پەیوەندی نێوان ئەوانەی کۆنترۆڵی داهاتی عێراقیان دەکردو چین و توێژە جیاجیاکانی گەلی عێراقی دارشت هەروەها بووە هۆی دروست بوونی بێنەو بەردەی ئایدیۆلۆژی لە وولات.

بەڵام هۆکاری سێ یەم بەستراوەتەوە بە دوو هۆکارەکەی پێشووکە خۆی لەو رۆڵە دەبینێتەوە کە توونـدو تیـژی لـە مێـژووی کـورتی عێـراق بینیویـەتی کەوایکرد توندوتیژی لە عێراق دا ببێتە یەك لەو شتانەی کە ئەوانەی چاویان لەدەسەلات بێت چاویان لێبێت بۆیە تـەنیا سوپا دەرنەکەوت بـەڵکو دەزگا ئەمنیـەکانیش زۆربـوون و وایکـرد پەنابردنـە بـەر توونـدو تیـژی لەسیاسـەتدا پانتاییەکی گرنگی مێژووی عێراق پێکبهێنێت.

بۆیە خوێندنەوەمان بۆ ئەو پرسە میراتیانە، ئابووری سیاسی ، نـەوت و پـەنا بردن بۆ توندو تیژی دەبێتە هێڵی وتووێژمان بەلام بۆروونکردنەوە، پشت بە چێوار چێوەیەکی زەمـەنی دەبەسـتین و هـەر سێ بابەتەکـەی کـە ئامـاژەمـان پێداوە لەو چوارچێوە زەمەنیەدا بەرێوەدەبەین بەو هەمەرەنگیـەی کەلـەخۆی دەگرێـت بـۆ چـیرۆکەکانی ئـەو کۆمەڵگـە جیاجیانـەی کـە لـە عێراقـدا هـەن. بەشـێوەیەکی گشـتی ئـەو چوارچـێوەیە ئـەو پشـێویە بەردەوامـەی نێـوان هەوڵەکانی دەستە بژێرە دەسەلاتدارەکان لە پێناو رێکخستنی رەگەزە جۆراو جۆرەکانی گەلی عێراق دەردەخات بەپێی تێگەیشتنە تایبەتیـەکانی ئـەوان بـۆ سستەمی سیاسی و ئەو ئاشتیە کۆمەلایەتیەی کە ویستراوە ـــ و شـێوازەکانی مقاوەمەت و ئەو گرنگی پێنەدان یان رازیبوونەی کە دۆزیانەوە لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەی کە لە هەوڵی سەپاندنی دابوون . هەوڵەکانی دەسەلاتدارە یـەك لەدوای یەکەکانی عێراق بـۆ دەست بەسـەراگرتنی ئـەو سـێ بـوارە لـە ژیـانی سیاسیدا بەناوی بنەمایەکی دەسەلات سیمایەکی دیـارە لـە چـیرۆکە بەیەکـەوە لکێنراوەکانی دەوڵەتی عێراق. ئەمە سەرباری ئەوەی ئەو رەهەنـدەی بـۆی دەچـن لەگەمەیەکی سیاسی کەتەنیا لەسەر چەند یاسایەك بنیاد نراوە رەنگـە هاوکاربێت لە تێگەیشتنی قووڵی و ئێش و ئازاری ئەو ململانێیانـەی کـە باڵیـان کێشا بەسـەر ئەو چیرۆکانە بەشێوەیەك کە زۆرجار بە دڕندایەتیەکەی دەناسرێتەوە.

❑

# بەشی یەکەم

## ویلایەتەکانی عوسمانی: بەغدا - بەسرە – مووسڵ

سەدەکانی شازدەو حەڤدە تێکهەڵکێشانێکی بەرەبەرەی بەخۆوە بینی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ ئەو خاکەی پاشە رۆژ دەبێتە خاکی عێراقی نوێ لەسەر شێوەی سێ ویلایەت لە سێ شار دروست دەبێ ئەویش موسڵ، بەغدا، بەسرە بەڵام دەستەواژەی ناوی عێراق (کەئامازەیە بۆ لێواری روبارێکی گەورە سەرەرای لەوەرگەکانی دەوروبەری) زانایانی جوگرافی عەرەب بەلایەنی کەم لە سەدەی هەشتەوە بەکاریان هێنا وە بۆ ئامازەدان بە دەشتی داپۆشراوی گەورەی روباری دیجلە و فورات، ئەوەش ناوچەیەکە لە ئەوروپا بە ناوی Mesopotamia ناسراوە یان دۆڵی دوونێ، لەوێوە دەسەلأتدارانی عوسمانیەکان هەژموونی خۆیان فراوانتر دەکردو هەوڵی رێگرتن لە نیازی شاهەکانی دەوڵەتی فارسی سەفەویان دەدا،لەراستیدا ئەو ململانێی ئیمپراتۆری و مەزهەبیەی نێوان عوسمانیە سوننەکان و سەفەویە شیعەکان کاریگەری جێهێشت بەسەر مێژووی گەلانی سەرئەوناوچەی کەلەسەر سنووری یەکترن و وایکرد خۆ بگونجێنن لەگەڵ ئەو بارو دۆخەی باوە یان هەڵاتن لە دەست فەرماندەکانیان جیهانێکی سیاسی ئاڵۆزو شێواوی لێ دروست بوو. سەنتەرەکانی دەسەلأت لەزۆر حاڵەتدا سەر بەخۆبوون و لە نێوان خۆیان رێك دەکەوتن لە ژێر بارو دۆخێکی گۆڕاودا، کە رۆژێکیان لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵێك بوون و رۆژێك دژی دەبوون، لێرەدا دەسەلأتی ناوەندی حکومەتی عوسمانی لە ئەستەمبۆڵ بەرەبەرە لاواز دەبوو. بۆیە دەسەلأت و دەستپێشخەری کەوتە دەستی ئەو کەسانەی توانای فەرماندەیی کردنی هێزی پێویستیان هەیە بۆ بەرانگار بوونەوەی دوژمنان لە ناوەوەو دەرەوە.

## "دەسەلآت لە سێ ویلایەتەکە"

لە لوتکەی دەسەلآت لە سێ ویلایەتەکە پاشاو مەمالیکی سەردەستەی سەربازیی هەبوون و دانیان بە دەسەلآتی عوسمانی نابوو، بەلآم بەرەبەرە لە ژێر دەسەلآتی دەردەچوون. لەسەرەتای سەدەی هەژدەمەوە حوکمی بەغدا کەوتە دەست زنجیرەیەك لە مەمالیکە جۆرجیەکان (ئەوانەی لە خێزانە مەسیحیەکانی جۆرجیا بە منداڵی هێنابوویانن و دواتر کرابوونە موسلمان). وە زۆر جار هەژمونیان گەیشتۆتە ویلایەتی بەسرەش سەرەرای ئەوەی کەهێزی سەربازیشیان لەدەست بووە و بەرگری کردنیش دژ بە فارسەکان و ئەوانی تر، ناچار بوون لەگەلّ سەرۆك هۆزە عەرەبیەکان ئەوانەی فشاریان دەخستە سەر بەغدا و بەسرەهاوپەیمانی ببەستن لەو کاتەدا بنەماڵەی جەلیلیەکان لە باکوور هەژمونی خۆیان بەسەر شاری موسلدا، سەپاندبوو هاوکات هەندێ ئیمارەتی کوردەکان کە نیمچە سەربەخۆ بوون لەوانە دیارترینیان بابانیەکان بوون دەسەلآتیان بەسەر چیاکانی کوردستاندا سەپاندبوو. بەلآم ناوچەکانی ناوەراست و باشوور کەوتنە ژێر فشاری یەکێتی سەرۆك هۆزە عەرەبە گەورەکان (منتەفەك، خەزاعل،زبێدو بەنولام) جگە لە هۆزە گەورە و بەهێزەکانی وەکو (شەممەر، ئەلبو مەحەمەد) کە ئەو یەکێتیە فەرماندەیی هێزەکانیان دەکردو زۆر جار سەرکەوتنیان بە دەست دەهێنا بەسەر پاشاکانی بەغدا یان بەسرە. جگە لەوەش هاوپەیمانێکی باش بوون دژ بە فارسەکان و ئەو هۆزانەی کە رازی نەبوون سەرانە بدەنە پاشاکان کەزۆربەی زۆری دەسەلآتیان پشتی پێبەستبوو.

حوکمکردنی پاشاکان و مەمالیکەکان لە سایەی سستەمێك بوو کە لە سەر بنەمای سەرانە دامەزرابوو و کاری سەرەکی حکومەت بریتی بوو لە هێشتنەوەی خۆیان و دەوروبەریان لە ئاستێکی گونجاو لە رێگای وەرگرتنی داهات کە بتوانن خزمەتی پاشکۆکانیان و بەرگری بکەن لە رژێم دژ بە هەموو ناحەزان، چ لە ناوەوە یان لە

دەرەوە. بۆیە باج سەپێندرا بەسەر کۆمەڵگا گوندییە نزیکەکان لە شارە سەرەکییەکان ، سەرانە لەلایەن سەرۆك هۆزەکانەوە دەهات کە زانیان بەرژەوەندیەکانیان پەیوەستە بە پەیوەندیەکی باش لەگەڵ دەسەلات کە زیاتر پاشاکان و مەمالیکەکان بە ژیرانە بەرێوەیان دەبرد. هەروەها باجەکانیش دەخرایە سەر ئەو پارەیە و ئەو باجەی سەپێندرابوو بەسەر ئەو کەل و پەلانەی دەگوازرایەوە لە دۆڵی دووزێ کە بەردەوام لە بەرزبوونەوە دابوو لە بەر گەشەسەندنی بازرگانی لەگەڵ (کۆمپانیای هندی رۆژ هەلاتی) بەریتانیا بە تایبەت.

هەڵسوکەوتی ئەو پاشایانە بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر ئاستی فەرمی دروست بوو،سەرەڕەی سوڵتانی عوسمانی دانپیانراو بوو لە دراو ونوێژی هەینی لەمزگەوتەکان و سیما دیارەکانی دیکەی دەوڵەت و پاشاکانی ئەو سێ ولایەتە بەتەنگ وەدەستهێنانی تەئکیدی سوڵتانی عوسمانی بوون بۆ دەسەڵاتەکەیان وەکو والی. بەڵام بە کۆت و بەندی راستەقینە بەسەر دەسەلاتیان رازی نەبوون هەرچەندە کەکارمەندیان هەبوو لە ئەستەمبوڵەوە هاتبوون بەڵام پۆستەکانی پلە دوویان پێدرابوو. لەبەغداش هەندێ فرقەی سەربازی عوسمانی ئینکیشاری جێگیربیوون بەلام پاشاکان لەژێر فەرمانی خۆیان دانابوو هەردەم هێزێکی مەملوکی تایبەت بەخۆیان هەبوو کەتوانای ملپێکەچکردنی ئەو هێزانەیان هەبێت،سەرانەش رەوانەی ئەستەمبوڵ دەکرا بەلام بەشێوەیەکی نارێك وپێك.

لە راستیدا هیچ جیاوازیەك نەبوولە نێوان هەڵسوکەوتی مەمالیکە جۆرجیەکان و دەسەلاتدارانی عوسمانی لە خۆیان پایە بەرزتر لەگەڵ دانیشتووانی هەرسێ ویلایەتەکە.. پەیرەوی هەمان هەڵسوکەوتی ئیدارەی عوسمانیان دەکرد لە بواری باجی سەپێندراو بەسەر بەروبوومە کشتوکاڵیەکان و رسوماتی گومرگی و ئامادەکردنی هێزە چەکدارەکان یان جێ بەجێ کردنی خواستی والی کە لە کۆتاییدا خواستی خەلیفەی عوسمانی بوو. لەبارەی بڕواش مەمالیکەکان هیچ مەیلێکیان نەبوو بۆ گۆڕینی سستەمی چینایەتی کە لەو کۆمەڵگایانەدا باوبوو کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەخۆیدەگرتن.

لە راستیدا دانیشتووانی ولایەتەکانی موسڵ و بەغدا و بەسرە هەموویان کۆمەڵێك پێکهاتەی کۆمەلایەتی و تایەفی و لەخۆ گرتبوو،لەوناوچانەی کەکوردی زمان بوون لە باکوورو باکووری رۆژهەلاتی موسڵ وبەغدا ناسنامەو دیاردەی وەلائی خانەوادەیی و ئایینی وعەشایەری بەسەر ژیانی خەلکەکەدا زاڵ بوو هەروەها گروپە سۆفیگەریەکان کاریگەریەکی گرنگیان هەبوو بەتایبەتیش قادرییەکان سەرەرای دەرکەوتنی بەرەبەرە زیادی نەقشبەندیەکان وشێخ وسەییدە کوردەکان زۆر بەسەریاندا زاڵ بوو.هەر لەو ناوچەیەدا گروپەکانی ئێزیدیەکان کەسەر بە ئایینی ئێزیدی وکورد بوون ئەمە جگە لە کریستیان و شیعەو هەندێ لەکوردو تورکمانەکان.ئەم سیمایانەوە جیاوازی زمان و پەراوێزی جوگرافی بووە هۆی دەرکەوتنی ژمارەیەك لە ئیمارەتی ناوەخۆیی بچووك کە بە پەیوەندی ئالۆزو گۆراو لەنێوان خۆیاندا ولەگەڵ هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی ناسرا بوون .

لەبەشەکانی دیکەی عەرەبی زمانیش لە ویلایەتی موسڵ دانیشتووانی گوندەکان بەسەر کۆمەڵە نیشتە جێیەکان و هۆزە رەوەندەکان دابەش ببوون خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەرو ماڵات بوون و سودیان لە هەندێ هەڵ وەرگرت کە بازرگانی هات و چۆ و رەخساندبووی. هەروەها پەیوەندی هۆزگەری ناوەخۆیی کاریگەری هەبوو بەسەر ژیانی رۆژانەیان .

لە بەرامبەردا خودی ویلایەتی موسڵ تێکەڵیەکی زیاتر راستەوخۆی بە سستەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەبوو. خانەوادە ناوخۆییەکان کە خاوەن هەژموون بوون وەك جەلیلیەکان جگە لە خانەوادە دیارەکانی دیکەی وەك عوبەیدیەکان کۆنترۆڵی هەندێ لە گەرەکەکانی شاریان کردبوو. دانیشتوانەکەش کەتارادەیەك رەنگدانەوەی پێکهاتەی گوندەکانی دەوروبەر بوون زۆربەی هەرەزۆریان عەرەبی سوننە بوون..هاوکات هەندێك گروپی دیار لە تورکمان و کوردیش هەبوون سەرەرای جو و مەسیحیەکانیش.

دەکرێ لەبارەی بەغداوەش هەمان شت بلێین،بەو پێیەی کە پایتەختێکی هەرێمیە زۆر هێمای هاوبەشی هەبوو لەگەڵ شارە گەورەکانی عوسمانی بەڵام ئەو دوور تر بوو لە هەژموونی ئەستەمبوڵ لە زۆر رووەوە. مەمالیکە جۆرجیەکان سیستەمێکی چیناپەتی سەربازیی جوداو سەر سورهێنەریان خستبوە سەروی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکەی، کەخۆی سەپاندبوو بەلام بەشێوەیەکی جودا لە سستەمی چیناپەتی ئەشرافەکان کە خانەوادەی گەیلانی سەرۆکایەتی دەکرد هەروەها نزیکی لە ولاتی فارس و گەورەیی قەبارەی شیعەکان لەدەوروبەری کازمیە شێوازێکی دیاری بەخشیبووە شارەکە هاوشێوەی قەبارەو ناوداری گروپی جوولەکەکان کەلە کۆنەوە لەوێ بوون ونزیکەی ٢٠٪ی رێژەی دانیشتووانیان پێکدەهێنا . سروشتی سنوری ویلایەتەکە وایکردبوو خەڵکێکی زۆر رووی تێبکات چ لەگوندەکان یاخود ئەو فەرمانبەرە عوسمانیانەی کە هاتنە شارەکەو تێیدا جێگیر بوون.

لە راستیدا ولایەتی بەغدا هەروەك موسڵ ملکەچی دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی پایتەخت نەبوو تەنها بە ناو نەبێ، لە باکوور زۆربەی دانیشتوانی دێهاتەکان داب و نەریتی هۆزگەری نیشتەجێ یاخود نیمچە نیشتەجێ بەسەریاندا زال بوو ،ئەو ناوچانەش کەلە بەغداوە نزیك بوون ئاسانتر ملکەچی ئیدارەی سیاسی شارەکە دەبوون سەرەرای ئەوەش کەمجار هەبوو مەمالیکە پاشاکان بتوانن دەسەلاتی خۆیان بەسەر هۆزو گروپە عەشایەریەکان بسەپێنن کەدوور تر بوون و پرچەکترو ژمارە زۆرتر بوون ئەمەش وایکردبوو مەمالیکەکان توانایان کەمتر بێتەوە لە کۆکردنەوەی سەرانە لەسەرتاسەری ویلایەتی بەغدا. وە لە خەسڵەتەکانی ئەو ویلایەتە لەخۆ گرتنی مەزارە پیرۆزەکان بوو(العتبات)کەکۆکراوەی ناوی نەجەف، کەربەلا،کازمیە،سامەرا یە کە شاری زۆر پیرۆزن بۆ موسلمانانی شیعەلەراستیدا ئەو شارانە بەتایبەتیش سەنتەری شارەکانی نەجەف وکەربەلا بۆماوەیەکی درێژ سەرچاوە بوون بۆ ئەگەری سەرهەڵدانی کێشە بۆ عوسمانیەکان. چونکە ئەو شارانە سەنتەری زانست و خوێندن لە قوتابخانەی یاسای جەعفەری بوون کە

لەلایـەن عوسمانییەکانـەوە دان پێنـراو نـە بـوو هـەر بۆیـە شـیعەکان بەگشـتی دامودەزگاکانی عوسمانیان پشت گوێ دەخست هەرچەندە شیعەکان دانیشـتوی دەوڵەتی عوسمانی بوون بەڵام تێکەڵیەکی کاریگەریان نەبوو ئەمە جگە لـە گرنگی سـەنتەرەکانی حـەج و زانست سـەبارەت بـە دەسـەڵاتدارانی سـەفەوی و قاجاریـە فارسەکان کە هەردەم بەوردی چاودێری هەر زوڵم و زۆرێکیان دەکرد کەلەوانە بـوو دەسـەڵاتدارنی عوسمـانی لـەدژی خـەڵکانی سـەر بـە شـا کەلـەو ویلایەتـە دەژیـان ئەنجامی بدەن.

لەویلایەتی بەسرەش ناکۆکییە عەشایەرییەکان وئایینیەکان وایکرد وەلائی خەڵکی ویلایەتەکە بۆ دەوڵەتی عوسمانی لاوازبێت ویەکێتیە عەشـایەرییەکان بەتایبـەتیش یـەکێتی بـەهێزی هۆزەکـانی مەنتەفـەك و خـەزاعل و هـۆزی بومەحەمـەد کـە هەژمونێکی زۆریان هەبوو زاڵ بێت بەسەر ژیانی زۆربەی دانیشتوانی ئەو ویلاتە لـە جوتیارو شوان و دانیشتووانی زۆنگاوەکان وپاشـا مەمالیکـەکان لـە بەسـرە تـەنیا نیمچە کاریگەریەکیان هەبوو بەسەر ئـەو ناوچـانە تـەنها بـەو مەرجانـە نـەبێت کـە سەرۆك هۆزەکان دەیان سەپاند.

کۆمـەڵگای بەسـرەش هـەر وەکـو بەغـدا لـە ژمارەیـەك کۆمەڵـەی دیـار پێکهـاتبوو لەسـایەی حـوکمی سـەربازیی چـینایەتی مەمالیکـەکان . دەسـتە بـژێری خانەوادەکانیشی کە بەگشتی عەرەب بوون و زۆرینەیان سـەر بـە مـەزەبی سـوننە بوون لە رووی پلەوە خانەوادەی نەقیبی ئەشرافەکان سەرکردایەتی دەکردن بـەڵام فەرمانبـەرانی عوسمـانی و خـاوەن زەوی زارو بازرگانیشـی لـە خـۆدەگرت کـە بەرژەوەندی گەورەیان لـە ئـابووری نـاوخۆی هـەبوو. ئـەم ئابووریـەش پشـتی بـە کشتوکاڵێکی چڕی خاکە دوورە دەستەکانی بەسەرە یان پەیوەندیە بازرگانیـەکان لەگەڵ کەنداو و زەریای هیندی بەستبوو. گرنگی بازرگانیی هیندیش بەتایبەتی لـە رێگـەی پێشـکەش کردنـی کۆمپانیـای هینـدی رۆژهـەڵاتی بـەریتانی بـۆ سـوودە بازرگانیـەکان (لەسـەرەتاکانی سـاڵی ١٦٣٩) دووپـات بـۆوە ، سـەرباری بازرگانـە فەرەنسی و ئەوروپیەکانی دیکە کە هەوڵیان دەدا سوود لـەو بازرگانیـە وەرگـرن و

دواتریش زۆربەی ئەو ماوەیە بەدەستیەوەی بگرن . ئەو کرانەوەیە زۆرە بەرووی هندستان سەرباری کەنداو و دواتر مسریش، لەگەڵ هەموو ئەوانەی لە خۆی دەگرت لە هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدەدا، کاریگەریەکی گرنگی هەبوو بەسەر کۆمەڵگەی بەسرەو هەڵوێستی خەڵکەکەی لە هەمبەر ئەو گۆرانکاریانەی کەچاوەرێی دەکردن .

## دووبارەداگیرکردنەوەی عوسمانی بۆ سێ ویلایەتەکە

گرنگی ئەو جیاوازیانەی نێوان هەر سێ ویلایەت لەگەڵ دووبارە داگیرکردنەوەیان لەلایەن عوسمانیەکان لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم زۆر بەروونی دەرکەوت.لاواز بوونی سەڵتەنەت لەبەرامبەر ولاتە ئەوروپیەکان و نمونەی مایەی نیگەرانی کە خۆی لەهێزە تازە پەرەسەندوەکەی والی میسر (محمد علی پاشا) دەدیتەوە لەپشت ئەو کاردانەوە چاکسازییە بوو لە ئەستەمبوڵ. و حکومەتی ناوەندی لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨٣٩-١٨٠٨) دەستی کرد بە دووبارە سەپاندنی هەژموون بەسەر ویلایەتە دوورو لاچەپەکان و هەروەها دووبارە دروستکردنەوەی هێزی سەربازیی بۆ ئیمپراتۆریەت. هەروەها رژێمی تازە هەوڵی دەدا بۆ پاڵپشتیکردنی دەسەلاتی خەلیفە و حکومەتەکەی و نەهێشتنی بوارێکی زۆری سەربەخۆیی بو دەسەلاتدارانی ویلایەتەکان کە دەسەلاتێکی نیمچە ئۆتۆنۆمیان هەبوو وە زۆری پێ نەچوو تا(بابو ئەلعالی) رووی کردە بەغداو بەسرە و موسڵ .کاتێك کە لەساڵی ١٨٣١ داود پاشای والی مەملوکی بەغدا رەتی کردەوە گوێرپەڵی (بابو ئەلعالی)بێت و دەست لە کار بکێشێتەوە، هێزێك بە سەرکردایەتی والی حەلەب عەلی رەزا پاشا رووی کردە بەغداو و شارەکەی داگیر کردو. خودی داود پاشای بە دیل گرت و بە دیل گرتنی داود پاشا دەسەلاتی مەمالیکەکان لە بەغدا بە شێوەیەکی لەناکاو کۆتایی پێهات.

دواتر عەلی رەزا رووی کردە بەسرە بۆ داگیرکردنی و کۆتایی هێنانی دەسەلاتی مەمالیك لەو شارە. لە ساڵی ١٨٣٤ دووبارە دەسەلاتی ناوەندی عوسمانی گەڕاوە سەر موسڵ و کۆتایی هێنا بە دەسەلاتی بنەماڵەی جەلیلیەکان. لەدەرئەنجامی ئەوەش و لەسەرەتای دەست پێ کردنی سولتان عەبدولمەجید بە قۆناغی رێکخستنەکان هەرسێ ولایەتەکە کەوتنەوە ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی ئیستەمبۆڵ ، ئەمەش وایکرد بەرووی زنجیرەیەك چاکسازی بکرێتەوە لە بوارەکانی موڵکداریتی زەوی ، کارگێری، سوخرە، یاساو پەروەردەی گشتی کە ئەو چاکسازیانەش بەپێی کات و هێزو ماوەی دەسەلاتی فەرماندە عوسمانیەکانەوە بەند بوو کە بابولعالی رەوانەی دەکردن .

لە راستیدا زەقترین تێبینی بۆ کۆمەلگای سیاسی هەر سێ ویلایەتەکەخۆی لەوگۆرانکارییە بەرەبەرەییانەدا دەدیتەوە کەلە خودی دەوڵەتدا روویدەدا وەکو سستەمێکی دیاری دەسەڵات چاکسازیەکانی عوسمانی لە دەرەنجامی ئەو بروایە هات کە لاوازی سەڵتەنە لاوازییێکە لە لەبونیادی دەوڵەتدا بەبەراورد لەگەڵ هێزی ئەوروپاییەکان بۆیە بابولعالی سوور بوولەسەر بنیاتنانەوەی کۆڵەگەکانی دەوڵەت لەبوارەکانی کارگێری ، یاسا دانان، پەروەردەو داهاتەکان هاوشێوەی ئەوروپیەکان ئەمەش وایکرد هەندێ لایەنی ئەو چاکسازیانە لەسێ ویلایەتەکە دەرکەوێ.

لێرەدا کۆمەلگەیەکی سیاسی جودا لەهەرسێ ویلایەتەکەدا سەری هەڵداو رۆڵی هەبوو لەزۆربەی ئەوچاکسازیانەی کە عوسمانیەکان کردیان .

هەروەها ئەوچاکسازیانە بووە مایەی دۆزینەوەی پلەو پایەی کۆمەلایەتی نوێ بۆ تاکەکان و بواریان بۆ رەخساندن بۆ رۆڵ گێران لە دەوڵەتی عوسمانی و پرۆسەی کۆمەلایەتی نوێ.

دیارترین ئەو شتانەی کە دەوڵەتی عوسمانی پەنای بۆ برد بۆ سەر لەنوێ تێکهەڵکێشانەوەی ویلایەتەکانی دۆڵی رافیدەین لەسەڵتەنەتی عوسمانی دا ئەو

چاکسازیانە بوو کەلە یاسای موڵکداری ساڵی ١٨٥٨ و یاسای ویلایاتی ساڵی ١٨٦٤ وەریگرتبوون. کەهەوڵی ڕێکخستنی بواری موڵکداریەتی زەوی دەداو لە هەمان کاتدا خاوەنداریێتی دەوڵەتی بۆ زەوی تەئکید دەکردەوە.

لەگەڵ گەیشتنی مەدحەت پاشای بەهێز و چالاك بۆ بەغداو بوونی بە والی لە ساڵی ١٨٦٩ چەند هەنگاوێکی یەکلاکەرەوەی گرتە بەر بۆ جێبەجێکردنی یاسای ویلایات و یاسای موڵکیەت و یاسای ویلایات وێنەیەکی تێر و تەسەلی بۆ سنووری هەرێمایەتی هەرسێ ویلایەتەکە و بنەمایەکی ئیدارەی نوێی لە ئاستی هەرێم تا ئاستی لادێ دانا بە ئامانجی گەیاندنی ئیدارەی ناوەندی بوو بە شێوەیەکی بەرنامە دارێژراو بۆ ئەو گەلەی تا ئەوکاتەش نەچووبوونە نێو دەزگاکانی دەوڵەت هەروەها ئامانجێکی دیکەشی ئەوە بوو لە ڕێگای ئەنجومەنە ئیداریەکانەوە نوێنەرانی گەل بە شێوەیەکی گشتی لە موسڵمان و غەیرە موسڵمان وەکو یەك بەشداری لەچالاکیەکانی دەوڵەتدا بکەن. مەدحەت پاشا توانی ئەو چاکسازیانە جێبە جێ بکات بێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ ئاستەنگێکی گەورە بێتەوە چونکە لەو قۆناغەدا دەستپێشخەری لەدەست دەسەلاتدارانی عوسمانی بوو، دەرەنجامە کردەییەکانی ئەو پرۆسەیە زۆر ڕوون نەبوو و کاتێکی زۆری ویست تا دەرکەوت چونکە کەسایەتیەکان و دەسەلاتی تاکەکان کاریگەریان بۆ سەر پرۆسەکە هەبوو سەرەرای هێڵە ناجێگیرەکانی ئەوانەی کە لە خودی ئەستەمبۆڵ داوای لامەرکەزییەتیان دەکرد کە دواتر بەرەبەرە لە ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بەرامبەر بەوانەی داوای سەپاندنی دەسەلاتی ناوەندیان دەکرد دۆراندیان ،هەر لەماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەوانە ئەو هۆکارانە بوون کە سرووشتی پەیوەندییەکانی نێوان هەرسێ ویلایەتەکەو ناوەندی دیاری کرد هەروەها تارادەیەك کاریگەری بەسەر هاوسەنگی هێزدا هەبوو لە جیهانی سیاسی بەغدا ،موسڵ و بەسرەدا .

مەدحەت پاشا بۆ بەجێگەیاندنی یاسای موڵکییەت هێشتا کارێکی زۆری مابوو کاتێ کە بۆ ئەستەمبۆڵ بانگهێشت کرا لە ساڵی ١٨٧٢ بەلام ئەو پرۆسەی

چاکسازییەکی قـوولّی دەسـت پێکردبـوو لەسسـتەمی مولّکیـەتی زەویـدا وکـە ئامانجەکـەی وەدیهێنـانی دەرەنجـامی مـاوە درێـژ بـوو سـەبارەت بـە زۆربـەی دانیشتوان کەپشتیان بە کشتوکالّ دەبەست بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیـان ویـەك لە کۆلّەگەکانی چاکسازی خانووبـەرە پێدانی (سـەنەدی تـاپۆ) بـوو بەوکەسـانەی کەپارچـە زەوییێکیـان هـەبوو یـاخود کاریـان تێـدەکرد ویاسـای مولّکیـەتی لـە رووبەرێکی فراوانی هەر سێ ویلایەتدا پەیرەو کرد .

ئەو کارە گۆرانێکی گەورەی لە پێکهاتـەی کۆمەلاییەتیـدا هێنـا ئـارا ومولکییـەتی بەکۆمەلی زەوی قەدەغە کراو تـاپۆ تـەنیا بـەناوی تاکـە کەسـێکەوە تۆمـار دەکـرا ،لەناوچە کشتوکالّیەکاندا کە سروشتی عەشایەری بەسەریدا زال بـوو زۆربـەی جـار ناوی سەرۆك هۆزەکان لەسەر تاپۆکـان دەنوسـرا بۆیـە زۆربـەی جوتیـاران بوونـە کرێگرتە و لەو زەویانەدا کاریان دەکرد لەهەندێ ناوچەی دیکەش لەژێر دەسەلاّتی سـولّتان عەبدولحەمیـدا (بەتایبـەتیش لەناوچـە سـوننیەکاندا کـە خـودی سـولّتان خاوەنیان بوو )باج بەسەر کشتوکالّدا هەروەکو خـۆی مایـەوە وایکـرد کەسـنەبێتە خاوەن زەوی .ئەم سستەمە تازە وایکرد گروپی دیکە پەیدا بن لـەو کەسـانەی کـە سودمەند بـوون لەدەولّـەت و بەرژەوەنـدیان لەجێبـەجێکردنی خواسـتی دەولّەتـدا خۆیدەتیتەوە لەو زەویانـەی کـە سـودیان لێـوەر دەگـرت هاوکـات زۆر جـار جێبـە جێکردنی یاسا نوێیەکە رووبەروی بەرگریەکی دژواری جوتیاران دەبۆوە .

ئەو گۆرانکاریانە بەرە بەرە خەلّکانێکی جۆراو جۆری بۆ ئـەو چاکسـازیانەی نـاوە نـاوە دەولّـەت دەیکـرد راکێشـا ، سـەبارەت بـە هەنـدێ خانـەوادەی شارنشـینە دیارەکان و خانەوادەی فەرمانبـەرە عوسمانیـەکان پرۆسـەی چاکسـازی رەچـاوی بەرژەوەندیە مادیەکان و هەستە سیاسیە تایبەتیەکانی دەکرد. بەلاّم سەبارەت بە هەندێ لە سـەرۆك هۆزەکـان چ لـە عـەرەب و چ لـە کوردەکـان ئـەو بەلّگەنامانـەی مولّکیەتی زەوی کە دەولّەت پێی دابـوون وایلێنـە کردبـوون کـە هـیچ هەسـتێکیان لادروست بکـات بەپابەنـد بـوونی دوولایەنـە لەلایـەن ئەوانـەوە و نـەدانی بـاج بـە

بەردەوامی دەبووە هۆی خراپی پەیوەندیەکانی نێوان پایتەختە هەرێمیەکان و گوندەکان .

هەر لەسەردەمی مەدحەت پاشاوە ئەو پرۆسانە بوون کەبوونە هۆی پێکهێنانی کۆمەڵگەی سیاسی لە هەرسێ ویلایەتدا و گۆرانکاری وشتی نوێشی هاتە سەر وەکو دامەزراندنی چاپخانەو بڵاوکردنەوەی یەکەم رۆژنامە(رۆژنامەی فەرمی زەورا لەساڵی١٨٦٩)،دەستپێکردنی پرۆژەی ئاودێری، دروستکردنی کارگەی نوێ لەدەوروبەری بەغداو دامەزراندنی دەزگای فێرکردنی نوێ ،سەرەڕای باشتر بوونی هۆیەکانی پەیوەندی لەنێوان ویلایەتەکان خۆیاندا وهەروەها جیهانی دەرەوە.

ئەم دەستێوەردانەی دەوڵەت لە ژیانی خەڵکدا زۆرجار دەبووە هۆی نارەزایی دەربرین لەلایەن خەڵکەوە بەڵام لەهەندێ حاڵەتدا ئەمە لەبەرژەوەندی عوسمانیەکاندا بوو. بۆ نموونە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لێکهەڵوەشانەوەی یەکیەتیە گەورەکەی هۆزی مەنتەفەك لە بەسرە هاریکار بوو لە لاوازکردنی تا رادەیەك و گۆڕانکاری لە پەیوەندی نێوان خانەوادەی ئاغاکانی (ئەلسەعدون) وشوێنکەوتوانیان لە رۆڵەکانی هۆزەکان هاوکار بوو لەو لاوازکردنە وبەهاتنی ساڵی ١٩٠٠یەکێتی هۆزەکانی مەنتەفەك ئەو دەسەڵاتەیان نەما کەپێشتر هەیان بوو.

بەڵام لەهەندێ شوێندا وبەهۆی ناکۆکی لەسەر زەوی و مافەکان زنجیرەیەك شۆرش روویاندا وهێزی عوسمانیەکان کەلەو ناوچانەدا بوون کپیان دەکردنەوە بەلأم لەهەندێ حاڵەتدا ئەو شۆرشانە لەدەسەلأتی هێزی والی عوسمانیەکان گەورەتربوو بەتایبەتیش لەناوچە کوردیەکان و ویلایەتی بەسرەدا ئەمەش وایکرد عوسمانیەکان سیاسەتی دووبەرکی نانەوە لەوناوچانەدا پەیرەو بکەن کە وایکرد توانایان بۆ رووبەروو بوونەوەی عوسمانیەکان لاوازبێ .

بەلأم لەو ویلایەتی بەغدا ئەو پرۆسەیە زیاتر پێشکەوتووتر بوو ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ هێزی سەربازیی ئیدارەی عوسمانی (چونکە بەغدا سەنتەری فەرماندەیی سوپای شەش بوو) هەروەها بەغدا شوێنێك بوو زۆربەی سەرۆك

هۆزەکانی بۆخۆی ڕاکێشابوو بۆ گەمەیەکی سیاسی کە بەرژەوەندی ئەوانی تێدا بوو.ئەمە جگە لەوەی بەغد بارەگایەکی ناوەندی بوو بۆ تۆمارکردنی زەوی و هەر لەوێ بڕیار دەربارەی گۆڕانکاریەکانی پەیوەست بە موڵکیەتی زەوی (سەنیە) (ئەو زەویانەی موڵکی سوڵتان بوو)دەدرا لەبەرامبەر ئەو پارمەتیانەش کە لەلایەن سەرۆك هۆزەکانەوە پێشکەشی والی دەکرا ئەوەی مسۆگەر کرد لەگوندەکانی دەورووبەری بەغدا لەماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم پشێویەکی وا ڕوونەدا .

## (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و تورکیای فەتات)

لە ڕاستیدا بەهای هاوکاری لەگەڵ شێخەکان(سەرۆك هۆزەکان) لە کۆتایی چارەکی سەدەی نۆزدەم بە ئاشکرا دەرکەوت. لەو ماوەیەدا قەیرانی دارایی سەڵتەنە سەری هەڵدا، وەك ئاماژەیەك بۆ کەمی دارایی کەپێویست بوو لە بواری چاکسازیدا کە لە ڕابردوودا نەخشەی بۆ کێشرابوو. لەسەر ئەو بنەمایە داهاتەکانی کە لە ویلایەتەکان دەهات لەو کاتەدا زۆر گرنگ تر لە پێشان بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریەت و بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی ئیدارەی قەرزی گشتی پێویست بوو. سەرەرای پێداویستیەکانی تر. ئەمانە هەمووی هاوکات بوو لەگەڵ گەیشتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بۆ کورسی دەسەلات (١٩٠٩-١٨٧٦) و هەڵپەساردنی دەستوور. جگە لە کۆتاییهاتنی چاکسازی لیبراڵی کە عوسمانیە لاوەکان سەرکردایەتیان دەکرد. سەبارەت بە سوڵتانیش کە بڕوای بە فەرمانبەرکانی خۆی نەبوو بە هۆی پەیوەندیان لەگەڵ بزووتنەوەی دەستووری و هاوسۆزیان لەگەڵ عوسمانیە لاوەکان گرنگ بوو کە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکان لە زۆربەی ویلایەتەکانی سەڵتەنە بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ دروست بکات.

سەبارەت بە دۆڵی رافیدێنیش ئەمانە سولتان عبدولحەمیدی هان دەدا بۆ پتەکردنی پەیوەندی لەگەڵ سەرۆك هۆزە دیارەکان و خانەوادە ماقووڵە سەرەکیەکان وکەسە سەرەکیەکان لە زۆربەی رێکخراوە سۆفیگەرییەکاندا. ئەوەش بووە هۆی پابەند بوونی سەرۆك هۆزەکان وپیاوانی ئاینی بە دەوڵەتی عوسمانی و وایکرد کە بتوانن پەنا ببەنە بەر ئەستەمبوڵ بۆ پاڵپشی کردنیان دژ بە دەسەلاتدارانی ویلایەتەکان . فەرمانبەرە عوسمانیەکان ورەخنەگرە هیوابراوەکان لەسەر نارەزایی بەرامبەر بەو سیاسەتەی سولتان کۆکبوون ولەکۆتاییدا بووە هۆی دروست بوونی بزووتنەوەی (تورکیای فەتات) لەسەرجەم ناوچە جیاوەزەکانی سەڵتەنەدا لەوانەش دۆلی رافیدەین.لەگەڵ زیادبوونی هەل بۆگەنجەکان لە هەرێمەکاندا بۆ فێربوونی زانستی نوێ ومەشقکردن چ وەکو فەرمانبەر یاخود ئەفسەری سەربازی وایکرد بکەونە ژێر کاریگەری ئەو رەوتە هزریانەی کەلەئەستەمبوڵ و هەروەها لەویلایەتەکانیش وەکو یەك باوبوون لە نێو فەرمانبەرە رۆشنبیروخاوەن کارەکاندا و لەسالی ١٨٦٩لەبەغدا ژمارەیەك دەزگای خوێندنی سەر بە حکومەت کرانەوە کە دیارترینیان هەردووقوتابخانەی روشیدیەی مەدەنی وسەربازی هەروەها ژمارەیەکی زۆری گەنجان چوونە کۆلێژی ماف یان کۆلێژی سەربازیی لە ئەستەمبول.

ئەم پەرەسەندنانە وایکرد ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی هەرسێ ویلایەت تێکەڵی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بن.

لەدەرەنجامی ئەوانەدا کۆمەڵەی جۆراوجۆر لە هەر سێ ویلاتەکەدا دروست بوو ئامانجیان وەدیهێنانی بەرژەوەندی یاخود چاککردنی سیاستمەدارەکان بوو، بەلام هیواو خەونەکانیان هیچ جیاوازیەکی نەبوو لە هیواو خەونی هاولاتیانی دیکەی سەڵتەنەت وسنووری جیهانە سیاسیەکەشیان لە چوار چێوەی سنووری

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تێنەدەپەری بەڵام ئەوانە پەیوەندیان لەگەڵ کەسانی دیکە و لە ویلایەتەکانی دیکە دروست کرد کەهەمان ڕێبازیان هەبوو وبۆیاندەرکەوت کە هاریکاری لەچالاکی سیاسی چ گرنگیەکی ستراتیژی هەیە.

لەگەل دەرکەوتنی ئەو جۆرە چالاکیانە کەنهێنی و ڕێکخراو نەبوو کاریگەریان بۆ سەر ژیانی هەندێك لە فەرمانبەرە گەنجەکان وئەفسەرانی سوپا لە هەرسێ ویلایەتدا دروست کرد هاوکات هەندێکی دیکە جۆرێکی تریان لە چالاکی سیاسی ئەنجام دەدا لە چوارچێوەی سەڵتەنەتدا کە ئامانجیان تەنیا مسۆگەر کردنی بەرژەوەندی راستەوخۆیان بوو لەدیارترین کەسانی ئەم بوارەشدا عەبدولرەحمان گەیلانی نەقیبی پیاو ماقولانی بەغداو سەید تالبی نەقیبی پیاو ماقولانی بەسراو کورەکەی بوون سەرەرای هەندێك لە سەرۆك هۆزە کوردەکان بۆ نموونە شێخ سەعید بەرزنجی کەنەوەی شێخەکانی سەر بەرێبازی قادری بوو ،ئەوانە هەوڵیان دەدا پەیوەندیان لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ پتەوبکەن بۆ ڕێگرتن لەپیلانی فەرمانبەرە عوسمانیەکان لە هەر سێ ویلایەتەکەو مسۆگەر کردنی بەرژەوەندیەکانیان.

دەکرێ هەمان شتیش لەبارەی خانەوادەی سەرۆك هۆزەکانی یەکێتیەکانی هۆزە گەورەکان بگوترێ کە هەندێکجار پێویستیان بە قەڵمرەوی بابو لعالی بوو بۆ تەئکید کردنی مافیان لە زەوی و یاخود لەکاتی دووبەرەکی ناوخۆیدا پێویستیان بە میانگیری سوڵتان یاخود دانپیانانی دەبوو.

سەرهەڵدانی شۆرشی تورکیای فەتات لەساڵی ١٩٠٨ کەسوڵتانی ناچار کرد کاربەدەستوری عوسمانی بکاتەوە وپارتی ئیتحادو تەرەقی بەئاشکرا بکەوێتە کار رێگەی خۆشکرد بۆ زۆر لەو رەوتە سیاسیانەی کەتائەوکاتە لەسێ ویلایەتەکەی دۆڵی رافیدەین سەرکوت کرابوون رای خۆیان بەئاشکرا دەربڕن هەروەها زۆر

بوونی یانەو گروپ و کۆمەڵەکان دوای سالی ١٩٠٨ سەرە رای دەرکەوتنێکی چری رۆژنامەکان (نزیکەی ٦٠ناونیشان کەلەکاتی جیا جیادا لەهەر سێ ویلایەتەکە دوای ئەو سالانەی بەدوای شۆرشی ١٩٠٨ )دا هاتن گەواهیدانە لەسەر تێکەڵ بوونی ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە موسڵ وبەغداو بەسرە لەکاری سیاسی .

خودی سوڵتان بە هۆی سەرنەکەوتنی دژە شۆرش لەساڵی ١٩٠٩دوورە پەرێز مابۆوە بەلأم ئەستەمبوڵ وەکو تەوەری سەرەکی سەڵتەنەت مابۆوە هەروەکو چۆن لە رابردودا وابوو،بەلأم گەمەی سیاسەتە هەرێمایەتیەکان لە پێشان ئالۆزتر ببوو،هاوکات هەندێ لەگەنجانی ویلایەتەکانی وادی رافیدەین وەکو تۆفیق سویدی،ناجی شەوکەت،حەمدی پاچەچی وحکمەت سلێمان بەشداریان لەو چەندو چونە دەکرد کەلە ئەستەمبوڵ لەبارەی دەستوری لیبرالیەت ولامەرکەزی وعەلمانیەت بەرێوە دەچوو.

لەهەمان کاتدا نموونەی شۆرشگێری وڵاتی فارس حەماسی لەلای شیعەی مەزارگەکاندا دروست دەکردو چەندو چون لەبارەی دەستورلێرەش گەرم بوو بەلأم لە چوارچێوەکی دیکەی جودا لە چوار چێوەی چینی فەرمانبەرە عوسمانیەکان و رۆڵی پیاوانی ئاینیی لە نەجەف و کەربەلا و ناوچەکانی تر لە شۆرشی دەستوری لە ساڵی ١٩٠٦ دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو . سەرەرای مەحکومکردنی هەندێك لە زانا ئاینیە موحافزکارەکان لە مەزارگەکاندا بەلأم ئەم هزرە نوێیانەو سەرکەوتنی دیاری بەشداریکردنی پیاوانی ئایینی لە پرۆسەی سیاسیدا لەلایەن زۆرانەوە پشتگیری لێکرا ئەمەش هانیدان بۆ بیرکردنەوە لە رەوشی ئێستایان و لەدەوڵەت کە باڵی بەسەر ژیانیاندا کێشابوو بێ ئەوەی رۆڵێکی کاریگەریان پێببەخشێ .

لەگـــەڵ ئـــەو بیرۆکانـــەی بڵاوبوونـــەوە لـــەبارەی سیاســـەتی بەشـــداریکردن ، هەستکردنێکی بەبەرەش هاتە ئاراوە بەوەی کە لەسایەی سستەمی سیاسی نوێدا هەندێك بۆیان دەلوێت لە خەڵکانی دیکە زیاتر توانـای بەشداری کردنیـان هـەبێت. لەسەرتادا ، چـەندو چونی بـەردەوام لـەبارەی سـودە رێژەییـەکانی لامەرکەزیـەت بەرامبـەر دەســەڵاتی ناوەنـد هانـدەر بـوو بـۆ ئـەو بیرکردنەوانـەو سـەرلەنوێ کارکردنـــەوەو بەدەســـتوورو هەڵبـــژاردنی پەرلـــەمانی تورکیـــا ســـاڵی ۱۹۰۸ پێشبینیەکانی زێدەترکرد لەبارەی پابەند بـوونی سسـتەمی نـوێ بـە نوێنەرایـەتی کردنـــی بەرژەوەندیـــەکانی ئیمپراتۆریـــەت لـــە ئاســـتێکی فراوانـــداو ئیمکانیـــەتی جێبـــەجێکردنی داواکاریـــە جیاجیاکـــانی ویلایەتـــەکان لـــە رێگـــەی جۆرێـــك لـــە لامەرکەزیەتەوە. بەڵام لەگەڵ پەیرەوکردنی ئەو سیاسەتە ناوەندیە توندانەی کـە حزبی ئیتحادو تەرەقی پەیرەوی کرد ئەم هیوایانە تێکشکان و هەرزوو کۆمەڵەی وا دامەزران کە داوای یەکسانیان لـە نێـوان سـەرجەم تورکـەکان و پێـدانی پێگەیـەك بەزمانی عەرەبی کە یەکسان بێت بەزمانی تورکی و بەخشینی دەسەڵاتی زیاتر بـە ویلایەتەکانیان دەکرد.

## (حزبی ئیتحاد وتەرەقی و بەرهەڵستکارانی)

لەگەڵ سووربوونی حکومەتەکانی ئیتیحاد و تـەرەقی ستەمکار لەسـەر سـەپاندنی خـۆی لەنەسـتەمبوڵ دەنگـە کـپ کراوەکـانی عـەرەب لـە ویلایەتـە عەرەبیـەکانی سـەڵتەنەت کـە داوای ئۆتۆنۆمیـان دەکـرد لـە ویلایەتـەکان هـانی هەسـتی تـازە گەشەسەندووی نەتەوەی عەرەبیان دەدا لە ویلایەتـەکانی وادی رافیـدەینیش ئـەو دەنگانە لە بەسرە بەرزتر بوو لە شوێنەکانی دیکە ئەوەش دەگەڕێتەوە بـۆ نزیکـی ویلایەتەکـە لـە دەسـەڵاتدارانی نیمچـە سـەربەخۆی کەنـداوی عـەرەبی و دورگـەی

عەرەب. وەكو شێخ موبارەك ئەلسەباح لە كوێت و شێخ خەزعەل لە موحەمەرە و هەژموونی گەشەسەندووی عەبدولعەزیز كوری سعود لە نەجد، هەروەها هەمەرەنگی كۆمەڵگای بەسرە پەیوەندیان بە میسرەوە هەبوو كە زۆربەی رەخنەگرەكانی عەرەب لەدەوڵەتی عوسمانی لەوێ جێگیر بوون كە رۆژنامەوانی تا رادەیەك چالاك و ئازاد بوارێكی بۆ رەخساندبوون بۆ دەربرینی بۆچوونی نوێ دەربارەی چاكسازی لە سەڵتەنە و پرسیار كردن لە بارەی ناسنامەی نیشتیمانی ، ئەم دیاردەیە بەشێكی زۆری هێز و وزەی بۆ سەید تالیب ئەلنەقیب دەگەرێتەوە كە هەوڵی دەدا لە بەسرە بنكەیەكی پتەو بۆخۆی دروست بكات. سەید تالیب ئەلنەقیب كە لە سەرەتادا پشتگیری سولتان عەبدولحەمیدی هەبوو، و لەسالی ١٩٠٨ بە ئەندام لە پەرلەمانی توركیا هەڵبژێردرا دژایەتی حزبی ئیتحادو تەرەقی دەسەلاتداری دەكرد و لەسالی ١٩١٣ هەڵسا بەدامەزراندنی كۆمەڵەی چاكسازی بەسرە و داوای ئۆتۆنۆمیەكی راستەقینەی كرد بۆ ویلایەتەكە. ئەوەش دوای كۆبوونەوەیەك هات كە خۆی سەركردایەتی كرد و شێخەكانی موحەمەرەو كوێت ئامادەی بوون وەك دەگێردرێتەوە رێككەوتن لەسەر بریارێك كە داوای ئۆتۆنۆمی بەڵكو سەربەخۆیی بۆ عێراق بكات (كەهەردوو ویلایەتی بەسرە و بەغدای مەبەست بوو).

كاتێكیش سەید تالیب دەستی بە هێرش كردنی ئاشكرا كرد بۆ سەر سیاسەتی (بە تورك كردن) كە حكومەتی عوسمانی پەیرەوی دەكرد و داوای لەسەربازە عەرەبەكانی سوپای عوسمانی كرد دەست بەهەڵگەرانەوە بكەن، حزبی ئیتحاد و تەرەقی هەوڵی كوشتنی دا بەلام پاش سەرنەگرتنی هەوڵەكەی سەید تالیب و حكومەتی حزبی ئیتحاد و تەرەقی داوای پیكهاتنێكی كاتیان كرد،لەبەرامبەردا حكومەتی ئیتحادی تەرەقی داوای لە سەید تالیب كرد هەولبدات بن سعود بەدانان بە سەروەری عوسمانی رازیبكات لەبەرامبەردا ناوبراو داوای

جێبەجێکردنی ژمارەیەك لە داواکارییەکانی کۆمەڵەی چاکسازی لە حکومەتی ئیتحادی تەرەقی کرد وئەوەی مایەی سەر سورمانیشە حکومەت بەو داواکاریانە رازیبوو .

وەك پاداشت کردنێکی سەید تالیب لەبەرامبەر ئەو خزمەتەیدا پلانێك هەبوو بۆکردنی بەوالی بەسرە بەڵام دواتر حکومەت وازی لەو پلانەی هێناو لەگۆڕانێکی سەیردا لەسیاسەتەکەی لە تشرینی یەکەمی ١٩٠٤دا فەرمانی بەوالی بەغدادا کەسەید تالیب دەستگیر بکات ، ئەم ڕووداوە هاوکات بوو لەگەڵ دابەزینی بەریتانیەکان لەنزیك بەسرە دوای ڕوودانی شەر سەید تالیب پەیوەندی بە بەریتانیەکانەوە کرد و داوای لێکردن بیکەنە والی یاخود میر بەسەر بەسرەدا ولەژێر پاراستنی ئەوان بەڵام بەریتانیەکان شارەزای مێژووی ناوبراو بوون بۆیە وایان بە باش زانی دووری بخەنەوە بۆ هندستان کە تاسالی ١٩٢٠ لەوێ مایەوە .

بەڵام لە بەغدا سیاسەت لە شارەکەو لە ویلایەتەکەدا ملکەچی دەسەڵاتی کەسایەتیەکی سیاسی دیاریکراو نەبوو هەروەك لە بەسرە وابوو بەڵکو رای زۆرو کەسایەتی و خانەوادەی گرنگ هەبوون و وتووێژو دیالۆگ تێیدا لەبارەی مەسەلەکانی چاکسازی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەخولانەوە هەروەکو ناوچەکانی دیکەی سەڵتەنەت یان لەبارەی هەندێك مەسەلەی تایبەت بەدانیشتوانی ویلایەتەکەوە بوو.

ناکۆکیەکان لەو دوو ناوچایەدا بووە هۆی لەدایك بوونی چالاکیەکی ڕۆژنامەوانی کاریگەرو جۆراوجۆر لە بەغداو دوو ویلایەتەکەی دیکە. وە هەندێك جار رکابەری سیاسی دەبووە هۆی دروست بوونی لقی دیکە بۆ حزبە سیاسیە رکابەرەکان، وەك حزبی یەکگرتوی لیبراڵی کە سەرو چاوەیەکی شارستانیشی هەبوو و ئەو

حزبە کەسانێکی خاوەن باگراوندێکی کۆمەڵایەتی و خاوەن کارو پتر پارێزگارو پەیوەست بە ئایین لە خۆ گرتبوو.

بەڵام ئەم بارودۆخە بەردەوام نەبوو، بەتایبەتیش دوای ئەو کودەتایەی کە حزبی ئیتحادو تەرەقی ساڵی ١٩١٣ کردی، لە ویلایەتی بەغدا هەروەك لە بەسرە لاوە تورکەکانی بە رەگەزو کەلتور عەرەب هەستیان بە تورەیی دەکرد، بەرامبەر بەو ستەمەی کە حزبی ئیتحاد و تەرەقی پەیرەوی دەکرد ئەو حزبە نەك هەر گوێی بە کاروبارو داواکارییەکانی ویلایەتەکان نەدەدا بەڵکو هەندێك وایان دەدیت کە رێکە بە هەوڵە ئاشکراکانی بە تورك کردنی سەڵتەنەت دەدات بەڵکو دەستیشی تێدا هەیە.هەندێکی دیکەش لەو مەرکەزییەتە نارازیبوون کە هاوشانی ئەو سیاسەتە بوون.

ئۆپۆزسیۆن وایلێهات بە ئاشکرا رای خۆی دەردەبری لە رێگای ئەو رێکخراو بڵاوکراوانەی کە جەختیان دەکردەوە سەر گرنگی ناسنامەو کەلتوری عەرەبی،لەدیارترین ئەو رێکخراوانەش کەلەو قۆناغەدا لە خودی بەغدا دامەزرا (یانەی زانستی نیشتمانی )ولقی (ئەلعەهد)لە بەغدا،موزاحیم پاچەچی سەرۆکایەتی یانەزانستی نیشتمانی کەلەساڵی ١٩١٢ دامەزرا دەکردو لەلایەن خانەوادەی ناوداری سوەیدی بەغدای وسەید تالیب لەبەسرە پشتیوانی لێدەکرا وهەولی بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و ئەدەبی عەرەبی دەداو رۆشنبیرانی شیعەو سونەی لە خۆ دەگرت،بەڵام لە کۆتایی ساڵی ١٩١٣رۆژنامەی یانەکە داخراو موزاحیم پاچەچی وخەلکانی دیکەش بەرەو بەسرە رایانکردو لەگەڵ سەید تالیب کۆبوونەوە ئەوانەی مابوونەوەش لەلایەن دەسەڵاتدارێتی عوسمانیەوە دەستگیرکران .

گەشەسەندنی بەرهەڵستکاریی ئاشکرا هاریکار بوو لە دروست بوونی کۆمەلەی نهێنی کە دیارترینیان لە هەرسێ ویلایەتەکەی وادی رافیدەین (کۆمەلەی

ئەلعەهد)بوو کەلـە ئەسـتەمبوڵ لەسـەر دەسـتی هەنـدێك لـە ئەفسـەرانی عـەرەب لەویلایەتـە جیاجیاکـانی سـەڵتەنەت دروسـت ببـوو ،هـەر زووش تـەها هـاشمیش دوولقی ئەو کۆمەڵـەی لـە موسڵ وبەغدا دروسـتکرد هـاشمی لەبنەچـەدا خـەڵکی بەغدا بوو یاسین هاشمی براشی سەرکردایەتی لقـی کۆمەڵـەی نـاوبراوی لـە موسـڵ دەکرد کە ژمارەیەك لە ئەفسەرانی سوپای لە خۆ دەگـرت کـەوەکو خـۆی ڕۆڵێکـی دیاریان دەبێت لە دوارۆژی دەوڵەتی عێراقدا وەکو مەولود موخلیس،عەلی جەودەت ئەیوبی وجـەمیل مەدفـەعی .لەبەغـداش حەمـدی پاچەچـی (یـەك لـە خزمـەکانی موزاحیم پاچەچی) بووە سەرکردەی لقی کۆمەلەی ناوبراو ونوری سـەعیدوجەعفەر عەسکەری هاتنە ریزی کۆمەلەکە.

ئەندامانی عەهدزۆر بـیرو بۆچـونی هاوبەشـیان لـەبارەی چاکسـازی و ئاراسـتەکەی لەگەل حزبی ئیتحادی تـەرەقی دەسـەلأتدار هـەبوو بـەلأم زۆر بـە تونـدی لـەبارەی مەسەلەی لامەرکەزیەت وناسنامەی دەوڵەتەوە ناکۆك بوون.

دەسەلأتدارانی عوسمانی هەستیان بەبوونی عەهد کردبوو ولەسالّی ١٩١٤دەستیان بە جووڵە کرد لەدژی وهەندێك لەئەندامانی بەرەو میسرو نیمچە دوورگەی عـەرەبی رایانکرد لەوقۆناغەدا هەندێ ڕووداو لە شوێنی دیکەدا ڕوویاندا کە دواتر کاریگـەری درێژخایەنیان بۆسەر هەرسێ ویلایەتەکە دەبێت و ڕێگە خۆشکەر دەبێت بۆ هاتنـە ریـزی هەرسـێ ویلایەتەکـە بـۆ دەوڵـەتی عێراقـی نـوێ، هاوپـەیمانیی حکومـەتی ئیتحاد و تەرەقی لەگەڵ ئەڵمانیا و ناکۆکی لەگەڵ روسـیا لەسـالأنی بـەر لـە ١٩١٤ وایکرد مانەوەی دەوڵەتی عوسمانی بە بـێ لایـەنی کـارێکی گـران بێـت کاتێك کـە جـەنگ لـەنێوان ئـەڵمانیا و روسـیا لـەهاوینی سـالّی ١٩١٤ راگەیـەنرا. لـە مـانگی تشرینی یەکەمی سالّی ١٩١٤ ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی خزیە ناو جـەنگ هاوشـانی دەوڵەتانی میحوەر ئەم هـەنگاوە کۆمـەلێك دەرەنجـامی بـەدوای خۆیـداهێنا کەبـە

لەناوچوونی سەڵتەنەیی کۆتایدێت.لەم پێودانگەدا نیشانەی یەکەمی دەرەنجامەکان کە لە داهاتوودا لە دۆڵی رافیدەین روودەدات لەگەڵ داگیرکردنی بەسرە لەلایەن بەریتانیەکانەوە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤دەرکەوت.

لە راستیدا زێدەرۆییە ئەگەر واباوەربکرێت کە ئەزموونە هاوبەشەکانی ئەو ویلایەتانە تێروانینێکی پێشوەختەی دەوڵەتی عێراقی ئایندەی لێکەوتۆتەوە لە ماوەی ئەو ساڵانەی پێش داگیرکردنی بەریتانیا بۆ دۆڵی رافیدەین . لە زۆر لایەندا ، پەیوەندی سیاسی ناوەندی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا زۆر لە پەیوەندی دەوڵەت بە ویلایەتە عەرەبیەکانی دیکە دەچوو ، کە تیایدا هێزەکانی چاکسازی عوسمانی و دەرەنجامە پێشبینی نەکراوەکانی کارلێکردنی ئەو هێزانە لەوەتای نیو سەدەوە چالاك بوو. لەدیدو بۆچوونی حکومەت لە ئەستەمبوڵ ، هەرسێ ویلایەتەکانی دۆڵی رافیدەین وەکو یەکەیەکی ئیداری مامەڵەی لەگەڵ نەدەکراو هەروەها هیچ شێوازێك لە شێوازەکانی نوێنەرایەتی بە کۆمەڵی نەدرابوو وەکو ناوچەکانی دیکەی ئیمپراتۆریەت . لەم کاتانەدا، ئەو کەسانەی کە دەستیان بەسەرلەنوێ بیرکردنەوە لە ناسنامەیان وەکو چالاکوانی سیاسی دەکرد بەلای بیرکردنەوە دەچوون لە چوارچێوەی چینی وا کە بەکەسانی دیکەی خاوەن عەقلیەتی هاوشێوە لە ویلایەتی دیکە بەسترا بوونەوە . لەهەندێك حاڵەتیشدا، هزریان لەگەڵ هزری هاوڵاتیانی دیکە لە رۆڵەکانی ولاتەکەیان یەکی دەگرتەوەکە لەناوچەکانی دیکەی دۆڵی رافیدەین دەژیان، بەلام ئەوانە پەیوەندی رێکخستن و وەهمیشیان بنیات نابوو کە زۆر زیاتر لەو سنورە هەرێمیەی تێپەراندبوو. هەتا سەید تالبیش کە لە زاهردا بە هیوای سەربەخۆیی زاتی قەوارەیەك بوو کە پێی دەوترێت(عێراق نەیتوانی بەئاسانی ئەوە لە هۆش خۆی دووربخاتەوە کە شانۆی زۆر بەرتەسکی بەسرا شوێنی تێروانینی کەسیی ئەو نەدەبۆوەو پێویستی بە دەستبەسەراگرتنی بەغداش هەبوو.

لەگەڵ ئەوەش ، كۆمەڵگەی سیاسی تازە پێگەیشتوو لە سێ ویلایەتەكە هاریكار بوو لە پەیدابوونی بنەما بۆ پەیوەندی سیاسی دیارو جیاوان، هەتا ئەگەر لەپێناو یەك ئامانج یان كاركردن بێت . بەغدا بەو پێیەی بارەگای دەسەلاتداری بالاو سەنتەری سەرەكی فرقەیەكی سوپای عوسمانی بوو ، ببووە مایەی جۆرێك لەسەرنج راكێشی بۆ دوو ویلایەتەكەی دیكە ، كەكاریگەری بەسەر بەسرە زیاتر بوو لە موسڵ، هەروەك چۆن هەندێك لە رێكخراوە سیاسیە گەشەسەندووەكان ئاماژرەیان پێدا پەیوەندی كەسایەتی دەستی بە دروستبوون كرد لە نێوان ئەندامانی ئەو گروپانە ـ ئەو پەیوەندیانەش بە زۆری پەیوەندیە خانەوادەییەكان لەرێگەی بازرگانی یان لەرێگەی ئەندامێتی لە ئیدارەی عوسمانی یان لە فەیلەقی ئەفسەران پتەوتری كردبوو . نهێنی ئەو رێكخراوانەی هاوشێوەی رێكخراوی عەهد رۆڵیان هەبوو لە هاندانی متمانەی كەسی و یەكتر ناسینی لە نزیكەوە . ئەمەش هاریكار بوو لە دروستبوونی پەیوەندی لە نێوان گەنجانی خاوەن رەوشی هاوشێوە لە هەرسێ ویلایەتەكە. بەمەش ، پەیوەندی نێو خۆی هەبوو لەنێوان هەندێك لە چینە كۆمەڵایەتیەكان لە هەرسێ ویلایەتەكە. هەرچەندە كە ئەو پەیوەندیانە لەسایەی دەوڵەتی عوسمانیدا بەس نەبوو بۆ هێنانە كایەی تەوژمێكی نێوخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێكی جودا بەڵام یەكسەر لەگەڵ لە دایك بوونی ئەو دەوڵەتە بەدەستێوەردانی بەریتانیا ، هەردەبوو كارلێككردنی ئەو گروپانەو ئەو ئەزموونە هاوشێوانەی كە دەیەكانی دوایی لە ژیانی دەوڵەتی عوسمانی بە خۆوەی دیبوو كارلە پێگەو هەڵوێستی ئەو كەسانە بكا كەدەبنە هاوولاتی لە دەوڵەتی عێراقی نوێدا.

# بەشی دووەم
# ئینتیدابی بەریتانی

داگیرکردنی هەر سێ ویلایەتی عوسمانی، بەسرە، بەغدا، موسڵ لە لایەن بەریتانیاوە و دواتر قایمکردنیان لە دەوڵەتی عێراقی نوێ لەژێر باڵی عوسبەی ئومەم کە بەریتانیای مەزن ئیدارەی دەکات کاریگەریەکی قوڵی هەبوو و رەوشی سیاسی دانیشتوانی سەر ئەو خاکەی تەواو گۆری.

لە راستیدا مێژووی عێراق لەوێوە دەست پێدەکات نەك وەك مێژووی دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەت بەڵکو وەك مێژووی هەموو ئەوانەی کە دیتیان رادەکێشرێنە ناو فەلەکی سستەمی دەسەلاتی نوێ و کارەکە پێویستی بەشێوەی نوێ هەبوو بۆ ناسنامە وە بۆ ستراژییەتەکی نوێ بۆ قۆزتنەوەی ئەو هەلانەی کە رەخسابوو لەو کات. ئەو چیرۆکە راستەقینانەی ژیانی ئەو خەڵکانەی لەیەك چوارچێوەدا کۆببوونەوە بەلام رەوشی جیاجیای بەسەر داهات دوای ئەوەی کە دەوڵەتی تازە لەدایك بوو بووە ئەداتێك بۆ بڵاوکردنەوەی هزرو شێوەی سستەمێکی جودا کە پێشتر دەوڵەتی عوسمانی روخاو بەخەیاڵی داهاتبوو بەلام هەرچەندە لەو هزر و شێوە سستەمەکەی ئەم دواییە نەچێت ، دەوڵەتی عێراقی بووە سەنتەرێکی نوێی راکێشان کە دەبێتە دروستکردنی یان چەسپاندنی ئەو پێکهاتانەی کە کاردەکەنە سەر سیاسەتی عێراق وئەو پێکهاتانە دروست دەکات یاخود جێگیر دەکات کە کار لەسیاسەتەکانی عێراق دەکات بە شێوازێکی دیار .

لەو روانگەیەدا بۆ چوونەکانی سەرکردایەتی دەسەلاتی بەریتانی یەك لاکەرەوەو ئاشکرابوو بەلام هەمەرەنگ بوو لەبەر ئەوەی مایەی . ململانێی نێوان فەرمانبەرە بەریتانییەکان خۆیان و عێراقییەکان بوو، بەریتانییەکان پێویستیان بەچەند

بابەتێك بوو و دۆزیانەوەش بۆ دروستکردنی سیستەمێك کە بڕوایان وابوو کە گونجاو ترینە بۆ بیرۆکەی ئینتیداب و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا. وە هەندێك جاریش ئەو بابەتانەیان دروست دەکرد و هەندێك کەسایەتی و گروپی دیاریکراویان هاندەدا بۆ دەرکەوتن کە گوایە ئەوانە تەوەری سەرەکین بۆ دارشتنی چیرۆکی مێژووی سیاسی عێراق.

سەرەرای بوونی ناکۆکی لە نێوان فەرمانبەرە بەریتانییەکان دەربارەی باشترین رێگا چارە بۆ دابینکردنی ئەمە ئەوا ئەوەی زۆر سەرقاڵی بوون مسۆگەر کردنی دروستکردنی دەوڵەتێکی دان پیانراوبوو هەروەها پەرە پێدانی سستەمێکی کۆمەلایەتی گونجاو.

لەئەنجامی ئەوە، تێروانینی بەریتانیا بەشێوەکی تایبەت کەوتە سەر دوو کۆمەڵە بۆ جێبەجێکردنی تێروانینی سیاسی لەو دوو رێگایەوە، یەکەمیان پێکهاتبوو لە ئەشرافەکان و کۆمەڵێك لە فەرمانبەرەکانی ئیدارەی عوسمانی رابردوو کە دەوڵەتی عێراقی نوێ سەبارەت بەوان بەرجەستەی مسۆگەر کردنی هەژموون و پلەو پایەیان بوو، دووەمیان پیاو ماقوڵانی کۆمەلگایەك کەپایەیان بە گوێرەی قەبارەی موڵکەکانیان دیاریدەکرا و بەهایان پشتی بەو دەوڵەتە بەستبوو کە هۆکارە پێویستەکانی سستەمی کۆمەلایەتی مسۆگەرکرد بوو.

بەلام دەسەلاتداریتی بەریتانی و پاشکۆکانیان لە عێراقییەکان هیچ لێبوردەییان رەچاو نەکرد لەهەڵسووکەوتیان لەگەڵ بەرامبەرەکانیان وەکو موجتەهیدە شیعەکان یان هەتا ئەو ئاشوریانەی کە تازە هاتبوون و چاوەرێی شێوازێکی جوداو نوێ بوون لەسستەمەکە. هەروەکو شێوەی پەیرەوکردنی سیاسەت لەسەردەمی ئینتیدابدا دەریخست رێگای نەدا بەو دەنگە نارازییانە کە ئەو رێرەوەی بۆ دەوڵەت لەلایەن ئەوانەی لە دەسەلات بوون نەخشەی بۆ کێشرابوو بگۆرن و لەنێو ئەو سێ ملیۆن کەسەی کە دانیشتووی دەوڵەتی عێراق بوون لەسەرەتای ئینتیدابدا زیاتر لەنیوەی شیعە بوون و نزیکەی ٢٠٪ی کوردبوون وە ٨٪ی لە کەمینەی جوولەکە ،

مەسیحی، ئێزیدی، سابیئە، تورکمان پێکهاتبوو. لەگەڵ ئەوەش وەزیرەکانی حکومەت و، خاوەن پلەو پایە بەرزەکانی دەوڵەت و ئەفسەرانی هێزە چەکدارەکان بەشێوەکی تایبەتی لە عەرەبە سوننەکان هەڵدەبژێردران ، ئەوانەی کەمتر لە ٢٠٪ی دانیشتوانیان پێکدەهێنا.وە لەبەر ئەوەی کە کەمینە بوون بەمانای ئابووری و مەزهەبی و بەهۆی ئارەزووە سەرکوت کارانەکەیان ئەوە نەبووە بناغەیەکی باش بۆ دوارۆژ بۆ ئەو یەکێتیە نەتەوەیەیی کە پێویست بوو هاوشانی دروستکردنی دەوڵەتی نویێ بێ.

## داگیرکردنی بەریتانیا و رەنگدانەوەکانی

پاش ماوەیەکی کورت لە هەڵگیرسانی جەنگ لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ لەنێوان سەڵتەنەی عوسمانی و بەریتانیای مەزن، بەریتانییەکان دەستیان بە هێرشێکی سەربازیی کرد لە دۆڵی رافیدەین لە کەنداوی عەرەبی لەتەنیشت بەسرەو. لەکۆتایی مانگی تشرینی دووەم شارەکە کەوتە دەست بەریتانییەکان. حکومەتی بەریتانیا لەهیندستان پێش وەختە پلانی دانابوو بۆ ئەو هێرشە کە هەنگاوێکی پێشوەختە بوو بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لەکەنداوی عەرەبی بەڵام دەست بەسەر داگرتنی بەسرە سەرەتایەك بوو بۆ پرۆسەی کۆتایی هێنان بە داگیرکردنی سێ ویلایەتەك45ە، بەسرە، بەغدا، موسڵ لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨. ئەو کارانە بوونە بناغەی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق و ئەو کاتە دەبێتە سەرەتای دەست پێکردنی مێژووی دەوڵەت و لەسەر دانیشتوانی ئەو ویلایاتانە بوو کە رووبەرووی ئەو راستیە بن کە دەوڵەتەکەیان لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیایە و بەرەنگاری پلانەکانی بەریتانیا ببنەوە کە بۆ داهاتوویانی نەخشە کێشابوو، لەساڵی ١٩١٤ بیرۆکەیەکی دیاریکراو نەلە لەندەن و نەلە هیندستان بۆ داهاتووی سیاسی وڵاتی دۆڵی رافیدەین نەبوو چونکە هێرشە سەربازیەکەی بەریتانیا ئامانجی سەربازیی دیاریکراوی هەبوو. بەڵام دەستکەوتە هەرێمایەتییەکان

دەستیانکرد بەوەی بەهایەکی سیاسی گرنگ وەربگرن و ئەو کۆمەلە هاندەرانە بووە هۆی داگیرکردنی ویلایەتی بەسرە بەگشتی پاش راکردنی هێزەکانی عوسمانی لە شوعێبە لە نیسانی ١٩١٥ و بووە هاندەرێك بۆ پێشەوە چونێکی خێرا بۆ هێزە بەریتانییەکان کە بەهاتنی مانگی تشرینی دووەم گەیشتنە دووری ٥٠ میل لە بەغدا. بەلأم هێرشێکی عوسمانی دژ بەو هێزانە بووە هۆی شکاندنی هێزە بەریتانییەکان و پاشەکشەیان بۆ کوت و مانەوەیان بە گەمارۆدراوی بۆ ماوەی چوار مانگ، هەتا خۆ بەدەست دانیان لەنیسانی ١٩١٦. وە ئەو پاشە کشێیە بووە هۆی دانانی پلانێکی هۆشیارانە ترو تا ئاداری سالّی ١٩١٧ بەغدا نەکەوتە ژێر دەستی هێزە بەریتانییەکان، وە لە کۆتایی هاوینی سالّی ١٩١٨ ئەو هێزانە توانیان شاری کەرکووك داگیر بکەن و سوپای شەشەمی عوسمانی بەتەواوی تێك بشکێنن. وە ئەو ماندووبوون و شەکەتییەی دەولّەتانی میحوەر کە هاوکات بوو لەگەلّ شکستە یەك لەدوای یەکەکانیان لەرۆژ هەلأتی ناوەراستدا وای لە حکومەتی عوسمانی کرد کە هەولّی ئاشتی بدات، کە رێگا خۆشکەربوو لەبەردەم ئاگربەستی مۆدروس لە تشرینی یەکەمی سالّی ١٩١٨، بەپێی برگەکانی ئەو ئاگربەستە دەبوایە سەرجەم سوپای عوسمانی لەدۆلّی رافیدەین خۆیان بدەن بەدەست بەریتانییەکان. فەرماندە بەریتانیەکە روویکردە موسلّ و داوای خۆ بەدەستەوەدانیکرد وفەرمانی دەرچوونی هەموو هێزە عوسمانییەکانی لەو ویلایەتە کرد. بەلأم والی عوسمانی لەو فەرمانە نارازیبوو بەبیانوی ئەوەی کە موسلّ بەشێك نییە لە دۆلّی رافیدەین، بەلأم ناچار کرا ملکەچی فەرمانەکانی بەریتانیا بێ بەمجۆرە لەتشرینی دووەمی سالّی ١٩١٨ هێزەکانی عوسمانی پاشکشەیان کرد و هێلّی ئاگربەست لەسەرسنووری باکووری موسلّ دیاریکرا .

خەلّکی سێ ویلایەتەکە بەشێوازی جۆراوجۆر لەگەلّ ئەو رووداوە تازانەی کەلەولأتەکەیان بەرپابوو مامەلەیانکرد. لەبەسرە زووبەزوو کەسایەتییە فەرماندەییەکانی ئەو شارە خۆیان راهێنا لەگەلّ دەسەلأتداری بەریتانی، کە لەدێر زەمانەوە پەیوەندیان هەبوو لەگەلّیان، وەکو بازرگان لەکەنداوی عەرەبی.

چونکە ماوەی نزیکەی پەنجا ساڵی رابردوو هێزە دەریاییەکانی بەریتانیا و هێزە بازرگانییەکان بەسەر ناوچەکەدا زاڵ بوون و زۆربەی بازرگانە سەرەکییەکان لەبەسرە هاتنە ژێر باڵی ئەمری واقیع و پەیوەندیان کرد بەدامەزراوە بازرگانییەکانی بەریتانیا نەك هەوڵدان بۆ بەربەرەکانیان ، وە ئەوەش بووە پتەو کردنی بەرژەوەندییە بازرگانییەکانی بەریتانیا لەولاتی دۆڵی رافیدەین تا ئاستێك کە پێش جەنگی جیهانی یەکەم ئەو بەرژەوەندیانە نزیکەی دوو لەسەر سێ ی قەبارەی بازرگانی و نیوەی داهاتەکانی کەبە بەسرەدا تێدەپەری بەدەستەوە بوو.

بانگەوازەکەی عوسمانیەکان بۆ جیهاد کردن دژی بەریتانیە کافرەکان کاردانەوەیەکی تێکەڵوپێکەڵی لە نێو شیعەکانی ناوەراست و باشوری فورات لەشارەکان و دێهاتەکان هەبوو، هەندێ لە موجتەهیدینی شیعە پشتگیری بانگەوازەکەیان کرد بەلام ئەوانەی لەوان بە تەمەنتر بوون، وەکو ئایەتو للا کازم یەزدی بانگەوازەکەی رەتکردەوە. بەمجۆرە ژمارەیەکی زۆرلە رۆڵەی هۆزەکان هاتنە ریزەی هێزە عوسمانیەکان بەلام پاش شکست هێنانی عوسمانییەکان لە شوعەیبە زۆربەیان رایانکرد ، لە مانگەکانی دوای شەری شوعەیبە چەندین شۆرش دژی دەسەلاتی عوسمانییەکان روویاندا. کە لە زۆربەی کات دەرەنجامی ناڕەزاییە ناوخۆییەکان بوو بەلام لایەنگری هەوڵە جەنگیەکانی بەریتانیاش نەبوو، لەجیاتی ئەوەیاخیبووەکان دەستیان بەسەر خاڵە لاوازەکانی دەوڵەتی عوسمانی داگرت بۆ فشارکردنە سەر دەسەلات بۆ بەخشینی ئاستێکی زیاتری سەر بەخۆیی ئیداری هەردوو شار.

لەبەغدا و لەگەڵ نزیك بوونەوەی سوپای بەریتانیا لەشارەکە لە ساڵی ١٩١٥ پیاو ماقوڵانی شارەکە و ئەندامانی (ئەلعەهد) بیریان لە شۆرش کردن لە دژی عوسمانیەکان کردەوە بەلام سەرانی خانەوادە ناودارەکان گومانیان لە دەرەنجامەکانی ئەو شۆرشە هەبوو بەتایبەتیش کە هێزە عوسمانیەکان هێشتا بە هێز بوون و لە شارەکە وئەو توانایەیان نەبوو تەحەدای بکەن لەلایەکی دیکەو

هاوکات لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵەی ئەلعەهدی عەرەبی نەتەوەیی نهێنی ئەو هەڵەیان قۆستەوە بۆ راکردن هەندێکی دیکە لەوانەی بەدیل کەوتنە دەست بەریتانیەکان ئارەزووی خۆیان دەربری بۆ پاڵپشتیکردن لە(پرسی عەرەبی ـ القضية العربية)بەڵام ئەم راگەیاندنە تا هەڵگیرساندنی شۆڕشی عەرەبی لە حیجاز بەسەرکردایەتی شەریف حوسێن ئەلهاشمی، شەریفی مەککە و کورەکانی لەناوەڕاستی ساڵی ١٩١٦بەتەواوی دیارنەبوو .

دوای ئەوە ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرە عوسمانیەکان کەبەرەچەڵەك خەڵکی وڵاتی دۆڵی رافیدەین بوون چوونە ریزی سوپاکەی شەریف و بەوە گەورەترین گردبوونەوەی یەکگرتویان لە فەیلەقی ئەفسەرەکان پێك هێنا و زۆربەی پۆستەکانی باڵای سەرکردایەتیان کەوتە دەست ، ئەمەش ئەو قۆناغە بوو کە ئەمیر فەیسەڵ هاشمی (کوری شەریف حوسێن وپاشای دادێ ی عێراق) چووە دیمەشق لەساڵی ١٩١٨وەك بەشێك لە هێزەکانی هاوپەیمانان سەرکردایەتی سوپایەکی دەکرد کەزۆربەی ئەفسەرانی سەر بەو ویلایەتانە بوون کە دەوڵەتی داهاتووی عێراقی لێپێکدێ.

و زۆربەی زۆری دانیشتوانی دۆڵی رافیدەین لە دڵە راوکێدا بوون لەبارەی چۆنییەتی دەربازبونیان لەو جەنگەی لەنێوان بەریتانییەکان و هێزەکانی عوسمانی بەرپابوو. لەکاتێکدا کە زۆربەیان بەنەمانی دەسەڵاتی عوسمانی خۆشحاڵ بوون، بەڵام باوەڕیشیان بە داگیرکردنی بەریتانیەکان نەبوو، لە هەندێ لە ناوچەکاندا هەر زوو بەرهەڵستکاری سەری هەڵدا.بەمشێوەیە لەسەرەتای ساڵی ١٩١٨و پاش چەند مانگێك لەوەی بەریتانییەکان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر نەجەف و کەربەلا سەپاند، کۆمەڵەی رابوونی ئیسلامی لەنەجەف کە پیاو ماقولان و پیاونی ئایینی و سەرۆك هۆزەکانی لەخۆ گرتبوو دامەزرا ،هەرچەندە لە رواڵەتدا ئامانجی بەرگری کردن بوو لەئیسلام دژی بەریتانیەکان بەڵام لەدژی کۆنترۆلی ئیداری بەریتانیاش کاریان دەکرد کە بەرەبەرە بەسەر شارەکە توند دەبوو، ئەم کارانەش بەکوشتنی بەرپرسێکی بەریتانی گەیشتە لوتکە کەلەبەرامبەرداو

لەتۆڵـەی ئـەوە بەریتانیـەکان گـەمارۆی نەجەفیانـداو کـۆنترۆڵی خۆیـان بەسـەر شارەکە توندتر کرد.

لەناوچە کوردیەکان لەسەرەتادا هێزە بەریتانییەکان پێشوازیان لێکرا کاتێك کـە بۆ ماوەیەکی کورت دەستیان بەسـەر شـاری کـەرکووك لـە ئایـاری سـاڵی ١٩١٨ دا گرت و هەر لەو مانگەدا لە کۆبوونەوەیەکی سەرۆك هـۆزە کوردەکـان لـە سـلێمانی دەسـەڵاتی وڵاتەکـەیان دایـە دەسـت بـەریتانیای مـەزن. پێشـتریش بەریتانیـەکان لەگەل یەکێك لەوان پەیوەندیان بەستبوو ئەویش شێخ مەحمود بـەرزنجی بـوو کـە لەو بڕوایەدا بوون دەسەڵاتی لەناوچـەکەدا هەیـە و لەسـاڵی ١٩١٨کردیانـە حـاکمی باشـووری کوردسـتان وەك بەشـێك لـە پلانێـك کـەدایاننابوو بـۆ حـوکم کردنـی ناراستەوخۆ، بەڵام هەرزوو شێخ مەحمود لەگەڵ هەندێ لـە سـەرکردە کوردەکـانی دیکە بەشەر هات چونکە بۆ بەرژەوەنـدی تایبـەتی خـۆی و شـەریکە نزیکـەکانی و خزم وکەسوکارەکانی لە هۆزەکەی خۆی کاری دەکرد هەروەها روون و ئاشکرا بوو کە هیـوای گـەورە تـری هەیـە بەشـێوەیەکی گشـتی بـۆ کـورد لەناوچـەکەدا زیـاتر لەوەی کە بەریتانیەکان پێ ی رازیبوون بۆ یە بەریتانیەکان کە لەو کاتەدا شۆرشـە پچـر پچـرەکانی ناوچـەکانی دیکـەی کوردسـتان شـەکەتی کردبـوون و هاوکـات لەناوخۆشیاندا لەبارەی تیـۆری حـوکمی ناراسـتەوخۆ نـاکۆك بـوون بـۆ دەسـگیر کردنـی شـێخ مـەحمود بەرێکـەوتن بـەڵام رووبـەرووی بەرهەلسـتی و راگەیانـدنی بەجەرگانەی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ لە ئایاری سـاڵی ١٩١٩ لەلایـەن شـێخ مەحمودەوە بوونەوە. بۆیە هێرشـێکی سـەربازیان رێکخسـت و شـێخ مـەحمودیان دەستگیر کردوو ئیدارەی بەریتانیان گێڕایەوە سلێمانی بـەلام ئـەوە نـەبووە هـۆی خامۆشکردنەوەی شۆرش و یاخیبوون بەرووی بەریتانیەکان لە کوردستان.

هەندێ لە کوردەکان ئەو پەرەسەندنانەیان کردە بیانوویەك لە بەرژەوەنـدی مـافی بڕیـاردان لـە چارەنووسـی کـورد، بەپشـت بەسـتن بـە نەتەوەیـەکی زمانـەوانی کوردی.بەپێی فرەیی شێوازەکانی زمانی کوردی و دابەش بوونە کۆمەڵایەتیـەکانی دیکـە لـە چـوار چـێوەی خـاکی کوردانـدا ئـەو بیرۆکەیـە بەشـێوەیەکی دروسـت

تێنەدەگەیشترا هەتا سەبارەت بەو کوردانەی کە هەست کردنیان بە ناسنامە لە پابەند بوونی عەشایەری و ئایینیان بەرجەستە بوو ئەو لێکهەڵوەشانەوەیەی کە دووچاری ناوەندەکانی پێشووی هێز ببووەوە هاتنە ناوەوەی بەریتانیا وەکو هێزێکی کۆنترۆڵ بەدەست وایلێکردن کە حیساباتەکانیان لەبارەی باشترین رێگە چارە بۆ مسۆگەر کردنی پێگەکانیان بگۆڕن ئەمەش بووە هۆی یاخیبوون لە هەندێ کاتدا بەڵام بووە هۆی خۆ گونجاندنێکی براگماتیش کە سەرکردە کوردەکان تێیدا هەوڵی بەکارهێنانی هێزی بەریتانیای مەزنیان دەدا بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان .

لەبەغداو ناوچەکانی ناوەڕاستی سێ ویلایەتەکە، بەهوشیاری تەماشا کردن لە داگیرکردنی سەربازیی بەریتانیا باڵی کێشابوو. وەرێککەوتنامەکەی سایکس بیکۆ لەگەڵ ئەو پلانانەی بەریتانیاو فەرەنسا بۆ دابەشکردنی ویلایەتەکانی پێشووی عوسمانی لەخۆی گرتبوو ، خەریك بوو بۆ خەڵك دەردەکەوت و مەترسی نایەوە تائەو کاتەی کەبەریتانیاو فەرەنسا لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ راگەینراوێکیان راگەیاندو وا پێدەچوو کە ئۆتۆنۆمی دەداتە ویلایەتەکان، ئەم ئۆتۆنۆمیە ئامانجی ئەو ئەفسەرانە بوو کە چوو بوونە ریزی ئەلعەهد ولەریزی سوپای میر فەیسەڵدا کاریان دەکرد، گرنگیدانیان بە ویلایەتەکانیان وایکرد ئەلعەهدی عێراقی لەساڵی ١٩١٨ دابمەزرێنن سەبارەت بەو ئەفسەرانەش ئامانجیان سەربەخۆیی عێراق بوو کە بەشێوەیەکی گشتی هەرسێ ویلایەتی عوسمانی بەسرە وبەغدا وموسڵی لە خۆ دەگرت لە چوار چێوەی یەکێتی عەرەبیدا کە دەسەڵاتدارێتی شەریف حوسێن خۆی سەرپەرشتی دەکرد .

زۆربەی ئەندامانی عەهدی عێراقی وایان دەزانی کە بەریتانییەکان هاوکاریان دەکەن بۆ دابینکردنی ئامانجەکانیان کە بووە هاندانێك بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی توند لەگەڵ بەریتانیای مەزن لە مەشدا لەگەل هاوەڵەکانیان لە عێراقدا جیاواز بوون چونکە لێرەدا ئەزموونی دەسەڵاتی بەریتانی هاندەر نەبوو، ئەفسەرەکان و فەرمانبەرەکانی دەسەڵاتی رابردوو خۆیان لەدەرەوەی کار یاخود

پەراوێز خراو دۆزییەوە. هەر زوو بەزوو ئەو ناكۆییە لە بیرورا رەنگی دایەوە سەر عەهدی عێراقی ودرزێكی تێدا دروستكرد. یاسین ئەلهاشمی سەرەكردەی كاریگەر بۆ عەهد لە دڵە راوكێ دابوو دەربارەی نیازەكانی بەریتانییەكان بەرامبەر بە عێراق، هەرچەندە كە سەرۆك ئەركانی میرفەیسەڵ بوو بەڵام زۆر هاوسۆز نەبوو لەگەڵی. بەڵام لایەنی دووەم كە نووری سەعید و جەعفەر ئەلعەسكەری سەركردایەتیان دەكرد زیاتر پەیوەست بوو بە بیرۆكەی دەسالاّتدارێتی هاشمی و دانی نا بە گرنگی بەریتانیای مەزن لەدەستنیشانكردنی ئایندەی عێراق.

لە راستیدا بەریتانییەكان خۆیان دوو دڵ بوون دەربارەی ئایندەی عێراق، هەروەكو كە دواتر عێراقییەكان بۆیان دەركەوت و بووە مایەی سەرسوڕمانیان، لەكاتی جەنگدا ئیدارەی مەدەنی بەریتانی پێشكەوت و رەنگدانەوەی ئەو ئارەزووە بوو بۆ سەپاندنی سستەم و یاسا كە تارادەیەكی زۆر كاریگەری ئەزموونی ئیدارەی بەریتانیای لە هیندستان بەسەرەوە دیار بوو ئەمەش خۆی لە حكومكردنی راستەوخۆی بەریتانیا دەدیتەوە لە رێگای توێژێكی كارمەندە بەریتانیەكان كە خەریك بوو بە (قوتابخانەی ئیمپریالیەت)دەناسرا و ئەفسەرە سیاسیەكانی بەریتانیا لەسەر جەم ناوچە كانی ویلایەتەكاندا جێگیر ببوون و چەندین فەرمانگەی پێكهاتوو لەكارمەندانی بەریتانی لە بەغدا پشتگیریان لێدەكردن و مامەڵەیان لەگەڵ هەرسێ ویلایەتدا وەكو یەك یەكەی ئیداری دەكرد و نێردراوی مەدەنی (سێر بێرسی كۆكس Percy cox سەركردایەتی ئیدارە ناوەندییەكەی دەكرد هەتا ئایاری ساڵی ١٩١٨ لە دوای ئەو (سێر ئارنۆلد ویلسۆن Arnold Wilson) هات بۆ جێگرتنەوەی بە وەكالەت كە تەنیا بەناوسەر بەدەسەلاّتی فەرماندەی بالاّی سەربازیی بەریتانیا بوو.

وە لە هەنگاوێكدا كە بواری دەسەلاّتی راستەوخۆی فراوانتر كرد بەریتانییەكان هەڵسان بە هەڵوەشانەوەی هەندێك لە دامەزراوەكان وەك ئەنجومەنەكانی شارەوانی كە عوسمانییەكان هەڵیانبژاردبوو و لەبری پشتیان بە ئەفسەرە سیاسییەكان بەست كە ئەوانەش لەرێگەی پیاو ماقوڵە نێو خۆییەكان بۆ پاراستنی

یاسا کاریان دەکرد . ئەم سیاسەتەش لە ناوچەیەکی فراوانی لادێکاندا جۆرێك لە حوکمی ناراستەوخۆی دروست کردبوو، هاوکات سستەمێکی هۆزگەری بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیە مەدەنی و جینائیەکان لەلایەن بەریتانیەکانەوە دامەزرا( کە پشتی بە یاسای حکومەتی هندستان بەستبوو کە هەمان ئەو ناوەی هەبوو و دواتر لەسالی ١٩٢٤خرایە نێو یاسای عێراقی)و ئەمەش وایکرد ئەو سەرۆك هۆزانەی لەلایەن بەریتانیەکانەوە دادەمەزران توانای چارەسەرکردنی سەرجەم کێشەو ناکۆکیەکانیان لە نێوان رۆڵەکانی هۆزەکانیان و خۆیان وئەوانیشدا هەبێت.هەروەها باجیشیان بۆ حکومەت کۆ دەکردەوە بەمەش بۆ زۆر لە خەڵکان روون بۆوە کەبەریتانیای مەزن رێگا لەبەردەم لەخۆگرتنی راستەو خۆی عێراق لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا خۆشدەکات .

ئەم بۆچوونەش لەو کاتەدا تەئکید بۆوە کاتێك کە ئارنۆلد ویلسۆن رووپێوێکی(بۆ چەواشەکردن ناوی راپرسی گشتی لێنا)لەسالی ١٩١٩ رێکخست لەبارەی رای پیاو ماقولانی هەرسێ ویلایەتەکە کاتێك کە لەبارەی شێوەی داهاتوی دەوڵەت و پێکهاتەکەی پرسیاری لێکردن ، وەلامی جۆراو جۆریان دایەوە، کە واپێدەچوو جۆرە رێککەوتنێك هەبێت جگە لە ناوچە کوردیەکان کە پێویستە دەوڵەت هەر سێ ویلایەتە عوسمانیەکان لە خۆ بگرێت لەسایەی حکومەتێکی عەرەبیدا بەلام ناکۆك بوون لەسەر شێوەی ئەو حکومەتە یان ناسنامەی دەسەلاتداری داهاتوو.

ئەوپەرە سەندنە رووبەرووی گومانێکی زۆربۆوە لە لایەن دەسەلاتدارانی سەربازیی و لە لایەن جێرترۆد بێل (Gertrude bell) کە ئەمینداری باوەرپێکراوی ویلسۆن بوو لە رۆژهەلات ولەسەرەتادا. بڕوای بە باشیەکانی حوکمی راستەوخۆ هەبوو وبووە یەك لەوانەی زۆر بەتووندی پشتگیری لە دەسەلاتی خۆ بەرێوبردنی عێراقیەکان دەکرد لەژێر چاودێری (ویسایە)ی بەریتانیا ئەم بۆچوونەشی لە هەلوێستی فەرمانبەرانی بەریتانی لە لەندەن و شوێنەکانی دیکە نزیکی کردەوە کە پشتگیریان لە حوکمی ئەوانەی سەر بە شەریف حوسێن بوون لە عێراق دەکرد، هەرچەندە هۆیەکانی بێل جودا بوو لەوانەی لەندەن کە

خەمی گەورەیان ئەوە بوو دەسەڵاتی راستەوخۆ تا چەند کاریگەر دەبێ بەسەر خەزێنەی بەریتانیا، بێل بڕوای وابوو کە نەتەوایەتی عەرەبی بە شێوەیەك پەرەدەسێنێ کە ناتواندرێ روو بە رووی بەستریٚ و سەبارەت بەویش ئەوە ئامازەیەك بوو بۆ ئەوەی کە پێویستە لەسەر بەریتانیەکان کە لەگەڵ نەتەوەپەرستەکان کار بکەن ئەوانەی زۆربەیان شارنشین و سوننە بوون بۆ نوێکردنەوەی وڵات و کۆتاییهێنان بەوەی کەبێل بە کاریگەری کۆنەپەرستی و نەفامی پیاوانی ئایینی شیعەو پاشکۆکانیان لە هۆزەکانی دەناسی، ئەو گۆرانکاریە لە هەڵوێستی بێل دا بووە هۆی دروست بوونی بۆشاییەکی گەورە لەنێوان ئەو و ئارنۆلدویلسۆن دا وهاوکات بووە هۆی بەرزبونەوەی ورەی ئەفسەرانی سەر بە شەریف حوسێن ئەوانەی کەئاگایان لەو ناکۆکیە بوو کە لە ریزەکانی بەریتانییەکاندا هەبوو. بەڵام عێراقیەکان نەیاندەزانی چۆن ئەو دووبەرەکییە بقۆزنەوە.

## شۆڕشی عێراق لەساڵی ۱۹۲۰

هەر دەبوایە بەرهەڵستکاری بەرامبەر بە دەسەڵاتی بەریتانی راستەوخۆ دەستپێبکات. کۆمەڵەی عەهدی عێراقی لە ئاداری ساڵی ۱۹۲۰لە دیمەشق کۆنگرەیەکی بەست و بڕیاری سەربەخۆیی عێراقی لەژێر حوکمی پاشایەتی میر عەبدوڵلای برای میر فەیسەڵ و یەك لە کورەکانی شەریف حوسێن دا.لەراستیدا کەم بوون ئەوانەی دانیان بە دەسەڵاتی ئەو کۆنگرەیە دانا،خودی میر عەبدوڵلاش کەمێك ساردبوو بەرامبەر ئەو بڕیارە. لەگەڵ ئەوەش کۆبوونەوەکە ئامازەی بەو گۆرانکاریانە کرد لە چالاکیەکانی عەهد بەرامبەر عێراق، ژمارەیەك لە ئەفسەرەکان چوونە دێر ئەلزۆر لە رۆژهەلاتی سوریا، بەنیازی ئەوەی ئەوێ بکەنە بنکەیەکی کارەکانیان. لە ئاداری ساڵی ۱۹۲۰ جەمیل مەدفەعی سەرکردایەتی هێزێکی تێکەڵاوی کرد کە پێکهاتبوو لەسەربازە نیزامیەکان وهەندێك لە هۆزە

هاوپەیمانەکانی و شارۆچکەی تەلەعفەری داگیرکرد پاشان رووی کردە موسڵ. بەو نیازەی لەکاتی گەیشتنی ئەو شۆڕشەی نەخشەی بۆ کێشرابوو لەناو شاریشدا دەست پێ بکا. بەڵام بەریتانییەکان ئەو هێزە یان بڵاوە پێکرد پێش ئەوەی بگاتە موسڵ و دواتر ئەو شۆڕشە رووی نەدا. پاش ئەوە ئەندامەکانی عەهد تاك تاك بەردەوام بوون لەچالاکی و لە سوریا وە دزەیان دەکردە ناو عێراق، بەڵام چالاکییەکانی رێکخستنەکانی عەهد بەشێوەیەکی رێکخراوەیی کۆتایی پێهات لە عێراق، لەماوەی چەند هەفتەیەکیشدا فەرەنسییەکان کە کۆمەڵەی نەتەوەکان ماف ئینتدابی پێدابوون هەموو خاکی سوریایان داگیر کرد و سەنتەری رووداوەکان هاتەوە عێراق خۆی.

لە عێراقیش نارەزایی بەرامبەر داگیرکاری سەربازیی بەریتانی گەیشتبووە لوتکە ، دەسەڵاتدارێتی بەریتانی رێگەی بە شاندێك نەدا کە بەنیاز بوو بچێتە کۆنگرەی ئاشتی لە ڤێرسای ساڵی ١٩١٩. وەکو کاردانەوەیەکیش لەبەرامبەر ئەوەدا کۆمەڵەیەکی نهێنی دروستبووکە ناوی لەخۆ نابوو پاسەوانی سەربەخۆیی هەر وەك عەهدی عێراقی، ئەو کۆمەڵە داوای سەربەخۆیی عێراقی دەکرد (کەبریتی بوو لە سێ ویلایەتە عوسمانییەکە) لەژێر دەسەڵاتی یەك لە کورەکانی شەریف حوسێندا. بەڵام جیاواز بوو لە عەهد لەوەی کە هەندێ خەڵکی مەدەنی لەخۆگرتبوو کەژمارەیان لە ئەفسەرە سەربازییەکان زیاتر بوو و پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی زیاتر هەمەرەنگی لەخۆگرتبوو.نزیکەی زۆرینەی ئەندامەکانی عەهد لە ئەفسەرە عەرەبە سوننەکان و ئەو فەرمانبەرانەی کە کۆڵەگەی دەوڵەتی عوسمانیان پێکدەهێنا بوون، لەکاتێکدا زۆربەی ئەندامانی پاسەوانی سەربەخۆیی شیعە بوون و محەمەد سەدری یەك لە کورەکانی موجتەهیدی شیعە ئایەتوڵلاحوسێن سەدر لەکازمیە سەرکردایەتی دەکردن ، هەروەها کۆمەڵە کە پەیوەندییەکی توندی هەبوو لەگەڵ موجتەهیدێکی تری ناسراو ئەویش ئایەتو ڵلا تەقی شیرازی بوو لە رێگای میرزا محەمەد رەزای کورەکەیەوە.

پاسەوانی سەربەخۆیی بوونە بازنەیەکی پەیوەندی نێوان گروپەکانی کۆمەڵە سوننیەکان و عەرەبە شیعەکان کە لەگەڵ بەردەوام بوونی دەسەلاتدارێتی بەریتانی بەجێبەجێکردنی پلانەکانیان سەبارەت بە عێراق دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لە ئایندەی سێ ویلایەتەکە،بەتایبەتیش دوای کۆنگرەی ساڵی ١٩١٩ی ڤێرسای .

سەبارەت بە ناوەندە رۆشەنبیر و فەرمییەکان لە ویلایەتە عوسمانیەکاندا بیرۆکەی ئینتیداب خراپەی لێچاوەروان دەکرا و لە هەمان کاتیشدا وەك بێزێیەك بوو و وادەرکەوت پێشنیاری دەسەلاتێکی کۆلۆنیالیستی ئەوروپی دەکات بەلام لەژێر ناوێکی دیکەدا و سەبارەت بە زۆر لە فەرمانبەرانی پێشووی سەڵتەنەتی عوسمانی جگە لە ژمارەیەکی زۆری خانەوادە ناودارەکان بیرۆکەی ئینتیداب واتەماشا دەکرا کە سوکایەتی کردنە بە ئەزمونی ئیداری و سیاسیان و کەمکردنەوەی رۆڵیانە وەکو سەرکردە لە کۆمەڵگەکانیاندا. ئەو مەترسیەش کاتێك زیاتربوو کە ئینتیدابی عێراق لە کۆنگرەی سان ریمۆ لەنیسانی ساڵی ١٩٢٠درا بە بەریتانیای مەزن کە رێگا خۆشکەر بوو بۆ بەریتانییەکان بۆ دروستکردنی ئەنجوومەنی دەسەلاتداری دەوڵەت کە زۆربەیان لە فەرمانبەرە بەریتانییەکان پێکهاتبوو، لەگەڵ هەندێك لەو عێراقیانەی کە لە شوێنی لاوەکیدا دانرابوون.

لەو قۆناغەدا ئیئتلافێك لەنێوان ئەو کەسانەدا دروست بوو کە ئەوەی زیاتر لێی دەترسان ، تێکهەڵکێشانی وڵات بوو لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا. لەشاری کەربەلا ئایەتو لَلاَ شیرازی فەتوای تەحریم کردنی کار کردنی لەگەڵ ئیدارەی بەریتانیاداو دوابەدوای ئەوە کۆبوونەوەکان دەستی پێکرد لەنێوان زانایانی ئایینی شیعە و سەرۆك هۆزەکان لە ناوەراستی فورات ولەنێوان ئەندامانی کۆمەڵەی پاسەوانی سەربەخۆیی کە چەند لقێکی لەژمارەیەك لەشارەکان دروستکرد. ئەو چاوپێکەوتنانە دانانی ستراتیژیەتێکی کاری رێکخراوەیی لێکەوتەوە کە لە سەرەتادا پشتگیری لەخۆ نیشاندانی ئاشتیانەی نارەزایی دەربرین کرد،کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە بەغدا کە بارەگای دەسەلاتی بەریتانی بوو. هاوکات

بواریشی بەکراوەیی جێهێشت لەبەردەم شێوازی دیکەی توونڈو تیژتر ئەگەر هاتوو ئەو خۆ نیشاندانانە دەرەنجامیان نەبوو.

بەپێی ئەوە و لەسەرەتای ئایاری ١٩٢٠ ژمارەیەك دیداری بەکۆمەڵ بۆ مەحکوم کردنی ئینتیداب لە بەغدا بەسترا و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بەغدا لەمزگەوتەکانی سوننە و شیعە هەرجارەی لەیەکێکیان کۆدەبوونەوە هەروەها ژمارەیەکی زۆری خەڵك دەهاتن بۆ گوێ گرتن لە وتارەکان و سروودە نەتەوەییەکان ئەمەش لەدایکبوونی شێوازێکی دیکەی نوێ بوو لە سیاسەتدا لە پایتەختی داهاتووی دەوڵەتی نوێدا، لە هەنگاوێکی دیکەی دیارترولەپێناو قۆزتنەوەی هەلّی یەك ئامانجی ئەگەر بەشێوەیەکی رووکەشانەش بێت یەك لە گەورەترین کۆبوونەوەکان لە مانگی ئایاردا بەسترا کەتیایدا پانزە نوێنەر دەستنیشانکران بۆ خستنەرووی پرسی سەربەخۆیی عێراق لەبەردەم دەسەڵاتی بەریتانیدا،و لەمانگی حوزەیراندا ئارنۆلد ویلسۆن بەچاو پێکەوتنیان رازی بوو بەمەرجێك بیست و یەك کەس لە پیاو ماقولانی بەغدایان لەگەڵ بێ کە بەخۆی دەستنیشانی کردبوون.

لە راستیدا ویلسۆن دەیزانی کە ئەو شێوازە سیاسیە نوێیە دەبێتە هۆی نانەوەی ئاڵۆزییەکی قوول بۆ زۆربەی پیاو ماقولانی سوننە لەولاتدا و رێککەوتنی رووکشانەی نێوان شیعە وسوننە هەرەشەی پتەو بوونی قەڵەمرەوی موجتهیدە شیعەکانی دەکرد کە بگاتە هەندێك ناوچە کە بۆچەندین سەدە لێی دوور خرابۆوە ،سەرباری ئەوەش زۆربوونی ژمارەکان وکاریگەرییان بەسەر سیاسەتدا هەروەها ئامادەکردنی کۆمەڵێکی زۆری خەڵك لەمزگەوتەکان و شەقامەکاندا بۆ زۆر لە زانایانی ئایینی سوننەو خانەوادەی پیاو ماقولان شتێکی خراپ و مەترسیدار بوو

دوای کۆبوونەوەیەکی بێ دەرەنجامی نێوان ویلسۆن و مەندوبەکان بەریتانیەکان بەردەوام بوون لەسەر سیاسەتەکەی خۆیان کەلەسەر بنەمای رێگرتن لە فراوانبوونی بواری حوکمی خۆ بەرێوەبردن لە عێراق دامەزرابوو لەلەندەنیش پشتیوانی لەو سیاسەتەیان دەکرا – بەهاندانی گیرترۆد بێل – لە حوزەیرانی

ساڵی ١٩٢٠ ئەوە راگەیەنرا کە نیاز وایە بۆ هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنێکی دامەزرانـدن هەڵبـژاردن بکرێـت و بـۆ رێکخسـتنی میکـانزمی ئـەو هەڵبژاردنـە دەسـتەیەك لـە پەرلەمانتارانی پێشووی عوسمانی بەسەرۆکایەتی تاڵب نەقیب دامەزرا ، ناوبراو کە پێشتر دوور خرابۆوە و تازە گەرابۆوە ئارەزووی وابوو سوود لەو هەلانە وەربگرێت کەرەنگە لەمیانەی پێکهاتنی دەوڵەتی نوێدا برەخسێن ، لـەم هەوڵەشـدا هـەر ئـەو بەتەنها نەبوو بگرە زۆربەی ئەفسەرەکانی شریف بڕوایان وابـوو کـە ململانـی دژی دەسەڵاتدارێتی داگیرکەری بەریتانیا بێ سوودە ولەبری ئەوە هـەوڵیان دابچـنە نـاو پێکهاتە نوێیەکانی ئـەو دەوڵەتـە دروسـتکراوە بـۆ مسـۆگەر کردنـی خزمـەتکردنی ئامانجەکانیان. واپێدەچێت هەمان هۆکاری هاوشێوەش لە لای ژمارەیەك لـە پیـاو ماقوڵانی سێ ویلایەتەکە هەبوو کە پەنایان بـردە لای بەریتانیـەکان بـۆ پاراسـتنی شوێن وپێگەیان و ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیـەی کـە پاڵپشـتیان دەکـات. ئـەوەش هەموو پیـاو ماقوڵـە عەرەبـە سوننەکان و ژمارەیـەك لـە شیعەکانیشـی گرتـەوە ، سەبارەت بە هەڵوێستی سەرۆك هۆزەکانیش لە دەسـەڵاتی بـەریتانی هەڵوێسـتیان پشتی بە چەند هۆکارێکی جۆراو جۆر بەسـتبوو کـە لـە پەیوەندیـەکانیان لەگـەڵ رۆڵەکانی هۆزەکانیان، بە تایبەت دەربـارەی مەسـەلەکانی خـاوەن داریـەتی زەوی دەستی پێدەکرد و هەروەها پرسەکانی باج و مافی ئاو تا دەگاتە سروشتی روو بە روو بونەوەیان لەگەڵ نوێنەرانی دەسەڵاتدارێتی نوێی بەریتانی دەگرتەوە.

بـەم شـێوەیە بیرۆکـەی تـازە سـەرهەڵداوی بـەریتانیا لـەبارەی دەوڵـەت وجێبـەجێکردنی بەرەبـەری ئـەو بیرۆکەیـە کاردانـەوەی جـۆراو جـۆری لای چـین وتوێژەکانی خـەڵك دروسـتکرد ، لەگـەل ئـەوەش و لەهـەموو حالەتێکدا دەوڵـەتی تازەلەدایك بووی عێراق هەرچەندە ناروون و هەمەرەنگ بێت دەبێتە تەوەری کاری بنـەرەتی و سـەنتەری سەرنجراکێشـان کـە هێزێکـی نـوێ وجـودا بـەکار دەهێنێـت بەسەر ئەو فرە کۆمەڵگەو گروپانەی کەلەسەرخاکی ئەو دەوڵەتەدان .

دەسـەڵاتی بـەریتانی بـە توونـدی بەرپەرچـی ئەوخۆنیشـاندانانەی دایـەوە کـە لـە شەقامەکانی بەغدا روویانـدا ، بـەهاتنی مـانگی ئـابی سـاڵی ١٩٢٠، وای لێهـات کـە

نارەزایی جەماوەریی رێکخراو لە شاردا کارێکی ئەستەم بێت، بەهۆی گەورەیی قەبارەی هێزەکانی ئاسایشی بەریتانیا و چالاکیەکانی هەوالگریی ، بەلام بەرهەلستکاریی لە دەرەوەی بەغدا زیاتر ببوو و لە مانگی ئایاری سالی ۱۹۲۰ سەرۆك هۆزە گەورەکانی ناوەراستی فورات دەستیان کرد بە گفتوگۆکردن لەبارەی کارکردن لەدژی هێزی داگیرکەری بەریتانی و هۆکاریشیان لەم کارەدا هەمەرەنگ بوو، هەندێکیان پەیوەنیان هەبوو لەگەل ناوەندەکانی ئۆپۆزسیۆن لە نەجەف و کەربەلا ، هەندێك جاریش هۆکاری زۆر ناوەخۆییان هەبوو بۆ ئەم کارە ، لەهەمان کاتدا بەئاشکرا دەرکەوت کەهێزەکانی بەریتانیا بەشێوەیەکی چرو پر بلاونەکرابوونەوە لەگەل گەیشتنی ئەو هەوالانەی کەباسیان لە ناکۆکیەکان دەکرد لە لەندەن بەبەغدا سەبارەت بە سوودەکانی داگیرکردنی بەریتانیا بۆ عێراق ، ئەمەش وایکرد عێرقیەکان بگەنەئەو بروایەی کەشۆرشی چەکداری نەك هەریەریتانیەکان لە عێراق دەکاتە دەرەوە بەلکو رەنگە هاریکار بێت بەلایەنی کەم لەپەلە کردن رۆیشتنیان.

لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی سالی ۱۹۲۰لەدەرەنجامی زنجیرە رووداوێك شۆرشی چەکداری سەری هەلدا. لە پاش دەستگیرکردنی کوری ئایەتوللا شیرازی (کەبووە گەورەترین موجتەهیدی شیعە دوای مردنی ئایەت وللا یەزدی لە سالی ۱۹۱۹) کە فتوایەکی دا پەنا ببەنە بەر شۆرشی چەکداریی. وە بۆ کپ کردنەوەی بەر هەلستکاری ، دەسەلاتدارانی بەریتانی دەستیان کرد بە دەست گیرکردنی ژمارەیەك لە سەرۆك هۆزەکان لە ناوچەی ناوەراستی فورات، بەلام ئەو پەلامارە کاریگەرێکی پێچەوانەی تەواوی هەبوو و شۆرشەکە زیاتر بە هێزتر بوو و بەهێزیەکەشی دەگەرایەوە بۆ لاوازی سەربازگە بەریتانیەکان لە ناوچەکە و ئەو پەیوەندیە بەتینەی کە لە نێوان سەنتەرە روحیەکانی شیعە لە نەجەف و کەربەلا و لەنێوان ئەو هۆزە چەکدارە بەهێزانەی کە بەرامبەر بەریتانیەکان وەستابوون. لە کۆتایی مانگی تەممووزدا بەشێکی زۆری ناوچەی فورات ناوەراست کەوتە ژێر دەستی بەرهەلستکاران. ئەو پاشەکشێیەی بەریتانیەکان بووە هاندەرێك بۆ

پەرەسەندنی شۆڕش و درێژبوونەوەی بۆ هۆزەکانی باشوری فورات. بگرە هەتا ناوچەکانی باکوورو رۆژهەلات و رۆژئاوای بەغداش. سەرکردەکانی کورد لە باشووری کوردستان ئەو هەلەیان قۆستەوە و دەستیان بە شۆڕش کرد بۆ کۆنترۆلّ کردنی ژمارەیەك لە شارەکانی دراوسێی سنووری ئێران، بەلام ئەو کارە تارادەیەکی زۆر هەلّپەرستی بوو و هیچ هاریکاریەك لەنێوان هۆزە عەرەبەکان نەبوو ، هەتا لە ناوچە کوردیەکانیش کە هەرچەند بەرهەلّستکاران لە ناوچەکانیان دوور کەوتبانەوە پالّپشتیان کەمتر دەبوو.

لەگەلّ ئەوەش بەشێوەیەکی گشتی لە ماوەی مانگێکدا شۆڕش دامرکاییەوە کە بووە مایەی دلّخۆشی دەسەلاتدارانی بەریتانیاو و زۆربەی پیاو ماقولانی سوننەی بەغدا وەکو یەك. کە لەوبلاوبوونەوەییەی قەلّەمرەوی شیعەکان و هۆزەکان نیگەران بوون . لە راستیدا تێروانینی سەرکردە ناوخۆییەکان بۆ چۆنیەتی کاریگەری بەریتانیەکان بەسەر رەوشەکەیان کاریگەری بەسەر بلاوبونەوەی شۆڕشدا هەبوو بۆیە سەرۆك هۆزەکانی هەردوو ناوچەی کوت وعیمارە نەك هەرنەهاتنە ریزی بەلّکو دژایەتیشیان دەکرد چونکە بەریتانیەکان هەندێك دەسکەوتیان بۆ دابین کردبوون ،سنووری جوگرافی شۆڕش وایکرد لەسالّی۱۹۲۰ بەریتانیەکان بتوانن سەرلەنوێ خۆیان رێکبخەنەوە وپەلامار بدەنەوەو ئەو شوێنانە بگرنەوە کەلەدەستیاندابوو و بەخۆبەدەستەوەدانی نەجەف وکەربەلا دوا پێگەکانی شۆڕش لەناوبردران .

شۆڕشی عێراق بووە هۆی کوژرانی ٦۰۰۰هەزار عێراقی و نزیکەی ٥۰۰ سەربازی بەریتانی و هیندی. بەلام ژمارەیەك دەرەنجامی سیاسی گرنگی هەبوو، سەبارەت بە عێراقیەکان شۆڕش بووە بەشێك لە ئەفسانەی دامەزراندنی نەتەوەی عێراقی، هەر چەندە ئەو کات ئەو بیرۆکەیەش دوور بوو لەهزری زۆربەی بەشداربووان لە شۆڕشدا.

شۆڕشی عێراق لە ساڵی ١٩٢٠ دەستی پێکرد وەك بەرهەڵستکارییێکی گشتی دژ بە دەسەڵاتی بەریتانی بەڵام لە ناوەراستی فورات بە شۆڕش کۆتایی هات ، بەو مانایە شۆڕشەکە دەرەنجامی بارو دۆخی تایبەت بوو لەو ناوچەیە ، کە جوودابوونەوەی ئاینی و نەبوونی سەقامگیری کۆمەڵایەتی و ئابووری و چەکداریی لە خۆ گرتبوو. داگیرکردنی بەریتانیاش هاوکار بوو لە بەیەك گەیشتنی ئەو هێزانە، سەبارەت بەشیعەکانیش کە قەڵەمرەوی خۆیان لەدەست نەدابوو سەرەرای ئەوەی لەلایەنی سەربازییەوە دۆرابوون بەچاوی خۆیان دیتیان کەچۆن خەڵکانێك سوود لەو هەلە سیاسیە وەردەگرن کەبەقوربانیەکانی ئەوان دروست بوون ئەمەش وایکرد جۆرێك لە رق لەلای ئەوان بەرامبەر بەدامەزراوەی سیاسی تازە دروست بوو لەبەغدا لەدایك بێت ، کەدەرەنجامی وای لێکەوتەوە کاریگەری بەسەر سیاسەتی تازەی دەوڵەت هەبێت لەدەیەکانی سەرەتای دروست بوونیدا.

## پێناسەی دامەزراوەیی دەوڵەت

لە لەندەن، شۆڕش و خەرجیەکانی سەرکوتکردنی هەوڵەکانی چرکردەوە بۆ دۆزینەوەی شێوازێکی گونجاوتر بۆ حوکم لە عێراق. واپێدەچوو پێداگیری لەسەر دەسەڵاتی راستەوخۆ هاریکار بوو لە پەرەپێدانی شۆڕش و وادیار بوو کە بەریتانیای مەزن تووشی نرخێکی زۆر گران دەکات هەربۆیە کاتێك کە بێرسی کۆکس گەیشتە بەغدا لەسەرەتای مانگی تشرینی یەکەم بۆ وەرگرتنی پۆستی یەکەم نێردراوی باڵا(مندوب سامی) لە ژێر سایەی ئینتیدابدا، بڕوای بە عەبدولرەحمان گەیلانی نەقیبی ئەشرافەکانی بەغدا هێنا کە پیاوێکی بەتەمەن بوو بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی کردنی ئەنجومەنێکی وەزیران کە لە ژێر چاودێری بەریتانیا کار بکات. لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٠ حکومەت بە سەرۆکایەتی نەقیب پێکهێنرا و بیست و یەك کەسی لە خۆ گرت لە کەسایەتیە عێراقیە ناودارەکان لەهەر سێ ویلایەتە عوسمانیە کۆنەکە. وە زۆربەی

ئەندامەکانی کە پۆستەگرنگەکانیان وەرگرت لە عەرەبی سووننە بوون ، هەروەها ئەنجومەن هەندێ لە شیعە و مەسیحیەکانی لە خۆ گرت جگە لە ژمارەیەکی گرنگی جولەکەکان. وە لە ماوەیەکی کەمدا یەکە ئیدارییە عوسمانیەکان و ، هەروەها ئەنجومەنەکانی شارەوانی گێردرانەوە. فەرمانبەرە عێراقیەکان دەستیانکرد بەگرتنەوەی شوێنی ئەفسەرە سیاسیە بەریتانیەکان لە ویلایەتەکاندا (جگە لە ناوچەی سلێمانی کوردنشین). لەگەڵ ئەوەش راوێژکارێکی بەریتانی هاوکاری دەکردن ، هەروەها چەند راوێژکارێکی بەریتانی رەوانەی وەزارەتە نوێیەکان کران.

لەخەسڵەتە نوێیەکانی دەوڵەت کە هەرزوو دەرکەوت نەبوونی فەرمانبەرانی شیعە بوو لە پۆستە ئیداریە باڵاکاندا تەنها لە مەزارەگەکاندا نەبێ. ئەو سستەمە کۆنەی کە لەسەردەمی عوسمانیدا باوبوو و سوننە زاڵ بوون بەسەریدا پێ دەچێ دووبارە زیندو بکرێتەوە. لە راستیدا ئەو بارو دۆخە دەبوایە هەروابێ، چونکە شیعەکان لە ئیدارەی عوسمانی دوورخرابوونەوە و زۆر کەمیان خاوەن شارەزایی ئیداری بوون.ئەمە سەرەرای هەڵوێستی نەقیب وئەوانی دیکە لەپیاوماقوڵ و کەساییەتیەکانی بەغدا بەرامبەر بە شیعەکان بەشێوەیەکی گشتی و ئەو نیگەرانیەی کەلەناوەندە بەریتانیەکاندا لەدوای شۆرشدا هەبوو بەرامبەریان کە بووە بنەما بۆ دەستنیشانکردنی فەرمانبەرانی دەوڵەتی نوێ ، زۆربەی ئەوانەی دەست نیشانیشکران لە فەرمانبەرانی پێشووی عوسمانی بوون و زۆربەیان عەرەبی سوننە بوون و ئەوانەی دوورخرابوونەوە هەتا ئێستا لە لایەن بەریتانیەکان و ئێستا چاویان بڕیبووە حکومەتی نوێ کە بیان گەڕێنێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە وایان دەزانی مافێکە لە مافە رەواکانیان، لە دامەزراندنی سوپای عێراقیشدا کە سەرەتای هەنگاوەکانی حکومەتی نوێ بوو لە ساڵی ١٩٢١ ئەم مەسەلەیە بەئاشکرا رەچاوکرا. جەعفەر عەسکەری کە ئەفسەرێکی عوسمانی کۆن بوو لە بەغدا و پێشتر لە ریزی هێزەکانی شەریف بوو لە مەککە لە کاتی شۆرشی عەرەبیدا پۆستی وەزیری بەرگری وەرگرت و نزیکەی ٦٠٠ ئەفسەری عوسمانی

کۆنی بە رەگەز عێراقی گەڕاندەوە ریزەکانی سوپا و سوپای عێراقی نوێی لێپێکهات ، کە لەو پیاوانە بوون لە خانەوادە عەرەبە سوننەکان لە سێ ویلایەتەکە، کە ناسراوترینیان نوری سەعیدی زاوای جەعفەر عەسکەری بوو کە دواتر لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٢١ بووە سوپاسالاری گشتی سوپای عێراق و بە شێوەیەك لە شێوەکان بووە سومبلێك بۆ ئەو توێژەی کۆمەڵگای عێراقی. ئەو پیاوانە هەموویان دەرەنجامی چاکسازی زانستی و ئیداری سەدەی نۆزدەهەمی عوسمانیەکان بوون، و زۆربەیان لە خێزانە مام ناوەندیەکان بوون لە عەرەبە سوننەکان و کوردەکان و تورکە بە عەرەبکراوەکانی بەستراو بە ئیدارەی عوسمانی بوون، دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی نوێ رێگای کردەوە بۆ دەسەڵات و هەژموون کە زۆربەیان هەوڵیاندا ئەو هەلە بقۆزنەوە بە نیازی بەدەستهێنانی سامان و ئەو پێگەوپایانەی کە لە سایەی ئەو سستەمەی چینایەتی کە لە کۆمەڵگای عەرەبی سوننەدا هەبوو نەیانبوو.

لەرووی ئیداریەوە دامەزراندنی دەوڵەت دەستی پێکرد، بەڵام لەبارەی مەسەلەی شێوە دەستورییە کۆتایەکەی هێشتا بە هەڵپەسێردراوی مایەوە ئەمەش لەبەر چەندین هۆکاری پەیوەست بە رەوشی عێراق سەرەرای هەندێك مەسەلەی دیکەی گرنگی پەیوەست بە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا،ئەمەش وایکرد کۆنگرەی قاهیرە لە ئاداری ١٩٢١ لەسەر دوای وینستۆن چەرچل (Winston Churchill)ببەسترێ کە تازە لەپۆستی وەزیری مۆنۆپۆڵەکان دامەزرابوو و کاروباری عێراقی پێ سپێردرابوو شاندێکی گەورەی عێراق ئامادەی کۆنگرەکە بوون کەزۆربەی فەرمانبەرە خاوەن پۆستە باڵاکان و ئەفسەرە بەریتانیەکانی لە خۆ دەگرت سەرباری دوو وەزیری عێراقی کە ئەوانیش جەعفەر عەسکەری و ساسۆن حەسقێل (Sasun Hasqail)بوون.

لە کۆنگرەی قاهیرەدا بریاردرا مەملەکەتی عێراق دابمەزرێ و تاجەکەشی بدرێتە میر فەیسەڵ هاشمی کە لە پاش داگیرکردنی سوریا لە لایەن فەرەنسیەکانەوە لە ساڵی ١٩٢٠ناچار کرابوو ئەو وڵاتە جێبێڵێ و پەنا بباتە بەر بەریتانیەکان کە

پەیوەندیەکی باشی لە گەڵیان هەبوو تا بیپارێزن، بەو پێیەی کە کەسایەتیەکی گشتیش بوو واتەماشادەکرا کەلە جیهانی عەرەبیدا خاوەن دەسەلاتێکی سروشتیە و لە هەمووش گرنگتر ئەوە بوو کە بەریتانیەکان بروایان وابوو گوێرایەڵی راوێژکاریەکانیان دەبێت و ئەو سنورانە باش دەزانێت کە قەڵەمرەوی بەریتانیا لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا بۆ خەونەکانی دایان دەنێت.

فەیسەڵ رازی بوو پاشایەتی عێراق بکات ، فەیسەڵ لە تەمەنی سی و شەش ساڵیدا شارەزای توانای ئیمپراتۆریەتە گەورەکان بوو لە دروستکردنی سەرکەوتن یان تێکشکاندنی .بەو پێیەی کە لە ئەستەمبوڵ گەورە ببوو شارەزاییەکی چاکی لە پیلانە سەرکەوتووەکانی باوکیدا هەبوو کە لەدەرەنجامدا کردیانە شەریفی مەککە هەروەها وەکو سەرکردەی شۆرشی عەرەبی لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا، هەروەها دەیزانی کە هاوکاری ماددی بەریتانیا لایەنێکی کاریگەری سەرکەوتنیەتی. ئەمەو دەرپەراندنی لە دیمەشق سەرەرای پاڵپشتی بەریتانیا بۆی ئەوەی بۆ دەرخست کە دۆستایەتی هیچ بەهایەکی نامێنێ کاتێك کە بەرژەوەندی ئیمپراتۆریەتە مەزنەکان بکەوێتە سەرسەنگی مەحەك. ئەو ئەزمونانە وای لێکرد ببێتە سیاسەتمەدارێکی لێهاتوو و واقیع بین، کە تواناو خاڵە لاوازەکانی پێگەی خۆی بناسێ و دەرك بەو تێکۆشانە بکات کە پێویستە بۆ ئەوەی بناغەی دەسەلاتەکەی دابنێ.

لە ساڵی ۱۹۲۱ فەیسەڵ چاك دەیزانی کە زۆربەی دانیشتوانی عیراق یان هەست بە بوونی ناکەن یان هۆی دانانی بە حاکم بەسەر دەوڵەتەکەیان نازانن. بەلام دەیزانی کە بنەمایەکی ناوخۆیی هەیە لەوانەی کە لە کاتی شۆرشی عەرەبی و کاتی ئیدارەی ماوەکەمی شەریف لە دیمەشقدا لە ژێر فەرمانی بوون.ئەمانە پۆستی جۆراوجۆریان لەدەوڵەتی عێراقدا وەرگرت و لەگەڵ دەسەلاتداریتی بەریتانیا وایانکرد پێشوازیەکی دۆستانە ئەگەر بەگووریش نەبێت لەکاتی هاتنی لەمانگی حوزەیراندا بۆ عێراق رێکبخەن و لەماوەی چەند هەفتەیەکیشدا ئەنجومەنی وەزیران بریارێکی دەرکردو تیایدا فەیسەڵی بەپاشای عێراق راگەیاند ،

راپرسیەکی ساختەش رێکخرا و ئیدیعای ئەوە کرا کە ٪٩٦ی گەلی عێراق بەپاشای نوێ رازین و ٢٣ی ئابی ١٩٢١ لە ئاهەنگێکی فەرمیدا تاجی لەسەر نرا.

لە راستیدا و سەرەرای کەمی جۆش و خرۆشی گەل بەرامبەر بە مەلیك فەیسەڵ بەڵام بەرهەڵستکاریی رێکخراو لاواز بوو ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی ئەلتەرناتیفێکی روون و ئاشکرا ، بەریتانیەکان بەردەوام بوون لە سەر دوورخستنەوەی سەید تالیبی نەقیب کە چاوی لە حوکمی عێراق بوو و بە پێچەوانەی سەید تالیب فەیسەڵ بەو پێیەی کە لە دەرەوەی وولاتەوە بوو ، سەربە هیچ حزب و ناوچەیەکی ولات نەبوو بەلام بە سیفەتی ئەوەی کە عەرەب بوو لەلایەن کوردەکانەوە پالپشتیەکی گەورەی لێنەکرا و ئینتیماشی بۆ مەزەبی سوننی وایکرد پالپشتیەکی فراوانی شیعەکانیش لەدەست بدات هەرچەندە کە هەندێکیان وەکو پیاوێکی رێزدار رێزیان لێدەگرت بەلام خانەوادە دەسەلاتدارە سوننەکانی عێراق لەلایەن خۆیانەوە وەکو کەسێکی خۆ تێ هەلقورتاو تەماشایان دەکرد سەرەرای ناسنامەی عەرەبی کە دلنیاکەرەوە بوو بۆیان سەبارەت بەوەی کە گۆرانکاری گەورە لە سستەمە کۆنەکەدا ئەنجام نادرێت .

لە راستیدا فەیسەڵ هەستی بە ناسەقامگیری پۆستەکەی و ئەو گیروگرفتانە دەکرد کە روو بەرووی دەبنەوە لە هەولەکانیدا بۆ وەدیهێنانی جۆرێك لە یەکگرتوویی لەو دەولەتەی کە ئێستا مەلیکیەتی. لەماوەی حوکمەکەیدا کە دوازدە سالی خایاند لەهەولی سەپاندنی دەسەلاتەکەی دابوو کە بەلاوازی ناسرابوو چونکە دەسەلاتداری ولاتێك بوو کە هەرلەبنەرەتدا سەروەری نەبوو، هاوکات زۆربەی چین و توێژەدەسەلاتدارەکانی کۆمەلگای عێراقی هەمەرەنگ بەگومانەوە تەماشایان دەکرد بەهۆی کەسایەتی و هاوکات هاوکاری کردنیشی لەگەڵ بەریتانیەکان هەروەها گرنگی دانی بەو بازنە بچوکەی کۆنە ئەفسەرەکانی پێشووی سەربە شەریف.

بیرۆکەی مەلیك فەیسەڵ لەدوو تەوەر دەخولایەوە وەدەست هێنانی پێبەپێی سەربەخۆیی لە کۆنترۆڵی بەریتانیا و تێکهەڵکێشانی کۆمەڵگاکانی نێو عێراق لەپێکهاتەیەکی یەکگرتوودا کەتیایدا هەست بەوە بکەن ناسنامەو بەرژەوەندیەکانیان دەستی لێنەدراوەو لەو بوارەشدا فەیسەڵ و حکومەتەکانی تارادەیەك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا .

لەراستیدا بوونی فەیسەڵ بە پادشا لە عێراق نەك هەر چوارچێوەیەکی گەورەتری بۆ دەوڵەت دیاری کرد بەڵکو خەسڵەتە دیارەکانی سیاسەتی دەوڵەتیش دەستیانکرد بەدەرکەوتن ، لەلایەکەوە بەغدا بوو بە تەوەرێك کە سەرجەم ئەوانەی چاویان لەدەسەلاَت بوو بۆ لای خۆی رادەکێشا ئەوانەش کە لەبەر هۆکاری پەیوەست بە پێگەی کۆمەڵیەتی و ئابووری وپێگەی هەرێمایەتی لەو جیهانە دوورخرابوونەوە ئەوا چارەنوسیان پەراوێز خستنی سیاسی بوو و ئەمەش رق وتوورەیی لای ئەوانە دروست دەکرد جاچ موجتەهیدە شیعەکان بووبن یان سەرۆك هۆزەکانی ناوەراست و باشووری فورات یان کوردەکانی باکوور ،

لەلایەکی تر ئەو دەوڵەتەی کە لە بەغدا جێگیربوو بەوە ناسرا کە توانایەکی دیاری هەیە بۆ راکێشان بۆیە دانیشتوانی لادێکان لەبەر هەژاری و بۆ دۆزینەوەی کار دەستیانکرد بە روو کردنە شار،لەبواری سیاسەتیشدا بەغدا بووە سەنتەری راکێشانی خاوەن پایە کۆمەلاَیەتیە بالآکان کە دەیانویست کۆتایی بەو پەراوێز خستنە بهێنن کەتێیکەوتبوون ،هەربۆیە سەرۆك هۆزەکان و سەرکردە کوردەکان و پیاو ماقووڵانی شارە گەورەکانی دیکەی عێراق لەبەغدا لەسەر گۆرە پانی رووداوەکان کۆبوونەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان لەو کاتەی کەبریارە گرنگەکان دەدرێت.

لەوچوار چێوەیەدا سستەمی مەحسوبیەت و مەنسوبیەت سەری هەڵداو زەوی دراوی سەرەکی ئەو سستەمە بوو و زەوی پاداشتێك بوو بۆ خاوەن هێزو دەسەلاَتەکان لەدەوڵەتی تازە دروستکراودا،ئەم کارە لەسەردەمی

عوسمانیەکانیشدا روون وئاشکرا بوو هاوکات یەك لەو خەسڵەتانەی پێکدەهێنا کە قۆناغی ئینتیدابی بەریتانی پێ جودا دەکرایەوە لەسەرەتاکانی دا کاتێك کە هێنری دۆبس (Henry Dobbs) کەمەندوبی داهات بوو لەکاتی داگیرکردنی سەربازیی و پاشان بووە مەندوبی سامیی لە سایەی ئینتیداب دا (١٩٢٣-١٩٢٩) تەئکیدی دەکردەوە سەر پێدانی موڵکیەتی زەوی و دابەشکردنی گرێبەستەکانی بەکرێدانی بەو پێیەی کە کاریگەرترین رێگە چارەیە بۆ مسۆگەر کردنی ملکەچی بۆ یاسا لە دێهاتەکاندا.

دۆبس زۆر بروای بە دەسەلاتی ( سروشتی ) سەرۆك هۆزەکان بوو بەسەر پیاوانی هۆزەکان . بۆیە زەوی بەکاردەهێنا بۆ پتەوکردنی ــ هەندێك جاریش بۆ هێنانە کایەی ــ هەژموونی سەرۆك هۆزەکان بەسەر رۆڵەی هۆزەکان کە ببوونە کرێگرتەش لەلایان. بەهۆی هەمەچەشنی بیروبۆچونەکانی مافەکانی پەیوەست بە زەوی لە ناوچە جودا جوداکاندا لە عێراق ، هەندێك جار ئەو سیاسەتە رەنگدانەوەی پێچەوانەی دەبوو، بووە هۆی روودانی مقاوەمەت و یاخیبوون لە نێوان ئەوانەی کە لە ناکاو خۆیان بێ موڵك و یاخود قەرزاری ئەو سەرۆك هۆزانە دیتەوە کە هەستیان بە وەلائێکی تایبەت نەدەکرد بۆیان . لەم حاڵەتانەشدا هەندێك جار پەنا دەبردرا بۆ هەندێك رێکخستنی نێو خۆیی گونجاوتر . بەلآم ئەمە لە کاریگەری هەندێك ئیعتیباراتی سیاسی دیاریکراو و زۆربەی جاریش یەکسەرە بەسەر نمونەکانی خاوەنداریەتی زەوی لە زۆریەی ناوچەکانی عێراقدا کەم نەکردەوە. لەگەڵ کاتیشدا پێکەوە گرێدانێکی نێوخۆیی لە نێوان سستەمی سیاسی و بەرژەوەندییە هەمەرەنگەکانی پەیوەست بە زەوی دروستکرد.

## ئینتیداب و رێککەوتننامە

لەو ماوەیەدا و لەگەڵ دەرکەوتنی پێناسەیەکی تایبەت بە دەوڵەتی نوێ ئەوعێراقیانەی کەلە دەسەلاتدابوون گیرۆدەی مەسەلەیەکی تایبەت بوون ئەویش

مەسەلەی پەیوەندی بوو لەگەڵ بەریتانیا چونکە بە هۆی دژایەتی کردنی بیرۆکەی ئینتیـــداب بەگشـــتی لەلایـــەن عێراقەیکانـــەوە بەریتانیـــەکان بڕیاریانـــدا پەیوەندییـەکانیان لەگـەڵ عێـراق لـە ڕێگـای ڕێککەوتننامەیەکدا ڕێکبخـەن کـە وا دەربخات پەیوەندیەکی سروشتی لەنێوان دوو وڵاتی خاوەن سەروەریدا هەیە بەڵام لەراستیدا بەریتانیا نەیدەتوانی ئەو واقیعە بشـارێتەوە کەلایـەنێکی ڕێکەوتنامەکـە زۆر بە هێزترە لەلایەنەکەی دیکەو بەشێوەی سەربازیی داگیری کـردووەو لەلایـەن کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە ڕێگەی پێدراوە لەڕێکـەی ئینتیدابـەوە کاروبارەکـانی ئـەو دەوڵەتە بەڕێوەببات بۆیە کاتێك کـە ئەنجومـەنی وەزیـران لـە مـانگی حـوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢ ڕەزامەندی لەسەر ڕێکەوتنامەکە دەربری سوور بوو لەسەر ئـەوەی کـە ئەنجومـەنی دامەزرانـدن دوای دروسـت بـوونی ڕەزامەنـدی لەسـەر ڕێکەوتنامەکـە دەریبڕێت ئەم بڕیارەش وایکرد ڕێکەوتنامەکە بەمەسەلەیەکی دیکە ببەسـترێتەوە کە چەندو چونی لەسەر بوو ئەویش پەیوەست بـوو بـە چـوار چێوەی دەسـتووریی دەوڵەتی نوێ ،ئەمەش وایکرد لە شارە شیعە نشینەکانی باشـووردا گردبوونـەوەی نـارەزایی دەربـڕین ڕووبـدات پشـێوی لـە ناوچـەی فـوراتی ناوەراسـت ڕووبـدات و شیعەکان هەستیان بەوە کرد کە ڕێکەوتنامەکە و شێوازی دەستووریی پێویست بۆ ڕەزامەندی دەربڕین لەسـەری دەوڵـەتێك بـە هێـز دەکـات کـە هـیچ کۆنترۆڵێکیـان بەسەریدا نیە بەڵکو ڕەنگە هەر بەرژەوەندییـەکانیان هـەروەك چۆن پێشـتر وابـوو پشتگوێ بخات .

ئەم هەست کردنە بەنیگەرانی وایکرد شێوازێکی نـوێ لەڕێکخسـتنی سیاسـی بێتـە ئارا کـە لەگـەڵ ئـەو یاسـا نوێیانـەدا تێکبکاتـەوە کـە یاسـای هەڵبـژاردنی مـانگی ئایاری سـاڵی ١٩٢٢ دیـاریکردبوو لـەهاوینی هـەمان سـاڵدا دوو حزبـی سیاسـی لەلایەن ژمارەیەك لە کەسایەتییە شیعە عەلمانیەکان لەوانەش جەعفەر ئەبولتممەن کـــە ئەنـــدامی ئەنجومـــەنی وەزیـــران بـــوو و وەك نـــارەزایی دەربڕینێـــك دژی ڕێکەوتنامەکە دەستی لەکار کێشایەوە دامەزرا ئەوانیش حزبی نیشـتمانی و حزبـی ڕابوون (حـزب النهضـة) بـوو . هـەردوو حـزب کـە سـەنتەرەکەیان لـە بەغـدا بـوو

ڕێکخستنی خۆنیشاندان و بلاْوکردنەوەی ڕۆژنامە وەکو بەشێك لەو هەڵمەتەی کە دژی ڕێکەوتنامەکەو هەڵبژاردنە چاوەڕوانکراوەکە سەرکردایەتیان دەکرد،گرتە ئەستۆ.

بە بۆچوونی سەرکردەکانی ئەو دوو حزبە زۆرینەی سروشتی لە عێراق دا شیعەیە و ئەو رایەشیان خەملاْندنەکانی بەریتانیا بۆ ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی ۱۹۲۰ تەئکیدی لێکردەوە هەر بۆیە ئەو دوو حزبە پێویستیان بە ڕێکخستن بوو بۆ سوود وەرگرتن لەو بارودۆخە تازەیەی کە تێیدا ئەو واقیعە کۆمەلاْیەتیە سەنگێکی سیاسیان پێدەدات .

دوو حزبەکە بە تەنها ڕوو بەڕووی ڕێکەوتننامەکە نەبوونەوە بەڵکو مەلیك فەیسەڵیش نارەزایی خۆی بەرامبەر هەندێك لە برگەکانی دەربڕی کە دەیزانی ڕەنگە ببێتە هۆکارێك بۆ بە کارهێنانی بەمەبەستی شەرعیەت دان بە دەسەلاْتدارێتی بەریتانیا هەر بۆیە مەلیك فەیسەڵ دەستیکرد بە هاندانی بەرهەڵستکارانی ڕێکەوتنامەکەو لاوازکردنی نەقیب و وایکرد پۆستی سەرۆکایەتی وەزیران جێبێڵێت و دەست لە کاربکێشێتەوە، لێرەدا مەلیك و بەریتانیەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕوو بەڕووی یەکتربوونەوە کە دەبووە هۆی لە دەست دانی مەلیك بۆ عەرشەکەی بەلاْم وارێککەوت تووشی نەخۆشی ریخۆلە کوێرە بوو و کۆکس ئەو هەلەی قۆزتەوە بۆ سەپاندنی دەسەلاْتی ڕاستەوخۆ و سەرکوت کردنی هەموو حزب و ڕۆژنامە توندرەوەکان و ژمارەیەکی زۆری سیاسیەتمەدارەکانی لایەنگری ئۆپۆزسیۆنیشی دوور خستەوە و هەروەها بڕیاری بۆردومان کردنی بەرهەڵستکارانی لە فوراتی ناوەڕاست دا. سەبارەت بە مەلیك و ئەوانی دیکە هیچ سووربونێك لەلایەن بەریتانیەکانەوە بەدینەدەکرا سەبارەت بە جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکەو ئەو پلانانەی کە دایانرشتبوو بۆ دەوڵەتی عێراق. ئاوەها دووبارە مەلیك فەیسەڵ لە ئەیلولی ساڵی ۱۹۲۲ گەڕاوە سەر کارو دووبارە نەقیبی دەست نیشان کردەوە بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران و تەئکیدیشی لە پاڵپشتی خۆی بۆ ڕێککەوتنامەکە کە لە تشرینی یەکەمدا واژۆ کرا کردەوە .

برگـەکانی رێکەوتنامەکـە بنـەمای ئینتیـدابی لـە خـۆ گرتبـوو و وا راگەیـەنرا کـە بێـەوەی دەسـت لەسـەر وەری عێـراق بـدرێت جێبەجێـدەکرێت بـەلام ئـەو رۆڵـە یەکلاکـەرەوەی کـە درابـووە دەسـەڵاتدارێتی بـەریتانیا لـە مەسـەلە داراییـەکان و کاروبـاری ئـەمنی و نێودەوڵـەتی هـەروەها هەنـدێك لەمەسـەلەکانی پەیوەسـت بـە دادوەری ئاماژەیەکی روون بوو بۆ سنوری دەوڵەتی عێراق و دەبوایە عێراق ئـەوە بسـەلمێنێت کـە ئامادەیـە توانـای ئەوەشـی هەیـە سـەروەری خـۆی بەشـێوەیەك بـەرێوەببات کـە قبووڵکراوبێـت لەلایـەن ئـەو زلهێزانـەوە کـە دەسـتیان بەسـەر کۆمەڵەی نەتـەوەکان داگرتبـوو و دەبوایـە هـەر بـەریتانیا راوێـژکاری و هاریکـاری لـەرێگای تـۆری راوێـژکارەکانی لـە فەرمانگـە عێراقیەکانـدا پێیشـکەش بکـات و هەروەکو بـەم دووایيانـەش دەرکـەوت خـودی عێراقيـەکان لـە رەتکردنـەوەی ئـەو راوێژکاریيانە ئازادنەبوو.

لەبەر رۆشنایی ئەو واقیعـەدا و لـە بەرامبـەر بەرهەڵسـتکاریی بـەردەوام لـە ناوچـە شیعە نشینەکاندا و خۆ پیشاندانەکانی کە لە بەغدا روویانـداو شـێوەیەکی نـوێ و نامۆ بوو لەسیاسەت سەبارەت بە نەقیب کە گـەورەیی تەمـەنی لاوازی کردبـوو ، و لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢دەست لە کار کێشانەوەی خۆی لە پۆستی سـەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران راگەیاند و عەبدولموحسـین ئەلسـەعدون شـوێنی گرتـەوە کـە یەکێك بوو لە پیاوماقووڵان و خاون زەوی و زارێکـی سـوننەبوو و هـەروەها یـەکێك بوو لە ئەندامانی خانەوادە دەسەڵاتدارەکان کە حوکمی یەکێتی هۆزە گـەورەکانی مەنتەفەکیان لە باشووری فورات دەکرد، و مەلیك بە هوشیاریەوە سەیری دەکـرد، بـەلام بەریتانیـەکان بەکەسـێکی خـاوەن دەسـەڵاتی کەسـایەتی و ناوبـانگی کۆمەلایەتی پێویستیان دەناسی بۆ جێبەجێکردنە رێکەتنامەکەو کارەکانی دیکـەی پێویست بۆ دانانی بناغەی دەستووریی بۆ دەوڵەتی عێراق.

بەلام سنووری هەرێمایەتی ئەو دەوڵەتـە خرایـە ژێـر پرسـیارەوە، لەلایـەك تورکیـا کەبەسـەرکەوتوویی بـە سـەرکردایەتی مسـتەفا پاشـا لـە جەنگەکەیـدا دژی یۆنـان دەرچوو داوای ویلایـەتی پێشـووی موسـڵی کـرد ئەمـەش وایکرد بارودۆخەکـە لـە

باکووری عێراق ئاڵۆزتر بێت،پێشتریش لە ساڵی ١٩٢٢هێزەکانی تورکیا هاتنە ناو ناوچە کوردیەکان لەو ویلایەتە و بووە هۆی بەرپاکردنی شۆرش لەلایەن ژمارەیەك لە سەرکردەکانی هۆزە کوردیەکان لە باکوورو بەریتانیەکان لەسلێمانی کشانەوە بە ئەنجومەنێکیان سپارد کە یەك لە براکانی شێخ مەحمود سەرکردایەتی دەکرد. لە هەوڵێکیشدا بۆ سەر لەنوێ سەپاندنەوەی جۆرێك لە دەسەلات لە ناوچەکە کەبتوانێت سنورێك بۆ چاو تێبرینەکانی تورکیا دابنێت کۆکس بریاری ئازادکردنی شێخ مەحمودی دا کەدەست بەسەر کرابوو و سەر لەنوێ بەحوکمداری سلێمانی دایمەزراندەوە. سەبارەت بە مێژووی پێشووی شێخ محمود و پەیوەندییە پشێوەکانی لەگەڵ بەریتانیا، ئەوە هەنگاوێکی لەناکاو بوو بەڵام لەوکاتەدا کۆکس وایدەبینی کەتەنیا شێخ لەتوانایدایە کۆنترۆڵی ئەو نارەزاییانە بکات کە لەناوچە کوردییەکاندا پەرەی دەسەند. هەروەها کۆکس دەیزانی کە گرنگترین هۆیەکانی پشێوی لە ناوچەی کوردەکان تێگەیشتنی زێتری کوردەکان بوو لەوەی کە ئەو بەڵێنانەی بەریتانیەکان بە کوردەکانیان دابوو سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی بەڵێنی ساختە بوون وهەروەها هەستکردنیان بەوەی کە لەگەڵ روونبوونەوەی شێوازی دەوڵەتی عێراقی دەبێت ملکەچی حوکمی راستەوخۆی حکومەتێکی عەرەبی بن کەبەریتانیەکان لەبەغدا دایان مەزراندووە .بۆیە لەهەولێکدا بۆ هێورکردنەوەی ئەو مەترسیانە و رازیکردنی شێخ مەحمود راگەیاندنێکی بەریتانی–عێراقی هاوبەش لەکانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ راگەیەنرا کە بەڵێن بە کوردەکان دەدات مافی ئەوەیان هەبێ حکومەتێکی کوردی لە چوارچێوەی عێراقدا دابمەزرێنن ئەگەر کوردەکان خۆیان توانیان لەسەر دامەزراندنی و ئەو زەویانەی کە دەیگرێتەوە رێکبکەون ئەمەش وایکرد ئەو بەڵێنانە زیندوو بکرێتەوە کە درابووە مەلیك فەیسەڵ بۆ هێنانی کوردەکان بەشێوەیەکی تەواو بۆ نێو دەوڵەتی عێراقی بەڵام ئەو پەیوەست بوونەش بەسترایەوە بەئاستی رێکەوتنی کوردەکان لەنێو خۆیاندا کە بەریتانیەکان باش دەیانزانی کارێکی چەندە ئەستەمە،لەراستیشدا کاتێك کە

بەریتانیەکان پاش چوار ساڵ لە بەڵێنەکەیان پاشگەزبوونەوە واباسکرا کە ڕێکنەکەوتنی کوردەکان لەنێو خۆیاندا هۆی سەرەکی ئەو پاشگەزبوونەوەیە.

لەگەڵ ئەوەش بەر لەو بەروارە ئیدراەی شێخ مەحمود لە سلێمانی کۆتایی پێهات و بەهاتنی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٢٣، بەریتانیەکان دەیانزانی کە شێخ مەحمود خەریکە دەست بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ دەکات کەخۆشی دەبێتە مەلیکی ئەو دەوڵەتە و ئەگەر پێویست بکات لەلایەن تورکیاوە دەپارێزرێت. لە مانگی ئاداردا هێزی ئاسمانیی شاهانەیان لە دژی ئەو و دژی هێزەکانی تورکیا و سەرۆك هۆزە کوردە یاخیبووەکان لە باکوور بەکارهێنا و بەریتانیەکان هەستی نارەزاییە ناوەخۆیەکانیان بەرامبەر بەشێخ محمود قۆستەوە بۆ دووبارە داگیر کردنەوەی سلێمانی لە مانگی ئایاردا.هەرچەندە کە شێخ محمود بەسەرکەوتوویی گەرایەوە کاتێك کە هێزەکانی بەریتانیا پاشەکشەیان کرد لە مانگی تەموزدا. لەگەڵ ئەوەش و لە ماوەی دوانزە مانگی داهاتوودا جۆرێك لە ناسەقامگیری باڵی بەسەر ناوچەکەدا گرت ،و هێرشی هێزە ئاسمانیەکانی شاهانە بۆ سەر سلێمانی چەندین جار دووبارە بۆوە و شارەکە لەلایەن هێزەکانی بەریتانیا لە تەموزی ساڵی ١٩٢٤داگیرکرایەوە ئەمەش شێخ مەحمودی ناچارکرد لەرێگای سنوورەکانی ئێرانەوە دەرباز بێت و لەچاکانەوە دەست بە شەرێکی پارتیزانی بکات کە دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراقی شەکەت کردبوو تا دەستگیرکردنی لە ساڵی ١٩٣١دا.

لە راستیدا مەسەلەی موسل و داهاتوی باکووری عێراق ئەوانەی بانگەوازی سەربەخۆیی تەواو و یەکسەرەی عێراقیان دەکرد خستە رەوشێکی سەختەوە. ئەوانە دانیان نابەوەی کە عێراق پێویستی بە پاڵپشتی و پاراستنی بەریتانیایەکان هەیە ئەگەر بێت و ویلایەتی موسل لەدەست بمێنێتەوە بەڵام لەبەرامبەردا ئەو نرخەیان رەتکردەوە کە بەریتانیای مەزن داوایکرد.هەروەها مەلیك و ئەوانەی پەنایان بۆبرد و داوای پاڵپشتیان لێدەکرد زۆرباش هەستیان بەوە دەکرد کە پێویستیان بە یارمەتی بەریتانیایە بۆ پاراستنی پێگە تایبەتیەکانیان و پاراستنی

یەکگرتوویی دەوڵەت.هەروەها بۆ ئەوانە روون و ئاشکرابوو کە لەدەست دانی ویلایەتی موسڵ یاخود دابرینی هەریەشێکی گرنگ لە خاکی دەوڵەتی عێراق ئەوا ئەو زۆرینەی شیعە کە هەن دەبنە زۆرینەو مەترسی دەست بەسەرا گرتنی هەنددێك لەتاکەکانی کەمینەی سوننە زیاتر دەکات. لە راستیدا بەریتانیەکان هەستیان بەو کێشەیە کردو بەشێوەیەکی لەرادەبەدەر قۆستیانەوە لە رێگای رێککەوتن لەگەڵ سەرۆك وەزیراندا لە نیسانی ساڵی ١٩٢٣ لەسەر ئەوەی کە رێککەوتنامە پێشنیار کراوەکە نەك بۆماوەی بیست ساڵ پەیرەو دەکرێت هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرابوو بەڵکو تەنیا بۆ ماوەی چوار ساڵ دوای مۆرکردنی رێککەوتنامەی ئاشتی لەگەڵ تورکیا.

لەدەرەنجامی ئەوەو بەهۆی ئەوئالۆزییەی کە لەو ماوەدا باڵی بەسەر پاشەرۆژی موسڵ و هەرەشەکانی تورکیا کەبەرەبەرە لە ئاسۆدا دەردەکەوت لەناوچە شیعەنشینەکاندا بەرهەڵستکاری سەری هەڵداو لەحوزەیرانی ساڵی١٩٢٣وبەر لە پرۆسەی هەڵبژاردنی ناراستەوخۆ موجتەهیدە شیعەکان سەر لەنوێ فەتوای بەشداری نەکردنیان لەو هەڵبژاردنەدا و لەسەرووی ئەوانەی کە رەخنەیان لەدەوڵەتی عێراقی دەگرت ئایەتوڵلا مەهدی خالسی بوو بەلام زۆرانیش لە بەغدا پشتگیریان لێدەکرد،هەربۆیە مەلیك بریاری دەستگیرکردنی ئایەتوڵلاخالسی دەرکردو رەوانەی بەسرە کرا لەوێوەش بەمەبەستی حەج کردن رەوانەی مەککە کرا کەدواتر گەرایەوە نەك بۆ عێراق بەڵکو بۆ ئێران و لەگەڵ گەیشتنی بۆ ئەوێ ژمارەیەك لە زانایانی ئایینی شیعە چوونە پاڵی و نارەزاییان لەبەرامبەر ئەو مامەڵەکردنە کەلەگەڵی کراوەو هەڵوێستی دەسەلاتداران لەبەرامبەر سستەمی چینایەتی شیعە بەگشتی دەربری.

خۆدوورخستنەوەی خالسی موجتەهیدی شیعە دەنگ دانەوەیەکی ئەو تۆی نەبوو لە عێراق و هەرچەندە هەستی دژایەتی لای شیعەکان بەرامبەر دامەزراوە بەریتانی و سوونییەکان لەبەغدا هێشتا مابوو بەلام هەردوولا هەولی خۆنزیکردنەوەیان لە شیعەکان دەدا لەلایەك بەریتانیەکان لە ئەنجومەنی دامەزراندندا نزیکەی٤٠٪ی

کورسیەکانیان بۆ سەرۆك هۆزەکان تەرخان کرد مەلیکیش لەلایەن خۆیەوە قەڵەمڕەوی خۆی بەکارهێنا بۆ لێبوردنیان لەباج و ئەمە وایکرد سەرۆك هۆزەکانی شیعە لەناوخۆیان یەك هەڵوێست نەبن و موجتەهیدەکان بی پاڵپشتی کۆمەڵایەتی بمێنەوە هاوکات چالاکوانە سیاسیە عەلمانیە شیعەکان پێشوازیان لە هەڵوێستی موجتەهیدەکان نەدەکردو سوور بوون لەسەر قۆستنەوەی هەڵبژاردن کەدەیانزانی باشترین ڕێگە چارەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەست بەسەراگرتنی سوننەکان ، هەروەها پەنابردنی خالسی و ژمارەیەك لە موجتەهیدەکانی دیکە بۆ شای ئێران حەساسیەتی زۆر لە عێراقیەکانی زیاتر کردوو سەر لەنوێ هەڕەشەی پەراوێزکردنی شیعەی هێنایەوە ئارا . لەراستیدا کەمبوونەوەی ڕۆڵی سیاسی موجتەهیدەکان لە عێراق بۆ ئەم ماوە دەگەڕێتەوەو بزوتنەوەکانی سەرکردایەتی کردنی شیعەکان لێرە بەدواوە لەلایەن کەسانی عەلمانیەوە بەڕێوەدەبرێت کە گرنگی بەبەرژەوەندی شیعەکان دەدەن لە چوار چێوەی دەوڵەتی عێراقدا لەبری ئەوەی دژایەتی خودی بیرۆکەی دەوڵەت بکەن.

لەلایەن خۆیەوە مەلیك هەوڵی چاککردنەوەی ئەو زیانەی دا کە دەستگیرکردنی خالسی دروستی کرد، ئەمەش یەك لەو هۆیانە بوو کە بووە هۆی دەست لە کار کێشانەوەی موحسین ئەلسەعدون لە سەرۆکایەتی وەزیران لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٣دا و بووە بەراییەك بۆ گەڕانەوەی زۆربەی زانایانی ئاینی شیعە بۆ عێراق و هەروەها بووە هۆی ئەوەی مەلیك سەردانێکی نەجەف و کەربەلا بکات لە هەمان ساڵدا. لەگەڵ ئەوەی کە مەلیك لە سەردانەکەیدا نیازی بەسەرکردنەوەی شوێنە پیرۆزەکانی شیعەی هەبوو بەلاّم ئەوەشی بەسەر ئەو موجتەهیدە دیارانەی شیعەکان کە لەعێراقدا مابوونەوە سەپاند کە ڕێز لە مەلیك بگرن وەکو سەرۆکی دەوڵەت. لەو کاتەدا مەلیك جەعفەر عەسکەری یارمەتیدەری پێشووی خۆی کردە سەرۆك وەزیران بۆ چاودێری کردنی قۆناغی کۆتایی پرۆسەی هەڵبژاردن و بۆ مسۆگەرکردنی بوونی کەسێك کە ئەویش (پیاوی مەلیك)ە لەو پۆستەدا لەکاتی کردنەوەی ئەنجومەنی دامەزرێنەردا.

لە ئاداری ساڵی ١٩٢٤دا ئەنجومەنی دامەزرێنەر دەستی بە کۆبوونەوەی خۆی کرد و هەرزوو ڕەخنەگرتن دژی ڕێکەوتنامەکە باڵی بەسەر دانیشتنەکە کێشا بۆیە، سێر هێنری دۆبس (ئەوەی لە ئایاری ساڵی ١٩٢٣ شوێنی سێر بێرسی کۆکسی گرتەوە لە پۆستی مەندوبی سامی) و لە ترسی ڕەت کردنەوەی ڕێکەوتنامەکە هۆشداری داو ڕوونی کردەوە ئەگەر هەتا ١٠ی حوزەیران ڕەزامەندی لەسەر ڕێککەوتنامەکە نەدرێ بەریتانیای مەزن پەنا دەباتە بەر شێوازی جۆراوجۆر بۆ جێبەجێکردنی ئینتیدابەکەی بۆ عێراق. وە ئەو گەف گوڕانەی بووە هۆی ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر ڕێککەوتنامەکە لەدواساتەکاندا و ئەمەش ڕێگە خۆشکەر بوو لەبەردەم دەرکردنی یاسای بنەڕەتی (ئەوەی کە دەستووریش لەخۆ دەگرێ) و دواتر یاسای هەڵبژاردنیش. لەبەر ئەوە ئەنجومەنی دامەزرێنەر هەڵوەشێنراو جەعفەر عەسکەری دەست لە کار کێشانەوەی خۆی لە پۆستی سەرۆك وەزیران پێشکەش کرد.

ئابەم شێوەیە زۆربەی ئالیەتی فەرمی دەوڵەتی عێراقی دروستکرا. دەستور لە دەرەنجامی چارەسەریەکی نێوان ویستەکانی بەریتانیا بۆ بوونی هێزێکی جێبەجێکەری کاریگەر کە مەلیك پەیڕەوەی دەکات و، دان پێ دانیان بە پێویستی پێدانی ڕۆڵ بەگروپە خاوەن دەسەڵاتەکان لە کۆمەڵگای سیاسی عێراقی دروست بوو مەلیك دەسەڵاتی هەڵپەساردن و هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و دەست نیشانکردنی سەرۆك وەزیران و دامەزراندنی سەرجەم وەزیرەکانی دیکە لەسەر ڕاسپاردەی ئەو پێسپێردرا هەروەها پەسندکردنی سەرجەم یاسایەکان لەلایەن مەلیکەوە پێویست بوو هەروەها دەسەڵاتێکی فراوانی لە پرسەکانی ئاسایش و دارایی و جێبەجێکردنی برگەکانی ڕێکەوتنامەکە هەبوو بەڵام پەرلەمان کەلەئەنجومەنی پیاو ماقووڵان کەمەلیك دایدەمەزراندن و ئەنجومەنێکی نوێنەرانی هەلبژێردراو پێکهاتبوو ، ئەنجومەنی نوێنەران لەڕێگەی دەنگدانی ڕاستەوخۆوە هەڵدەبژێردرا ئەویش بە هەڵبژاردنی هەر ٢٥٠ دەنگدەر بۆ نوێنەرێکیان کەدواتر ئەویش پەرلەمانتارێك هەڵدەبژێرێت، ئەنجومەنی وەزیرانیش بەرپرس بوو لە

بەرامبەر ئەنجومەنی نوێنەراندا کە دەتوانێ حکومەت ناچار بکات بە زۆرینەی دەنگ دەست لەکاربکێشێتەوە هەروەها هەر پەرلەمانتارێك بۆی هەبوو یاسایەك پێشنیار بکات بەمەرجێك دە پەرلەمانتاری دیکە پاڵپشتی لێبکەن و یاسایەکە پەیوەست نەبێت بە مەسەلە داراییەکان کە بەپێی برگەکانی رێکەوتنامەکە لە ژێر کۆنترۆڵی بەرتانیا مایەوە.

## پرسی مووسڵ: خاك و نەوت

دوای ئەوەی بەشێوەیەکی رووکەشانە چوارچێوەی دەستووریی دەوڵەت چارەسەرکرا ،کێشەی مووسڵ به هەڵپەسێردراوی مایەوە. هەر لەو ماوەیەدا بوو مەلیك یاسین ئەلهاشمی بە سەرۆك وەزیران دامەزراند هۆی ئەم بریارەشی تارادەیەکی زۆر دەگەرێتەوە بۆ رابردووی دوژمنایەتی هاشمی بەرامبەر بە تورکەکان. حکومەتی تورکیاش لەکۆتاییدا بەوە رازیبوو کە لێژنەیەکی سەر بە کۆمەڵەی نەتەوەکان هەلسێت بەپێکهێنانی لێژنەیەك بۆ دەستنیشانکردنی دروستی مافی تورکیا لە داواکردنی ویلایەتی مووسڵ لەبەر رۆشنایی رای دانیشتووانی و دەرکردنی راسپاردەی تایبەت بە رەوشی کۆتایی ویلایەتەکەو سنووری هەرێمایەتی. لە تەمووزی ساڵی ١٩٢٥ لێژنەکە بریاری لەسەر مانەوەی ویلایەتەکە وەك بەشێك لە دەوڵەتی عێراق داو سنووری باکووریشی تارادەیەك وەکو سنووری کۆنی ویلایەتەکە هێشتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دوو مەرجی دیاریکراوی دانا ، یەکەم مانەوەی عێراق لە ژێر ئینتیدابدا بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ، و مەرجی دووەمیش ئەوەبوو کەدەوڵەتی عێراق دان بە سروشتی جودای ناوچە کوردییەکان بنێت لەرێگای پێدانی ئیدارەیەکی خۆیی بە کوردەکان و رێگایان پێبدات پەرە بە ناسنامەی کلتوری خۆیان بدەن لە رێگای دامەزراوەکانی تایبەت بە خۆیان. ئەنجومەنی کۆمەڵە رەزامەندی لەسەر ئەو راسپاردانە دەربری و لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥ کۆمەڵە داوای لە بەریتانیا کرد رێککەوتنامەیەکی

نوێی بەریتانی–عێراقی ببەستریٚ بۆ ماوەی بیست و پێنج سالٚ (ئەگەر هاتوو عێراق وەکو دەولّەتێکی خاوەن سەروەری تەواو لە کۆمەلّەی نەتەوەکان لەو ماوەیەدا وەرنەگیرا)و بۆئەوەی کۆمەلّەی نەتوەکان لەهەمان کاتدا ئەوە مسۆگەر بکات لەکاتێکی نزیکدا پێشنیارەکانی پەیوەست بە ئیدارەیەکی کوردیی تایبەت پێشکەش بکرێت حکومەتی تورکیا زۆر نارازیبوو لەو بریارانە بەلاّم ناچار بوو رەزامەندی لەسەر دەربریٚ لە عێراق بریارەکەی کۆمەلّەی نەتەوەکان رووبەرووی هەستی جۆراوجۆربۆوە ،زۆر لەکوردەکان ئەوەیان پێباش بوو کەلێژنەکە ترسەکانی ئەوانی لەوەی بکەونە ژێر دەسەلاّتی هەردوو حکومەتی تورکیاو عێراق بەهەند وەرگرت دوای ئەوەی کە توانیان خۆیان لە داگیر کردنێکی نوێ ی تورکیا وەلادەن ترسیان لەهەلّوێستی حکومەتێکی عەرەبی بەرامبەریان هەبوو لەلایەکی دیکەوە راستە سەرپەرشتی کردنی کارەکانی حکومەتی عێراق بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەلایەن کۆمەلّەی نەتەوەکانەوە دلّنیای پێبەخشین بەلاّم ئەم رەوشە دەگاتە کۆتایی هەرکاتیٚ کە بەریتانیا رایسپارد عێراق بچێتە نێو کۆمەلّەی نەتەوەکانەوە وەلەبەر ئەو پەیوەندییە گەرمەی نێوان دەسەلاّتی بەریتانیاو عەرەبەکانی سەردەسەلاّت لەعێراق ترسێکی رەواهەبوو لەوەی کە نەبادا بەریتانیا بەهۆی ناکۆکی و دووبەرەکی لەریزی کوردەکان کوردستان لە پلانە ستراتیژیەکانی خۆی بەلاوە بنیٚ.

لەبەغدا ئەگەری ئەوەی کە بەریتانیا کۆمەلّەی نەتەوەکان راسپێرێت عێراق وەك ئەندام وەربگریٚ ئەو بیست وپێنج سالّەی داپۆشی کەماوەی رێکەوتنامەکە بوو ،ئەو ئەگەرەش کە کوردەکان بەترسەوە تەماشایان دەکرد هەندێك لە سیاسەتمەداران لەبەغدا هیوایەکی پێشبینی نەکراویان تێدا بەدی دەکرد کەرێگەیان پێدەدات لەماوەیەکی کەمدا بگەنە دەسەلاّتی خۆبەرێوەبردن ئەمەش وایکرد رێکەوتنامەیەکی نوێی بەریتانی–عێراقی لەرێگای پەرلەمانەوە لەکانونی دووەمی سالّی ١٩٢٦دەربچێت و راسپاردەکانی کۆمەلّەی نەتەوەکانی لەخۆ گرتبوو کەتیایدا هاتبوو پێویستە لەسەر بەریتانیا لە سالّی ١٩٢٨ بەشێوەیەکی

کردەیی لەماوەی چوارساڵدا بیر لە پاڵپشتی کردنی وەرگرتنی عێراق لەکۆمەڵەی نەتەوەکان بکاتەوە.

ئەو پرۆسەیە لەلایەن عەبدولومحسین ئەلسەعدون لە دوای یاسین ئەلهاشمی پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥دا سەرکردایەتی دەکرا. هەروەها سەرۆکایەتی یەکەم هەڵبژاردنی گشتی کرد کە پەرلەمانێکی لێ کەوتەوەو دەستی بەدەرکردنی یاسای پێویست بۆ رێکخستنی رووە جۆراو جۆرەکانی دەوڵەتی نوێکرد. هەروەها ئەو پەرلەمانە لە ئاداری ساڵی ١٩٢٥ بڕیاری رێککەوتنی ئیمتیازی نەوتی لەنێوان حکومەتی عێراقی و کۆمپانیای نەوتی تورکیا (TPC) پەسند کرد، (پاش ساڵی ١٩٢٩ بووە کۆمپانیای نەوتی عێراقی (IPC).

کۆمپانیای نەوتی تورکی لە یەکگرتنی کۆمەڵێك کۆمپانیای نەوتی دروست بوو کە پێش جەنگی جیهانی یەکەم دامەزراو رەزامەندی حکومەتی تورکیای وەرگرت بۆ گەران بەدوای نەوت لە دۆڵی رافیدەین. وەکو بەشێکیش لە چارەسەرە ئاشتیەکان کە دوای جەنگ ئەنجامدران دەست بەسەر پشکەکانی ئەڵمانیاو عوسمانیەکان لە کۆمپانیاکەدا گیرا لە بەرژەوەندی هاوپەیمانان. لە کۆتایی بیستەکانیشدا کاتێك کە بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکای هاتەناو بوو بەموڵکی هەریەك لە کۆمپانیای ئەنگلۆ ـ ئێرانی بۆ نەوت(٢٣,٧٥٪) و رۆیاڵ دەتش شێڵ (٢٣,٧٥٪) و کۆمپانیای فەرەنسی بۆ نەوت (٢٣,٧٥٪) و یەکێتیەکی کۆمەڵێك کۆمپانیا کە سەنتەرەکەی لە ئەمەریکا بوو دواتر پشکەکانی بەیەکسانی دابەشکرا لە نێوان ستاندارد ئۆیەڵ ئۆف نیوجێرسی و مۆبێل (٢٣,٧٥٪) و گالبینکیان (٥٪). بەمەش بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بەسەر کۆمپانیای نەوتی تورکی زاڵ بوو ئەمە جگە لە پشکێکی گرنگی خودی حکومەتی بەریتانیا ، بەلەبەر چاوگرتنی موڵکەکانی لە کۆمپانیا ئەنگلۆ ـ ئێرانی بۆ نەوت. لەسایەی قەیرانەکەی موسڵ ئەو هەژاریە بەردەوامیەی کە حکومەتی عێراق تێیدا بوو ، کۆمپانیا نەوتیەکانی بەریتانیا بە پاڵپشتی حکومەتی بەریتانیا هەلێکیان دۆزیەوە بۆ دامەزراندنی ئیمتیازێکی سەرتاسەری تایبەت بۆ کۆمپانیای نەوتی تورکی و دورخستنەوەی ئەگەری خاوەندارێتی عێراق بۆ بەشێك

تیایدا . ئەم بەڵێنە ساڵی ١٩٢٠دا کاتێك کە ڕێکەوتن لەسەر دوارۆژی کۆمپانیای نەوتی تورکی ئەنجامدەراو پشکێك کە دەگاتە ٢٠٪ بۆ (حکومەتی نیشتیمانی تەرخانکرا). حکومەتی عێراق ڕەزامەندی لەسەر وازهێنان لە مافەکانی لەپشکێك لە کۆمپانیای نەوتی تورکی دەربری سەرەرای نارەزاییە توونەدەکانی هەندێك لە ئەندامانی (کە دوانیان لەبەر ئەم هۆیە دەستیان لەکار کێشایەوە). لەبەرامبەردا، عێراق هاوکاری نەختی زیاتر و ژمارەیەك لەپاداشتی دیکەی وەدەستهێنا وەکو دامەزراندنی پالاوگەیەك و هێڵێکی بۆری نەوتی .

سەرباری مسۆگەرکردنی داهاتی یەکسەرە، حکومەتی عێراق لەوبروایەدابوو کەخۆی لە ئەگەری هەڵسانی بەریتانیا بەپێشکەشکردنی تەنازولاتی گەورە بۆ تورکیا لە موسڵ دەرباز کردووە. لە پێداچوونەوەیەکی رووداوەکانی ئەو قۆناغە ، ئەگەری ئەوە نەبوو، بەلام لەلایەن دەسەلاتداریتی بەریتانیاوە لەکاتی دانوستانەکان لەسەر ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی ئامـاژەی پێکرابوو . بەپێی بەندەکانی ئەم ئیمتیازەش کۆمپانیاکە بەبەریتانیایی مایەوەو مافی گەران بەدوای نەوتی لەسەرجەم عێراقدا پێبەخشرا جگە لە ویلایەتی کۆنی بەسرا. مۆڵەتێکی دیاریکراویشی پێدار بۆ دەست نیشانکردنی ژمارەیەك پارچە زەوی و پابەند بوون بە گەران بۆ دەۆهێنانی نەوت لەماوەی چەند ساڵێکدا بەمەرجێك حکومەتی عێراق برێك پارە کە پێشتر لەسەری ڕێکەوتبوون بدات بۆ هەر تەنێکی مەتری لە نەوت کە دەردەهێنرێت هەرئەمەش بواری لەبەردەم پەرلەمانی عێراقدا رەخساند تاکو ئەو ڕێکەوتنامە سێ قۆڵیە بەریتانی تورکی عێراقیە پەسند بکات کە بەشێوەیەکی کۆتایی پرسی موسڵی لە تەمموزی ساڵی ١٩٢٦ چارەسەرکرد .

## کۆمەڵگای هەمەڕەنگ، ئامانجی زۆر، مێژوویکی جیاواز

سەرەرای ئەوەی لە رواڵەتدا ملکەچ بوو ، پەرلەمان نەیتوانی پشتگیری لە پالێوراوی سەعدون وەکو وتەبێژ بە ناوی ئەنجومەن لە تشرینی دووەم لە ساڵی

١٩٢٦ بکات. کە بووە هۆی دەست لە کار کشانەوەی و هەڵێك بوو بۆ مەلیك کە دووبارە بە دوای هاوبەشە ئەمینەکەی جەعفەر عەسکەری بنێرێ و ماوەی سەرۆکایەتیەکەی دوومەسەلەی گرنگی بەخۆوە دیت کە سروشتی دەوڵەتی عێراقی تازە دروست بوو و پەیوەندی بەبەشە جۆراوجۆرەکانی گەلی عێراق پێدەناسرێتەوە ، یەکەمیان ناونوسکردنی ئیلزامی وەك بناغەیەك بۆ ئامادەکردنی سوپای عێراق وە دووەمیشیان کەپەیوەستە بەوەی یەکەم، مەسەلەی نارەزایی شیعە بوو.

بەپێی رێکەوتنامە سەربازییەکانی ساڵی ١٩٢٤دەبوایە عێراق بەهاتنی ساڵی ١٩٢٨ بەرگریکردن لەخۆی بگرێتە ئەستۆ هەرچەندەکە قەبارەی سوپای عێراق وهێزی لەئاست ئەو کارە نەبوو ، لەراستیدا ئەوانەی داوای مەسەلەی ناونوس کردنی ئیلزامیان دەکرد هەندێك باوەری دیاریکراویان هەبوو لەبارەی سروشتی دەوڵەتی عێراق و رۆلی هێزە چەکدارەکانی چونکە پێیان وابوو تاکە گەرەنتی دەوڵەتی سەربەخۆ بوونی سوپایەکی زەمینی بەهێزە کە پشت بە ناونوسکردنی ئیلزامی گشتی دەبەستێت ،هەروەها لەوڵاتێکدا کە هۆزەکان چەکیان چەندین جار بەقەدەر چەکی دەوڵەت بێت ئەوا حکومەتێکی ناوەندی بەهێز پێویستە بۆ کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکان،دواجاریش هەندێك کەس بروایان وابوو کە خزمەتی سەربازیی گشتی هەستی پابەند بوونی تایبەت لەلای خەڵکی عێراق لەناو دەبات و هەستکردن بەخزمەت و ئەرکی بەکۆمەڵ لەهەمبەر دەوڵەتی عێراقی نوێ دروست دەکات.

لەبەرامبەردا زۆری دیکە لەخەڵکی عێراق بەتایبەتیش لەناوچە هۆزگەریە کوردی وشیعەکان رقێکی قووڵیان بەرامبەر ناونوسکردنی ئیلزامی هەبوو چونکە هەندێك لە خراپترین سیماکانی دەوڵەتی عوسمانی وەبیر دەهێنانەوەو سەبارەت بەزۆر لە سەرۆك هۆزو ئاغەکان وابیریان دەکردەوە کە ئەوانەی لەبەغدا حوکم دەکەن ناونوسکردنی ئیلزامی بۆهەمان مەبەست پەیرەو دەکەن ئەویش بەکارهێنانی وەك ئامرازێك بۆ سەپاندنی کۆنترۆڵی ناوەندی و سنوردانان بۆ سەربەخۆیی هۆزەکان.

بەلاّم بەریتانیەکان کەوایان دەبینی ناونوسکردنی ئیلزامی گەورەترە لە داهاتی دارایی کەمی حکومەتی عێراق ئەوا بەمەسەلەیەکی مایەی چەندو چونیان دەژمارد و لەوە نیگەرانبوون کە نارەزایی بنێتەوەو ناچار بن پەناببەنە بەر هێزی ئاسمانی شاهانە بۆ سەرکوتکردنی یاخیبووان ،بۆیە جەعفەر عەسکەری و ئەوانی دیکەش ئاگادارکرانەوە کەبەریتانیای مەزن هاریکاری ناکات لە مامەڵەکردن لەگەلّ ئەو کارە توندانەی کەرەنگە لەو مەسەلەیە بکەوێتەوە.

لە سالّی ١٩٢٧ ئەو مەسەلەیە باگراوندێکی ترسناکی بۆپرسی ململانێی تایەفی دروست کرد ،کاتێك کە یەك لە فەرمانبەرە سوننەکان لە حکومەت پەرتوکێکی بلاّوکردەوە کەتیایدا رەخنەی لە مەزەبی شیعە گرتبوو، نارەزاییەکی زۆری نایەوەو بووە هۆی پەرەسەندنی پشێوی و لە تەمووزی سالّی ١٩٢٧ یەکەیەکی سوپای عێراقی تەقەی لە کاروانێکی شیعەکان لە مانگی موحەرەم لە کازمیە کردو رووداوەکە ژمارەیەك کوژراوی لیّ کەوتەوە بەلاّم ئەفسەری ئەو یەکەیە کەبەرپرس بوو لەرووداوەکە نەك هەر بێتاوان کرا بەڵکو پلەشی بەرز کرایەوە بەمەش نارەزایی شیعەکان زیاتر بوو و خۆپیشاندنەکانی دوای رووداوەکە پەرەی سەند و نەك تەنیا موجتەهیدەکان بەشداریان تێدا دەکرد بەڵکو هەندیّ لە شیعە عەلمانیەکانیش لەگەڵیان بوون کە حزبی نەهزە کەدامەزرایەوە نوێنەرایەتی دەکردن ،یاسین هاشمی لە وەلاّمی ئەو نارەزاییانە هەوڵی سەرکوت کردنی حزبەکەی دا بەلاّم هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو و خۆشی ناچار کرا دەست لەکار بکێشێتەوە ئەمەش وایکرد حکومەتەکەی عەسکەری هێندەی دیکە لاواز بیّ. لەگەلّ شکستهێنانی حکومەت لە دەرکردنی یاسای ناونوسکردنی ئیلزامی لەرێگەی پەرلەمانەوە هاوکات بەردەوام بوونی پشێوی شیعەکان و دەست لەکار کێشانەوەی ژمارەیەك لە کەسایەتیە دیارەکان لەحکومەت ، هەموو ئەمانە وایکرد جەعفەر ئەلعەسکەری لەکانونی دووەمی سالّی ١٩٢٨ دەست لەکار بکێشێتەوەو عەبدولموحسین ئەلسەعدون جێگای بگرێتەوە . سەعدون داوای هەڵبژاردنی گشتی کرد کە لەو بروایە بوو پەرلەمانی نویّ رێگەی پێدەدات سەر لەنویّ دانوستان لەگەلّ بەریتانیا

لەبارەی رێکەوتنامە سەربازی و داراییەکان بکاتەوە،دەست تێوەردانی حکومەت لە هەڵبژاردن کە لەمانگی کانونی دووەم تا ئایاری ساڵی ۱۹۲۸ بەردەوام بوو وایکرد پەرلەمانێك بێتە ئاراوە کە لایەنگری حکومەت بێت و نوێنەرایەتیەکی گرنگی شیعەش لەخۆ بگرێت کە هاوکار بوو لە هەوڵەکانی سەعدون بۆ ئاشت بوونەوە لەگەل شیعەکان . بەڵام لەسەر لەنوێ دانووستاندن لەگەل بەریتانیەکان سەرکەوتوونەبوو و بەریتانیەکان هیچ تەنازولێکیان نەکردوو پێشنیارەکانی سەعدونیشیان کە لە کانونی دووەمی ساڵی ۱۹۲۹ پێشکەشی کرد رەتکردەوەو ناچارکرا دەست لە کار بکشێنێتەوە.

تۆفیق سویدی لەمانگی نیساندا بەوە رازی بوو کە سەرۆکایەتی حکومەت وەربگرێت رەنگە ئەوەی پاڵنەریشی بوو بۆ ئەم کارە رۆیشتنی دۆبسی نێردراوی سامیی کەللەرەق و گۆرینەوەی لە سەرەتای ساڵی ۱۹۲۹ بە گێلبەرت کلایتۆن (Gilbert Clayton)کە بەسۆزداری لەگەڵ عێراقیەکان ناسرابوو و پەرلەمانیش پاڵپشتی لێکرد بەڵام مەلیك و نوری سعید کە ئەو کات وەکو سەرۆك حزبێکی خاوەن هەژموون دەرکەوتبوو پێگەیان لاواز کرد لە مانگی ئاب دا وایانکرد دەست لەکار بکێشێتەوەو رێگایان خۆشکرد بۆ گەرانەوەی عەبدولموحسین ئەلسەعدون کە سەرلەنوێ سەرۆکایەتی حکومەت بکاتەوە.لەم ماوەیەدا هەموو کارەکان پشتیان بە دەستپێشخەریەکەی بەریتانیا بەست کە لە ئەیلولی ساڵی ۱۹۲۹ پاش هەڵبژاردنی حکومەتێکی سەربەحزبی کرێکاران لە بەریتانیای مەزن هاتوو راگەیاندنی ئەو حکومەتە کەکۆمەڵەی نەتەوەکان رادەسپێرێت عێراق وەکو ئەندام وەربگرێت کە لە ساڵی ۱۹۳۲دا و دانی بەرپرسیارێتی عێراق نا لەبەرگریکردن لەخۆی.

ئیمکانیەتی ئەوەی کە عێراق لەساڵی ۱۹۳۲ سەربەخۆیی خۆی وەرگرێت بەشێك لە کۆمەڵگای کوردی هاندا کە داواکارییە بەکۆمەڵەکەیان وەکو کورد رابگەیەنن چونکە تا ئەو کاتە کاروباری گشتی لە کوردستان بە دەستی هەندێك کەسایەتی وەکو شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد بارزانی بوو کە لەو پشێویانە بەرپرسیاربوون

کە لە ناوچە کوردیەکانی باکوور سالّی ۱۹۲۷رووباندا، و ئەو سەرکردانە هەندێ جار داوای سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی بەرژەوەندیەکانیان بەرتەسك بوو و پشتی بە پالّپشتی ناوخۆیی هۆزەکان یان تۆرەکانی رێکخراوە سۆفیگەرییەکان دەبەست،بەلاّم دوای چارەسەرکردنی مەسەلەی مووسڵ لە سالّی ۱۹۲٦هەندێك گروپ لە بیرمەندە کوردە شارستانەکان دەستیان کرد بەبلاّوکردنەوەی بیروبۆچون لەبارەی رێگای باشتر بۆ گەرەنتی کردنی ناسنامەو بەرژەوەندیە کانی کورد لە چوارچێوەی دەولّەتی عێراق .
هەندێکیشیان پەیوەندیەکی پتەویان لەگەڵ کەسایەتیە خاوەن دەسەلاّتەکان لە بەغداناو هەندێ بەرژەوەندی تاکەکەسی ،لەبەرامبەردا هەندێکی دیکە هەولّیان دا ئەم پالّپشتیە بۆ وەدەستهێنانی پێگەکانی دەسەلاّت لەدەولّەتی عێراقدا بەکار بێنن ، بۆ نمونە ببنە پەرلەمانتار کەئەمەش رەنگە یارمەتی دەر بێت لە گەیاندنی داواکاریەکانی کورد.

لە هاوینی سالّی ۱۹۲۹دا هەندێ لە پەرلەمانتارە کوردەکان یاداشتێکیان پێشکەشکرد کە داوای خەرجی زیاتریان کرد بۆ ناوچە کوردیەکان بەگشتی و پێکهێنانی ویلایەتێکی کوردی کە لەدهۆك وهەندێك قەزای دیکەی سەر بەمووسڵ سەرەرای قەزاکانی سەربەهەولێر و، سلێمانی و کەرکوك کە نزیکەی سەرجەم کوردەکان لەوێ دەژیان. کۆمەلێك داواکاری تایبەتی کورد سەریان هەلّدا کە جیاوازبوو لەو داواکارییانەی کە سەرۆك هۆزەکان لەبارەی حکومەتی ناوەندییەوە بەرزیان دەکردەوە هەروەها جۆرێکی دیکەی پالّپشتی کۆمەلاّیەتی لێدەکرا.ئامانجی پلانەکەشیان تێکەڵ بوونی زیاتر بوو لە دەولّەتی عێراق بەپشت بەستن بە خۆگونجاندنی پەرلەمانتارەکان لەگەڵ ئەم جیهانەدا لەهەمان کاتدا دەربری سوور بوونیشیان بوو لەسەر پشتگوێ نەخستنی داواکارییەکانیان لەلایەن دەسەلاّتدارانی دەولّەتی نوێ و ئاماژەشیان بەوەدا کە (حزب)ی کوردەکان لەو حالّتەدا داوای مانەوەی ئینتیداب دەکات بۆ ئەم بیست و پێنج سالّەی کە

کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاری لێدابوو ،لەگەر نزیك بوونـەوەی وادەی سـەربەخۆیی سوور بوون لەسەر ئەو داواکارییانە هەندێك توندیشی وەگەردرا.

موحسین ئەلسەعدون لەخستنەرووی مەسـەلەی پێداچوونەوەی بەرێکەوتنامەکـەو وەدەسـتهێنانی بـڕوای مـەلیك پێـی و سـەرکەوتوونەبوو.بـە مردنـی لـەناکاوی کلایتـۆنیش سـاڵی ۱۹۲۹ سـەعدون هاوپـەیمانێکی گرنگـی لەدەسـت دا ئەمانـەو هەستکردنی بەبێ دەسەلاتی سیاسی لەگەڵ گرفتە تایبەتیەکانی خـۆی وایکـرد لـە تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۲۹خۆی بکوژێت. و ناجی ئەلسویدی (بـرای تۆفیـق) لـە دوای ئەو پۆستی سەرۆکی حکومەتی وەرگرت، بەڵام ئەویش بێ دەسـەلاتی خـۆی سـەلماند لەمەڵـەکردن لەگـەل ئـەو فشـارانەی کەلەزێـدەبوون دابـوو بـۆ گرێـدانی رێکەوتنامەیەك کە رێگا لەبـەردەم سـەربەخۆیی خۆشـبکات بۆیـە لەبەرامبـەر ئـەو خۆپیشاندانانەی کەلەشـەقامەکاندا دەسـتی پێکـرد بێئومێـدی بەسـەریدا زاڵبـوو و لەگـەڵ رەخنـەکانی رۆژنامـەکان و سیاسـەتەکانی مـەلیك ونـوری سـەعید بـۆ لاوازکردنی پێگەکەی لە ئاداری ساڵی ۱۹۳۰دا دەستی لەکار کێشایەوە

## رەوتە سیاسیە نوێ یەکان و ئابووری

سەردەمی بیستەکان لە عێراق بە جموجۆڵێکی رۆژنامـەوانی چـالاك و هەنـدێ جـار گاڵتەجاری ناسرابوو ، جگـە لـە گەشـانەوەی هـۆنراوە کەلـەو قۆناغـەدا سیاسـەت کاری لێدەکرد ، شاعیرەکانی وەکو ئەحمەدسافی ئەلنەجەفی ومـەعروف رەسـافی و مەحەمەد مەهدی جـەواهیری و لەشـیعرەکانیاندا باسـیان لـەعێراقێك دەکـرد کـە رۆمانسـیەت بەسـەریدا زاڵ بـوو باسـیان لـە داگیرکـردن و جیـاوازی دابەشـکردنی سامان لە نێوان دانیشتووان دەکرد ئەم نامانە مایـەی دڵنیـایی نـەبوون چ لەلایـەن بەریتانیەکان و چ لەلایەن مەلیك و نوخبـەی دەسـەلاتداردا. لەسـایەی ئـەم چـەندو چوونە نوێیەدا هەریەك لە ناوەندە رۆژنامەوانی و ئەدەبیەکان بەشـێوەیەکی قـووڵ تێکەڵی پرسە سیاسیەکانی عێراق بوو، هەندێك لـە ئـەدیب و نووسـەران هـەولێکی

هۆشیارانەیان دا بۆ بنیاتنانی ناسنامەیەکی عەلمانی کە جیاوازییە مەزهەبیەکانی نێوان سوننەو شیعە کەم بکاتەوە . بەلآم روون و ئاشکرا بوو کە ئەو ناسنامەیە ناسنامەیەکی عەرەبی بوو کە کوردی لێدوور خرابۆوە تورکمانیش ئەوە هەر هیچ – نوسینەکانیش لەبارەی پرسی مووسڵ کە دەیان گووت بەشێکە لە عێراق ئەوەیان روونکردەوە بێئەوەی باس لە کۆمەڵگە کوردییە گەورەکەی بکات .

نوری سەعید کە مەلیك متمانەیەکی زۆری پێبوو هەڵی لاچوونی سویدی قۆستەوەو تا سەرۆکایەتی وەزیران بگرێتەدەست ،نوری سەعید سەرکردایەتی دەست و پێوەندەکانی مەلیکی دەکرد و بازنەیەك لە دۆستانی نزیکی لە خۆی کۆکردبۆوە زۆر لەوانە دۆستی خۆی بوون لە ئەلعەهدو لە هێزەکانی سەریە شەریف لەمیانەی شۆڕشی عەرەبیدا و لەگەڵ ئەو پاڵپشتیە بەهێزەی کەمەێك بوو بەریتانیەکان لێیانکرد کە بە پەرۆش بوون بۆگەیشتن بەرێکەوتنێك، نوری سەعید ئەو هێزەی دەرخست کەپێگەکەی پێی بەخشی لە سیاسەتی عێراقیدا و بەپەلە دانوستانێکی ئەنجامدا لەبارەی رێکەوتنامەیەکی عێراقی بەریتانی نوێ . کە لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠مۆرکرا.

ئەم رێکەوتنامەیە بناغەی پەیوەندیەکانی عێراقی لەگەڵ بەریتانیای مەزن دوای سەربەخۆیی عێراق لەساڵی ١٩٣٢پێکهێناو هەموو بەرپرسیارێتی پەیرەوی ناوخۆیی لەعێراق درایە دەست مەلیك و بەرگری کردن لەخاکی عێراقیش بەعێراق سپێدرا ، بەلآم لە بەرامبەردا عێراق رەزامەندی نواند لەسەر رێگا پێدان بە بەریتانیای مەزن بۆ بەکارهێنانی هەموو ئاسانکاریەك کەلەتونای دابێت لەکاتی سەرهەڵدانی هەر جەنگێکدا، لەوانەش مافی تێپەربوونی سوپای بەریتانی بە سەر خاکی عێراق لە کاتی پێویستدا، هاوکات کەرەستەکانی سوپای عێراق و راوێژکارانی سەربازیی بەریتانیای مەزن دابینی دەکات،هەروەها هێزە ئاسمانیەکانی شاهانە دووبنکەی سەرەکیان لەعێراقدا لەدەست دەمێنێ یەکیان لە حەببانیە لەنزیك بەغدا ئەوی دیکەشیان لە شوعێبە لە تەنیشت بەسرە. رێککەوتنامەکەش بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ کاری پێدەکرێت لەبەرواری

وەرگرتنی عێراق لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بەڵام لەگەڵ ئیمکانیەتی سەر لەنوێ دانووستاندنەوە لەبارەیەوە دوای بیست ساڵ.

عێراقیەکان پێشوازیەکی گەرمیان لە ڕێککەوتنامەکە نەکرد ، بەڵام ئەوانەی نارەزاییان دژی ڕێکەوتنامەی سەربازیی بەردەوام لەگەڵ بەریتانیای مەزن دەربڕی پێویستیان بە ڕێکخستنێك هەبوو کە سەرکردایەتی بەرهەڵستکاریەکی چالاك بکات ، لە ڕاستیدا بەڵێندان سەبارەت بە سەربەخۆییەکی نزیك وەڵام دانەوەیەك بوو بۆ زۆربەی ڕەخنەکان .ڕەنگە ئەوەی هاریکار بوو بۆ ئەوە خودی ڕێکەوتنامەکە بوو کەبووە مایەی نارەزایی کوردەکان چونکە هیچ ئاماژەیەکی بە ڕەوشی تایبەتی ئەوانی تێدا نەبوو دەسەڵاتدارانی بەغدا لەوە دڵنیا بوون کە بەریتانیا پرسی کورد وەك بەهانەیەك بۆ دەست تێوەردان بەکارناهێنێ ،بەڵام ئەم ڕەوشە نارەزایی کوردەکانی زێدەتر کردوو بەڵێنەکانی نوری سەعیدیش سەبارەت بە ڕێوشوێنی ئیداری تایبەت بە کارگێری ،پەروەردەیی ،ڕۆشنبیری و زمانەوانی لە ناوچە کوردییەکانی بەر لەساڵی ۱۹۳۲ کوردەکانی دڵنیا نەکردەوە .

نوری سەعید دوای هەڵبژاردنێکی گشتی کە هەوڵی دا لایەنگرانی تێیدا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بێنن لە تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۳۰ ئەو پەرلەمانەی کە کرێگرتەو لایەنگرانی خۆی تیایدا بالا دەست بوون ڕێکەوتنامەی پەسند کرد.بەڵام ئەوەی ببووە مایەی نیگەرانی نوری سەعید بەردەوامیی پشێویەکان بوو لەناوچە کوردیەکاندا کە ئەو خۆنیشاندان و پشێویەی لە پایزدا سەریان هەڵدا ڕێگەی بە سەر لەنوێ دەرکەوتنەوەی شێخ مەحمود دا کە پەیوەندیەکانی بەسەرکردە کوردە شارستانەکان بە ئاشکرایی بوو بەڵام شێخ لەو سەرکردانە دوورتر ڕۆیشت و داوای جودابوونەوەی کوردستانی لە عێراق و کردنی بە ناوچەیەکی پارێزراو لەلایەن بەریتانیەکانەوە کرد و بۆ پتەو کردنی هەڵوێستەکەی سەر لەنوێ دەستی کرد بە هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ئەو هۆزانەی کەپێشتر پشتگیریان لێکردبوو .بەشێکی زۆری سوپای عێراق بەشداری لەو شەڕەدا کرد کەبەهۆی ئەمەوە ڕوویداو دەرکەوت کەحکومەتی عێراق توانای

پاراستنی یاسای نیەو لەجێبەجێکردنی پابەندییەکانیدا بەرامبەر بەکوردەکان شکستی هێنا ئەم پەرەسەندنانەی ڕووداوەکان حکومەتی خستە جۆرێك لەشەرمەزاری لەبەر ڕۆشنایی هەوڵەکانی عێراق و بەریتانیا بۆ ڕازیکردنی کۆمەڵەی نەتەوەکان به کۆتایی هێنان به ئینتیداب بەر لە نۆزده ساڵ لە وادەی دیاریکراو لە ڕێکەوتنامەی ١٩٢٦ ،بەهۆی ئەوەو دوای داواکارییەکی فەرمی حکومەتی عێراق بەریتانیەکان چەند یەکەیەکی هێزی ئاسمانی شاهانەیان بۆ هاریکاریکردن لە سەرکوت کردنی شۆرش ڕەوانە کرد . دوای نزیکەی مانگێك لەشەر شێخ مەحمود هەوڵی پێکهاتنی دا و لەئایاری ساڵی ١٩٣١ بۆناسرییە لەباشووری عێراق دوور خراییەوە .

لەهەمان کاتدا حکومەتی عێراق هەنگاوێکی ئیجابیانەی نا بەئاراستەی ئاسنامەی ڕۆشنبیری کوردی لەڕێگەی دەرکردنی یاسای زمانە نێوخۆییەکان کەلەڕێگەی ئەم یاسایەوە حکومەت دەیویست ئەوە بۆ کوردەکان و بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان دەربخات کە جدییانە مامەڵە لەگەڵ گەرنتیەکانی دانان بەسروشت و بەرژەوەندییە جوداو دیارەکانی هاولاتیانی کوردی عێراق دەکات .بەلاَم ئەم یاسایە لاوازە مەترسی کوردەکانی هێور نەکردەوە چونکە بەڵێنێکی لاواز بوو لەبارەی بەکارهێنانی فەرمی زمانی کوردی ،هیچ ڕێسایەکیش بۆ دامەزراندنی ئەفسەرانی کورد نەبوو ،لەدەرەنجامی ئەوە سەرکردە کوردەکان لەسلێمانی و شوێنەکانی دیکە پەنایان بردە بەر ئامرازی دیکەی جودا لەوەی شێخ مەحمود بەکاری هێناو داوایان لە کۆمەڵەی نەتەوەکان و هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراق کرد کە کەمترین داواکارییەکانی کورد بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی ڕۆشنبیری وخودموختاری جێبەجێبکات٬بەلاَم ئەم داواکارییانەیان بێسوود بوو چونکە سەبارەت بەنوری سەعید ئەگەر مامەڵەکردن لەگەڵ کێشە ئەمنیەکاندا بەڕێگای سەربازیی مومکین بێت ئەوا بەرهەڵستکاریی سیاسی لە کوردستان کارێکی ئەوەندە مەترسیدار نەبوو هاوکات نەمەلیك و نەبەریتانیەکان و نەحزبە جودا جوداکانی ئۆپۆزسیۆن لەناوەڕاست و باشووری عێراق هیچ فشارێکیان نەخستە

سەر حكومەت بۆ جێبەجێكردنی ئەو گەرەنتیانەی بە سەركردە كوردەكانی دابوو لەكات وساتی جۆراوجۆردا بەڵكو بەپێچەوانەوە وادەردەكەوت كەهەموویان كۆكن لەسەر پێویستی لەناوبردنی هەر ئارەزوویێكی كوردەكان لە جودابوونەوە .
لەراستیدا ئەوەی كەنوری سەعیدو هێزە سیاسیەكان لەبەغداو ناوەراستدا زیاتر پێوەی سەرقاڵ بوون ئەو قەیرانە ئابوورییە بوو كە لە سیەكانەوە وڵات تێیكەوتبوو هەروەها رەوشی لەرزۆكی دارایی حكومەت چونكە ئابووری عێراق لەبیستەكاندا پشتی بە كشتوكاڵ بەستبوو و خورماوجۆ پلەی یەكەمی هەناردەكانی عێراقیان پێكدەهێنا هاوكات چاندنی پەمۆ سەركەوتنێكی وای بەدەست نەهێنا ،هەروەها كێشە داراییەكانی حكومەت كاریگەری بەسەر پیشەسازیش هەبوو چونكە زۆربەی كاری پیشەسازی خۆی لە كارگە بچوكەكان و كەرەستەكۆنەكان دەدیتەوە

لەساڵی١٩٣٠ سێر هیلتۆن یۆنگ (Hilton Young) راسپێردرا بۆ لێكۆڵینەوە لە هۆیەكانی هەردوو قەیرانی ئابووری ودارایی و دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆیان ناوبراو ژمارەیەك هۆكاری ئەو دووقەیرانەی دۆزیەوە ،لەراستیدا لە بیستەكاندا زەوی رۆلێكی بنەرەتی هەبوو لە باشكردنی پەیوەندیەكان لە نێوان لایەنەكانی دەسەلاتدا ،سەبارەت بەهەندێكیان دەوڵەت ئامرازێك بوو بۆ بەدەستهێنانی پارچەیەك زەوی و نەدانی باج لەهەمانكاتدا بۆیە مەلیك و سەرۆكە یەك لەدوا یەكەكانی حكومەت و وەزیرەكان و خاوەن پۆستە باڵاكان و خانەوادەو دەست و پێوەندە سیاسیەكانیان زەوی زارێكی زۆریان هەبوو پەرلەمانیش كەلە دەست ئەوان بوو تاكە ئامانجی هەرزێدەكردنی داهاتی زەویەكانیان بوو ،ئینجا یاسای ساڵی ١٩٢٦ هات كە هانی بەكارهێنانی ترۆمپای ئاوی دەداو ئامانجە ئاشكراكەشی زێدەكردنی رووبەری زەوییە كشتوكالیەكان بوو بەلام رێگەی بە خەڵكی شارەكاندا كە خاوەن سەرمایە بوون بەرژەوەندیەكانیان بگاتە گوندەكان هاوكات قەرزی سەرشانی ژمارەیەكی زۆری جوتیارانی گران كردبوو و كێشەكانی بەرهەمهێنان و نزمبوونەوەی نرخی بەربوومە كشتوكاڵیەكان بووە هۆی كەمبوونەوەی داهاتەكانی دەوڵەت ، نیگەرانیەكان سەبارەت بەم

کەمبوونەوەیە لەسایەی دارمانی ئابووری جیهانی لەپشت سەردانەکەی یۆنگ بوو ،کێشەکانی دیکەی پەیوەستیش بەوە وەکو بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و رەوشی ئابووری کشتوکاڵی بووە هۆی پێکهێنانی لێژنەیەکی لێکۆڵینەوە بەسەرۆکایەتی ئەرنست داوسۆن ( Ernest Dowson) لەساڵی ١٩٢٩داو لەساڵی ١٩٣٢دا راپۆرتی خۆی لەبارەی بواری کشتوکاڵ پێشکەش کرد و تیایدا هاتبوو کەپێویستە لەسەر حکومەت پشت بەکەسانی خاوەن هەژموون نەبەستێت و لەمامەڵە کردن لەگەڵ گوندەکاندا پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ خاوەن زەوییەکان ببەستێ .

دواتر هەندێك لەلێژنە هونەریەکان چەند راسپاردەیەکی ئیداری داوسۆنیان پەیرەو کرد بەلام یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ ساڵی ١٩٣٢ کەگوایە پشتی بە راسپاردەکانی داوسۆن بەستووە هەژموونی خاوەن زەویەکانی بەشێوەیەکی کردەیی لە هەموو بوارەکاندا زێدەتر کردو باجەکانیش زۆرتربوون و رێگەی لەبەردەم سەپاندنی باجی بەکارهێنان لەساڵی ١٩٣١ خۆشکرد . راپۆرتەکەی سێرهلتۆن یۆنگ حکومەتی راسپاردبوو کە قەرز بکات لەسەر داهاتی ئەو نەوتەی کەلەدوارۆژدا دەردەهێنرێت ،نەوت بەبرێکی زۆر لەنزیك کەرکوك لەساڵی ١٩٢٧ دۆزرایەوە بەلام هەناردەکردنی بەر لەساڵی ١٩٣٤ دەست پێناکات ، لەئاداری ساڵی ١٩٣١ رێکەتنامەیەك مۆرکرا کەرێگە بە کۆمپانیای IPC دەدات لەسەرجەم ناوچەی باکووری رۆژهەلاتی عێراق بەدوای نەوتدا بگەرێت سەرەرای لێبوردنەکان لەباج بەرامبەر بەوەی کۆمپانیاکان سالانە برێکی زۆر پارە بەزێر بدات تائەو کاتەی دەست بە هەناردەکردنی نەوت دەکات ، لەماوەی نێوان ١٩٣١–١٩٣٢ داهاتی نەوت ٢٠٪داهاتی حکومەتی پێکدەهێنا .

بەهاوکاری نوری سەعید لەپەرلەمان رەزامەندی لەسەر ئەو رێکەتنامەیە درا بەلام لەساڵی ١٩٣١ قەیرانی ئابوری و گۆرانکارییەکان لەجیهانی سیاسەتدا لە عێراق نوری سەعیدی خستە بەردەم تەحەدایەکی مەترسیدار ، لەئاداری ئەو ساڵەدا یاسین هاشمی سەرۆکی حزبی گەل و جەعفەر ئەبولتمەنی سەرۆکی حزبی

نیشتمانی یەکیان گرتوو حزبی برایەتی نیشتمانیان پێکهێنا گروپەکەی هاشمی کەعەرەبی سوننە بوون لەهەردوو جیهانی سیاسی و ئیداری دەوڵەتی عوسمانی و هەروەها دەوڵەتی عێراقدا چالاك بوون بەلاّم حزبەکەی جەعفەر ئەبولتممەن سەرەرای ئەوەی هەندێك کەسایەتی سوننەی تێدابوو بەلاّم بەشێوەیەکی بنەرەتی پشتی بە شیعە رۆشەنبیرە عەلمانیەکان بەستبوو ، دیاردەیەکی دیکە کەلەساڵی ۱۹۳۱ دا گرنگی هەبوو ئەوە بوو کە ئەبولتممەن پەیوەندیەکی پتەوی لەگەل کۆمەڵەی خاوەن پیشەکان بەسەرۆکایەتی محەمەد سالّح قەزاز هەبوو کەسەندیکایەك بوو ساڵی ۱۹۲۹ دامەزرابوو و زۆربەی ئەندامانی لە پیشەییەکان و بازرگانە بچوکەکان بوون کە ئامانجی پێشنیارەکانی نوێ ی باج بوون ، کاتێکیش حزبی نیشتمانی دەستی بەهەڵمەتەکانی کرد لەشەقامەکانی بەغداو هەرێمەکاندا ئەو کۆمەڵەیە رۆلێکی گرنگی هەبوو ، هاوکات نارەزاییەکانی خەڵك وەکو سەرۆك هۆزەکانی ناوەراستی فورات و زانایانی ئایینی لە شارەشیعەنشینەکاندا وایکرد لەگەلّ بانگەوازەکانی حزبی برایەتی نیشتمانی هاورابن ،لەگەلّ ئەوەش چالاکیە سیاسیەکان سنورداربوون چونکە هێزە ئەمنیەکان وایانکردبوو کە کۆبوونەوەی گشتی و خۆنیشاندانەکان کارێکی ئاسان نەبێت هەربۆیە لەدەرەنجامی ئەوە هەڵمەتێکی رەتکردنەوەی دانی باج دەستی پێکردوو چەندین یاداشتنامە کەداوای دەست لەکار کێشانەوەی حکومەتیان دەکرد بۆ مەلیك رەوانەکران هاوکات ئامادەکاری بۆ بزووتنەوەی راستەوخۆ لەهەریەك لە ناوەراستی فورات و بەغداو شارەکانی دیکە کە پلانیان دانابوو بۆ مان گرتنی گشتی دەکرا ، حکومەتیش بەدەرکردنی یاسای باجی شارەوانییەکان رەوشەکەی ئالّۆزترکرد ، لەتەمموزی ساڵی ۱۹۳۰ یەك رۆژ دوای سەردانی مەلیك بۆ ئەوروپا مانگرتنی گشتی کەلەبەغدا دەستی پێکردو زۆربەی شارەکانی باشووری عێراقی گرتەوە لەوانەش بەسرە ، هاتووچۆ وەستاو دووکانەکان داخران و کار لەوەزارەتەکاندا وەستا ، ئۆپۆزسیۆن ئەو هەڵەی قۆستەوە بۆرێکخستنی خۆنیشاندان لە شەقامەکان و داواکارییە تایبەتیەکان کەلەپشت خۆنیشاندانەکان بوون گۆران بۆ دروشمی گشتیتر دژی

سستەمی حوکم لە عێراق بە مەلەکیەتیشەوە لەهەندێك حاڵەتیشدا رووبەرووبوونەوە لەگەڵ هێزە ئەمنیەکان کاری توندوتیژیشی لێکەوتەوە

لەراستیدا مانگرتنەکان لەهەفتەی دووەمیدا هەڵپەسێردرا ،چونکە حکومەت هەندێك هەنگاوی نا بۆ وەلامدانەوەی داواکاریەکانی پەیوەست بە یاسای باجی شارەوانیەکان کەیەك لە هۆکارە گرنگەکانی نارەزایی جەماوەریی بوو ،ئەمە سەرەرای بلاوبوونەوەی زۆری هێزە ئەمنیەکان لەشارەکانداو دەستگیر کردنی رێکخەرانی خۆنیشاندانەکان لەوانەش دەستگیرکردنی قەزاز ،ئەو هەوڵەش کە لەکۆتایی تەمموزدا بۆ سەر لەنوێ دەستپێکردنەوەی مان گرتنەکە شکستی هێنا لە مانگی ئابیشدا حکومەت کۆمەلەی خاوەن پیشەکانی هەڵوەشاندەوە بەمەش ورەی ئۆپۆزسیۆن زیاتر دابەزی و نوری سەعید بەسەرکەوتوویی و دڵنیابوون لەپاڵپشتی بەردەوامی مەلیك و دەست وپێوەندەکانی و بەریتانیەکان دەرچوو.

ئەو شێوازەی نوێی کاری سیاسی لەعێراق کەخۆی لە مان گرتنی گشتی و خۆنیشاندانە جەماوەرییەکان لە بەغدا لەگەڵ پشێویی و کاری تێکدەرانە لە ناوچە هۆزگەرییەکان لەناوەراستی فورات زۆر کەسی نیگەران کرد کەمەرج نیە لایەنگری نوری سەعید بووبن چونکە ئەو مەترسیەی پشێویەکە دروستی کرد نیگەرانی کردن سەبارەت بە ئەگەری دروست بوونی هاوپەیمانیەکی نێوان شیعەو سوننە کە سوننەکان کۆنترۆڵی بکەن و هاوکاری نێوان شارستان و دێهاتیەکان لەگەڵ رێکخراوەکانی کرێکاران لە شارەکان ، لەدەرەنجامی ئەوەدا زۆر کەس پشتگیریان لە حکومەت کرد کە ئەو پەرەسەندنانەیان بە ئاماژەیەکی خراپ زانی بۆ شێوازێکی دیکەی زۆر جودا لە ژیانی سیاسی لە عێراقدا

بەلام حاڵی حازر نوری هێشتا سەرە داوەکانی لەدەست مابوو و توانی لایەنەکانی هاوپەیمانیی ئۆپۆزسیۆن لێك جودا بکاتەوەو ئەوە مسۆگەر بکات کە ئامانجی بنەرەتی سیاسەتی عێراق بۆ ساڵی ئایندە وەدەست هێنانی سەربەخۆیی بێت ساڵی ١٩٣٢، بۆ ئەم مەبەستە مەسەلەی ناونوسکردنی ئیلزامی پشتگوێ خست

بەلآم بارودۆخ لە ناوچە کوردییەکاندا لەوەتای هاوینی ١٩٣١کە سەر لەنوێ کێشەکانی پەیوەست بەناوی شێخ ئەحمەد بارزانی دەستیان پێکردەوە ،لەوپەڕی پشێویدا بوو ، لەراستیدا ئەو شەڕی پارتیزانییەی کە شێخ ئەحمەد سەرۆکایەتی دەکرد سوپای عێراقی هیلاکو ماندووکردبوو و وای لە نوری سەعید کرد لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٣١ بۆ جاری دووەم داوای هاوکاری هێزی ئاسمانی شاهانە بکات و هەروەکو جارانی پێشووش هاوسەنگی هێز لەشەڕدا گۆڕاو سوپای عێراق لەبەهاری ساڵی ١٩٣٢ توانی خودی ناوچەی بارزان داگیربکات و شێخ ئەحمەدیش بەرەو تورکیا بڕوات و دەسەلآتدارێتی تورکیاش یەکسەر دەستگیریان کرد .

لەم قۆناغەدا وەرگرتنی عێراق لەکۆمەڵەی نەتەوەکان بەرەو پێشدەچوو ،لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٣١دەستەی ئینتیدابەکان سەربە کۆمەلەی نەتەوەکان رەزامەندیدا لەسەر ئەوەی کە عێراق هەموو مەرجە پێویستەکانی جێبەجێکردووە بۆ وەرگرتنی وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سەرەوەری بەلآم داواشی لە عێراق کرد هەندێك گەرەنتی پەیوەست بەمافی کەمایەتیەکان لەچوارچێوەی سنوری خۆیدا پێشکەش بکات و لەگەڵ نزیکبوونەوەی وادەی سەربەخۆیی گروپە کوردیەکان و هەندێك گروپی دیکەی وەکو ئاشورییەکان بەرادەیەکی کەمتریش تورکمان و ئێزیدیەکان بەهیوای وەدەستهێنانی هەندێك پاڵپشتی نێودەوڵەتی یاداشتنامەیان پێشکەشی کۆمەڵەی نەتەوەکان وبەریتانیا دەکرد بەلآم چالآکوانە کوردەکان لەبارەی ئەو مەسەلەیە لەنێوان خۆیاندا ناکۆك بوون هەندێکیان لایەنگری سەرپەرشتی کردنی بیانی بوون (بەریتانی یان نێودەوڵەتی)دوای ساڵی ١٩٣٢ بۆ مسۆگەرکردنی جێبەجێکردنی ئەو رێوشوێنانەی کە دان بەو سروشتە تایبەتیە دەنێت کە ناوچەکانی کوردستانی پێدەناسرێت بەلآم هەندێکی دیکە پێیان وابوو ئەم رێوشوێنانە سوودیان نیە چونکە تەواو پشت دەبەستێ بە نیاز پاکی هێزە دەرەکیەکان ئەمەش بەردەوام بەرژەوەندییەکانی دیکەیان کاری تێدەکات هەروەکو چۆن کارەکانی حکومەتی بەریتانیا ئەوەی سەلماند لەراستیدا حکومەتی بەریتانیا لە هەوڵەکانیدا بۆ قبوڵکردنی عێراق لە کۆمەلەی نەتەوەکان

بەبەردەوامی ئیدعای ئەوەی دەکرد کەحکومەتی عێراق هەموو ئەو بەڵێنانەی لەکاتی چارەسەرکردنی مەسەلەی مووسڵ بەکوردەکانی دابوو جێبەجێکردووە.

مەترسیەکان لەدوا رۆژ گەیشتە کۆمەڵگەی ئاشوری مەسیحی کەبەقەوارە بچوکترو کەمتر هەستیان بە ئارامی دەکرد ئاشوریەکان کەوەکو پەنابەر لە ئەنادۆڵیاوە لە میانەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا گەیشتبوونە ئەو خاکەی کە لەدوارۆژدا دەبێتە دەوڵەتی عێراق ئیدارەی بەریتانیایان وەکو پارێزگاری سەرەکی خۆیان دەزانی ، زۆربەی ئەو سوپایەشیان ئامادەکردبوو کە لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرە بەریتانیەکان شەرەکانی عێراقیان دەکرد و پەیوەندیان لەگەڵ کوردەکانی دەورووبەریان دانیشتوانی دێهاتە عەرەبنشینەکانی باکووری عێراق کە بەریتانیەکان وایانکردبوو لەوێ نیشتەجێببن پشێوبوو.بۆیە شتێکی سروشتیە کەلەگەڵ نزیك بوونەوەی وادەی سەربەخۆیی ئەو کۆمەڵە هەست بە لەرزۆکی رەوشەکەی بکات ،ئەم مەترسیانە وایکرد کۆنگرەیەکی گشتی بۆ ئاشوریەکان لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ لەمووسڵ ببەسترێت و داواکاریەك پێشکەش بە کۆمەڵەی نەتەوەکان بکەن بۆ ئەوەی بایەخێکی تایبەتیان پێبدرێت و رێگەیان پێبدرێت کۆچی بەکۆمەڵ یان بۆ سوریا یان بۆ دەرەوەی رۆژهەڵاتی ناوەراست هەمووی بکەن.بەڵام وەڵامەکەی کۆمەڵە زۆر هاندەر نەبوو بەڵام دەسەڵاتدارێتی بەریتانیا رێگەی بەهیچ بزوتنەوەیەکی راستەوخۆی ئەوان نەدا کەباسیان لێکردبوو ئەویش کاتێك کە بەلێنی پێدان هێزە سەربازییەکانی هەردوو بنکەی ئاسمانی بەریتانیا وەکو یەکەی سەربازی پارێزگاریان بکەن ،ئەم بەڵێنەی بەریتانیا دوای ساڵی ١٩٣٢ بووە بەربەستێك لەبەردەم ئاشوریەکاندا و سیفەتی هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەریتانیای بەو کۆمەڵگەیە نووساند.

بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵەی نەتەوەکان لەهاوینی ١٩٣٢ راگەیاندنێکی فەرمی لەحکومەتی عێراقەوە پێگەیشت کەتیایدا بەلێنی مسۆگەرکردنی مافەکانی بیانیەکان و کەمایەتیەکان و رێگەدان بە ئازادی بیروڕا دەدات لە بەرامبەریشدا ئەو دەوڵەتانەی کەتا ئەو کاتە ئیمتیازاتیان لە سەڵتەنەی عوسمانیدا هەبوو لەوانە

عێراقیش رازیبوون بەوەی دەست لەو ئیمتیازاتانە بەردەن و لەتشرینی دووەمی ساڵی١٩٣٢ بەکۆی دەنگ کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاری لەسەر بەئەندامبوونی عێراقدا لەگەڵ ئەوەش باڵکێشانی بەریتانیا بەسەر عێراق چ بەشێوەیەکی فەرمی لەمیانەی رێکەوتنامەی ١٩٣٠ یاخود غەیرە فەرمی لەرێگەی ئەوچوارچێوەی کەپەیوەندیەکانی نێوان عێراق و بەریتانیای دیاریدەکرد هەر بەردەوامبوو . بەمشێوەیە وەدەستهێنانی سەربەخۆیی عێراق هیچ گۆرانکاریەکی ریشەیی لەو شێوازەی سیاسەت کەباوبوو نەهێنایەکایەوە .

بەپێچەوانەوە، لەراستیدا ماوەی ئینتیداب بە زۆر رێگا ماوەیەکی دیاریکەر بوو . ئەو ماوەیە بنکە دامەزرێنەرەکانی دەوڵەتی عێراقی دانەناو سنورە هەرێمیەکانی دیاری نەکرد بەڵکو دەوڵەتی کردە گۆرەپانێکی سەرەکی بۆ چەندین ململانێ کە ژیانێکی سیاسی عێراق جیاواز پێکدەهێنێت . لەلایەك ، بێ گومان ئەو ماوەیە عێراقی کردە پرۆژەیەکی ئیمپریالستی بەریتانی ، کەلەشێوەو پێکهاتەیدا لەگەڵ ئەو هزرانە تێکدەکاتەوە کە لەبەریتانیای مەزن باوبوون لەبارەی رێکخستنی دروستی دەسەلات و ئەو مەرجە تایبەتیانەی کە دەتوانن بەرژەوەندیەکانی لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا پتەوبکات. ئەمەش بووە کلتورێکی زۆر گران کەبەخشینی سەربەخۆیی فەرمی نەیتوانی بیسرێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە، ئینتیداب ئامرازێکی خستە دەست ئەو کەسانەی کە ماکینەی دەوڵەتیان پێکهێناو کۆنترۆڵی داهاتەکانیان کرد تاکو دەست بەسەر زەوی و زاردا بگرن و سودمەندیەکانی خۆیان بپارێزن بە شێوەیەك کە خزمەتی تۆرە تایبەتیەکانی مەحسوبیەت و بەرژەوەندیەکانیان بکات. بەلام سەبارەت بەوانەی کە لەو نێوەندانە دوورخرانەوە یاخود ئەوانەی دیدوبۆچونیان لەگەڵ دیدوبۆچونی دەسەلات تێکی نەدەکردەوە واپێدەچوو کە رێگە چارەیەکی روون و ئاشکرایان نەبێت پەنای بۆ ببەن . لەگەڵ ئەوەش ناکرێ پێگەکانی ململانێ و خودی ململانێکان بە وەستاوی بمێنەوە. هەر ئەو ماوەیە دەستپێکردنی پرۆسەی وای بەخۆوە دیت کە دەرەنجامە پێشبینی نەکراوەکانی بەشێوازی جوداجوداو لەکاتی

جوداجـودا لـە مێـژووی عێراقـدا دەردەکـەوێت. رەنگـە چـیرۆکی ئەوانـەی بوونـە قوربانی سەرکوتکردن یان پەراوێزخستن لە رابردوودا رەنگە دەرکەوێتەوە بۆ تۆڵـە سەندنەوە لەوانەی کە بروایان وابوو نەك تەنها دەستەبالآن بەسـەردەوڵەتدا بـەڵکو بەسەر مێژووی عێراقیشدا .

❑

# بەشی سێیەم
# مەملەکەتی هاشمی ١٩٣٢-١٩٤١

بوونی عێراق وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەشێوەیەکی فەرمی بە شێوازێکی شاراوە دەستی پێکرد. بوونی بەریتانیا کەمتر نەبۆوە لەجاران بەڵکو زۆربەی راوێژکارو فەرمانبەرە بەریتانیەکان لەو کاتەدا لەپۆستەکانیاندا مانەوە و شاندە سەربازییەکەی بەریتانیاش کە مەشقی بەسوپای عێراق دەکرد مایەوە ، هاوکات هێزی ئاسمانی شاهانە هەردوو بنکەی حەببانیە و شوعێبەیان لەدەست مایەوە .کۆمپانیا بەریتانیەکانیش لەهەموو کاتێکی دیکە زیاتر لەبوارە گەورەکانی ئابووریدا دەرکەوتن و کاریگەری بەریتانیاش بەسەر مەلیك و وەزیرەکانیدا هەربە بەهێزی مایەوە سەرباری ئەوەش سیاسەتی عێراق کاریگەری پەرەسەندوی سوپای عێراقی بەسەرەوە دیاربوو و ململانێکان و کێشە تایەفیەکان وکێشەکانی دێهاتەکانیش کاریگەریان بەسەر سستەمی دەسەلاتداردا جێهێشت ، ئەم پرۆسانە جیهان و چیرۆکی مێژوویی جودا جودای بۆخۆی راکێشاو پاڵەوانەکانیشی ناچارکرد لەگەڵ جیهانی سیاسەتی دەوڵەتی عێراقدا کە ئەو گروپەی دەستی بەسەر ناوەندا گرت دیاریکردبوو پێکەوە بژین و هەندێك جار دەبووە هۆی دەرکەوتنی چینی گشتی و هەندێك جاریش زێدە کردنی توندیی ناکۆکیەکان ، زۆربەی کاتەکانیش ناسنامەی تایەفی گرنگی خۆی هەبوو لەدارشتنی وەلامدانەوەی گەل بۆ پرسە جۆراوجۆرەکان . بەلام سەبارەت بەدەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت ئەوا کەتبووە دەست کەسایەتیە خاوەن هەژموون و دەست و پێوەندەکانیان کەئەمەش هاندەر بوو بۆ لێکترازان و جوودایی لەنێوان فەرمانبەراندا و پرسیاریشی لەبارەی سروشتی پابەندیان دەخستە روو . ئەم

دیاردەیـــەش لـــە ســـلکی ئەفســـەراندا لەســـوپای عێراقـــدا روونـــتر دەردەکەوێت(کەلـــەماوەی نێـــوان ١٩٣٢و١٩٤١دا ژمارەیـــان لـــە ١٢,٠٠٠گەیشـتە٤٣,٠٠٠)بـەهۆی سیاسـەتی مەحسـوبیەت ومەنسـوبیەت و رۆڵـی سیاسی دیاری ئەفسەرانی سوپا کە بەشدار بوون لە پێکهێنانی بنەماکانی جیهانی سیاسی و بەهۆی دیدی دیکتاتۆریانەی سستەمی سیاسی کەزۆربەی دەستەبژێری سیاسەتمەداران و پیاو ماقوڵان و فەرمانبەرانی باڵای دەوڵەت تێیدا بەشدار بوون وایکرد هێزە چەکدارەکان رۆڵێکی سەرکردەییان هەبێت لە دیاریکردنی کۆمەڵگەی عێراقی و راگرتنیدا.

سەربەخۆیی هانی سەرهەڵدانی چەندوچونێکی گەورەیدا لەبارەی ناسنامەی عێراق چ وەکو دەوڵەت و چ وەکو کۆمەڵگا چەندوچونەکەش بەشێوەیەکی تایبەتی لە نێـوان بـەرگریکاران لەناسـنامەی عـەرەبی عێـراق و ئەوانـەی کـە بانگـەوازی کۆمەڵگەیەکی نشتیمانیی عێراقی جودایان دەکرد بـوو . ئـەم ململانێیـەش لەسـەر ناسنامەکە وایکرد سیاسەتی دەرەوەی عێراقیش پرسێکی مایـەی ململانێ بێـت ، سەرەرای سەروەریی عێراق لە ئاستی فەرمیـدا بـەڵام بـواری سیاسـەتی دەرەوەی عێراق بە هۆی هەژموونی بەریتانیاو پێگەی لەرۆژهەڵاتی ناوەراستدا وایکـرد تـەنیا لەچوارچێوەی ناوچەی دەوروبەریدا بمێنێتەوە . هەروەکو رەشید عـالی گـەیلانیش لـەکاتی جـەنگی جیهـانیی دووەمـدا هەسـتی پێکـرد بەریتانیـەکان رێگـەیان بەسیاسـەتێکی دەرەکـی عێـراق نـەدەدا کـە دژی بەرژەوەندییـەکانیان بێـت . لەراستیدا ئەم کۆت و بەندانە هۆکار بوون بۆ نائومێدی و کێشـەی گەورەشـی بۆ حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق دروستکرد.

لـە بـەرەی نـاوەخۆش لایـەنگرانی بیرۆکـە جیاجیاکـان لـەبارەی عێـراق هـیچ ئاستەنگێکیان لە رازیبوون بەرۆڵی فاشیستانە وەکو بنەما بۆ دەوڵـەت نەدۆزیـەوە سەبارەت بە نەتەوە پەرستەکان ـ چ عێراقی بن یـان عـەرەب ـ کـاری پێکهێنـانی نەتـەوە زۆر مەترسـیدار بـوو تـاکو رێگـە بـدەن بـە دابەشـبوون تـا بکەوێتـە نێـو

پرۆسەی دیموکراتی، بەلام سەبارەت بە رەخنە توند رەوەکان لە سستەمی کۆمەلایەتی مومکین نیە ئەو هێزە رەگ داکوتاوەی لای دەستە بژێرەکان لە خاوەن زەوی و زارەکان لە ناوببرێت تەنیا بە جولەیەکی بە هێزی حکومەت نەبێت ، دواتریش لە هەردوو حالەتدا هەردوو گروپەکە کۆك بوون لەسەر پێویستی بە هێزکردنی دەولەت یەکەمجار بۆ پاراستنی ئەو سستەمەی کە هەیەو راهێنانی کۆمەلگەیەك کە بەیاخیبوون ناسراوە لەسەر بەهاکانی ناسنامەی نیشتیمانی و ریفۆرمکردنی هەرکاتێك کە پێویست بوو بە شێوەیەك راو بۆچوونی لەبارەی رێکاری کۆمەلایەتیەوە بگونجێت ، دووەمیش تا رۆلی هۆکارێك بگێرێت بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو کۆمەلگایەو دامالینی ئەو دەستە بژێرەی کە تا ئێستا رێگرە لەبەردەم پێشکەوتن لە سوودمەندییەکانیان .

## ناسنامە تایەفیەکان و پشێویە هۆزگەرییەکان

مەلیك فەیسەلێ لەسەرەتای قۆناغە نوێیەکەدا هەولی پێکهێنانی حکومەتێکی پتر تەوافوقی لە حکوماتەکانی پێشتردا ، داواشی لە نوری سەعید کرد دەست لەکار بکێشێتەوەو ناجی شەوکەتی کە تارادەیەك بێلایەن بوو کردە سەرۆك وەزیران لەشوباتی سالی ١٩٣٣دا پەرلەمانێکی نوێ هەلبژێردرا کەزۆربەی زۆری بەناو لایەنگرانی حکومەتی لە خۆگرتبوو (کەزۆربەیان پیاوی نووری بوون) بەلام ژمارەیەکی گرنگیشی لە لایەنگرانی حزبی برایەتی لە خۆ گرتبوو، لەماوەی مانگێکدا هێرشەکانیان بۆ سەر شەوکەت وایکرد دەست لەکار بکێشێتەوە بەهۆی ئەوەش مەلیك بەدوای رەشید عالی گەیلانی نارد(کەسەرۆکی دیوانی مەلەکی و لەهەمان کاتدا یەك لەسەرکردەکانی حزبی برایەتی بوو) حکومەتێك پێك بێنێ کەنوێنەرایەتیەکی چاکی حزبی برایەتی تێدابێت سەرباری خەلکی دیکەش لەوانە نوری سەعید ، لەراستیدا پێدانی وەزارەتەکان بە سەرانی حزبی برایەتی هاندانێك بوو بۆیان کە بە رێکەوتنامەی سالی ١٩٣٠ کەپێشتر رەتیان دەکردەوە رازیبن

ئەمەش بووە هۆی ناکۆکی لەگەڵ جەعفەر ئەبو لتمەن و دابەش بوون لەریزەکانی خودی حزبی برایەتیدا کەبووە هۆی نەمانی حزبەکە لە دوای چەند سالێکدا.

لەراستیدا دوورخستنەوەی ئەبولتمەن و لایەنگرە هەمەجۆرەکانی بەتایبەتیش پەیوەندیەکانی بەشیعەکان سروشتی سوننی دەوڵەتی پتەوترکرد دوای ئەوەی کە عەرەبە سوونەکان ئەو وەزارەتانەیان وەرگرت لەسەر حیسابی ئەوانەی کە پێشتر هاوپەیمانیان بوون ، مەلیکیش درکی بەو واقیعە کردبوو بەلاَم نەیدەویست گۆرانکاریەکی بنەرەتی تێدا ئەنجام بدات لەبەر پاراستنی پلەوپایەی خۆی ، هەربۆیە کاتێك کە فەرمانبەرێکی حکومەت لەسەرەتاکانی١٩٣٣ پەرتوکێکی بلاَوکردەوە تیایدا هێرشی کردە سەر شیعەکان و بەوە تاوانباری کردن کە وەلایان بۆ دەوڵەت نیەو لەسەرجەم ناوچەکانی زۆربە شیعە نشیندا خۆ نیشاندانی نارەزایی روویدا مەلیك چەند هەنگاوێکی بۆ رازیکردنی هەستی تایەفی نا بەلاَم نەبوونی هاوسەنگی ژێرخانی وەکو خۆی مایەوە چونکە کەس لە وانەی لەسەر دەسەلاَت بوون ئامادە نەبوون سیاسەتێك بگرنەبەر کە ببێتە هۆی لەدەستدانی پۆستەکانیان .

لەراستیدا ئەو پشێویانەی کەلەناوچە شیعە نشینەکان روویاندا بووە هۆشداریەك بۆ پرۆسەی تێکهەڵکێشانی داهاتوو و چۆنیەتی بەرێوەبردنی عێراق. رووداوەکانی هاوینی ١٩٣٣ کە کۆمەڵگەی ئاشوری گرتەوە هەربەهەمان شێوە بوو ، ئاشورییەکان کە شکستیان هێنا لەرازیکردنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەدانانان بەمافی سەربەخۆیی ،مەترسیەکانیان لەدوارۆژ هانیدان بۆ بیرکردنەوە لەدروستکردنی هەرێمێکی سەربەخۆ لەباکووری ولاَتدا کە ئەگەر پێویست بکات هێز بەکاربێنن بۆ دامەزراندنی . لەمانگی ئایاری١٩٣٣ مارشەمعونی پێشەوای ئاشوریەکان بەمەبەستی وتوویژ چووە بەغدا بەلاَم کاتێك کە وتوویژەکان وەستان حکومەت دەستگیری کرد و ئەم رووداوەش ترسێکی گەورەی لەنێو ئاشوریەکاندا نایەوەو ژمارەیەکی زۆری چەکدارانیش لەمانگی تەممورزدا هەولّی پەرینەوەیاندا بۆ سوریا بەو هیوایەی کەکۆمەلگاکەیان پەناگەیەك لەوێ بدۆزێتەوە بەلاَم کاتێك کە

دەسەلأتدارێتی فەرەنسا ناچاری کردن بەزۆر بگەرێنەوە هەندێك لەفرقەکانی سوپای عێراق لەرێگای گەرانەوەیاندا هەولّی چەککردنیانی داو رووبەرووبوونەوە لە نێوان هەردوو لادا روویداو دەیان سەربازی عێراقی و ئاشورییەکان بوونە قوربانی .

ئەو رووداوە هەریەك لە جیهانی سیاسی لە بەغداو ئەو هێزە عێراقیەی کەلە شوێنی رووداوەکەدا بوو بەسەرکردایەتی کۆلۆنێل بەکرسدقی فەرماندەی ناوچەی باکوور هانداو لە رۆژنامەگەری عێراقیدا ئاشوریەکان بە سەرچاوەی هەرەشە بۆ یەکێتی نیشتمانیی عێراق سەرەرای بچوکی قەوارەی کۆمەلّگەکەیان ، هەروەها بەشێك لە پلانێکی بەریتانیای مەزن ناوبردران . هەرچەندە ئەو وەسفکردنە دووربێت لەراستی بەلأم بەشداریکردنی ئاشوریەکان لە هێزە موجەنەدە عێرقیەکەو رۆلّی بەردەوامیان لەپاراستنی هەردوو بنکەکەی بەریتانیا ئەم بۆچوونەی پتەوترکردو فەرمان بە بەکرسدقی درا کە بەتووندترین شێوە کەدەیەوێت مامەلّەیان لەگەلّدابکات بەم جۆرە هێزە چەکدارەکانی عێراق لە ئابی سالّی ١٩٣٣دا هەلّسا بە کوشتنی سەدان لەگوند نشینە ئاشوریەکان بەهاوبەشی لەگەلّ هۆزە کوردیەکان کەلەهەمان کاتدا ئەو هەلّەیان قۆستەوە بۆ تالأنکردنی دەیان گوندی ئاشورییەکان .

لەناوبردنی (هەرەشەی) ئاشوریەکان بەسەر کەوتنێکی گەورەی سوپای عێراق و خودی بەکرسدقی کە پلەیەکی دیکەو نمایشێکی سەربازیی بۆ ئاهەنگ گێران بەسەرکەوتن لە بەغدا پێبەخشرا . ئەمە سەبارەت بەهەندێك کەس سەرەتایەکی پر ئێش و ژان بوو بۆ بوونی عێراق وەکو دەولّەتێکی سەربەخۆ بۆ هەندێکی دیکەش سەرکەوتنێکی دەولّەتی نویّ بوو بەسەر ئەوانەی هەرەشەیان لەیەکێتی ولأت کردبوو لەهەمان کاتیشدا لەناوبردنی گۆمەلگایەك بوو کەبەمامەلّەکردن لەگەلّ بەریتانیای مەزن ناسرابوو ، جگە لەمەش وەك پاساوێك بۆ کارەکەی سوپای عێراق بەکارهێنراو پێگەی وەکو (رزگارکەر)ی ولأت بەرزترکردەوە . ستایش کردن بەکرسدقی هاندا بۆ بیرکردنەوە لە رۆلّی دوارۆژی سوپا نەك تەنها بۆ بەرگریکردن

لەولآت دژی دوژمنانی دەرەکی بەڵکو لە لێکترازانی ناوخۆییش ، وەکو فەرماندەی ناوچەی باشوریش لەماوەی دووساڵی داهاتوودا بەکر سدقی ئەو رۆڵەی گێرا کاتێك کە رووبەرووی شۆرشە یەك لەدوای یەکەکانی فوراتی بۆوە .

دوای ئەم رووداوانە تەندروستی مەلیك فەیسەڵ تێکچوو و لە ئەیلولی ١٩٣٣دا بەمەبەستی چارەسەری چووە سویسراو دوای هەفتەیەك لەگەیشتنی گیانی لەدەست دا غازی کوری کە گەنجێکی بیست و یەك ساڵە بوو شوێنی گرتەوە مەلیك غازی ئەوەندە گرنگی نەدەدا بە جیهانی سیاسەت بەلآم بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ پرسە عەرەبیەکاندا هاوسۆزبوو هەروەکو زۆربەی عێراقیەکانیش لە باڵکێشانی بەریتانیا بەسەر عێراقدا نارازیبوو ئەم هەستەشی لە سەرەتادا لە ئەندامانی حزبی برایەتی نزیکی کردەوە ، هەرچەندە دواتر بازنەی تایبەت بەکەسانی نزیك لەخۆی دروستکرد بەپشت بەستن بە هەوەسی کەسایەتی خۆی و بێئەوەی کاریگەری باوکی بەسەرەوە بێت ، لەگەڵ ئەوەش ئەو هەستیارییەی کەباوکی هەیبوو بەرامبەر بە هێزە کاراکان لەکۆمەڵگای عێراقیدا و لەهەمانکاتدا زیرەکیشی لە راکێشانیان بۆ نێو بازنەکانی لایەنگرانی مەلەکیەت ئەو هەستیاریەی نەبوو.

غازی دەرەنجامی سستەمێك بوو کە هاوکار بوو لە زێدەکردنی نارەزایی شیعە بەرامبەر دەوڵەتێك کە سوننە باڵی بەسەر داکێشا لەساڵانی کەمی کەدادێ ، ئەم هەستەش چەند شێوازێکی وەرگرت لەنێو ناوەندی دەسەلآتدا ئەو نارەزاییە خۆی لە دەست لەکارکێشانەوەی دوو وەزیری شیعە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٣٣دا دیتەوە کاتێك کە حکومەت بریاری دا ئەو پارانەی بۆ دروستکردنی بەنداوی غەرافە تەرخانکراوە بدرێتە سوپا ئەمەش سەبارەت بەو دوو وەزیرە مانای بایەخ نەدان بوو بە کۆمەڵگەی زۆرینە شیعە کە سوودیان لەو بەنداوە وەردەگرت لەبەرامبەردا زیادکردنی هێزە چەکدارەکان لەرێگای ناونوسکردنی ئیلزامی کە هەنگاوێك بوو رووبەرووی نارەزاییەکی زۆر بۆوە لەناوچە شیعە نشینەکاندا لەباشووری عێراق .

جەمیل مەدفەعی (کە لەپایزی ساڵی ١٩٣٣دا شوێنی گەیلانی لە سەرۆکایەتی وەزیران گرتەوە) پرۆژە یاسای بەرگری نیشتمانی خستە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران و لەشوباتی ساڵی ١٩٣٤دا پەسند کرا بەمەش ڕێگە لەبەردەم سەپاندنی ناونوسکردنی ئیلزامی و زێدەبوونێکی خێرای ژمارەی هێزە چەکدارەکان کرا ، ئەم پرۆژەیەش لای عەرەبە سونەکان و ئەوانەی داوای مەرکەزییەتی دەوڵەتیان دەکرد زۆر خۆشە ویست بوو بەڵام زۆر لە شیعەو کوردەکان بەچاوی گومان و نارەزاییەوە تەماشایان دەکرد. لەمانگی ئابیشدا عەلی جەودەت شوێنی مەدفەعی گرتەوە و مەلیکی بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان ڕازیکرد.لەکانوونی دووەمی ١٩٣٥دا پشێوی لەناوچەی ناوەڕاستی فورات سەری هەڵدا کە پێشتر کۆبونەوەیەك لە نێوان دیارترین سەرۆك هۆزە شیعەکان و ئایەتوڵلامحەمەد کاشیفولغیتاءلەنەجەف بەسترابوو و تێیدا داواکاریەکانی شیعە تاوتوکرابوو لەئاداری ١٩٣٥دا یاداشتنامەی گەل کە خەمەکانی زۆربەی چینەکانی گەلی لەخۆگرتبوو درایە حکومەتی عەلی جەودەت کەوا ئەو چینانەی گەل واهەستیان دەکرد لەلایەن ئەو حکومەتەوە فەرامۆشکراون ئەو خەڵکە دەوڵەتی عێراقیان قبوولّ بوو بەڵام جەختیان کردبووە سەر نەبوونی نوێنەرایەتی شیعە لەپەرلەمان و دەسەڵاتی دادوەریدا هەروەها داوای هەڵبژاردنێکی ئازادی ڕۆژنامەگەری و کەمکردنەوەی باجیان دەکرد . هاوکات سەرۆك هۆزەکان لەیاداشتنامەیەکدا داوایان لەمەلیك کرد عەلی جەودەت لادات و پەرلەمانیش هەڵوەشێنێتەوە بەڵام کە ئەمە نەکرا حیکمەت سلێمان یەك لە ڕکابەرانی سەرۆك وەزیران و یەك لەسەرکردەکانی حزبی برایەتی هانی بەکرسدقی کۆنە دۆستی خۆیی و(فەرماندەی ناوچەی باشوور)ی هاندا سەرکوت کردنی پشێویە هۆزگەرییەکان ڕەتکاتەوە ،لەبەرامبەر ئەوەو ئەوناکۆکیانەی وەزارەتی کردە دوو لەتەوە عەلی جەودەت دەستی لەکار کێشایەوەو جەمیل مەدفەعی کەلەدوای ئەو هات ڕووبەڕووی یاخی بوونێکی فراوان لەدیوانیە بۆوە کەدوو سەرۆك هۆز سەرکردایەتیان دەکرد پەیوەندیەکی بەهێزیان بەیاسین هاشمی لەحزبی برایەتی هەبوو و کاتێك کە تەهاهاشمی سوپاسالارو برای یاسین

سەرکوت کردنی شۆرشەکەی رەتکردەوە مەدفەعی گومانی لەبوونی کودەتایەك پەیدا کردوو دەستی لەکارکێشایەوە ،مەلیك یاسین هاشمی راسپارد و لەئلداری ١٩٣٥دا حکومەتێکی پێك هێنا کەبەکردەیی کودەتایەك بوو دژی رکابەرانی ئەنجامیدا .

لەماوەی یەك هەفتەدا یاخیبوونەکە سەرکوتکرا،دوای ئەوە دوو لەو سەرۆك هۆزانەی کە سەرکردایەتی یاخیبوونەکەیان دەکرد بەخۆیان و ژمارەیەکی زۆر چەکدار لەسالّی ١٩٣٥دا هاتنە بەغدا بۆ پێدانی یاداشتنامەیەك بۆ مەلیك و بیرهێنانەوەی هاشمی کە دەسەلأتیان چەندە زۆرە ، ئەم رووداوانە هەلێك بوو بۆ دەسەلأتدارانی سوننە کە هۆزە شیعەکان و پیاوانی ئایینی و شێخەکانی سەربەو هۆزانە وادەربخەن کەتەگەرەنە لەبەردەم پرۆسەی بنیاتنانی دەولّەتی نوێدا .دەستگیرکردنی یەك لە دیارترین لایەنگرانی محەمەد کاشیفولغیتاء لەمانگی ئایاردا بووە هۆی نانەوەی پشێوی لە باشوور ناوەراستی فوراتداو بەکرسدقی یاسای عورفی لەدیوانیە راگەیاندو تەواوی هێزی ئاسمانی تازە دامەزراوی عێراق و سوپای دژی هۆزەکان بەکارهێناو توانی بە ئاسانی سەرکوتیان بکات و لەئایاری ١٩٣٥دا شۆرشی لەناوبرد .سەرەرای سەرهەلّدانی پشێوی ناوەناوە لەناوچە جۆراوجۆرەکاندا بەلأم نەبوونە هەرەشەیەکی راستەوخۆی ئەو تۆ نەبوون بۆ سەر دەولّەت ، سەرەرای ئەوەی ناوەناوە داواکاریەکانی شیعەکان لەگوندەکان بەرز دەبۆوە وبەگشتیش لە چوارچێوەی بانگەوازێکی تایەفی هاندەر بوو بۆدانانی سنورێك بۆ حوکمی بەزۆری سوننەکان بەلأم ئەم کارە دروستکراوی دەستی شیعە رۆشنبیرە شارستانەکان بە موتەدەیین و عەلمانیەکان بوو .ئەم سکالایانەش دەرەنجامی کەم وکورتیەك بوو کەلە هاوسەنگی تایەفی نێوکرۆکی کۆمەلّگەی عێراقیدا هەبوو چونکە هەستکردنی شیعەکان بەوەی کەنەك تەنها ژمارەیان لە عەرەبی سوننە زیاترە بەلّکو زۆربەی دانیشتوانی عێراق بەگشتی پێك دەهێنن ، هاندەر بوو بۆ چالأك وانەکانیان ، زانایانی ئایینی شیعە بەلای فشارخستنە سەر حکومەتەوە بوون بۆ وەدەستهێنانی نوێنەرایەتیەکی تایەفی باشتر کەلەگەلّ

قـەوارەی تایەفـەی شـیعە بگونجێـت لەکاتێکـدا کـە زۆربـەی عەلمانیـەکان لـەو بروایـەدابوون کـە بـەدیهێنانی ئەمـە تـەنیا لـەرێگای جێبـەجێکردنێکی باشـتری بنـەماکانی دیموکراسـی لـە عێراقـدا. سـەبارەت بـە شـیعە عەلمانیـەککانیش لەشارەکاندا ئـەوا ئـەم کـارە رێگـەیان پێدەدات لـە دەسـتەبالأیی تایـەفی توێـژی ئایینی رزگارین، بەلأم لەبەرامبەردا ناکۆکی نایەوە لە نێوان زۆر لەو شـێخانەی کـە کۆنترۆڵی ژیانی زۆربەی زۆری شیعەکانیان لە عێراقدا کردبوو .

## رەخنەی کۆمەلأیەتی و پیلانگێری سیاسی

لـەم ماوەیـەدا جـۆرێکی دیکـەی هەماهـەنگی لەبەغـدا دەسـتی بەدەرکـەوتن کـرد کـەخۆی لـەگروپێك لـە رۆشـنبیرو پیشـەییەکاندا دیتـەوە کـە دەرکـەوتنیان بـە دەرکردنی رۆژنامەی ئەهالی لەساڵی١٩٣٢ بەسترایەوە. هەریەك لەوانە باگراونـدێکی هەمەرەنگی هەبوو بەلأم سەرجەمیان گەنج بوون و لەبیستەکانی تەمەنیان دابـوون و دژایەتی ئەو گروپ و حزبانەیان دەکرد کەلەدەوڵەتی عێراق دروست ببوون و لـەو شـێوازەش کـە دەسـەلأتداران هەڵبـژاردنیان بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیـان بـەرێوەبرد نـارازیبوون ،ئەوانـە کەبـە گروپـی ئـەهالی ناسـرابوون لەوبروایـەدابوون کەزۆربـەی ئاسـتەنگە دارایـی و کێشـەکۆنەلأیەتیەکانی رەگ داکوتـاو لـە عێـراق لـە ئەسـتۆی گـەورە مەللاکەکانـەو ئەوانـە وایـان کـردووە کـە بەرژەوەنـدی تایبـەتی خۆیـان لەسـەرووی کارەکـانی دەوڵـەت بـێ بـەهۆی سـووربوونیان لەسـەر فراوانکردنـی موڵکەکانیان و زێەترکردنی داهاتەکانیان جا ئەوانە چ سەرۆك هـۆزبن لەگونـدەکان یاخود فەرمانبەرانی دەوڵەت یان بازرگان بن لەشارەکاندا بۆیە لەسـاڵی١٩٣١دا زۆر بەتووندی پشـتگیریان لـە سـەپاندنی بـاجی بـەکاربردن کـرد ،هـەروەها لەسـاڵی ١٩٣٢دا قەڵـەمرەوی ئەوانـە رۆڵـی سـەرەکی هـەبوو لـەوەی کـە یاسـای چارەسـەرکردنی خاوەندارێـەتی زەوی هـیچ یـەك لـە راسـپاردەکانی داوسـۆن

پەیوەست بە کرێ یە ماوە کورتەکانی حکومەت و دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیارە بچوکەکان لەخۆبگرێت دواتر ئەم یاسایە بووە ئامرازێکی سەرەکی دەستی حکومەت بۆ بەخشینی مافەکان بە تاکەکان کەزۆربەیان پەیوەندیان بەکەسانی خاوەن پۆستە گرنگەکانەوە هەبوو و لەساڵی١٩٣٣دا قەڵەمرەوی دەربەگەکان زۆر بەرزی لەویاسایەدا دەردەکەوت کەئەرك و مافی جوتیارانی رێکدەخست و لەبەرژەوەندی دەرەبەگەکان بوو کە جوتیارانیان بەهۆکاری کەمی بەرهەم دادەناو هەردەم لەژێر هەرەشەی دەرکردن دابوون و زۆری قەرزەکان و قەرزاری وایکرد زۆر لە جوتیاران رابکەن و لەدەوروبەری بەغدا ژیانێکی کولەمەرگی بەسەربەرن ، بۆیە شتێکی سەیر نیە کەلەو رەوشەدا شەپۆلێك لە رەخنەی کۆمەڵایەتی لەو بارودۆخە دەرکەوێت .

لەودەنگانەی کەلەو ماوەیەدا بەرزبوونەوە هەردوو دەنگی عەبدولفەتاح ئیبراهیمی مارکسی و مەحەمەد حەدیدی خاوەن مەیلێکی دیموکراتی کۆمەڵایەتی ،دامەزراندنی یانەی بەغدا لەکۆتاییەکانی ساڵی١٩٣٣دا زیاتر هانی چەندو چوونی سیاسیداو خەڵکانێکی خاوەن باگراوندی هەمەرەنگی بۆلای خۆی راکێشا هەندێکیان سەربە فیدرالیەتی کرێکارانی عێراق بوون کە مەحەمەد ساڵح قەزاز دایمەزراندو مان گرتنێکی لەبەغدا لەکۆمپانیای ووزەی کارەبا کە موڵکی بەریتانیا بوو لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٣٣دا رێکخست و حکومەت سەرکوتی کردن و بەهۆی ئەوەش زۆر کەس بەرەو ناوەندەکانی گروپی ئەلئەهالی رۆیشتن کەلەنێویاندا جەعفەر ئەبولتمەن هەبوو کەحزبەکەی لەرووخاندابوو ، هاوکات هەندێك لەئەندامانی پێشووی حزبی برایەتی وەکو کامل جادرجی و حیکمەت سلێمان چوونە نێو ئەو گروپە کەبوارێك بوو بۆ رەخنەگرتنیان لەو رەوشەی کەهەبوو .

بانگەوازی چاکسازی کۆمەڵایەتی ئابووری گومانی لای زۆران دروستکرد کە گروپی ئەهالی بەرەیەکن بۆ بلاوکردنەوەی هزری شیوعیەت بەلأم لەراستیدا شیوعیەکانی عێراق رێگایەکی جوودایان گرتەبەروو لەئاياری ساڵی ١٩٣٥دا یەکەم دەستەی ناوەندیی حزبی شیوعی عێراقی پێکهێنرا ، بەلأم بەکۆتایی ئەو ساڵە زۆر

لەئەندامانی دەستگیرکران و رۆژنامەکەشیان داخرا،بەلآم ئەمە نەیتوانی رێگە لەگەیشتنی هزری شوعیەت بەگروپی ئەهالی بگرێت ، کەبووە هەرەشەیەك بۆسەر ئەو سستەمە کۆمەلآیەتیەی کەهەبوو هەروەها بۆسەر ئیسلامیش بەهەردوو تایەفەی سوننەو شیعەوە ئەم مەترسیانە رێگەی لەبەردەم نەتەوە پەرستە عەرەبەکان خۆشکرد تالەسالی ١٩٣٥دا دەست بەسەر یانەی بەغدا بگرن ، لەسایەی ئەم رەوشەدا گروپەکە دەستی بەخۆ رێکخستن کردوو دەستەیەکی ناوەندیی پێکهێنا کە جەعفەر ئەبولتمەن و کامل جادرجی(ئەم نازناوەش لە دروستکردنی چادرەوە هاتووە کەپیشەی خانەوادەکەی بوو هاتووە) و حیکمەت سلێمانی لەخۆگرتبوو و پەیوەندیەکانی حیکمەت سلێمان و ژەنەرال بەکرسدقی رۆلێکی یەك لاکەرەوەی لە دارشتنی رۆلی سیاسی گروپەکەدا هەبوو کە بووە هۆی کودەتاکەی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٣٦ کە حکومەتەکەی یاسین هاشمی رووخاند .

لەثابی سالی ١٩٣٥دا شۆرشێك لەناوچە کوردییەکانی باکووردا روویدا کە هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ رق وکینەو نەبوونی متمانە لەنێوان هۆزە کوردییەکاندا بەلآم ترس لە ناونووسکردنی ئیلزامیش رۆلی خۆی هەبوو و سوپای عێراق تا مانگی ئاداری سالی ١٩٣٦ ئینجا توانی شۆرشەکە سەرکوتکات گومان لەوەدا نیە کەترس لە ناونووسکردنی ئیلزامی هۆکاری شۆرشی کوردە ئێزیدیەکان بوو لەچیای شنگالدا کاتێك کە حکومەت بەخشینی بەکۆمەلی ئێزیدیەکانی لە ناونووسکردنی ئیلزامی رەتکردەوەو ئەوانیش چوونە ریزی سوپایان رەتکردەوە، ئەمەش بووە هۆی راگەیاندنی یاسای عورفی لەناوچەکەداو سەرهەلدانی شەر لە تشرینی یەکەمی سالی١٩٣٥دا کەبەسەرکەوتنی هێزەکانی حکومەت کۆتایی هات ، شەرەکە بووە هۆی کوژران و دەستگیرکردنی سەدان ئێزیدی و خاپوور بوونی ژمارەیەك گوند . بەلآم سەرکەوتنەکەی حکومەت سەرکەوتنێکی بۆشبوو چونکە ئێزیدیەکان بەردەوام بوون لەراکردن لەناونووسکردنی ئیلزامی و کاتێکیش کە حکومەت فشاری بۆ دەهێنان یان بەهێز بەرهەلستیان دەکرد یان زۆر بە ئاسانی

لەرێگەی سنورەوە بەرەو سوریا کۆچیان دەکرد . لەباشوری عێراقیش هەندێ لە هۆزە شیعەکانی باشووری فوراتیش دژی یاسای ناونووسکردنی ئیلزامی یاخیبوون بەلاَم هاشمی ئەم جارە زۆر بەتووندی بەر پەرچی دانەوە .

سەرەرای توونـدی حکومەت لەبەر پەرچدانەوەی هۆزەکان بەلاَم ئەو هۆزانە کەدەیانویست حکومەت گوێ لەداواکاریەکانیان بگرێت دەستیان بە یاخیبوون دەکردەوە هەربۆیە لەساڵی١٩٣٦دا یاخیبوونێك لەناوچەی غەرراف روویداو بەرپەرچ درایەوە بەلاَم دوای ماوەیەکی کەم یاخیبوونێکی مەترسیدارتر لەنزیك رووميێسە رووبدا ، لەمانگی حوزەیرانیش یاخیبوونێکی دیکە لە نزیك دیوانیە روویدا .

لەبەغدا مەیلە دیکتاتۆریەکانی یاسین هاشمی لەساڵی ١٩٣٦دا پتر دەرکەوت و چەندین مەرسومی دەرکردو دەزگاکانی موخابەرات و پۆلیسی پەرەپێداو بەهێز وەلاَمی هەر رەخنەیەك چ لەبەغدا یان لەهەرێمەکان دایەوە کە ئاراستەی حکومەتەکەی کرا ، بەهۆی کاریگەری نەتەوە پەرستە عەرەبەکانیش لەوەزارەتی پەروەردە مەشقی سەربازیی ئیلزامی بەسەر قوتابخانەکاندا سەپاند هاوکات زۆر بەتووندی هەرهێمایەکی شۆرشی لە هەرێمەکاندا لەناو دەبردو چەندین رۆژنامەش کە رەخنەیان دەگرت وەکو رۆژنامەی ئەلئەهالی داخست و هەوڵی سەرکوت کردنی بەرهەڵستکاری جەماوەری لە خوودی بەغدادا . واپێدەچوو کەیاسین هاشمی لە هەوڵی سەپاندنی خۆیدایە وەکو دیکتاتۆر بەسەر وولاَتدا و زۆر کەسی دوورخستەوە لەوانە مەلیکیش کەلە خەونەکانی هاشمی نیگەران بوو لەوەش مەترسیدارتر دوورخستنەوەی بەکر سدقی بوو لەلایەن هاشمیەوە کەوایکرد سدقی بەسۆزەوە گوێ لە پلانەکانی حیکمەت سلێمان بگرێت کەمەبەستەکەی رووخاندنی حکومەتەکەی یاسین هاشمی بوو.

# کودەتاکەی ساڵی ١٩٣٦

لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٦دا تەها هاشمی بەسەردانێك چووە تورکیاو بەکرسدقی وەکو جێگری سەرۆکی ئەرکانی گشتی لەشوێنی خۆی دانا ، سدقیش بەهەماهەنگی لەگەڵ حیکمەت سلێمان و سەرکردەکانی گروپی ئەلئەهالی فەرمانی بەو یەکانەی سوپادا کەلەژێر دەستی دابوون بۆ بەرەو پێشچوون بەرەو بەغدا لەهەمانکاتدا چەندین بلاوکراوە لەپایتەختدا بلاوکرانەوە کەتیایدا راگەینرابوو سوپا داوای لە مەلیك کردووە یاسین هاشمی لە پۆستەکەی لابدات و حیکمەت سلێمان بەسەرۆك وەزیران دابمەزرێنێ ، لەهەمانکاتدا نامەیەك لەو بارەیەوە ئاراستەی مەلیك کرا کە واپێدەچێت پێشتر ئاگای لەکودەتاکە بووبێت بۆ رێگرتن لەهەر هەولێك بۆ روویەروبوونەوە . هێزە ئاسمانیەکانیش رەوشەکەیان مەترسیدارتر کرد لەرێگەی بەردانەوەی چەند بۆمبێك لەنزیك نوسینگەی سەرۆکی حکومەتدا کەیاسین هاشمی والێکرد پەلە لەبریاری دەست لەکار کێشانەوە بکات (ولاتی جێهێشت و ساڵی ١٩٣٧لەدەرەوە کۆچی کرد) لێرەدا مەلیك حیکمەت سلێمانی بە پێکهێنانی حکومەتی نوێ راسپارد . جەعفەر عەسکەری کەوەزیری بەرگری هاشمی بوو هەوڵیدا نامەیەك لە مەلیکەوە بگەیەنێتە سدقی کەتیایدا داوای لێدەکا هاتنی سوپا بەرەو بەغدا رابگرێ بەلام سدقی وایزانی ئەو نامەیە تەنیا فێڵێکە ئامانجەکەی لەناوبردنی کودەتاکەیە بۆیە فەرمانی بە ئەفسەرەکانی دا رێگە لەو سەربازە بگرن و بیکوژن . پرۆسەی کوشتنەکە کەیەکسەر جێبەجێکرا نەك هەروایکرد هاوپەیمانە سیاسیەکانی جەعفەر عەسکەری ببنە دوژمنی بەکر سدقی بەڵکو زۆر لەو ئەفسەرانەی کە چوونە ریزی سوپاو لایەنگری عەسکەری بوون بوونەدوژمنی سدقی .

ئیدارەکەی حیکمەت سلێمان پشتی بە هاوکارەکانی لەگروپی ئەهالی بەستبوو و حکومەتەکەی رێژەیەکی زیاتر لەهەموو حکومەتەکانی پێشووتر لە وەزیرە

شیعەکان لەخۆگرتبوو ، بەکر سدقی بووە سەرۆکی ئەرکانی گشتی سوپا و قەلەمڕەویی خۆیی بەسەر سیاسەتی حکومەتی نوێ لەبواری کاروباری دەرەوە سەپاند و هەروەکو خودی حیکمەت سلێمانیش هەوڵی هاندانی بنیاتنانی پەیوەندی پتەوتری لەگەل ئێران و بەتایبەتیش لەگەڵ تورکیا دەدا چونکە خۆی وسلێمانیش هەوەسێکی زۆریان بەهەرشتێك دەهات کەتورکی بێت .

سەربەخۆیی عێراق بوارێکی رەخساندبوو بۆ پتەوکردنی سیاسەتی دەرەوە بەلایەنی کەم ئەوی پەیوەستبوو بە ولاتە هەرێمیەکان بەلام لەگەڵ ئەوەش ئەستەم بوو بۆ عێراق سیاسەتێکی دەرەکی سەربەخۆ لەو ناوچەیە پەیرەوبکات بێئەوەی خۆی رووبەرووی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بەتایبەتی نەبینێتەوە هەرئەمەش هەرحکومەتێکی عێراقی لەبەردەم دوو رێگە چارە دادەنا یان پاشکۆیەتی یان یاخیبوون ، سەبارەت بەو سیاسەتمەدارانەش لەوێنەی حیکمەت سلێمان کەسۆزی کەم بوو بۆ هەستی عەرەبایەتی کە باڵی بەسەر ئەو دەستە بژێرەی لە حکومدابوون گرتبوو هۆی دیکە هەبوو بۆ گەران لە شوێنێکی دیکەدا لەپێناو دروستکردنی سیاسەتێکی دەرەکی عێراقی جیاواز ، بۆ دەرکەوتنی عێراق وەکو ولاتێکی هەرێمیی پێویستی بە هەندێك گرنگیدان بەسنورو دراوسێ بەهێزەکانی هەبوو لەراستیشدا دووپرسی گرنگ رووبەرووی هەر حکومەتێکی عێراقی بۆتەوە کە هەوڵی مسۆگەرکردنی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی عێراقی دابێت ،یەکەمیان پەیوەست بوو بە تاکەدەرچەی دەریایی عێراق لەرێگەی شەتولعەرەبەوە ، دووەمیشیان هەڵوێستی تورکیاو ئێران بووە لەبەرامبەر پرسی کورد دا بەتایبەتیش کەسنوری لاوازی عێراق و ئەوکێڵگە نەوتیانەی کە بەنوێتی لەناوچەکەدا دۆزرابوونەوە هەستی عێراقی بەلاوازیی لەمبارەیەوە زێدەترکردبوو .

لەبارەی مەسەلەی شەتولعەرەبەوە ئەوا رێکەوتنامەی ئەرزروم کەلەساڵی١٨٤٧بەستراو پرۆتۆکۆلی قوستەنتینیەی ساڵی١٩١٣و لێژنەی دیاریکردنی سنور لەساڵی ١٩١٤ سەرجەمیان کۆنترۆڵی عوسمانیەکانیان بەسەر هەموو ئەو رێرەوە ئاوییەدا تادەگاتە لێوارە ئاوییەکانی ئێران سەپاندبوو ،

ئەمەش ئەو سنووره بوو كەبۆ عێراق مابۆوه ، لەساڵی١٩٣٢ ئێران ئەو سنوورانەی رەتكردەوەو داوای چاوپێخشاندنەوه بەسنورەكانی نێوان خۆی و عێراقی كرد تا ئەو هێڵەی كەدرێژ دەبێتەوه تاقووڵترین خاڵ لە پانایی شەتولعەرەبدا بەلاّم عێراق ئەو داوایەی رەتكردەوەو گرژی لەنێوان هەردوو ولاّتدا سەری هەڵداو هەردوولا یەكتریان بەپشتگیریكردن یاخود دابینكردنی پەناگە بۆ شۆرشگێران تاوانبار دەكرد ، هەندێك جاریش پێكدادانی چەكدارانە لەسەر سنور لەگەڵ پۆلیسدا روویدەدا . لەساڵی١٩٣٤ حكومەتی عێراق ئەوكێشەیەی خستە بەردەم كۆمەڵەی نەتەوەكان و هەرچەندە كەسەركەوتووش نەبوو بەلاّم ئەمە بووە هۆی كردنەوەی دەرگای دانوستاندن لەساڵی ١٩٣٥ لەنێوان عێراق و ئێراندا ، بەلاّم حكومەتی عێراق ئەو چارەسەرییەی رەتكردەوە كەنوری سەعیدو شای ئێران پێیگەیشتن چونكە دەبووایە عێراق دەست لەبەشێك لەدەسەلاّتی خۆی بەسەر شەتولعەربدا بەربدات بەلاّم حكومەتەكەی سلێمان كە بەكرسدقی پاڵپشتی لێدەكرد پێیان وابوو دەبێت عێراق پەیوەندیەكی هێمنی لەگەڵ ئەو دراوسێیە بەهێزەی سەر سنوری رۆژهەلاّتی هەبێت ئەمەش بووە هۆی لەدایك بوونی رێكەوتنامەی سنووری ئێران–عێراق لەتەمموزی ١٩٣٧دا كە چارەسەری مەسەلەی سنوری كرد لەرێگەی دەستنیشانكردنی ئەو هێڵەی كەتا قووڵترین خاڵی نێو پانایی شەتولعەرەبدا درێژدەبێتەوە تا چوار میل لەنزیك بەندەری عەبادانی ئێرانی بەلاّم رێكەوتنامەكە سەروەری عێراقی بەسەر رێرەوە ئاوییەكەدا تالێوارە ئاوییەكەی ئێران پەسند كرد

سەرەرای نارەزایی كەلەدژی ئەو رێكەوتنامەیە بەرپابوو بەلاّم رێكەوتنامەكە رێگە خۆشكەر بوو لەبەردەم میساقی سەعەد ئاباد دا كەعێراق ، ئێران ، توركیاو ئەفغانستانی لە خۆگرتبوو لەهاوپەیمانیەكدا كەرووە ئاشكراكەی رووبەروبوونەوەی قەڵەمرەوی یەكێتی سۆڤیەت بوو لەناوچەكەدا ، رەنگە ئەم رێكەوتنامەیە سەبارەت بەعێراق گرنگیەكی دیكەی هەبێت ئەویش ئارەزووی حكومەتی عێراق بوو بۆبنیاتنانی پەیوەندیەكی جێگیرو رێك و پێك نەك تەنیا

لەگەڵ ئێران بەڵکو لەگەڵ تورکیاش . راستە چارەسەرکردنی پرسی موسڵ لەساڵی ١٩٢٠ سنوری نێوان عێراق و تورکیای پەسند کرد بەلام نارەزایی تورکیای سەبارەت بە لەدەستدانی موسڵ نەدەشاردەوە بۆیە بۆ عێراقی تازە سەربەخۆ گرنگ بوو پەیوەندیەکی باش لەگەڵ تورکیا مسۆگەر بکات لەکاتێکدا کە بوونی برێکی زۆری نەوتی یەدەگ بەهای موسڵی زێدەتر کردبوو ، جگەلەوەی کە روون و ئاشکرابوو کەکوردەکان بەو رۆڵە لاوەکیە رازینەبوون کە لەبەغدا پێیاندرابوو .

خۆنیشاندانەکانی بەغداو بەسرە لەدژی رێکەوتننامەکەی ١٩٣٧ حکومەتی عێراقی بەوە تاوانبارکرد کەدەستبەرداری هەندێك لەخاکی عێراق بووەوخیانەتی لە عەرەبەکانی عەرەبستان/خوزستان کردووە و لەلایەن عەرەبە سوننەکانەوە رەخنەی لێدەگیرا بەوەی کە ئاراستەی سیاسەتی دەرەکی عێراق پەیوەندییەکان لەگەڵ جیهانی عەرەبیدا پشگوێ خستووە ، بەپێی ئەم لێکدانەوەیەش هەر جەختکردنەوەیەك لەناسنامەی عێراق وەکو ولاتێك پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ دراوسێ تورك و ئێرانیەکاندا هەبێت ناوی سیاسەتی (یەکەمجار عێراق )ی ناولێدەنرا ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ هەوڵەکان بۆ دروستکردنی هەستێك بەناسنامەی نیشتمانیی عێراق ، عێراقێکی سەربەخۆی دوور لە بالا دەستی نەتەوە عەرەبە نەتەوەپەرستەکان کەزۆربەیان سوننە بوون و دروستکردنی کەشێك لە لێك نزیك بوونەوەو پێکەوە ژیان لەنێوان زۆربەی عێراقیەکاندا لەعەرەب و غەیرە عەرەبیش ، ئەمەلەکاتێکدا کە شۆرشی عەرەبی لە فەڵەستین پرسێکی گەرم بوو سەبارەت بە عەرەبەکان لەعێراق و لەولاتانی دیکەشدا .

سیاسەتی یەکەمجار عێراق لەلایەن ئەوانەی کە بەلایەنگری سستەمی نوێ ناسرابوون پشتگیری لێدەکرا بەلام سەبارەت بەزۆران واپێویست بوو کە لەسەرەتادا جەخت بکرێتەوە سەر چاکسازی کۆمەلایەتی لەسەر ئەم بنەمایە خۆنیشاندانی پشتگیری لێکردن لەشارە جودا جوداکانی عێراق بۆ پێشوازیکردن لەحکومەتی نوێ ئەنجامدرا کەلەلایەن گروپە رادیکالییە جۆراو جۆرەکان و کۆمەڵە نافەرمی و نهێنیەکانی کرێکاران هەروەها حزبی شیوعی عێراقی تازە دروست بوو

ڕێكدەخرا كەسەرجەمیان هیوا خوازبوون ئامانجەكانیان بێتەدی ، لێرەدا كۆمەڵەی چاكسازی جەماوەریی دروست بوو كەداوای جێبەجێكردنی زیاتری بنەماكانی دیموكراتیەت و چاكسازی كشتوكاڵی دانانی یاسایەك بۆ بوونی سەندیكاكانی دەكرد سەرەرای كەمكردنەوەی كاتژمێرەكانی كاركردن لەرۆژێكدا و بەڵێنی دارشتنی بەرنامەیەكی بنەرەتیشیان بۆ پەرلەمانی نوێدا .

بەلاَم ئەم نیازانەیان ترسی لای زۆران دروستكرد و لەبەرامبەر پەرەسەندنی بەرهەڵستكاریشدا حیكمەت سلێمان رووی لەسەر كوتكردنی رۆژنامە دژەكان كردو پەرەی بەهەڵمەتی پاكسازی دا لەنێو ئەو فەرمانبەرانەی كە گومان لە پابەند بوونیان بەحكومەتەوە دەكرێت ، ئەو هەڵبژاردنە گشتیەش كەلەشوباتی ١٩٣٧دا ئەنجامدرا پەرلەمانێكی لێهاتەكایەوە كەزۆربەی كورسیەكانی بەر پاڵێوراوەكانی بەكر سدقی و پارێزگارەكان و سەرۆك هۆزەكان كەوت كەبۆنی شوعیەتیان لەكۆمەڵەی چاكسازی جەماوەریی كرد ، هەرچەندە سلێمان لەبەرنامەی حكومەتدا هەندێك بەڵێنی بەریفۆرمخوازان دا بەلاَم زۆربەیان جێبەجێنەكرا ، لەئاداری ساڵی ١٩٣٧دا بەكر سدقی بەئاشكرا هێرشی كردە سەر ریفۆرم خوازان و بەوەتاوانباری كردن كە بە نهێنی سەر بە شوعیەكانن و بانگەوازی تێكدانی سەرجەم بنەماكانی كۆمەڵگەی عێراقی و ژیانی سیاسی عێراقی دەكەن و سدقی لەوەش دڵنیا بوو كە هاوسۆزانی ریفۆرمخوازان لەنێو ئەفسەرانی سوپادا كەمن ، ئەو خۆنیشاندان و مان گرتنانەی كەلە ئادار و نیساندا لەلایەن ریفۆرمخوازاندا روویاندا لەلایەن حكومەتەوە سەركوتكران ، هاوكات بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ سەرۆك هۆزەكانی فوراتی ناوەراست كرا . لەئایاری ١٩٣٧دا سوپای عێراق رووی لەو ناوچەیەكردوو سەرانی یاخیبووانی لەسەرۆك هۆزەكان دەستگیركرد ، ئەمەش لەنێو حكومەتدا قەیرانێكی نایەوەو لە حوزەیرانی ١٩٣٧دا چوار وەزیر ئەوانیش جەعفەر ئەبولتمەن ، كامل جادرجی ، ساڵح جەبر و یوسف عزەدین دەستیان لەكار كێشایەوەو رەخنەیان لە حكومەت دەگرت بەهۆی پابەند نەبوونی بە

چاکسازیەکی راستەقینە ، ئەم دەست لەکار کێشانەوەیە هەڵێك بوو بۆ حیکمەت سلێمان کە بەیەکجاری لە ریفۆرمخوزان جودابێتەوە .

لەم قۆناغەدا لەنێو ریزەکانی هێزە چەکدارەکاندا نارەزایی بەرامبەر سیاسەتەکانی بەکر سدقی لەنزیکردنەوەی کەسانی نزیکی خۆی و مەحسوبیەت و مەنسوبیەت هاوکات بوو لەگەڵ نیگەرانیەکی گشتی سەبارەت بە پشتگوێ خستنی عروبە لەلایەن حکومەتەوەو پشتگوێخستنی ئەو (ئەرکانەی) کەپێویستە لەبەرامبەر نەتەوەی عەرەبیدا ئەنجامی بدات ، ئەم هەستانە هاندەرێك بوو بۆ دارشتنی پیلانێك لەریزی ئەفسەراندا بۆ تیرۆکردنی بەکر سدقی و لەمانگی ئابی ١٩٣٧دا ئەم هەلە رەخسا کاتێك کە بەکر سدقی لەرێگەی چوونی بۆ سەردانێکی تورکیا لەمووسڵ دابەزی لەگەڵ مەحەمەد عەلی جەوادی کەسی نزیك لەخۆی و فەرماندەی هێزە ئاسمانیەکانی عێراق لەفرۆکەخانەی مووسڵ تەقەیان لێکراو تیرۆرکران .

دوای تیرۆکردنی بەکر سدقی بەرهەڵستکارانی لەریزەکانی سوپادا تا ئاستێکی مەترسیدار پابەند بوونی سوپایان بۆ حکومەت لاوازکرد و کاتێك کە حیکمەت سلێمان فەرمانی دەستگیرکردنی ژمارەیەك لەکودەتا چیەکانی دەرکرد بۆ دادگایی کردنیان لەبەغدا ئەمین ئەلعومەری فەرماندەی ئۆردوگای موسڵ فەرمانەکەی جێبەجێنەکردو رایگەیاند کە فەرماندەیی باکووری سوپا لەمرۆ بەدواوە گوێرایەڵی فەرمانەکانی حکومەت نابێ کەئەمەش نیمچە هەرەشەیەك بوو بۆ دروست بوونی شەری ناوخۆیی لەوڵاتدا کاتێکیش کە فەرماندەی یەکێك لە بنکە سەربازیەکانی نزیك بەغدا پشتگیری خۆی بۆ عومەری راگەیاند حیکمەت سلێمان خۆی لە بەرامبەر بەشێکی بەرهەڵستکار لەسوپادا دۆزیەوەو بەربەرە ژمارەیەکی زۆری ئەفسەران پشتگیریان بۆ شۆرش رادەگەیاند و ئەمەش حیکمەت سلێمانی ناچارکرد لە ئابی ١٩٣٧دا دەست لەکار بکێشێتەوە .

# سیاسەتە سەربازییەکان : عروبەو کودەتاکانی سوپا

دەرکەوتنی حەوت سەربازەکە (حوسێن فەوزی ، ئەمین ئەلعومەری ، سەلاحەدین سەبباغ ، کامل شبیب ، عەزیز یاملکی و فەهمی سەعید) کە پلانی کوشتنی بەکر سدقیان دارشت وبوونە هۆی رووخاندنی حکومەتەکەی حیکمەت سلێمان عێراقی خستە قۆناغێك کەتیایدا هیچ سیاسەتمەدارێکی مەدەنی سەرۆکایەتی نەگرتەدەست ئەگەر بەرەزامەندی ئەوان نەبووایە ، لەراستیدا ئەوانە دەستیان بەکاروباری رۆژانەی حکومەت وەرنەدەدا و تەنیا لەکاتی دەرکەوتنی دوو پرسدا دەهاتنە پێش یەکەمیان هەڵوێستی حکومەت لە مەسەلەی عروبە کە دەربڕی دیدی ئەوان بوو بۆ ناسنامەی عێراق و ، ئەو ئەفسەرانە کە هەموویان عەرەبی سوننە بوون جۆرێك لە دووفاقی لە هەڵوێستیان بەرامبەر خودی دەوڵەتی عێراق هەبوو لەلایەك پێیان وا بوو کاتێك کە عەرەب سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرن و دەوڵەتێکی عەرەبی گەورە دروست دەبێت کە هەموو عەرەبەکان لە خۆ دەگرێت عێراق نامێنێت ، لەلایەکی دیکەوە ئەوانە ئەفسەر بوون لە هێزە چەکدارەکانی سەر بە دەوڵەتی عێراق کە لەزۆر رووەوە پەیوەست بوو بە بەریتانیای مەزن .

ئەم راوبۆچوونانەو تارادەیەك دووفاقیەکەشی دوای نەمانی داگیرکاری عوسمانیەکان روون و ئاشکرابوو و لەزۆر رووەوەش لە بۆچوونی عوسمانیەکان بەرامبەر ناسنامەی نشتیمانی و گرنگی سەرکردایەتیەکی دیکتاتۆریانەو رێککاری سەربازی لە کۆمەڵگایەکی رێکخراودا دەچوو ، ئەم بۆچوونەش لە بیستەکانی سەدەی بیستدا دوای دامەزراندنی ساتع حوسەری بەبەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی پەروەردە توندتر دەرکەوت ، حوسەری کەفەرمانبەرێکی پێشووی عوسمانیەکان بوو و خانەوادەکەی دوای رووخانی ئیدارەی شەریفیی لەدیمەشق ، لەحەلەبەوە هاتبووە عێراق بنەمای سستەمێکی پەروەردەیی زۆر ناوەندیی توندی دارشت و بەپشت بەستن بە لێکدانەوەیەکی عەلمانی بۆ نەتەوایەتی عەرەبی سستەمی خوێندن و پەرتووکوکانی قوتابخانەکانی دانا ، حوسەری هیچ گرنگیەکی بە

سروشتی تایبەتی تایەفەکان ئەدا کەلەعێراقدا بەدیکرد ، ئەمەش وایکرد کوردو شیعە بە چاووی گومانەوە سەیری بکەن و هەردوولا وەکو کەسایەتیەکی نمونەیی بۆ مەرکەزییەتی دەولەتێك کە لەژێر دەسەلاتی عەرەبە سوننەکاندایە بیناسن لەراستیشدا لەزۆر رووەوە هەروا بوو ، دواتر فازل جەمالی کە شیعەیەکی خەلکی کازمیە بوو شوێنی گرتەوەو سەرەرای ئەوەی کەبروای بەزۆر لە رایەکانی حوسەری هەبوو بەلام زۆر گۆرانکاریکرد لەوانە بروای بە دابەشکردنی داهاتەکان بەشێوەیەکی یەکسان بەسەر سەجەم هەرێمەکاندا هەبوو هەروەها داوای سستەمێکی پەروەردەیی کەمتر ناوەندیی دەکرد، لەراستیدا سەرەرای ئەوەی سستەمی پەروەردەیی جەمالی بروای بە بیرۆکەی نەتەوایەتی عەرەبی هەبوو بەلام هەستیاریش بوو بەرامبەر واقیعی جودای عێراق ، هەتا کوردەکانیش کەبەسروشتی خۆیان ئاراستەی نەتەوایەتی عەرەبی حکومەتیان رەتدەکردەوە تارادەیەکی زۆر سودیان لەو هەلانەدیت کە لامەرکەزیەت دابینی دەکرد .

لەهەمان کاتدا سستەمی پەروەردەیی شێوازێکی سەربازیی پۆشی بوو لەگەل هەولی بەردەوامی پیاوانی سیاسەت بۆ ئەوەی کە گەل فێری رێککاری و ملکەچی بکەن بەو هیوایەی کۆمەلگایەکی رێکخراو و ملکەچ لەگەلی عێراقی رەقەکار دروستبکات ، لەسالەکانی ١٩٣٠-١٩٣٦ مەشقی سەربازیی هێنرایە نێو قوتابخانەو پەیمانگاکانی راهێنانی مامۆستایان هەروەها بزوتنەوەی لاوانی نیمچە سەربازی لەسالی ١٩٣٩دروستکرا . لەلایەکی دیکەوە ، هاندەری دووەم کەوایکردبوو ئەو ئەفسەرانە گرنگی بەپرۆسەی سیاسی بدەن ترسیان لە پۆستەکانیان هەبوو ئەو ترسە نەك تەنیا لەسیاسەتمەدارەکان بەلکو لەهاوەلە ئەفسەرەکانی رکابەرەکانی خۆیان لە لەریزی سوپادا ،ئەمانە هەندێك لەو بابەتانە بوون کەلەو قۆناغەدا باوبوون کەئەو ئەفسەرانە لەپێگەکانی دەسەلاتدابوون ، سەرقالیی ئەو ئەفسەرانە بە کاروباری راستەوخۆی حزبیان و هەروەها سەرقالیان بە هەندێك لە مەسەلە بالاکانی دیکەی پەیوەست بە پێگەی عێراق لە جیهاندا رێگربوو لەگرنگیدانیان بە کۆمەلگەی عێراق و هیچ گۆرانکاریەکی ژێرخانیی گرنگ لەو ماوەیەدا روویندا ،

لەبری ئەوە پتەوکردنی دەوڵەت لەرێگەی ناونووسکردنی ئیلزامی بەزۆر و ئامرازی دیکە بەردەوام بوو هاوکات سەپاندنی بەرژەوەندییەکانی خاوەن زەویە کشتوکالیەکانیش بەردەوامبوو .

کاتێك کە حیکمت سلێمان دەستی لە کار کێشاوە مەلیك جەمیل مەدفەعی بۆپێکهێنانی حکومەتێك راسپارد بەلام مەدفەعی رازی نەبوو تاکو رەزامەندی ئەفسەرە شۆرشگێرەکانی مسۆگەرنەکرد، مەدفەعی هەولیدا سیاسەتی لێبووردەیی پەیرەو بکات و رەنگە ئەمەشی بۆ پاراستنی خۆی بوو بێت. هەڵبژاردن ئەنجامدرا، لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٧ پەرلەمانی نوێ کۆبۆوە، بەلام پێکهاتە گشتیەکەی زۆر نەگۆرا بوو جگە لە نەبوونی کاندیدەکانی بەکر سدقی و ریفۆرمخوازەکانی سەر بە کۆمەڵەی ئەهالی توندرەو بەلام . دەسەلاتی یەك لاکەرەوە بەدەستی ئەفسەرەکانەوە بوو. لە سەرەتادا مەدفەعی هەولی دا حەفت ئەفسەرە بەهێزەکەی سوپا کە خاوەنی بە هێزترین هەژموون بوون رازیبکات بەوەی کە پۆستی بالایان پێببەخشێت. بەلام ئەوان متمانەیان پێنەبوو.ئەمە سەرباری بوونی زۆرلەو سیاسەتمەدارانەی کە هەولی قۆستنەوەی ئەوبێ متمانەییەیان دەدا. لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٨ هەندێك هێز لە خیوەتگای رەشیدی نزیك بەغدا جێگیر بوون، و مەدفەعی ئاگادارکرایەوە کە ئامادەکاری بۆ کودەتایەك دەکرا و ئەویش یەکسەر دەستی لەکار کێشاوە. لێرەدا سوپا سالار بە مەلیکی راگەیاند کە سوپا بروای بە حکومەت نەماوەو بۆیە پێویستە داوا لە نوری سەعید یان تەها هاشمی بکات (کە هەردووکیان سەرقاڵی خۆنزیکردنەوە بوون لە ئەفسەرە پەیوەندارەکان) ئیدارەیەکی نوێ پێکبهێنێ. کاتێك مەلیك داوای لە نوری سعید کرد حکومەت پێك بهێنێ ،نوری دیتی کەدەسەلاتی ئەویش تارادەیەکی زۆر پشت بەتواناکانی بۆ وەدەستهێنانی رەزامەندی حەوت ئەفسەرەکە دەبەستێت و تارادەیەکیش توانای ئەوەی هەبوو بەهۆی راو بۆچوونە هاوبەشەکانیان لەبارەی مەسەلەی فەڵەستینەوە . چونکە لەماوەی ساڵانی کەمی رابردوودا نوری سەعید هەولێکی زۆری دابوو بۆ دروست کردنی رۆلێك بۆ عێراق و

لەرێگەی ئەوەشەوە بۆخۆی لەفەڵەستین . لە ساڵی ١٩٣٦ لەگەڵ راگەیاندنی مان گرتنی گشتی کە دەستەی باڵای عەرەبی لەفەڵەستین رێکی خستبوو نوری چەند هەوڵێکی سەرکەوتووانەی دا بۆ میانگیری لەسەرەتادا لەنێوان عەرەب و ئاژانسی جوولەکەکان و دواتریش لەنێوان دەستەی باڵاو دەسەلاتدارێتی بەریتانیا . ئامانجی ئاشکراشی لەوە هاندانی سەرجەم لایەنەکان بوو بۆ رێکەوتن لەسەر چارەسەریەك بۆکێشەی فەلەستین لەچوارچێوەی فیدرالیەتێکی عەرەبی کەلە ناوچەی کەوانەی بەپیت (الهلال الخصیب) دابمەزرێت و نەوەی هاشمیەکان سەرۆکایەتی بکەن . نوری زۆر هەولیدا ئەو بیرۆکەیە بلاوبکاتەوە سەردانی چەندین پایتەختی عەرەبیشی کردو رایگەیاند کە دەتوانێت ئاشتەوایی لەنێوان بەریتانیەکان و حاجی ئەمین حوسەینی سەرکردەی فەلەستینی بەدیبێنێت بەلام پێچەوانەی ئەوە روویدا ، بەلام ئەم ئاراستەیە هاریکار بوو لە خولقاندنی بۆ چونێك لە عێراق کە نوری سەعید لە هەموو سیاسەتمەدارەکانی قۆناغی خۆی زیاتر سوورە لەسەر خزمەتکردنی پرسی فەڵەستین . ئەمەش پێگەی لەلای ئەفسەرە عروبیەکانی نێو سوپای عێراق پتەوترکرد ، لەبەر ئەمە کاتێك کە نوری سەعید سەرۆکایەتی وەزیرانی گرتە دەست بەردەوام بوو لەرێرەوەکەی خۆی و هەربەخۆی سەرۆکایەتی شاندی عێراقی کرد لە کۆنگرەی لەندەن لەبارەی فەڵەستین لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٩دا کەتیایدا هەوڵی گەیشتنی بەرێکەوتنێکدا لەنێوان فەڵەستینیەکان و بەریتانیەکاندا ، هەرچەندە سەرکەوتووش نەبوو بەلام ئەم پابەند بوونەی هاوکاری کرد لەوەدەستهێنانی رەزامەندی بازنەی سەربە حەوت ئەفسەرەکە لەنێو سوپادا .

هەنگاوی داهاتوی نوری هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان وجێ بەجێ کردنی پلانێك بوو بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی گشتی، لە ئاداری ساڵی ١٩٣٩دا ئیدعای ئەوەی کرد کەبە کودەتایەکی زانیوە بۆ تیرۆرکردنی مەلیك غازی و ژمارەیەك لەسیاسەتمەدارە باڵاکان و پەنجەی تاوانبارکردنی ئاراستەی حیکمەت سلێمان و هاوبەشەکانی دیکەی درێژ کردو یاسای عورفی لە خیوەتگای رشیدی سەربازیی راگەیاندو

تاوانبـاری ئامـادەكرد تالەبـەردەم دادگـا سـەربازییەكاندا دادگـایی بكرێـت. تۆمەتەكان بەسەر سلێمان و هاوەڵەكانی ساغكرایەوە و فەرمانی مردنیان بەسەردا سەپێندرا بەڵام دواتر حوكمـەكان كەمكرانـەوە بـۆ زینـدانی كـردن . بەڵگـەكان زۆر لاوازبـوون و كودوتاكـەش واقعـی نـەبوو بەشـێوەیەك كـە واپێدەچـوو سـەرجەم رووداوەكان نوری سەعید دایرشتبێت بۆ تۆڵەكردنەوە لەمردنی جەعفەر عەسكەری دۆست و زاوای و رەنگە بۆ ئەوەشی بووبێـت كـە بـۆ حـەوت ئەفسـەرەكە دووپـات بكاتەوە كە رژێمەكەی سلێمان – سدقی تا ئەبەد كۆتایی پێهات .

لـەو قۆناغـەدا بـوو كـە مـەلیك غـازی لـە نیسـانی سـاڵی ١٩٣٩ بـەهۆی رووداوی ئۆتۆمبێلی گیانی لەدەستداو ئەم مردنە لەناكاوەشی دەسەڵاتی نوری بـەهێزتر بـوو ، مـەلیك غـازی گەمەكـەرێكی سیاسـی بـەتوانا نـەبوو و لەبـەردەوامی هـەژموونی بەریتانیا بەسەر وڵاتەكەیدا نـارازییبوو و هاوسۆزیشـی لەگـەڵ پرسـەكانی عروبـە و شـانازیكردنی بـەوەی كـە دەسـەڵاتداری عێراقـە وایكردبـوو رەخنـەی زیـاتر لەسیاسـەتی بـەریتانیا لەناوچـەی دیكـە لەرۆژهـەڵاتی ناوەراسـتدا بەتایبـەتیش لەفەڵەستین كەنداوی عەرەبیدا بگرێـت ، لەسـەردەمی ئەویشـدا یەكـەم راگەیانـدنی گشتی و مەترسیدار سەبارەت بە ئیدعای سەروەری عێراق بەسەر كوێتدا راگەیەنرا و مـەلیك وەكـو چـەندین پرسـی دیكـەی پەیوەسـت بـە هەرێمەكـە لەرێگـەی ئـەو ئێزگەیـەی كـە لـە سـاڵی ١٩٣٧ دا لەكۆشـكەكەی خـۆی دایمەزرانـدبوو رای خـۆی بەرامبەر دەردەبری .

دەرەنجامی راستەوخۆی مردنیشی پێویستیی دامەزرانـدنی راسـپێردراوێك (وصـی) بوو بۆ عەرش چونكە مەلیك فەیسەڵی دووەمی كوری تەمەنی سێ ساڵان بوو و میر عەبدولئیلای كوری عـەلی مـەلیكی پێشـووی حیجـازو بـرای شـاژن عـەلیای دایكـی فەیسـەڵی دووەم بـۆ ئـەو كـارە دەستنیشـانكرا ، هـەروەكو دواتـر رووداوەكـان دەریدەخـەن دامەزرانـدنی عەبـدولئیلا هاوسـەنگیە وردەكـەی نێـوان كۆشـك و ئەفسەرەكان و دەستە بژێری سیاسی مەدەنی بەریتانیـەكانی گـۆری ، عەبـدولئیلا جودابوو لە زاواكەی بەوەی كە پتر لێبووردەیی هەبوو بەرامبەر بە بوونی بەریتانیا

لەعێراق . لەراستیدا لەهەندێك بواردا حەماسێكی ئیجابیانەی هەبوو بەرامبەر بە پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیای مەزن كەبەیەك لە گەرەنتیە بنەرەتیەكانی بەردەوامبوونی حوكمی نەوەی هاشمیەكانی دادەنا . لێرەوە زۆر هاوبەشی نەبوو لەگەڵ ئەفسەرانی عەرەبی نەتەوە پەرست لەنێو سوپادا كە بە هەڵپەرستی كۆمەڵایەتی دادەنان كەشایانی دۆستایەتی ئەو نین .

بوونی عەبدولئیلا بووە هۆكارێك بۆ ئاڵۆزی چونكە سیاسەتی عێراق لەگەڵ نزیكبوونەوەی هەڵگیرسانی شەر لە ئەورووپا بەرەبەرە لەسەر شانۆی سیاسی دووردەكەوتەوە و پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیای مەزن سەر لەنوێ گەرایەوە سەرووی كارەكان ، بەشێك لەهۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە زیادبوونی داواكارییەكانی بەریتانیا ئەوخاڵانەی مایەی چەندو چوون بوون لەرێكەوتنامەی ١٩٣٠دا بەبیری ئەفسەرەكان هێنایەوە كە نیگەران بوون لەوەی بكەونە نێو بازنەی بەریتانیا . لەكاتێكدا كە بروای تەواویان بەوە هەبوو كە ولاتانی میحوەر لەجەنگدا سەردەكەون و سەرسورمانی خۆیان بە كاریگەری بەهێزی ئەڵمانیای سۆشیالستی نیشتمانیی كە فریتزگرۆبای باڵیۆزی ئەوسای ئەڵمانیا لەعێراق پروپاگەندەی بۆ دەكرد نەدەشاردەوە .

بەرلەوەی ئەو رووداوانە روون ببنەوە نوری سەعید لەمانگی ئایاردا هەڵبژاردنێكی رێكخست و هەروەكو پێشبینی دەكرا كەسانی سەربەخۆی هێنایەوە سەر دەسەلات لەگەڵ ئەوەش نوری هەستی بەوە دەركرد كە پاڵپشتی پەرلەمان لێی ناگاتە ئەو هێزەی كە سوپا نوێنەرایەتی دەكات بۆ زۆر هوشیار بوو و پەیوەندی باشی لەگەڵ بازنەی حەوت ئەفسەرەكە هێشتەوە بەتایبەتیش لەگەڵ هەرچوار سەركردە سەلاحەدین سەبباغ ، فەهمی سەعید ، مەحمود سەلمان و كامل شبیب ، ئەم ئەفسەرانە ئەو چوارگۆشە زێرینەیان پێكدەهێنا كە بووە خاوەنی دەسەلاتی كردەیی لە عێراقدا .

# عێراق لە جەنگی جیهانی دووەمدا

لەگەڵ سەرهەڵدانی جەنگ لە ئەورووپا لە ئەیلولی ساڵی ١٩٣٩دا بەریتانیای مەزن داوای لە عێراق کرد هەموو پەیوەندیە دبلۆماتییەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا بپچڕێنێت وهەموو ئەڵمانیەکان دەستگیر بکات و هەموو یارمەتیەك کە بەریتانیای مەزن پێویستیەتی بەپێی برگەکانی ڕێککەوتنامەکە پێشکەشبکات. هەر زوو نوری سەعید داواکاریەکانی جێبەجێکرد و تەئکیدی پاڵپشتی تەواوی عێراقی بۆ بەریتانیای مەزن تەئکید کردەوە ، سەرباری ئەوەش سستەمەکانی چاودێری ، قەدەغەکردنی هاتووچۆ و دەستبەسەراگرتن و سەرجەم سستەمەکانی پێویستی بەدانانی عێراق بەشێوەیەکی کردەیی لە حاڵەتی جەنگدا جێبەجێکرد، لێرەدا نەیارانی سیاسی نوری سەعید لەوە دەترسان دەسەڵاتەکانی تازەی حکومەتەکەی لەدژی ئەواندا بەکاربێنێت .

لەم قۆناغەدا بازنەی حەوت ئەفسەرەکە هیچ هۆیەکیان نەبوو بۆ ملکەچ نەکردنی عێراق بۆ داواکارییەکانی بەریتانیا هەروەها زێدەبوونی هەژموونی نوری سەعید نیگەرانی نەکردبوون ، نوریش لەلایەن خۆیەوە بروای وابوو کەدەتوانێت هاوسەنگی لەنێوان سۆزیان بۆ نەتەوەی عەرەبی داواکارییەکانی بەریتانیا لەحکومەتەکەی رابگرێت بۆیە هیچ نیگەران نەبوو کاتێك کە ئەو ئەفسەرانە لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩دا حاجی ئەمین حوسەینی موفتی قودس و سەرۆکی دۆراوی شۆرشی فەڵەستینیان بانگکردە بەغدا ، لەگەڵ ئەوەش نوری هەوڵیدا ئەو هەڵە بقۆستەوە بۆ سەر لەنوێ میانگیریکردن لەپرسی فەڵەستین لەرێگەی رازیکردنی موفتی بە چاکیەکانی بەڵگەنامەی سپی بەریتانیا لەبارەی فەڵەستین لە ئایاری ساڵی ١٩٣٩دا بەڵام نەیتوانی موفتی رازیبکات بە بۆچونەکانی و ناکۆکی لەنێوانیان زێدەتر بوو ئەمەش دابەش بوونی لەسیاسەتی عێراقدا زێدەترکرد .

سەبارەت بە نەیارانی سیاسی نوری سەعید تاکە هیوا بۆ لادانی لەکورسی دەسەڵات وەدیهێنانی دۆستایەتی رکابەرانی بوو لە نێو ئەفسەرەکاندا و کاتێکیش کە رۆستەم حەیدەری کە وەزیری دارایی و کەسی نزیکی نوری سەعید لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٠دا تیرۆرکرا هەندێك لەخاڵەکانی پشێوی تەقینەوە ، بکوژەکە فەرمانبەرێکی

حکومەت بوو لەنەیارنی بەریتانیاو لایەنگرانی دەوڵەتانی میحوەر ، بەهۆی ئەوە نوری وای بریاردا کە ئەو کارە بەشێکە لە کودەتایەکی گەورەتر کە دوژمنانی رێکیدەخەن و واپێدەچوو ئامادەبێت بۆ ئەوەی پرسی تیرۆکردنی حەیدەر وەکو ئیدیعای (کودەتاکەی)ئاداری ١٩٣٩ بۆ لێدانی دوژمنە سیاسیەکانی بەکار بهێنێت ، ئەم پشێویە گەیشتە ریزی ئەفسەرەکان و ناکۆکی لە نێوان هەندێك لە ئەندامە بەتەمەنەکانی نێو بازنەی حەوت ئەفسەرەکە بەتایبەتیش ژەنەراڵ حوسێن فەوزی سەرۆکی ئەرکانی گشتی و ئەوانەی بەتەمەن بچوکتر لەنێو چوار گۆشەی زێرین کە پەیوەندیان لەگەڵ نوری باشبوو روویدا و بووە هۆی روودانی قەیرانەکەی شوباتی ١٩٤٠ کاتێك کە نوری دەستی لەکار کێشایەوەو هاوپەیمانە سەربازیەکانی یەکسەر داوایان لێکرد بگەرێتەوە پۆستەکەی و هێزەکانیان لە ئۆردوگای رەشید کۆکردەوەو ئامادە کرد بۆ پێشرەوی بەرەو پایتەخت ، لەبەرامبەردا ژەنەراڵ فەوزی هێزەکانی لە ئۆردوگای وەشاش کۆکردەوە و واپێدەچوو رەوشەکە بۆ رووبەرووبوونەوەیەك ئامادەکرابێت بۆ بریاردان لە دوارۆژی حکومەتی عێراق ، لێرەدا عەبدولئیلا کەدەیزانی هاوسەنگی هێزەکان چۆنەو خۆشی لایەنگری نوری بوو داوای لەناویراو کرد کەحکومەت پێکبێنێ و نوری سەعیدیش ئەو کارەی کردو یەکسەریش ژەنەراڵ فەوزی و هەردوو هاوەڵەکەی لەسەرکار لاداو بەمەش سەلاحەدین سەبباغی رازیکرد .

لەگەڵ ئەوەش پاشکۆیەتی نوری سەعید بۆ چوار گۆشەی زێرین دەسەڵاتەکەی هەڵگێرایەوە ، ئەمەش لەسەر نەکەوتنی لە جێبەجێکردنی ویستەکانیدا لەدادگایی کردنەکانی پەیوەست بەکوژرانی حەیدەر دەرکەوت و هەتا خودی تەها هاشمی وەزیری بەرگری نەیتوانی ئەو چوارگۆشە زێرینە لەناوببات ، لەئاداری ١٩٤٠دا عەبدولئیلا داوای کۆبوونەوەیەکی گەورە سیاسەتمەدارانی کرد بۆتاوتوکردنی کێشەی دەست تێوەردانی سوپا لەسیاسەتدا ، لەبەرامبەر ئەو ناکۆکیانەی کەحکومەتەکەی نوری سەعیدیش لەت لەت کردوو زێدەبوونی رەخنەکان لەسیاسەتەکانی کەلەسەر بنەمای هاوکاری پتەوێ لەگەڵ بەریتانیای مەزن دامەزرابوو لە ئاداری ساڵی ١٩٤٠دا نوری سەعید دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لەسەرۆکایەتی وەزیران راگەیاند ، لێرەدا مەلیك رووی لە رەشید عالی گەیلانی سەرۆکی دیوانی مەلەکی کرد بۆ

پێکهێنانی هاوپەیمانیەکی نیشتمانی کەتێیدا نوری سەعید بوو بە وەزیری کاروباری دەرەوە .

لەگەڵ سەرهەڵدانی جەنگ لە ئەوروپاو، زنجیرە سەرکەوتنەکانی ئەڵمانیا سەرباری بەشداری کردنی ئیتاڵیا لە جەنگ و ڕووخانی فەرەنسا. دوو بەشی لە بیرورا لەنێو حکومەت و لە عێراقدا ڕوونتر بوو لەنێوان ئەوانەی کەبڕوایان وابوو پێویستە لەسەر عێراق هەموو تواناکانی بخاتە گەڕ بۆ یارمەتی دانی هاوپەیمانان و ئەوانەی وایاندەبینی کە ئەو جۆرە پاڵپشتیە بەرژەوەندیەکانی عێراق لەناودەبات. بە شێوەیەکی گشتی وابێدەچوو نوری سەعید و عەبدولئیلا سیاسەتی پاڵپشتی کردنی بەهێز لەبەریتانیا پەیرەو دەکەن، لەبەرامبەردا چوارگۆشەی زێرین و ناجی شەوکەت لەوەزارەت و نێوەندەکانی نەتەوە پەرستە عەرەبەکانی دەوورووبەری موفتی بڕوایان وابوو کە هێزەکانی میحوەر سەردەکەون لەجەنگداو پێویستە عێراق دژایەتیان نەکەن.

ڕەشید عالی گەیلانی زیاتر هەستی بەو هەنگاوە یەکسەرە دەکرد کە پێویستە لەسەری بینێت بۆگێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ ڕەوشەکە چونکە بەریتانیەکان لەعێراق هێزێك بوون نەدەکرا پشتگوێ بخرێن سەرەرای شکستەکانیان لەشوێنەکانی دیکە لەجیهاندا ، هەربۆیە گەیلانی داوای پەیرەوکردنی سیاسەتێکی بێلایەنیی دیراسەتکراوی دەکرد و بەهۆی ئەو پاڵپشتیەی کە سوپا لێیدەکرد گەیلانی لەجێبەجێکردنی داواکارییە زۆرەکانی بەریتانیا دووچاری ئاستەنگ دەبۆوە و لەتەمووزی ساڵی ١٩٤٠دا ناکۆکیەکی پەیوەست بەداواکارییەکانی بەریتانیا بۆ گواستنەوەی هێز لەڕێگەی عێراقەوە سەری هەڵدا و لەکۆتاییشدا حکومەتی عێراق بەوە ڕازیبوو ، بەڵام ووتووێژە دوورودرێژەکانی پەیوەست بەو خاڵەی ڕێکەوتنامەکە کەڕێگا بەوەدەدات ئەوەی بۆ بەریتانیا دەرخست کەسەرۆکی حکومەت بەتەنگ هەستی وڵاتانی میحوەرەوەیە نەوەکو جێبەجێکردنی ئەرکەکانی عێراق بەرامبەر بەریتانیا بەپێی ڕێکەوتنامەکە.

لەهاوینی ١٩٤٠دا هەمانشت لەبارەی مەسەلەی پەیوەندییەکانی عێراق لەگەڵ ئیتاڵیا دووبارە بۆوە کاتێك کە نوری سعید پێشنیاری کرد عێراق پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئیتاڵیا بپچڕێت ، بەڵام حکومەت ئەو پێشنیارەی ڕەتکردەوە وە ڕەشید عالی لە

پێشکەش کردنی پاڵپشتی تەواو بۆ نوری شکستی هێناو لەدەرەنجامی ئەوە لە پاییزی ١٩٤٠دا ئەفسەرە بەریتانیەکان رایاندەگەیاند کەپێویستە لەسەر رشید عالی بڕوات . ئەمەش نارەزایی عێراقیەکانی لێکەوتەوە لەبەرامبەر دەست تێوەردانی بەریتانیا و رەشید عالی گەیلانی سەرکەوتوبوو لە پشتبەستن بەو هەستەی عێراقیەکان کە بێگومان خۆشی هاوبەش بوو لەگەڵیان ، بەڵام وایلێهات گەیلانی بەسەرکردە یان هێمای بزووتنەوەی دژ بە بەریتانیا لە عێراق و(هاوسۆز لەگەڵ هێزەکانی میحوەر، لەچوار چێوەی رەوشی جەنگدا) دەناسرا ، ئەمەش کە دواتر رووداوەکان دەیسەلمێنن پێگەیەکی مەترسیدار بوو .

سەرەرای شکستەکانی نوری سەعید لە وەزارەتدا بەڵام دوودڵ بوو لەدەست لەکارکێشانەوەی ، عەبدولئیلا لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤١دا ، لەهەنگاوێکی چاوەروان نەکراودا رایگەیاند کە پێویستە لەسەر حکومەت دەست لەکاربکێشێتەوە بەڵام گەیلانی بەدڵنیابوون لە پاڵپشتی چوارگۆشەی زێرین و هەستکردنی بەوەی کەعەبدولئیلا دەسەڵاتێکی دەستووریی وای نیە حکومەت ناچار بکات دەست لەکاربکێشێتەوە داواکەی رەتکردەوەو عەبدولئیلاش سوور بوو لەسەر داواکەی و رەشید عالیش لەسەر رەتکردنەوەی ، بەڵام کە دیتی زۆربەی وەزیرەکانی ئامادەی دەست لەکارکێشانەوە بوون ، ترسێکی زۆری لێنیشت .رەشید عالی بە پەلە داوای یارمەتی لە سەبباغ کرد کە هەرەشەی لە عەبدولئیلا کرد ئەگەر موکر بێ لەسەر دەست لە کارکێشانەوەی گەیلانی ئەوا هێزی سەربازیی راستەوخۆ بەکار دەهێنێ و عەبدولئیلای ناچارکرد گوێ رایەڵی بێت، لێرەدا نوری (کە ئێستا لە دەرەوەی حکومەتە) دەستی کرد بە کۆکردنەوەی لایەنگرانی لە پەرلەماندا بۆ هاندانی گەیلانی تاداوا لە عەبدولئیلا بکات پەرلەمان هەڵبووەشێنێتەوە. بەڵام عەبدولئیلا ئەوەی رەتکردەوەو بەغدای جێهێشت بەرەو دیوانیە کە دەیزانی لەوێ دەتوانێت پشت بە یەکە دڵسۆزەکانی سوپا ببەستێ. ئەو هەنگاوە رووداوەکانی ئاڵۆزتر کردو رەشید عالی لە کۆتایی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤١ ناچارکرا کە دەست لەکار بکشێنێتەوە. پاش ئەوەی کە ئەندامانی چوراگۆشەی زێرین بۆیان روونکردەوە کە ئامادە نین شەرێکی ناوخۆ لەپێناو مانەوەی لەسەر کورسی سەرکردایەتیدا بەرپابکەن.

دوای ئـەوە عەبـدولئیلا داوای لەتـەها هـاشمی کـرد حکومـەت پێکبهێنێـت ، هـاشمی پاڵپشـتی سـەرەتایی ئەنـدامانی چوارگۆشـەی زێرینـی بەدەسـتهێنابوو کـە واتەماشـایاندەکرد نەتەوەپەرستێکی عەرەبـە سـەرەرای ئـەوەی کـەتۆرێکی تایبـەت بەخۆی لەهەژموون لەنێو هێزە چەکدارەکاندا هـەبوو ، بـەڵام کاتێك کـە سـەر لـەنوێ ویستی ئەو چوار گۆشەیە لەناوببات ئەندامانی بەرێکەوتن لەگەڵ ژەنەراڵ ئەمین زەکـی (سەرۆکی ئەرکانی گشتی بەوەکالـەت)و رەشـید عـالی گـەیلانی بریاریانـدا لـە نیسـانی ساڵی ١٩٤١دا دژی هەریەك لە عەبدولئیلا و هاشمی بجوڵێن و هاشمی ناچارکرا دەست لە کارکێشانەوەکەی بنوسێ بەڵام عەبدولئیلا کـە زانـی چـواردەوری کۆشـك بـە سـوپا گـیراوە تـوانی بـەرەو بەسـرە رابکـات و پاشـانیش بـۆ ئـوردن. لەگـەڵ دەسـت بەسەرداگرتنی بەغدا لەلایەن هێزە چەکدارەکانەوە نوری سـەعید، جـەمیل مەدفـەعی، وعەلی جەودەت کەسەرجەمیان لەنەیارانی گەیلانی بوون چوونە پاڵ عەبدولئیلا.

## کودەتای ١٩٤١ و داگیرکردنی سەربازیی بەریتانیا

کودەتاکـەی یـەکی نیسـانی سـاڵی ١٩٤١ جیـاواز بـوو لەوانـەی پێشـووتر.چـونکە ئامانجەکەی ئەوە نەبوو سەرۆك حکومەت بەیەکێکی دیکە بگۆرێ، بـەڵکو دژی مـەلیك بوو، کە عەبدولئیلا نوێنەرایەتی دەکردو بـەپێی دەسـتوریش دەسـەڵاتەکەی پێویست بوو بۆ رەوایی دان بە کارەکانی هێزە چەکدارەکان و هاوپەیمانە مەدەنیەکانی . بـەڵام بەشداری نەکردنی عەبدولئیلا لەم یاریەدا کودەتا چیەکانی ناچـارکرد بـەدوای رێگـەی دیکەدا بگەرێن بۆ شـەرعیەت دان بـەکارەکانیان ، کەهـەنگاوی یەکـەمیان دامەزرانـدنی حکومەتێکی بەرگری نیشتمانی بـوو بەسـەرۆکایەتی رەشـید عـالی گـەیلانی و پاسـاوی ئەمەش پاراستنی یەکێتی ولآت و ئاسایشی بوو ، لەهەمانکاتـدا تۆمـەتی هەوڵدان بـۆ لاوازکردنی سوپاو زیانگەیاندن بە یـەکێتی نیشـتمانی و سـوکایەتی کـردن بەدەسـتور ئاراستەی عەبدولئیلا کراو رەشید عالی گەیلانی یاداشتنامەیەکی پێشکەشـی پەرلـەمان کرد کە تیایدا داوایکـرد عەبـدولئیلا لەسـەر کـار لابـدرێ و یـەکێکی دیکـە لەخزمـەکانی مەلیك لە شوێنی دابنرێت ئەویش شـەریف شـەرەفە . ئـەوەی مایـەی سەرسورمانیشـە لەبەر ئەوەی پەرلەمان ژمارەیەکی زۆر لەو پەرلەمانتارانـەی لـە خۆگرتبـوو کـە بـەهیچ

شێوەیەك سۆزیان بۆ گەیلانی نەبوو ، بەکۆی دەنگ رەزامەندی لەسەر پێشنیارەکەدرا ، بەم جۆرە دەکرا کارەکان بەشێوازێکی نیمچە دەستوری بکرێن لەبەر ئەوەی شەریف شەرەفی سەرپەرشتیاری نوێ بەسەر کورسی پادشایەتی یەکسەر فەرمانی رەزامەندی لەسەر دەست لەکارکێشانەوەی تەها هاشمی واژۆکردوو رێگەی بەرەشید عالی گەیلانی دا حکومەت پێك بهێنێ .

لەهەوڵدان بۆ مانەوە لە دەسەڵات بە شێوەیەکی دەستوری، رەشید عالی گرنگی دا بە کۆکردنەوەی کۆمەڵێك لە سەردەستەی سیاسی عێراقی لەچواردەوری خۆی کەبەهۆی راکردنی عەبدولئیلا شڵەژابوون و لەهەمانکاتدا لەبەرامبەر دەسەڵاتی چوارگۆشەی زێرین هۆشیار بوون . بەدوور لە شێوازە دەستورییەکان ئەو پیاوانە لەخۆ بایی بوون و دەرکەوتنە ئاشکراکەشیان لەسەر شانۆی سیاسی وەکو ئاگاداریەك بوو بۆ دەرکەوتنی ئیدارەکی توندرەو تر لە دەسەڵات، نەك بەهۆی بەرنامە سیاسیە نادیاری کراوەکەیان بەڵکو بەهۆی ئەوەی (نەناسراو بوون) و لەرێگای هەژمونیان لەنێو سوپادا جۆرێك لەسەریەخۆییان لەتۆرە کۆنەکانی مەحسوبیەت و مەنسوبیەت هێنایەکایەوە ئەمەش بەشێوەیەك لەشێوەکان هەژمونی ئەو خانەوادەو کەسانەی کە هەبوون خستە بەرهەرەشەوە ، و هاریکاربوو لە زێدەکردنی ئەو پشێویەی کەزۆر لەئەندامانی دەستەی سیاسی گرتەوە کاتێك کە ئەفسەرانی سوپا بەشێوەیەك هەڵسوکەوتیانکردکە خزمەتی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان بکات نەك وەکو پاشکۆی کەسانی تر و رووداوەکانی نیسانی ساڵی ١٩٤١بۆ زۆران وابوو کە نمونەی ئەو مەترسیانەیە کە پەرەسەندنێکی وا لەخۆی دەگرێت ، ئارەزووی رەشید عالیش بۆ پێدانی سەرپۆشێکی دەستووریی بۆ ئەو رێوشوێنانە ئامانجەکەی دڵنیاکردنەوەیان بوو لەوەی کە جیهانەکەیان لەسەر لێواری رووخاندا نیە.

لەگەڵ ئەوەش گەیلانی هەستی بە پێویستی رازیکردنی بەریتانیەکان دەکرد بەوەی کە هیچ گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی روویندداوە لەبەر ئەو هۆیەش هەرزوو بەریتانیای مەزنی دڵنیا کردەوە کە عێراق رێز لە هەموو ئەرکەکانی دەگرێ کە لە رێککەوتنامەکەدا هاتووە. بەڵام بەریتانیەکان لە لایەن خۆیانەوە زۆر نیگەران بوون لە گەڕانەوەی رەشید عالی بۆ دەسەڵات و لەو سروشتە نەتەوایەتیە بە هێزەی کە بە

حکومەتی نوێوە دیاربوو. هەروەها ئاگادار بوون لەبوونی (حکومەتێك لە سێبەر)دا کە پێکهاتووە لە رەشید عالی و ژمارەیەك لە وەزیرەکانی و هەروەها ئەفسەرانی چوارگۆشەی زێڕین و حاجی ئەمین حوسێنی. لە بەر ئەوە بەریتانیای مەزن رەتیکردەوە دان بە حکومەتی نوێ دابنێت و ئیدیعاکانی رەشید عالیشیان سەبارەت بە دەستووریەتی کارەکانی رەتکردەوەو بەریتانیا بڕیاری دا نیازەکانی حکومەت لە رێگای داواکاردنی مۆڵەت بۆ رێگەدان بەهێنانی سەرباز بۆ عێراق بە پێی برگەکانی رێککەوتنامەکە تاقیبکاتەوە.

رەشید عالی رەزامەندیی لەسەر داواکاریەکەی بەریتانیا دەربڕی، بەلأم هەرزوو خۆی لەبەرامبەر فشارێکی گەورەی چوارگۆشەی زێڕین و هاوەڵەکانی لە حکومەتدا دۆزیەوە کە داوایان لێ دەکرد مەرجی وا بسەپێنێت کە بەشێوەیەکی کردەیی توانای بەریتانیا بۆ هێنانی ژمارەیەکی زیاتری سوپا بۆ عێراق سنوردار بکات ، بەریتانیەکان ئەوەیان بەتەئکید کردنی گومانەکانیان داناو سەرجەم کۆتەکانیان رەتکردەوەو لەبری ئەوە هەندێك لەسوپاکەیان لەبەسرە دابەزاند و حکومەتی عێراق بەشێوەیەکی فەرمی نارەزایی دەربری و رێگەی بە هەندێك لەیەکەکانی سوپای عێراقدا کە لەهەندێك لەو پێگانەی کەدەڕوانیە سەر بنکە ئاسمانیەکەی بەریتانیا لە حەبانیە جێگیربن و فەرماندە بەریتانیەکە ئاگادار کرایەوە کە پێویستە سەرجەم چالأکیە ئاسمانیەکان رابگرێت و هەرفڕۆکەیەکیش هەوڵی فرین بدات تەققەی لێدەکرێت . بەریتانیەکان ئەو داوایەیان رەتکردەوە لەبەرامبەردا داوای کێشانەوەی ئەو هێزانەیان کردوو هەرەشەی ئەوەشیان کرد کە نەکشانەوەیان لەلایەن بەریتانیاوە بەکارێکی سەربازیی لەقەڵەم دەدرێت .

هێزەکانی عێراق داواکەی بەریتانیایان رەتکردەوەو لەدووی مانگی ئایاردا فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا لەحەبانیە فەرمانی هێرشکردنیداو بۆ چەند رۆژێك شەر بەردەوام بوو هێزەکانی عێراق ناچارکران بەرەو بەغدا بگەرێنەوەو لەفەلوجە جێگیربن ، بەلأم لەم قۆناغەدا بەریتانیەکان هێزی زیاتریان لەهیندستانەوە دەهێناو هێزێکی دیکەشیان لە ئەردەن لەئامادەکاری دابوو بۆ برینی بیابان بەرەو عێراق ، لەم رەوشەدا رەشید عالی بەپاڵپشتی کەسانێك لەسوپا و لەحکومەت کە ئەمەیان بەهەڵ

زانی بۆ هێرشێكی فراوانتر بۆ سەر هەژمونی بەریتانیا لەعێراق ، هەولّی دا داوای یارمەتی هێزەكانی میحوەر بكات و ناجی شەوكەت رەوانەی توركیا كرا بۆ روونكردنەوەی ئەوە بۆ ئەلّمانیا كەعێراق پێویستی زۆری بە هاریكاری سەربازیی هەیە . هەریەك لە ئەلّمانیاو ئیتالّیاش لە هەلّێكی وادەگەران بۆ لێدانی هەژمونی بەریتانیا لە رۆژهەلاتی ناوەراستداو پالّپشتی حكومەتی فیشی فەرەنساشیان بۆ ئەم مەبەستە بەدەستهێنا بەلاّم نەگونجاوی كاتەكە رێگەی بە ولاّتانی میحوەر نەدەدا كارێكی وابكەن بۆ گۆرینی تەرازووی هێز لە عێراق لە دژی بەریتانیای مەزن . هەریەك لە ئەلّمانیا و ئیتالّیا برێكی كەم چەك و نزیكەی سی فرۆكەی جەنگیان رەوانەی موسلّ كرد بەلاّم رۆلّیان لە هەلّمەتەكەدا شایەنی باسكردن نەبوو .

لەو كاتەدا ژمارەی هێزەكانی بەریتانیا لە عێراق زیاتر بوو و بەسرەی داگیر كرد و لە باكوورەوە بەغدای دابری. سەرەرای ئەوەی ژمارەی یەكە عێراقیەكان زیاتر بوو، بەلاّم توانای ئەو هێزە بەریتانیانەیان نەبوو كە هێنرابوون، زۆری نەخایاند تا هێزەكانی بەریتانیا گەیشتنە دەورووبەری بەغدا و. حكومەتەكەی رەشید عالی و چوارگۆشەی زێرین بەهۆی ئەو پشێوی و ئالۆزیەی كە پێشوەچوونە بەردەوامەكەی هێزەكانی بەریتانیا بەرەو پایتەخت دروستی كردبوو رووخان. زۆربەی زۆری گەلی عێراق هەستی بەوە نەدەكرد كە پیویستە لەگەلّ حكومەت بێت و سەرەرای بانگەوازی ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی بۆ جیهادكردن و هەولّەكانی دەزگاكانی راگەیاندنی حكومەت ، بەشێكی زۆر لەگەلی عێراق (هۆزە شیعەكان لەباشوور كۆمەلّگای كوردی لەباكوور) كەدەیان توانی رێرەوی رووداوە سەربازییەكان بگۆرن وەلاّمی بانگەوازەكەی حكومەتیان نەدایەوە ، بەلّكو بەپێچەوانەوە لەزۆر حالّەتدا سەرۆك هۆزە كوردەكان و شیعەكان یارمەتی هێزەكانی بەریتانیایان دەدا .

لە كۆتایی مانگی ئایاردا رەشید عالی گەیلانی و ئەندامانی حكومەتەكەی و حاجی ئەمین حوسەینی و ئەو ئەفسەرانەی كە پتر تێكەلّی حكومەتەكەی ببوون،لە بەغدا رایانكردو كاری دانوستان بۆ راگرتنی شەر لەگەلّ هێزەكانی بەریتانیا بە ئەرشەد عومەری موختاری شارەكە سپارد ، رووخانی حكومەت هەلّێك بوو بۆ چەند بەشێك لە گەل و هێزەكانی ئاسایش كە جامی توورەبوونی خۆیان بەسەر تایەفەی جوولەكەكان

لەبەغدا برێژن و ئەو رووداوانەش کە بە (فەرهود) واتە دزی و رێگری ناسراوە بووە هۆی کوژرانی نزیکەی دووسەد جوولەکەو بەتالآن بردن و خاپوور کردنی چەندین لە دووکانی جوولەکەکان لەبەغدا ، زۆربەی جوولەکەکانی عێراقیش کە پێشتر لەسیەکاندا لەلایەن نەتەوە پەرستە عەرەبەکانی دژ بەبزووتنەوەی سەهیۆنیەتەوە کرابوونە ئامانج ئەو رووداوانەیان بە خاڵێکی وەرچەرخان لە پەیوەندیان لەگەڵ هاوولآتیانی عێراقی تەماشاکرد ، دوای دووڕۆژ و دوای ئەوەی تالآن و دزی هەرەشەی فراوان بوونی زیاتری دەکرد دەسەلآتدارێتی عێراقی و بەریتانی بریاری هاتنەناو کێشەکەیانداو پەنایان بردە بەر هێز بۆ گێرانەوەی یاسا بۆ شارەکە ، ئەمەش رێگەی بۆ عەبدولئیلای سەرپەرشتیاری کورسی پادشایەتی خۆشکرد بەیاوەری نوری سەعید و ئەوانی دیکەی کە دوای کودەتاکەی رەشید عالی گەیلانی و لەمانگی نیساندا رایانکردبوو بێنەوە بەغدا .

بەم جۆرە سنورێك بۆ ئەو قەیرانە راستەوخۆیە دانرا ، چالآکیەکانی ئەفسەرانی سوپاو حکومەتەکەی رەشید عالی هەرەشەیان لەبەرژەوەندیەکانی عەبدولئیلاو نوری سەعید و ئەوانی دیکە دەکرد جگە لەبەریتانیەکانیش بەزۆر شێوە ، هەربۆیە ئەوانە ئاستەنگێکی وایان نەدیتەوە لەرێکەوتن لەسەر ستراتیژیەتێکی هاوبەش بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکە کەلەسەر بنەمای کاری سەربازیی و هێزی تێکشکێنەر دامەزرابوو . کەرەنگە بەشێك لە هۆیەکانی دەگەرێتەوە بۆ سروشتی شاراوەی بەردەوامیی هەژمونی بەریتانیا لە عێراق و بارودۆخ و پێداویستیەکانی جەنگ ، بەلآم لەلایەکی دیکەوە بۆ پەرەسەندنی نمونەکانی سیاسەتی عێراقیش دەگەرێتەوە ، کە هێزی چەکداری و ئەو هەرەشەی کەنوێنەرایەتی دەکات بووە ئامراز بۆ دیاریکردنی ئەوانەی کە دەسەلآتی دەوڵەت دەگرنە دەست . خودی دەوڵەتی عێراق نەك تەنها دەبووە گۆرەپانێك بۆ کاری سیاسی گرنگ بەڵکو بۆ سستەمێکیش لە رێوشوێن و هەڵوێست و ئەو کاروکردەوانەی کە دوور لە کارو دیدی ئەوانە گەشەی کرد کە لەبەر هۆی جوداجودا توانای سەپاندنی هەژمونێکی گرنگیان هەبوو بەسەر بەشێکی گەورە لەگەلی عێراق و بەشێکی دیاری لە سیاسەتی عێراقدا پێکهێنا . سەرەرای ئەو چەندو چونەی کە ئەوانەی هەستیان بەوە دەکرد دوورخراونەتەوە لەو سستەمی هێزە هێنا بویانە ئارا ، کەچی ئەم سستەمە لەگەڵ ئەوەش توانی نوێنەرایەتی کۆمەڵێك لەو

ئامانجانەیکات کە خەریك بوو زیاتر ڕووندەبۆوە ، و هەندێك لەو کەسانە دەریان خست کە توانیان کۆنترۆڵی بکەن. بە چاوپۆشینیش لە جیاوازیە کەسیەکان یان حزبیەکان یاخود هەتا لێك دووری گەورەی ئایدیۆلۆژی ، هەندێك لە سیماکانی ئەوە دەستیان بەدەرکەوتن کردو بەشێوەیەکی بنەرەتی گرنگی متمانەی کەسی و سوور بوون لەسەر حاڵەتی نایەکسانی لە خۆدەگرت جا لەسەر ئاستی مادی یان لەسەر ئاستی پۆستەکان بوایە، هەروەها گرنگی ئەو سستەمە تووندەش کە بە شێوەیەکی بنەرەتی خۆی لەپەنابردن بۆ سیاسەتی تێکشکاندن دەدیتەوە لە خۆدەگۆت. هەموو ئەوسیمایانە وایکرد پێکهاتنی ناسنامەیەکی عێراقی ببێتە کارێکی نادیار ، چونکە شتێکی سەلمێنراو بوو کە دیاریکردنی ئەو ناسنامەیە پشت بە کەسانێك ببەستێت کە واسەیری عێراقیان دەکرد کە ئامێرێکی هێزەو وەکو کۆمەڵگە سەیری ناکەن . لە ڕاستیدا دەرکەوتنی ئەفسەرانی سوپا لە سیەکاندا وەکو دەسەڵاتی باڵا لەسەر گۆرەپانەکە زۆر هاوککار بوو لە دەرکەوتنی ئەو سیمایانە بەشێوەیەکی ئاشکرا . گەرانەوەی عەبدولئیلاو نوری سەعیدو هاوپەیمانانی کاریگەرێکیان هەبوو لە گێرانەوەی شێوەیەك لە مەدەنیەت بۆ دەوڵەت، بەڵام بەهەمان بنەما هەمان مەنتیق . چونکە گۆرانێکی وای بەسەردا نایەت کە شایەنی باسکردن بێت .

❑

# بەشی چوارەم
# مەملەکەتی هاشمی ۱۹٤۱-۱۹٥۸

دەست تێوەردانی سەربازیی بەریتانیا لەساڵی ۱۹٤۱ کۆتایی بە سووری کودەتا سەربازییەکان هێنا کە سیاسەتی عێراقی پێدەناسریەوە لە ساڵەکانی رابردوودا.رێگەشی لەبەردەم سەرپەرشتیاری سەر کورسی پادشایەتی و سیاسەتمەدارەکان خۆشکرد بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەلات وسەرلەنوێ تەئکید کردنەوەی رێساو یاساکان کەبەگونجاوتریان دەزانی . لەنێوەندە تەسکەکانی سەردەستەی سیاسەتمەدارە عێراقیەکانیش ئەمە هیچی لەو پەیوەندیانە نەگۆری کە هاوپەیمانێتی و رکابەرایەتی سیاسی دیاریدەکرد هەروەها کاریگەریەکی دیاری نەبوو بەسەر سستەمی زنجیرەیی کە رێرەوی هەژمونی مەحسوبیەتی لەنێوان سەردەستەی دەسەلاتدار و کۆمەلگەی عێراقی بە هەموو جیاوازیەکەیەوە دیاریکرد . و پێکهاتەی سیاسی دەسەلات و پاداشتی ئابووری چۆن بوو ، وەکو خۆی مایەوەو بەرژەوەندیەکانی کەسە سەرەکیەکانی ئەو قۆناغەش کەدیارترینیان نوری سەعید بوو پتەوتری کرد .

نوری سەعید کۆنترۆلی شانۆی سیاسەتی عێراقی دوای جەنگی کۆنترۆڵ کرد لەهەردوو بواری سیاسەتی دەرەوەو ناوەوە ، ئەمە سەرەرای کێشەکانیشی لەگەڵ عەبدولئیلاو ئەو تەحەدیانەی کەلەنێو سیاسەتمەداران و بازنەی سیاسی رووله فراوانبوون بەهۆی تێکەڵ بوونی جەماوەری سیاسیی عێراق لە پرسەکانی ولاتەکەی رووبەروویدەبوونەوە . سەبارەت بە نوری شانۆی سیاسی لەدوو ئاستدابوو یەکەمیان شانۆیەکی سیاسی خاوەن شێوازێکی زۆر کەسایەتی کەپێویستی بە چاودێری و مانۆری بەردەوام هەبوو و ، پێویستیی راستەوخۆ بۆ

پتەوکردنی هاوپەیمانیەکان و خۆنزیکردنەوەی ئەوانەی کەرەنگە دوژمنبن و ئەگەر پێویست بکات لەدەم دانەوەیان و لەناوبردنیان بەهێزو بێبەزەیی کۆنترۆڵی کردبوون . سەرکەوتنیش لەم ئاستەدا بواری کارکردنی لەئاستی بەرزتر بۆناوچەکەو مێژووی عێراق کردەوە . هەربۆیە بوارانە بوون رامانی نوری سەعیدی هاندا بۆ دەوڵەتێکی عەرەبیی فیدرالی کە نەوەی هاشمیەکان کۆنترۆڵی بکەن و بۆ دەوڵەتێکی عێراقی کەتیایدا ناکۆکیە کۆمەلایەتیەکان نامێن و هەردوولا دان بە سودەکانی دەوڵەتێکی میراتگری دابنێن کە پشت بە داهاتەکانی نەوت ببەستێت .

چالاکیەکانی پەیوەست بەم رامانە سیاسیە شێوەیەکی وای بۆ نوری سەعید دروست کردبوو کە چالاکەو گرنگی بە هەموو وردەکاریەکان دەدات و بەوە ناوبانگی دەرکرد بوو بەلام هەندێك جاریش کورتبین بوو رێرەوی خەونەکانی پشتگوێ دەخست ، ئارەزووشی لەتەماشاکردنی سیاسەتی رۆژانە لەسەر بنەمایەکی زۆر کەسیی وایلێکردبوو جۆرێك لە توندی دامەزراوەیی پشتگوێ بخات ئەمەش لە زۆر حاڵەتدا دژی هزرە تایبەتیکەی بوو لەبارەی دەسەلات کەتارادەیەکی زۆر هزرێکی دیکتاتۆری بوو .

لەرواڵەتدا سەرجەم ئامرازەکانی دەسەلات لەو ماوەیەدا لە دەست نوری بوو و دڵنیابوو لە توانای بۆ دارشتنی مێژووی دەوڵەتی عێراق لە ماوەی ئەوسالانەدا ، بەلام رێرەوی رووداوەکان بەرەبەرە لەکۆنترۆڵی دەردەچوو ، پرسەکانی نوێنەرایەتی تایەفی و ئەتنی سەر لەنوێ هاتنەوە دەرکەوتن بەلام دەکرێ لەرێگەی سیاسەتی خۆلێك نزیکردنەوەو پێدانی سوودەکان و گرتنەبەری رێوشوێنی توند مامەڵە لەگەڵ ئەمانەدا بکرێت ، بەلام ئەم ستراتیژیەتە لەبەرامبەر داواکارییەکان بۆ وەدیهێنانی دادوەریەکی کۆمەلایەتی و ئابووری زیاتر ئەوها کاریگەر نەبوو . ئەم سیاسەتەی نوری سەعید کۆمەڵگەی لەسەر دوو بنەما پەرەپێدابوو یەکەمیان نایەکسانی کەتیایدا خانەوادەکان تاکە سودمەند بوون و ئەمەش مەترسی دروست بوونی هاوپەیمانیەکی لەنێوان خەڵکە هەژارەکان کەبەرەبەرە رێکخراوتر دەبوون لەگەڵ بەڵێندەران و خاوەن پیشە تازە دروست

بووەكان لەهەردوو بواری سەربازی و مەدەنی دروست كردبوو كەرقیان لە دەست بەسەراگرتنی ئەو بازنە تەسكە بەسەر داهات و پێگەكان لە دەوڵەتدا گرتبوو . نوری لەو بروایەدا بوو كە لەرێگەی پەرەپێدانی دامەزراوەی ئەمنیی دەوڵەت دەتوانرێ مامەڵە لەگەڵ ئەو هاودژایانە بكرێت بەڵام ستراتیژیەتێكی وا سەرناگرێت ئەگەر هێزە ئەمنییەكان پابەندیەكی تەواویان نەبێت و یاخود میكانزمێك نەبێت كەتوانای لەناوبردنی هەرهەوڵێكی هەبێت كە ئەندامانی هێزە ئەمنیەكان پێی هەڵسن بۆ ئەوەی دەستپێشخەری بۆ ئەوان بێت . هەروەكو چۆن رووداوەكان دواتر دەری دەخە ن ئەمە خاڵی لاوازی سەرەكی پلانەكەی نوری بوو ، كە بەلاوازی رژێمەكەی نەدەزانی لەبەرامبەر كودەتای ژمارەیەكی بچوكی ئەفسەرەكان كەبێ پسانەوەو بێ بەزەیی دژی ژمارەیەكی كەم لەكەسایەتیە سەركردەییەكانی جێگیر لەبەغدا كەسەرووی مەحسوبیەت و دەسەڵاتیان پێكدەهێنا كە مەلەكیەت لە عێراق لەسەری دامەزرابوو ، جێبەجێیدەكەن .

## دووبارە سەپاندنەوەی یاسا

لەگەڵ گەرانەوەی عەبدولئیلا بۆ بەغدا لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ بەیاوەریی ئەو سیاسەتمەدارانەی كەلە لە دەرەنجامی كودەتاكەی مانگی نیسان لە وڵات رایانكردبوو، ژیانی سیاسی لە عێراق گەرایەوە دۆخی جاران. راستە بەریتانیا بە شێوەیەكی راستەوخۆ و بەهێزتر لە ساڵانی رابردوو چووە ناو هاوكێشەكە ، بەڵام سەبارەت بە زۆران، بەریتانیا تا ئەو كات بە شێوەیەكی نیمچە شاراوە هەربوونی هەبوو و ئەوەی روویدا دەركەوتنی بوونەكەی بوو . بە هاندانی بالیۆزخانەی بەریتانیا و عەبدولئیلا حكومەتی نوێی جەمیل مەدفەعی دەستی بە پرۆسەیەك بۆ پاكسازیكردنی لایەنگرانی رەشید عالی كرد. بەڵام كاری چوونە نێو ئەو تۆرە عێراقیە ئاڵۆزە لە بەكرێگرتەو پاشكۆكان سەرۆك وەزیرانی شپرزە كرد و لە مانگی تشرینی یەكەم دەست لە كار كێشانەوەی پێشكەش كرد.

نوری سەعید جێگای گرتەوەو سەرۆکایەتی حکومەتێکی کرد کەسوور بوو لەسەر سەپاندنی یاسای سزاو پاداشت و لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٢ دادگای سەربازی حوکمی غیابی سێدارەدانی بەسەر سێ لەو چوار ئەفسەرە سەپاند کەچوارگۆشەی زێرینیان پێکدەهێنا سەرباری ڕەشید عالی گەیلانیش . تەنیا گەیلانیش کە پەناگەیەکی لە سعودیە دۆزیەوە لەو حوکمە دەربازی بوو و دوای ڕووخانی مەلەکیەت ساڵی ١٩٥٨ گەڕایەوە عێراق . هەروەها چەندین حوکمی دیکە بەزیندانیکردنی درێژ خایەن دەرچوون و سەدان کەس ڕەوانەی بەندیخانەی فاو کران لەڕاستیدا ئەو پرۆسەی پاکسازیەی کەلەنێو سوپادا ئەنجامدرا ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرە دیارەکانی لەسیاسەتی حزبیدا لەسیەکان بەلاوەنا و ڕێوشوێنی هاوشێوەی ئەوەش لەلقەجیاوازەکانی ئیدارەی مەدەنیدا پەیرەو کرا بەتایبەتیش لە وەزارەتی پەروەردەدا .

نوری سەعید گوێی بەو نارەزاییانەنەدا کە دوای ئەم ڕێو شوێنانە بەرز بوونەوە هەتا ئەو نارەزییانەی کەهەندێك لەوەزیرانی حکومەتەکەی کە لەبەرژەوەندی لایەنگرانیان هاتنە ناو مەسەلەکە دەریانبڕی و سالح جەبر کەیەك لەپیاوەکانی نوری سەعید و یەکەم وەزیری شیعەی کاروباری ناوخۆ بوو هاریکاری نوری سەعیدی لەجێبەجێکردنی ئەو ڕێو شوێنانەدا دەکرد . ڕەخنەیەکی زۆر ئاراستەی سالح جەبر کرا چ لەلایەن سیاسەتمەدارە عەرەبە سوننەکانەوە کە ڕانەهاتبوون کەسێکی شیعە لەو پۆستەدا ببینن یان لەلایەن شیعەکانەوە کەپێیان وابوو دەبێت هەوڵی زیاتر بدات بۆ پاراستنی بەرژەوەندی شیعەکان . پرۆسەکانی پاکسازی بوونە هۆی دروست بوونی پۆستی بەتاڵ و هەڵی بەرزکردنەوەی پلە ئەمەش ڕێگە خۆشکەر بوو لەبەردەم سیاسەتی خزم خزمانێ و مەحسوبیەتدا ، هەروەها بووە هۆی سەرلەنوێ سەرهەڵدانی مەسەلەیەك کەدواتر پتر دەردەکەوێت ئەویش نزمی ئاستی نوێنەرایەتی شیعەیە لەئیدارەی دەوڵەتدا بەتایبەتیش لە پۆستە باڵاکاندا لەڕیزی ئەفسەراندا و دەنگی نارەزایی بەشێوەیەکی بەرفراوان دژی حکومەتە یەك

لەدوای یەکەکان بەرزبۆوە کەساڵح جەبر و ئەو حزبەی پێکیدەهێنێت سەرکردایەتی دەکات .

ئەو نیگەرانیەی کەباڵی بەسەر ناوچە کوردییەکاندا کێشابوو لە هەمبەر رەوشی کوردەکان لەدەولەتی عێراقدا گرنگیەکەی کەمتر نەبوو و لەساڵی ١٩٣٩دا ئەمە بووە هۆی دروست بوونی رێکخراوەکانی کوردیی نەتەوەیی هاوشێوەی (هیوا) لەلایەن نەوەی گەنجانی خاوەن پیشە یاخود کوردە لادێییەکان کەترسیان لەو ئاراستە عروبیە هەبوو کەبەسەر شێوازی سیاسی ئەو سای عێراقدا زاڵ بوو . لەساڵی ١٩٤١و لەگەڵ نەبوونی حزبی عروبی عێراق رێکخراوی هیوا و کوردەکان بەشێوەیەکی گشتی سەرقاڵی مەسەلەی باڵادەستی بەغداو گرنگی نەدانی دەسەلاَتدارانی پایەتەخت بەرەوشی ئابووری نا هەموار لە ناوچە کوردییەکاندا بوون . ئەم کۆمەڵە هۆکارە بووە هۆی دووبارە دەرکەوتنەوەی مەلامستەفا بارزانی (برای شێخ ئەحمەد) وەکو سەرکردەی یاخیبوونی چەکدارانەی کورد . پێشتر مەلا مستەفا لەبەندیخانە رایکردبوو و جێپێی خۆی لە ناوچەی بارزان لەساڵی ١٩٤٣ قایم کردبوو ، دواتر لەرێگەی ماجید مستەفا و یەك لەوەزیرە کوردەکان و حکومەتەکەی نوری سەعید لەگەڵ حکومەتدا کەوتە دانوستان . داوا کارییەکانی بارزانی زۆربەیان تارادەیەکی زۆر ناوخۆیی بوون و پەیوەست بوون بە دەرکردنی لێبوردنێکی گشتی لەبەرژەوەندی خۆی و ئەندامانی خانەوادەکەی هەروەها سوککردنی ئەو برسێتیەی کە زۆربەی دێهاتە کوردییەکانی ژێر دەسەلاَتی تێیکەوتبوون بەلاَم داواکارییەکانی هەندێك داواکاری کوردی گشتیتری لە خۆگرتبوو وەکو جوداکردنەوەی ناوچە کوردیەکان لەدەسەلاَتی مووسڵ و دامەزراندنی دەسەلاَتێکی کوردی جودا ، نوری سەعید سەرەرای بەرهەڵستی هەندێك لە شەریکەکانی ، بەشێوەیەکی سەرەتایی رەزامەندی لەسەر داواکارییەکانی دەربری و لەساڵی ١٩٤٤دا رێگەی بە هاتنی مەلا مستەفا بۆ بەغدا دا بۆ رێکەوتن لەگەڵ دەسەلاَتی ناوەندی .

دەربارەی پەیڕەوکردنی دەسەڵات لەناوەندا، نوری سەعید و عەبدولئیلای سەر پەرشتیاری سەر کورسی پادشایەتی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣دا زنجیرەیەك گۆرانکاریی دەستوورییان ئەنجامدا کە دەسەڵاتی مەلیکیان پتەوتر کرد. نوری لەو بڕوایە دابوو بەهۆی پەیوەندییە پتەوەکانی لەگەڵ عەبدولئیلادا ئەو کارانەی وایلێدەکات لە سیاسەتمەدارەکانی دیکە پتر دەردەکەوێت . بەلام عەبدولئیلا ئەمەی بە هەڵ زانی تا رووی لە یاریکەرێکی دیکەی سیاسی سەربەخۆ بکات کە دەرکەوتنی وەکو کەسێکی سیاسی هەڵگری بیروڕای جودا بەرەو ململانێ لەگەڵ نوری سەعیدا دەیبات . عەبدولئیلا دەیویست رۆڵێك بۆ خۆی دروست بکات بەلام ئەو دوودڵی و ڕاراییەی کە پێی ناسرابوو و لاوازی کەسایەتیەکەی وایکردبوو بەردەوام نەبێت لەسەر جێبەجێکردنی ستراتیژیەکانیدا هەروەها شەرمنی و حەزکردن بەتەنیایی و بەوەی کەتەنیا لەنێو بازنەی دۆستە نزیکەکانی ئارام دەبێت وایکردبوو نیازەکانی بۆ بەردەوامبوون لە ژیانی گشتیدا روون نەبێت . لە هەندێك بواردا واپێدەچوو کە شانۆی گشتی سیاسەتی عێراق لە پەنجاکاندا نیگەرانی کردبوون لەو ماوەیەی کە سەرپەرشتیاری کورسی پادشایەتی بوو ئەو سیفەتەی کە پێیدەناسراوە ئارەزوو بوو بۆ تەبەنی کردنی هەندێك لە پرسەکان بە حەماسێکی زۆرەوە کە دواتر دوای چەند مانگێك لێیان دەکشایەوە ئەمەش رەنگدانەوەی بەسەر رۆڵی لە رەوشی ناوخۆیی عێراقدا هەبوو . لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٣٤دا پشێوی لەپەیوەندیەکانی نێوان عەبدولئیلاو نوری سەعیدا کەتا ئەو کاتە باشبوو سەریهەڵدا ، ئەمەش وایکرد لەمانگی حوزەیراندا دەست لەکاربکێشێتەوە و حەمدی پاچەچی لەپۆستی سەرۆکایەتی وەزیران جێگای گرتەوەو ژمارەیەك لە هاوپەیمانانی نوری هەندێك لەوانەی عەبدولئیلا پێی باشبوون هێنایە ریزی حکومەتەکەی . عەبدولئیلا پێیوابوو نوری سەعید توانای حوکم کردنی ولاتی نەماوە ، لەراستیشدا گوێنەدانی نوری بەئاسەوارەکانی هەلاوسانی ئابووری بێتوانایی کەجەنگ بەسەر زۆربەی رۆڵەی دێهاتەکان جێیهێشتبوو وایکرد هەندێك لە هاوپەیمانەکانی پێشووشی لێیدووربکەونەوە .

هەروەها یاسای عورفی رێگەی پێدابوو چاودێری رۆژنامەكان و سەرجەم شێوەكانی چالاكی سیاسی رێكخراو بكات ئەمەش وای لە رەخنەگرانی كرد كەلەرێگەی عەبدولئیلاوە كاربكەن ، لەلایەن خۆیەوە عەبدولئیلاش نیگەرانی خۆی لە نەبوونی چاكسازی كۆمەلآیەتی و ئابووری و ئازادیە سیاسیەكان دەردەبری ، هەرچەندە ئەم بۆ چوونانەی عەبدولئیلا بەئاشكرا بلاْونەدەكرانەوە بەلاْم دەگەیشتە بەرگوێی سیاسەتمەدارەكانی سەردەسەلاْت و بالیۆز خانەی بەریتانیا كە مەترسیەكان پەرەی دەسەند لەبەرامبەر دەرنجامە سیاسیەكانی رژێمە سەركوتكارو پارێزگارەكەی نوری كە رەنگە بتەقنەوە .

لەبەر ئەم هۆیە هەندێك پێشبینی هەبوو كە پاچەچی لەرێگەی وەرگرتنی پۆستی سەرۆكایەتی وەزیران لەحوزەیرانی سالّی ١٩٤٤ هەندێك گۆرانكاری بكات ، بەلاْم زۆری پێنەكرا هەرچەندە كە ژمارەیەك لەوانەی لەسالّی ١٩٤١ دەستگیر كرابوون ئازاد بكات و چاودێری سەر رۆژنامەكانیشی سووكرد ، هەروەها بەهاندان لەلایەن عەبدولئیلاوە سالّی ١٩٤٥ یاسای میری سێرفی دەركردو لەسەرەتادا لە ناوچەی دوجەیلی نزیك كووت جێبەجێكراو ئامانجەكەشی دابەشكردنی زەویەكانی دەولّەت بوو بەسەر ئەو لادێییانەی كە زەویان نیەو فەرمانبەرانی خانەنشینی حكومەت. بەلاْم زۆریەی ئەو زەویانە كەوتە دەست مەللاكە نادیارەكان كە بەكرێ دایانە جوتیارەكان ، لەگەلّ ئەوەش ئەم یاسایە ترسی لەنێو ئەو كوتلە پەرلەمانیە دروستكرد كەبەم دواییانە لەسەرۆك هۆزەكان پێكهاتبوو و دژی وەستانەوە تا ئەو كاتەی كە زانیان ئەمە سەرەتای چاكسازیەكی كشتوكالّی بنەرەتی نیەو دیتیان كە ئەوانیش سودێكی زۆری لێدەبینن .

بەلاْم پاچەچی رووبەرووی شۆرشێكی هەلّچوو بۆوە لەناوچە كوردییەكاندا . بەهۆی رێزنەگرتنی جێگرەوەكەی نوری سەعید بۆ ئەو خالاْنەی كەلەسەرەتاكانی سالّی ١٩٤٤ لەسەری رێكەوتبوون ، مەلا مستەفا دەستی بە شۆرش و رێكخستنی بەرهەلّستیی لەباكووری كوردستان كرد و هاوپەیمانیشی لەگەلّ چەندین لە هۆزەكان بەست ئەوانەی كە نیگەران بوون لەدەست تێوەردانی حكومەت و

گوێپێنەدانی کە ببووە هۆی نانەوەی نارەزایی لەسەرجەم ناوچە کوردیەکاندا . ئەمەش وایکرد مەلا مستەفا داواکارییەکانی لە حکومەت زێدەتر بکات و بەرژەوەندی کوردەکان لەتەرازووی هێزەکاندا لەدەولّەتی عێراق مسۆگەر بکات. بەلاّم رەتکردنەوەی داواکارییەکانی لەلایەن پاچەچیەوە بووە هۆی ئەوەی لە ناوەراستی سالّی١٩٤٥دا بەکردەیی شۆرشی چەکداری سەرهەلّبدات .

سەرەرای ئەوەی لەسەرەتادا هێزەکانی بارزانی سەرکەوتن ، بەلاّم قەبارەی سوپای عێراق و لاوازیی ئەو هاوپەیمانیانەی کە مەلا مستەفا بەستبوونی بووە هۆی سەرنەکەوتنی و ناچاربوو لەگەلّ هێزەکانی لەتشرینی یەکەمی ١٩٤٥دا عێراق بەرەو ئێران جێبێلّێت و بەگەیشتنی بۆ ئێران بووە یەك لە پیاوە بەهێزەکانی کۆماری سەربەخۆی مەهاباد بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد ، کۆمارەکە زۆر بەردەوام نەبوو بەلاّم کاتێك کە هێزەکانی شا لەکانوونی یەکەمی ١٩٤٦دا سەرلەنوێ مەهابادی داگیرکردەوە ، مەلا مستەفا ئەوانەی لەگەلّی بوون سەرلەنوێ بەرەو سنورەکانی عێراق هاتنەوە بەلاّم خۆیان لە رووبەروو بوونەوەی گەورە لەگەلّ هێزەکانی عێراق بە دوورگرت ، بەلاّم لەگەلّ زێدەبوونی فشارەکان بارزانی بریاری دا روو لەشوێنێکی دیکە بکاو لە ئایار تا حوزەیرانی ١٩٤٧دا سەرکردایەتی هاوەلّەکانی کرد لەسەفەرێکی ئەفسووناویدا لەرێگەی چیاکانەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت کە رێگەی بە بارزانیدا لەوێ بمێنێتەوە تا رووخانی مەلەکیەت لەسالّی ١٩٥٨و گەرانەوەی بۆ عێراق .

سەرکەوتنی سەربازیی بەسەر بارزانیدا ناوودەنگێکی زۆری بۆ پاچەچی دروستکرد بەلاّم واپێدەچوو نیگەرانی بۆ عەبدولئیلا نایەوە کە بەردەوامبوو لە بانگەوازەکەی بۆ چاکسازییەکی گشتی بەلاّم هەستی بەوە کرد کەزۆربەی سیاسەتمەداران پشتگوێی دەخەن بۆیە لەکانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا ووتارێکی خوێندەوەو تیایدا بەئاشکرا داوای ئازادی سیاسی زیاتری پێکهێنانی پارتی سیاسی و ئەنجامدانی هەلّبژاردنی ئازاد کرد ، سەرباری جێبەجێکردنی ئەو چاکسازیانەی کەدەبنە هۆی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی زیاتر و سستەمێکی

گەرەنتی کۆمەڵایەتی . ووتارەکەی عەبدولئیلا هاندەرێکی گرنگی بۆ زۆران و هێرشی رەخنگران لە حکومەت زێدەتر بوو ئەوانەی کە بێزار بوون لە بەردەوامی یاسای عورفی لە عێراق و هەستیشیان بە لاوازی پەیوەندی نێوان سەرۆك وەزیران و عەبدولئیلای سەرپەرشتیاری کورسی پادشایەتی دەکرد . پاچەچی دوای ئەوەی هەستی بە لەدەستدانی پاڵپشتی عەبدولئیلا کرد دەستی لەکار کێشایەوەو رێگای بۆ گەیشتنی تۆفیق سویدی خۆشکرد لەشوباتی ساڵی ١٩٤٦دا بگاتە سەرۆکایەتی حکومەت .

## ئازادکردنێکی ئاڵۆز

سویدی لەو ماوە کورتەی دەسەڵاتیدا یاسای عورفی هەڵپەساردو بەندیخانەی فاوی داخست و چاودێری لەسەر رۆژنامەکان لابرد ، هەروەها یاسایەکی نوێی هەڵبژاردنی دەرکرد بە دوو قۆناغی هەڵبژاردن بەڵام وولاتی بەسەر سەد بازنەی هەڵبژاردندا دابەشکرد (لەبری سێ بازنەدا کەپێشتر هەبوون) و لەبنەمادا یاساکە رێگەی بە نوێنەرایەتیەکی گەورەتر لەشارەکانی عێراقدا دەدا کە ژمارە دانیشتوانی لەگەشە کردندابوو. سویدی هەروەها رێگەی بە سەرلەنوێ دامەزراندنی حزبە سیاسیەکانداو دیارترینیان حزبی نیشتیمانی دیموکراتی و حزبی سەربەخۆیی بوون کە نوێنەرایەتی دوو رەوتی سەرەکیان دەکرد کەلە سیەکانەوە لەسەر گۆرەپانەکە بوون . حزبی نیشتیمانی دیموکراتی کە کامل جادرچی و مەحەمەد حەدید سەرۆکایەتیان دەکرد ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی گروپی ئەهالی لە خۆگۆتبوو و داوای دیموکراتیەتی کۆمەلایەتی و چاکسازی سیاسی لەرێگەی پەرلەمانەوە دەکردو ئەندامانیشی رەخنەیان لە بوونی سەربازیی و دەستتێوەردانی بەریتانیا لەکاروباری عێراق دەگرت لەبەرامبەریشدا حزبەکە کەمتر گرنگی بە پرسەکانی جیهانی عەرەبی بەگشتی دەدا . بەلام حزبی سەربەخۆیی کە مەحەمەد مەهدی کوببە ، فایەق سامەرایی و سەدیق شەنشەل سەرکردایەتیان

دەكرد بە پێچەوانەوە گرنگی بە پرسە عەرەبییەكان دەداو ئەندامانی بیرۆكەی نەتەوایەتی عەرەبی و عروبە كەلەسیەكاندا هەبوو ، هەڵگرتبوو . هاوكات رێگە بە دامەزراندنی دوو حزبی سۆشیالستی بچوك درا كەلەراستیدا زۆر بەردەوام نەبوون و جەماوەرێكی زۆریان نەبوو بەلاّم دەركەوتنیان ئاماژەبوو بۆ زێدەبوونی ئاراستەی رەخنەگرتن لە زوڵم و زۆری كۆمەڵایەتی ئابووری لە عێراقدا ، لە هەمان كاتدا حزبی شیوعی داواكارییەكی پێشكەشكرد بۆ پێكهێنانی حزبی رزگاربوونی نیشتیمانی ، لەتشرینی یەكەمی ۱۹٤۱دا چالاكیەكانی حزبی شیوعی چڕتربوون كاتێك كە یوسف سەلمان یوسف (هاورێ فەهد) ئەمینداریێتی گشتی حزبی گرتە دەست و هەوڵێكی زۆریدا بۆ فراوانكردنی ئەندامێتی حزب تالەنێوەندەكانی بیرمەندە شارستانیەكان درێژ بێتەوەو بگاتە گوندە بچوكەكان لە هەرێمەكانی كرێكاران لە ژمارەیەك لە بوارەكاندا ، وەكو بەندەری بەسرەو هێلی ئاسنینی عێراقی نیشتیمانی ولەپیشەسازی نەوتدا .سەرباری ئەوەش هەندێك شانە لە بواری پەروەردەو لە هێزە چەكدارەكاندا بەلاّم لە ئاستێكی بچوكتر پێكهێنرا .

دوای داگیركردنی یەكیەتی سۆڤیەت لە حوزەیرانی ساڵی ۱۹٤۱ لەلایەن ئەڵمانیاوە ، حزبی شیوعی بە دڵگرانیەوە هەڵوێستی لایەنگری لە بوونی سەربازیی بەریتانیا لە وڵات وەرگرت ، بەوپێیەی كە بەشێكە لە پاڵپشتی جەنگیی لەهاوپەیمانان. ئەمەش پەیوەندیی حزبەكەی بە حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراقی باشتركرد. سەرەرای ئەوەی لەسایەی ئەو كۆت و بەندانەدا كاری دەكرد كە حكومەت بەسەریدا سەپاندبوو بەلاّم توانای بلاّوكردنەوەی بۆچوونەكانی و فراوانكردنی رێكخراوەكەی هەبوو و لەگەڵ زێدەبوونی پشێوی لە نێوان یەكێتی سۆڤیەت و وڵاتانی هاوپەیمان دوای ساڵی ۱۹٤٥ حزبەكە سەر لەنوێ چووە پێگەیەكی گونجاوتر و جەماوەری تر ئەویش رەتكردنەوەی توندی بوونی سەربازیی بەریتانیاو رژێمی پادشایەتی بوو لەعێراق .

بوارێكی دیكەی دیاریكراو هەبوو كە حزبی شیوعی تیایدا سەركەوتنێكی گەورەی بەدەست هێنا . لە گوندەكانی ناوچە كوردییەكاندا لە باكوور كە هەستی

نەتەوایەتی کوردی لە گەشەسەندن دابوو هاوکات رەخنەیەکی توونـد لـە نـەبوونی یەکسانی دادپەروەری لەکۆمەڵگەی کوردیدا خەریك بوو دەردەکەوت . هەروەکو لە ناوچە عەرەبیە عێراقیەکانیشـدا بـاوبوو ، زۆر شـت هـەبوو کـە بگوترێـت لـەبارەی دابەشـکردنی داهاتـەکان و دەسـەڵاتدا کـە کەمینەیـەك لـە گـەل لـەدەرەنجامی ناعەدالـەتی موڵکیـەتی کشـتوکاڵی هـەیانبوو و کاریگـەری بەسـەر ژیـانی زۆرینـەی زۆری کوردەکانـدا . تـا ئـەو کاتـە سـەرکردەکانی یاخیبوونـە چـەکدارییەکان لـە خودان زەوی و زارەکان بوون کە هەوڵی وەدیهێنـانی بەرژەوەنـدی تاکـە کەسـی و هۆزگـەریان دەدا ، ئەگـەر بـۆ وەدەسـتهێنانی پاڵپشـتیش پـەنایان بـۆ وروژانـدنی هەستی نەتەوایەتی کوردی بردبێت . ئەمە بووە هـۆی دەرکـەوتنی شـێوازێکی زۆر توونـدرەوی نەتـەوەیی کـوردی لەشـارەکان ، کەلـە رێکخراوەکـانی وەکـو حزبـی شـیوعی کـوردی یـاخود (شـۆرش) کـەرۆڵێکی سـەرکردایەتییانەی هـەبوو لەدامەزراندنی بزوتنەوەی رزگاری کورد کە کوردانی نەتەوەیی و سۆشیالستەکانی لـە خـۆ دەگـرت . کـوردانی دیکـەش هاتنـە ریـزی حزبـی شـیوعی عێراقـی کەبـە رەخنەگرێکی چالاکیان بۆ ئەو رەوشەی هەبوو دادەنا سەرباری ئەوەی کە حزبەکە هۆکـارێکی گەیشـتن بـوو بـە ئەگـەری پاڵپشـتی سـۆڤیەتی بـۆ پـرۆژەی رزگـاری نیشتیمانی .

لەگـەڵ نـەمانی چـاودێری بەسـەر رۆژنامـەکان و هەڵپەسـاردنی یاسـای عـورفی چالاکیەکانی حزبە بچوکەکانی ئۆپۆزسیۆن لەشارە گەورەکاندا بەتایبەتیش بەغدا پـتر روون بـوون و واپێدەچـوو چـالاکیەکانی حزبـەکانی ئۆپۆزسـیۆن و ئـەو سـەندیکایانەی کـەتازە پێکهـاتبوون قۆناغێـك لـە زێـدەبوونی نـارەزایی دەربرینـی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکەن هەربۆیە لەبەندەری بەسرە چەندین مان گرتن روویانداو پشـێویش لـەنێو بێکـارانی هێڵـی ئاسـنینی عێـراق بـەردەوام بـوو هاوکـات بـاری ئابووری زۆربەی عێراقیەکان لەماوەی پێنج ساڵی رابردوودا بەشێوەیەکی بەرچـاو تێکچوو بوو ، نرخی زۆری دانەوێڵە (کەتا ئەو کات لەسەرووی هەناردەکان دابـوو) نەك تەنیا لە عێراق بەڵکو لەسەرجەم ناوچەکەدا خاوەن زەوی و زارو بازرگانەکانی

هاندابوو بۆ سوود وەرگرتن لەو هەلآنەی کە بۆیان رەخسابوو بۆ هەناردەکردن ئەمەش وایکرد کەل و پەلەکانی خۆراك لە عێراق کەم بێتەوەو لە هەندێ ناوچەی ولآتدا بەتایبەتیش ناوچە کوردیەکان هەژاریەکی راستەقینە تائاستی گرانی و برسێتی دروست بکات . ئەو مان گرتنانەی کەلەو مانگانەدا روویانداو تارادەیەك ئازادی تێدابوو سەرجەمیان ئامانجیان زێدەکردنی مووچەو باشترکردنی گوزەرانی کرێکاران بوو بەشداریکردنی حزبی شیوعیش لەم مان گرتنانەدا دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کەلە بنەرەتدا ئەو حزبە بەنهێنی لەریزی هێزی کرێکاران بوو لەو کارگانەدا ، سەبارەت بە بەریتانیەکان کە گرنگیەکی ستراتیژیان بە بوارە پیشەسازیە گەورەکانی هەناردەکردن و نەوت دەدا ئەو مان گرتنانەو ئەو سەندیکایانەی کە پروپاگەندەیان بۆ دەکرد دەستدرێژیەکی گشتی بوو بۆسەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە کاتێکدا کە زۆر لە ئەندامانی دەستە بژێری دەسەلآتدار بزوتنەوەی راستەوخۆ لەرێگەی کاری رێکخراوەیی و بەشداری کردنی حزبی شیوعی تێیدا بە پێشەکیەکیان دادەنا بۆ چالآکیەکی شۆرشگێری فراوانتر ، و کاتێك کە رۆژنامەوانیی ئۆپۆزسیۆنیش گەشەیکرد ، هەستێکی دروستکرد کە سویدی کاتێك رێگەی بە ئۆپۆزسیۆندا چالآکی ئەنجامبدات کۆنترۆلی لەدەستداوە .

لەئایاری سالی ١٩٤٦دا سویدی دەستی لەکار کێشایەوەو ترسەکانی دەستە بژێرانی سیاسەتی عێراقی گەیشتە سەرپەرشتیاری سەر کورسی پادشایەتیش کە تەنیا بەر لەشەش مانگ پالپشتی لە پێویستی بۆ چاکسازی کۆمەلآیەتی و زێدەکردنی ئازادیەکان دەکرد ، هەربۆیە بریاری دامەزراندنی ئەرشەد عومەری بەسەرۆك وەزیران دا بەو هیوایەی کە ئۆپۆزسیۆن رابگرێت بەلآم رێوشوێنەکانی گومانی لای عەبدولئیلاو ئەوانی دیکەش لەتواناکانی بۆ کەمکردنەوەی پشێوی کۆمەلآیەتی پەرەسەندو دروستکرد . لەگرنترین ئەو رووداوانەش کە ئەوکات روویاندا ئەوە بوو کە لەتەمموزی سالی ١٩٤٦دا نزیکەی ٥٠٠٠کرێکاری کۆمپانیای نەوتی عێراقی لەکێلگەکانی کەرکوك بۆ نارەزایی دەربرین لەبەرامبەر کەمی مووچەو رەوشی کارکردن مان گرتنێکیان راگەیاندو بە تەقفەکردنی پۆلیس لە

کرێکاران و کوژرانی ژمارەیەکیان کۆتایی هات . ئەم ڕووداوانەش نارەزاییەکی زۆری دروستکرد کە عومەری بە پرۆسەیەکی دەستگیرکردن و داخستنی ڕۆژنامەکان وەڵامی دایەوە .

لێرەدا گرنگ بوو کە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لەو ماوەیەدا بتوانێت کۆنگرەی دامەزراندنی خۆی لە ئابی ١٩٤٦ لەبەغدا ببەستێت . ئەو حزبە کە لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی و حزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد دروست بوو تارادەیەکی زۆر لەلایەن هاوپەیمانانی بارزانییەوە ڕێکخرابوو ئەو حزبە پەیرەوی بەرنامەیەکی نەتەوەیی کردو بارزانی بەسەرۆك هەڵبژارد . حزبەکە بەسەروەری دەوڵەتی عێراق رازیبوو و بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێشیش دەربارەی مەسەلەکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی یان ئابووری بێدەنگ بوو . بارزانی هێشتا لە کۆماری مەهاباد بوو لە ئێران لەگەڵ ئەوەش بارزانی لە پەیوەندی دابوو لەگەڵ حکومەتی عێراق و پێشنیاری کرد کەپێکهێنانی ئەو حزبە سەرجەم ڕێکخراوە کوردیەکان لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا لە خۆدەگرێت و بەمەش ئاماژەیەکی دا بۆ ئەوەی کە دەتوانێت سنورێك بۆ حزبە توندرەوەکان دابنێت . لەبەرامبەر مان گرتنەکانی کەرکوك و چالاکیەکانی حزبی شیوعی لە ناوچە کوردیەکاندا عومەری پێشوازی لە بزوتنەوەیەکی نیشتیمانی کوردی کرد لە ژێر کۆنترۆڵی سەرکردەیەك کە بەهیوای ئەنجامدانی گۆرانکاری بنەرەتی نیە . لەگەڵ ئەوەش کاتێك کە مان گرتنەکانی کرێکارانی هێڵی ئاسنین و کرێکارانی چاپخانەکان لەبەرامبەر سیاسەتە سەرکوت کارانەکەی عومەری دووبارە بوونەوەو نەمانی متمانەی عەبدولئیلاو بەریتانیەکان بە عومەری وایکرد ناوبراو لە تشرینی دووەمی ١٩٤٦دا دەستی لەکار کێشایەوە .

لەسایەی ئەم بارودۆخەدا عەبدولئیلا سەرلەنوێ ڕووی لە نوری سەعید کرد کە بەپیاوێکی دادەنا توانای ئەوەی هەیە هەمان سیاسەتی دیکتاتۆریانە بگرێتە بەر بەڵام زیرەکانە تر . نوریش دەستی کرد بە سەلماندنی توناکانی پشێویەکی لە نێو ریزەکانی حزبەکانی ئۆپۆزسیۆندا دروستکرد کاتێك کە ژمارەیەك لەوانەی بە

وەرگرتنی پۆستی وەزاری رازیکردو فەهدو چەند سەرکردەیەکی دیکەی حزبی شیوعی عێراقیش دەستگیر کران کە بووە هۆی هەڵپەساردنێکی کاتی زۆربەی چالاکیەکانی حزبەکە . دواتر هەڵبژاردنی گشتی لە ئاداری ۱۹٤۷دا ئەنجامدراو زۆرینەیەکی لایەنگری رەوشەکەی گەراندەوە سەر دەسەلآت . نوری داواکەی عەبدولئیلای بۆ پێکهێنانی حکومەت رەتکردەوەو لەبری ئەوە پێشنیاری ساڵح جەبری شەریکی خۆی بۆ ئەو پۆستە کردو بووە یەکەم سەرۆك وەزیزانی شیعە ، ئەمەش بوارێکی فراوانتری بۆ نوری سەعید رەخساند بۆ کارکردن و توانی لەپشت پەردەوە قەڵەمرەوی خۆی پەیرەو بکات بۆ ئەوەی نارەزایی حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن یان دوژمنایەتی عەبدولئیلا لەماوەی سالی داهاتوودا بورووژێنێت .

## سیاسەتی دەرەوە : پرسە عەرەبیەکان ، فەڵەستین و رێککەوتنامەی پۆرتسماوس

واپێدەچێ بریارەکەی نوری بۆ خۆهێشتنەوە لەدەرەوەی بازنەی رۆشنایی دەگەرێتەوە بۆ دوو کێشە کە خەریك بوو لەئاسۆدا دەردەکەوت . یەکەمیان پرسە عەرەبیەکان بەگشتی بەتایبەتیش پرسی فەڵەستین . ئەم پرسانە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی بەچەندین رێگە هاتنەوە سەرگۆرەپانەکە . نوری بەردەوام بوو لەسەر هەوڵەکانی بەدوای بیرۆکەی دامەزراندنی فیدرالیەتێك بۆ دەوڵەتە عەرەبیەکان لە کەوانەی بەپیت ، سەرەرای ئەو گومان و نارەزاییە فراوانەی کە سەرکردەکانی دیکەی عەرەب دەریان بری بەتایبەتیش لەمیسر و سعودیە . هەروەها عەبدوڵلا رازی نەبوو بە پلانێك کە واپێدەچوو بۆ تێکدانی خەونەکەی لەبارەی (سوریای گەورە)و دروستکردنی رۆڵێکی سەرکردایەتی بۆ عێراق ـ و لقی عێراقیی خانەوادەی هاشمی ـ لە فەڵەستین و رۆژهەلآتدا دارێژرابوو . لە راستیدا ئەگەر ئەوە بەشێکیش بوویێت لە پلانە دوورمەودایەکەی نوری

سەعید بەلاّم تا ئەوئاستەش واقعبین بوو کە هەستبکات عێراق بەتەنیا ناتوانێت ئەوە بەدەست بێنێت لەبەرامبەر ئەو بەرهەڵستکاریە فراوانە .

بەم شێوەیە ، نوری بە ناوی عێراق لە نزیکەوە بەشداری لە دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبیدا کرد لە نێوان ساڵی ١٩٤٤-١٩٤٥، کە وەکو گۆرەپانێك تەماشای دەکرد بۆ کۆکردنەوەی دەوڵەتە عەرەبیەکان و دەرگاکەش بە کراوەیی جێدێڵێت لە بەردەم دامەزراندنی فیدراڵیەتێك لە دوارۆژدا. لە هەمان کاتدا، موکر بوو لە سەر ئەوەی کە نابێت کۆمکاری عەرەبی هانی لایەنگرانی ئایدلۆژیای عروبە لە عێراقیەکان بدات یاخود هاریکاری دەرەکیان پێشکەش بکات کە لەسیەکانەوە هەوڵی مانەوەیانی دەدا لە ژێر کۆنترۆڵدا . میساقەکەی کۆمکاری عەرەبی رێك لەگەڵ ئەوەی کە نوری دەیویست گونجاو بوو لەبەر ئەوەی تەئکیدی کردەوە سەر بنەمای سەروەری و سەربەخۆیی دەوڵەتانی ئەندام و تەنها ئاماژەیەکی سادەی لە خۆ گرتبوو بۆ عروبە . بەلاّم نوری سەعید لە یەکەم سکرتێری گشتی کۆمکاری عەرەبی کە ، عەبدولرەحمان عەزامی بەرەگەز میسری رازی نەبوو ، کەوەکو پیاوێکی وا سەیری دەکرد لایەنگری هزری رۆمانسیەتە لەبارەی یەکێتی عەرەبی، کە خۆی کەم ئارام بوو بەرامبەری.

نوری هەستی بە گرنگی جیهانی عەرەبی سەبارەت بە عێراق دەکرد ، بەلاّم بە هۆی تێگەیشتنی لە بەرژەوەندیەکانی عێراق هەستی بەوە کرد کە پێویستە سیاسەتی دەرەوەی گرنگیەکی گەورە بە وەدەستهێنانی دۆستایەتی هاوسێکانی بدات لە باکورو رۆژهەلاّتدا کە کەمتر نەبێ لەو گرنگیەی کەبە جیهانی عەرەبی دەدات ، بەلاّم لەساڵی ١٩٤٦دا کاتێك کە پەیماننامەی دۆستایەتی لەگەڵ هەریەك لەتورکیا و ئەردەن تاوتوکرد بۆی دەرکەوت کە زۆربەی سیاسەتمەدارانی دەسەلاّتدار و عەبدولئیلاش لەگەڵ رایەکەی ئەو دانیە چونکە بەردەوامی گومانەکان لە چاو تێبرینی هەرێمایەتی تورکیا لە باکووری عێراق و مەسەلەی ئەسکەندەرۆنە باڵی کێشابوو بەسەر رای زۆربەی سیاسەتمەدارە عێراقیەکان لە هەمبەر تورکیا . کشانەوەی هێزەکانی فەرەنساش لەساڵی ١٩٤٦ توندی ئەو

رایانەی زێدەتر کردو هیواکانی عەبدولئیلاو کەسانی دیکەشی بە دروستکردنی یەکێتیەك لەنێوان سوریاو عێراقدا لە سۆنگەی نەتەوایەتی یاخود پادشایەتیەوە زیندوکردەوە روون و ئاشکراش بوو کە لە حاڵەتی ئەردەندا مەسەلەکە مەسەلەی یەك خانەوادەیی پادشایەتیە . بەڵام بەهۆی ئەو حەماسەتە دیارەی کە عەبدوڵلای پادشای ئەردەن ( مامی عەبدولئیلای سەرپەرشتیاری کورسی پادشایەتی عێراق کە نزیکەی سی ساڵ لەو گەورەتر بوو ) دەربری لەکاتی خستنە رووی مەسەلەی هەرلقێك لە لقەکانی خانەوادەی هاشمیدا دیار بوو کە ئەو لە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی ئەوی دیکەدابوو . نوری رووبەرووی ئاستەنگێکی وا نەبۆوە لە رازیکردنی عەبدولئیلای سەرپەرشتیاری کورسی پادشایەتی عێراق بەوەی کە هەر رێکەوتنێك لە پەیماننامەی دۆستایەتی زیاتر بێت دەرەنجامەکانی باش نابێت .

لە ساڵی ١٩٤٧ روون و ئاشکرا بوو کە چاو تێبڕینەکانی عەبدولئیلاو ئەوانی تر لە جیهانی عەرەبی دا گەورەتردەبێت و ، پرسی فەڵەستینیش زیاتر لە پرسەکانی تر، دەبێتە مایەی ناکۆکیەکی گەورە. لە شوباتی ١٩٤٧دا بەریتانیا کێشەکەی ئاراستەی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد . ئەوەش مانای ئەوەبوو کە بەریتانیای مەزن دەست لە ئینتیداب و بەڵگەنامەی سپی ساڵی ١٩٣٩ بەردەدات ، لە هەولێکیش بۆ پاراستنی یەکێتی فەڵەستین و زۆرینەی عەرەبی تێیدا نوری هەوڵی دانانی دەقێکی جودای بۆ دەدا . کشانەوەی بەریتانیا ئیمکانیەتی ئەوەی خستەروو کە رەنگە کاریگەری ئیجابیانەی بەسەر عەرەبەکانی فەڵەستیندا نەبێت ئەمەش هەستی عروبیەتی لە عێراق و وولاتانی دیکەی عەرەبیش ورووژاندو حکومەتەکانی ناچار کرد هەندێك رێگە چارە بگرنە بەر کە لەوانەیە لەرەوشێکی جودادا خۆیان لێلابدابا . بەهۆی ئەم مەسەلە ئاڵۆزانەی جیهانی عەرەبی شتێکی سەیر نەبوو ئەگەر نوری لەو مانگانەدا خۆی لە دەرکەوتن بە دووربگرێت .

هۆیەکی دیکەش بۆ ئەمە هەبوو . چونکە هاتنەوەی پرسی پەیماننامەی بەریتانی ـ عێراقی بۆ گۆرەپانی وتوویژ بەهەمان شێوە مایەی ورووژاندنی کێشەو هەستی نارەزایی بوو لەعێراق و ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی کە وایکرد بەریتانیا

دوودڵ بێت لە سەر لەنوێ خستنە رووی پەیماننامەکە لە١٩٣٠دا چونکە نمونەیەك بوو بۆ زۆربەی ئەو شتانەی کە عێراقیەکان لە پەیوەندی وڵاتەکەیان لەگەڵ بەریتانیا رقیان لێیبوو، سەرەرای ئەوەی پرسێکی زۆر پێویست نەبوو بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەر حکومەتێکی عێراقی دەرگای وتووێژ لەبارەی پەیماننامەی ١٩٣٠ بکاتەوە پێویست بوو لەسەری داوای چوونە دەرەوەی کۆتایی سوپای بەریتانیاو پێدانەوەی هەردوو بنکەی ئاسمانی سەرەکی بەعێراق بکات . لەبەر ئەم هۆیەش سالح جەبر دوای وەرگرتنی سەرۆکایەت حکومەت لە ئاداری ١٩٤٧دا بەپەلە دەرگای سەر لەنوێ دانوستانی کردەوە بەو هیوایەی شکۆی وەدیهێنانی کشانەوەی کۆتایی بەریتانیای بەرکەوێت .

گفتوگۆ لەگەڵ بەریتانیای مەزن بە نهێنی دەستپێکرد بەهۆی ترسی هەردوولا لەوەی کە دانوستاندنی بە ئاشکرا پشێویەك لە شەقامی عێراقیدا دروستبکات و چەندین حزبی سیاسی کە دەیانەوێت کۆتایی بە هەموو شێوازەکانی هەژموونی بەریتانیا بێنن دەست بەجموجۆڵ بکەن . بە هاتنی کانونی یەکەمی ١٩٤٧ گەیشتنە رێککەوتنێك و زۆربەی عێراقیەکان لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا تووشی سەرسورمان هاتن بەوەی کە گفتوگۆکان لەئارادا بووە . لەگەڵ واژۆکردنی رێککەوتنامە لە پۆرتسماوس لە ١٥ی کانونی دووەمی ١٩٤٨دا برگەکانی ئاشکرا بوون. سەرەرای بەڵێندانی رێککەوتنامەکە بەکشانەوەی یەکجارەکی هەموو هێزەکانی بەریتانیا و پێدانەوەی هەردوو بنکە ئاسمانیەکەی سەربە هێزی ئاسمانی شاهانە ، بەڵام ئەنجومەنێکی بەرگری هاوبەشی دروستکرد کە پێکهاتبوو لە فەرمانبەرانی بەریتانی و عێراقی بۆ سەرپەرشتیکردنی پلاندانانی سەربازیی عێراقی. سەرباری ئەوەش رێککەوتنامەکە رێگای بەریتانیا دەدا کە هەردوو بنکە ئاسمانیەکە لە کاتی جەنگدا وەربگرێتەوە . هەروەها لە رێکەوتننامەکەدا هاتبوو کە دەبێ عێراق لەبواری تەموین و مەشف و راهێناندا پشت بە بەریتانیا ببەستێت . هەروەکو زۆر کەسیش ئەو مەترسیەیان هەبوو ماوەی رێکەوتنامەکە بیست و

پێنج ساڵ بوو کە هەژموونی بەریتانیای لە عێراقدا هەتا ساڵی ١٩٧٣ دیلێتەوە ، واتە (١٥) ساڵ دوای کۆتایی هاتنی بەرواری رێککەوتنامەکەی ١٩٣٠.

رێکەوتنامەکەو ئەو رێگایەی وتووێژەکانی پێ ئەنجامدرا نارەزاییەکی زۆری نایەوەو بووە هۆی خۆنیشاندانی نارەزایی لە بەغدا ، بەتایبەتیش کە حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن هەوڵی پرکردنی جەماوەریان دەدا دژی رێکەوتننامەکەو چوونی زۆربەی وەزیرەکانی حکومەت بۆ بەریتانیا بۆ ئامادەبوون لە ئاهەنکی واژۆکردنی رێکەوتنامەکە هەستێکی بەبۆشایی حکومی دروستکردو ئۆپۆزسیۆنیش بەپەلە ئەوەی قۆستەوەو بەرهەڵستکاریی گەیشتە ئاستێك کە وای لە عەبدولئیلا کرد هەست بەترس بکات و رایبگەیەنێت کە رێکەوتنامەکە پەسند ناکات . ئەو راگەیاندنەی عەبدولئیلا کاریگەری نێگەتیڤانەی بەسەر ساڵح جەبردا هەبوو کە لەکاتێکدا گەرایەوە بەغدا خۆنیشاندان و نارەزاییەکان بەردەوام بوون . رۆژێك دوای گەرانەوەشی گەورەترین خۆنیشاندان روویداو لەلایەن پۆلیسەوە تەقەی لێکراو ژمارەیەکی زۆر قوربانی لێکەوتەوە .

بەهۆی ئەوە نزیکەی بیست پەرلەمانتار دەستیان لەکار کێشاوە لەگەڵ دوو وەزیری حکومەتەکەی جەبردا. لێرەدا عەبدولئیلا سووربوو لەسەر دەست لە کارکشانەوەی ساڵح جەبر و مەحەمەد سەدر کە سیاسیەتمەدارێکی شیعە بوو بەپێکهێنانی حکومەتێك راسپارد کە زۆربەی ناحەزانی نوری سەعید و ساڵح جەبر لە خۆگرتبوو. دامەزراندنی سەدر ئەوەی دەرخست کە عەبدولئیلا هەستی بەو کێشە تایفیە دەکرد کە خەریك بوو لە ئاسۆدا دەردەکەوت و خۆنیشاندانەکان هەلێك بوو بۆ دەربرینی . ساڵح جەبر یەکەم سەرۆك وەزیرانی شیعە بوو لە عێراقدا ئەم دەرچونەش لەوەی کە باوبوو سەبارەت بە کۆنترۆڵی سوننە بەسەر حوکمدا نارەزایی لای هەندێك کەس نایەوەو حەساسیەتیشی لای هەندێکی دیکەش دروستکرد و سەرەرای ئەو هێمنیەی کە باڵی کێشابوو بەلام ئەو نارەزاییانەی کە بەهۆی ئەم هەنگاوە دروستبوو بەفراوانی سەرکوتکران . لەگەڵ ئەوەش خۆنیشاندانەکان لەدژی حکومەت بووە هۆی ئاراستەکردنی رەخنەی تایەفی دژی

سالح جەبر و بەخاین و کرێگرتەی بەریتانیای مەزن تاوانبار کرا . نارەزاییە زۆرەکان لە هەمبەر رێکەوتنامەی پۆرتسماوس رێگەی بە حزبەکانی ئۆپۆزسیۆندا کە لە داواکاریەکانیاندا حکومەت تاوانبار بکەن و خودی سستەمی پادشایەتی ئیدانە بکەن سەرباری نارەزایی لە هەمبەر رەوشی خراپی ئابووری زۆربەی دانیشتوانی بەغدا و کێشە ئابووریەکان لەدەرەنجامی ئەو قەیرانە داراییەی کەلە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٧دا روویدا زێدەتر بوو ولەکانوونی دووەمی ساڵی١٩٤٦دا جەماوەر بۆچەند رۆژێك لە شەقامەکانی پایتەخدا کۆدەبوونەوەو ئەم رەوشە کاریگەریەکی ئاشکرای بەسەر عەبدولئیلادا هەبوو و هەروەها رۆڵیشی لەبریاردان لە چارەنووسی حکومەتدا هەبوو .

سەرۆك وەزیرانی تازە دیتی کە سەرەرای وازهێنانی حکومەت لە رێکەوتنامەی پۆرتسماوس بەلام هەر رووبەرووی خۆنیشاندانی بەردەوام بۆوە ، سەرەرای ئەوەی خۆنیشاندانەکان بەقەبارەی ئەوانەی پێشتر نەبوون و پۆلیسیش بە توندی رووبەروویان نەبۆوە بەلام فشارێکی زۆریان دروستکرد و سەدر لەرێگەی بەڵێندان بە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی هەوڵی سوکردنی دا بەلام هەرزوو دیتی کە دەسەلاتی بەسەر شەقامدا نەماوە وەکو کە لەو باوەرەدا بوو ، خۆنیشاندانەکان هەر بەردەوامبوون بەهۆی توانای رێکخراوەکانی دیکە کە زۆربەیان سەر بە حزبی شیوعی عێراقی بوون بۆ هێنانی خەڵك بۆ سەر شەقام . لەئاياری ١٩٤٨ بەشێوەیەکی کتوپر خۆنیشاندانەکان کۆتاییان پێهات کاتێك کە حکومەت لەگەڵ سەرهەڵدانی شەر لەفەلەستیندا یاسای عورفی راگەیاند و بەمەش زنجیرەیەك لە رووداوەکان کە لەعێراقدا بەناوی هەستانە سەرپێ (الوثبة) ناسراوە کۆتاییان پێهات . ئەم رووداوانە ئاماژەیەك بوون بۆ گۆرانێکی جۆریی لەو قۆناغەدا لە رووی چالاکی سیاسی و تێکەڵبوونی جەماوەری شارەکان تێیدا دواتریش والێکدرایەوە کە رێگە خۆشکەر بوو بۆ رووخاندنی پادشایەتی لەساڵی ١٩٥٨دا هەرچەندە کە نابێت ئەو رووداوانە قەبارەیەکی لەرادەبەدەری پێبدرێت بەلام ئەم

ڕووداوامە ڕێگەی بەهەندێك لە حزبەکاندا لەعێراق کە سەر لەنوێ هێزی شەقام لەسیاسەتی عێراقیدا بدۆزێتەوە ئەمەش هاندەرێکی گەورە بوو بۆ کارکردن .

لەو هەڵبژاردنەی کەلە حوزەیراندا لەسایەی یاسای عورفیدا ئەنجامدرا ، حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن لەکۆی (١٣٨کورسی) تەنیا ٧ کورسیان بردەوە و ئەمەش ئەو ئاستەنگانەی دەربری کەلەمیانەی کارکردن لەڕێگەی دامەزراوە فەرمیەکانی دەوڵەت ڕووبەڕوویان بۆوە هەروەکو باوبوو ئەو دامەزراوانە لەژێر کۆنترۆڵی کەسانێك بوو کە پلەو پایەی دیاریکراویان هەبوو چ لەگوندەکان بن یان لەشارەکان بەهۆی سەرچاوەی سەربەخۆی داهاتەکانیان یان بەهۆی پاشکۆیەتیان بۆ سەرپەرشتیاری سەرکورسی پادشایەتی یان کەسانی دیکەی خاوەن هەژموون ، لەڕاستیدا توانای نوری سەعید و ساڵح جەبر بۆ مسۆگەرکردنی بردنەوەی ژمارەیەکی زۆری لایەنگرانیان بەکورسیەکانی پەرلەمان سەرەرای ئەو هەوڵانەی کە حکومەت دای بۆ ڕێگەگرتن لەوە سەلمێنەری هەژموونی نافەرمی ئەو دووکەسە بوو .

دوای کۆتایی هاتنی هەڵبژاردن مەحەمەد سەدر دەستی کێشایەوە لەسەرۆکایەتی وەزیران و عەبدولئیلا موزاحیم پاچەچی بۆ پێکهێنانی حکومەت ڕاسپارد کەزۆر لەوەی پێشو دەچوو بەلاَم دابەشبوونی نێو خۆیی وەزارەتەکە وایکرد توانای بەرگەگرتنی ئەو زنجیرە کارەساتانەی نەبێت کەلەدەرەنجامی شەری فەلەستیندا ڕوویاندا . لەمانگی ئایاردا عێراق ٣,٠٠٠سەربازی ڕەوانەی بەرەی شەرکردو لەچەند مانگی دوای ئەویش ١٥,٠٠٠دیکەی ڕەوانە کردو بەمەش گەورەترین هێزی عەرەبی بوون لەفەلەستین ، سەربازانی عێراق سەرکەوتووانە بەرگریان لە سێگۆشەی جەنین ــ نابلوس ــ تولکەرەم کرد بەلاَم شکستهێنانیان لەوەی کەهیچ هێرشێك بکەن سەرباری ئەو گومانانەی هەیانبوو لەوەی کە ئامرازێکن بەدەست عەبدوڵلای شای ئەردەن و تەنیا بەکاریهێناون لە هاوکاریکردنی لە خستنە سەر فەلەستین بۆسەر مەملەکەتەکەی عێراقی ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر کردەوە ، کاتێکیش کە شکستە سەربازییەکانی سوپا عەرەبیەکان بووە هۆی ڕازیبوون بە ئاگربەست

لەحوزەیران و تەمووزی ساڵی ١٩٤٨دا رەوشەکە خراپتر بوو و ئیدیعای حکومەت لەبارەی سەرکەوتنی عەرەب بەدرۆ دەرچوون و بەمەش هەلێك بۆ هێزەکانی ئیسرائیل رەخسا بۆ بەردەوامیدان بە هێرش بۆ سەر جەلیل ، ئەللەد / رەملەو دواتریش بیابانی نەقەب .

سادق بەسسامی وەزیری بەرگری ئەوهەلەی قۆستەوە بۆ تەنگ پێهەلچنینێکی رێك دژ بە رەوندی جولەکەکانی عێراق، کە وەلایان زیاتر لەجاران بووە مایەی گومان بزاوتی جوولەکەکان کۆت و بەندی خرایە سەرو رێگەیان پێنەدرا هەندێك کاری حکومی بگرنە دەست و پەنابردرایە بەر ئەنجومەنەکانی سەربازیی بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ زیندانیکردن و ترساندنیان و حوکمی لە سێدارەدان بۆ ژمارەیەك لە کەسایەتیە دیارەکانیان دەرچوو بە تۆمەتی هاوکاریکردنی دەوڵەتی نوێ ی ئیسرائیل وەکو کە ئیدیعا کرا . بەلام دەنگی نارەزایی جیهانیی کە دوای ئەوە بەرز بۆوە ، رێگەی بە سەرۆك وەزیران و رکابەرانی سیاسی بەسسام دا بۆ دەرکردنی لە وەزارەت ، بەلام ئەم هەنگاوە سنورێکی بۆ ئەو هەستکردنە پەرەسەندوە دانەنا کە هەرەشەی لە رەوەندی جولەکە دەکرد بەهۆی شکستە یەك لەدوا یەکەکانی سوپا عەرەبیەکان .

ئەو رووداوانە دواتر بوونە پێشەکیەك بۆ لەناوچوونی رەوندی گەورەو کۆنی جولەکە لە عێراق (لە ساڵی ١٩٤٧ ژمارەی جولەکەکان ١١٧,٠٠٠ جوولەکەبوو واتە ٢,٦٪ی گەلی عێراق) لەگەڵ سەپاندنی ئینتیدابی بەریتانی بەسەر فەلەستین و عێراق لە یەك کاتدا ، رەوندی جولەکە خۆی لە بارودۆخێکی خراپدا دۆزیەوە لە ناو دەوڵەتی عێراقی نوێدا . زوو بە زووش جولەکەکانی عێراق تاوانی ئەوەیان ئاراستە کرا کە بەکرێ گیراوی دەسەلاتداریێتی بەریتانیان لە عێراق و کار بۆ خزمەتکردنی پرۆژەی سەهیۆنیەت دەکەن لەفەلەستین ئەو پرۆژەیەی کە ئینتیداب ئاسانکاری بۆ جێبەجێکردنی کرد . لەسیەکاندا و لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆرشی عەرەبی لەفەلەستین و پەرەسەندنی هەستی عروبیەتی دژ بە سەهیۆنیەت لەعێراق رۆژنامەکە پتر لە هەرکاتێکی رابردوو هێرشیانکردە سەر جوولەکەکان و لەبەغدا

دەستدرێژیان کرایە سەرو ئەمەش هانی سەرکردەکانی ڕەوەندی جوولەکەی دا کە بەئاشکرا لای حکومەتی عێراق نارەزایی دەرببڕن .

ئەو هەوڵە گشتیانەی سەرکردەکانی ڕەوەندی جوولەکە دایان بۆ بروا پێهێنانی عێراقیەکان بەوەی کە پشتگیری لە دامەزراوەی سەهیۆنیەت لە فەلەستین ناکەن ، بەراورد نەدەکرا بەقەبارەی تۆمەتەکانی نێوەندە نەتەوەییە عەرەبیەکانی یانەی موسەننا و بەهاندانی فەرمی ئەفسەرانی سوپا کەلەکۆتایی سیەکاندا دەستیان بەسەر سیاسەتی عێراقیدا گرتبوو ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی ڕەوەندی جوولەکە دەکرا جیاوازی لە نێوان ناسنامەی سەهیۆنیەت و یەهودیەت نەدەکرا بەڵکو هەردووکیانی سوککردو کاریگەریە مەترسیدارەکانی لە فەرهودەکەی ساڵی ١٩٤١دا دەرکەوت . سەبارەت بە زۆر لە جوولەکە عێراقیەکانیش ئەمە ئاماژەیەکی روون بوو نەك تەنیا بۆ لەرزۆکی رەوشەکەیان لە عێراق بەڵکو بۆ گرنگی پێنەدانی ئاشکرای هەردوو دەسەڵاتداریتی عێراقی بەریتانی بە چارەنووسیان .

لەکۆتاییدا شکستی عەرەبەکان لەفەلەستین پاڵی بە عێراقیەکان وەنا لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٩دا حکومەتەکەی پاچەچی بروخێنن . دوای شکستەکەی سوپای میسر و گەمارۆدانی لە تشرینی دووەمی ١٩٤٨دا لەباشووری فەلەستین ، حکومەتی میسر هۆیەکەی بۆ خەمساردی هێزە عێراقیەکان گێرایەوەو ئەم بابەتەش بەسەر ژمارە زۆرەکانی خۆنیشاندەران و رکابەرانی سیاسی پاچەچی زاڵبوون . لەبەرامبەر ئەم قەیرانە پەرەسەندووە لەشەقامەکانی بەغدا ، عەبدولئیلا سەر لەنوێ داوای لە نوری سەعید کرد حکومەت پێکبێنێت و ئەویش کە زۆر لێهاتوو ببوو لە رۆڵی (پیاوی بەهێز)ی دیکتاتۆر لەسیاسەتی عێراقیدا سەرنجی خۆیدایە ئەو کێشەو پشێویانە بۆ چارەسەرکردنی بەو دڵرەقی و خێرایەی کە پێی ناسرابوو .

بەم جۆرە پەنابردرایە بەر ئەنجومەنە سەربازییەکان بۆ دادگاییکردنی ئەوانەی کە بە مانەوەی پشێوی لەریزەکانی گەلدا تاوانبار کرابوون و سەدانیان فرێدرانە

زیندان و هەڵمەتێکی دژی حزبی شیوعی عێراقی لایەنگرە ئاشکراکانیان دەستی پێکردو هەڵمەتەکە بەدەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆری شیوعیەکان نەوەستا بەڵکو گەیشتە لەسێدارەدانی هاوڕێ فەهدو دوولە هاوەلآنی کە لەزیندان دابوون لەوەتای دەستگیرکردنیان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٦دا تا دادگایی کران و لە حوزەیرانی ١٩٤٧دا حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەردا سەپێنرا بەلاّم سزاکە سووککرا بۆ ماوەیەك لە زیندانی کردن . بەلاّم لەشوباتی ١٩٤٩دا لەبەردەم ئەنجومەنێکی سەربازییدا تۆمەتی ئەوەیان ئاراستە کرا کە لەناو زیندانەوە چالاکیەکی تێکدەرانە ڕێکدەخەن و حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو لەماوەی چەند ڕۆژێکدا بە ئاشکرا حوکمەکە جێبەجێکرا.

دوای ئاراستەکردنی ئەم زنجیرە لێدانانە بۆ ئۆپۆزسیۆن لەناوەوە ، نوری سەعید رووی لە پرسی فەڵەستین کردو دەستی بەلێکۆڵینەوەیەك کرد لە مەسەلەی دەستپێکردنی جەنگ و دانوستانەکانی پێش جەنگ . سەرەرای ئەوەی راپۆرتی لێژنەکە سەرجەم ئەو عێراقیانەی کە تێوەگلابوون لەو مەسەلەیە بێتاوان دەرنەهێنا بەلاّم واباسی سیاسەتمەدارە عێراقیە یەك لەدوایەکەکانی کرد کە ئەوەی لەتوانایاندا بووە کردوویانەو سەر زەنشتی ولآتە عەرەبیەکانی دیکەو سەرکردایەتی فەڵەستینی کرد لەڕوودانی کارەساتەکەدا ، لەهەمانکاتدا نوری لە رێگەی هەرەشەکردن بە دەرکردنی سەرجەم رەوەندی جوولەکە لەعێراق ئەگەر رێگە نەدرێت بە گەڕانەوەی پەنابەرە فەڵەستینیەکان نیگەرانیەکانی رەوەندی جوولەکەی عێراقی زێدەتر کرد . دواتر ئەم هەرەشەیە بووە دەستپێشخەریەك بۆ گۆرینەوەی دانیشتوان واتە جوولەکەکانی عێراق لەبەرامبەر ژمارەیەکی یەکسان لەپەنابەرانی عەرەبی فەڵەستین ، و هەرەشەی لە جوولەکەکان کرد کەسامانەکانیان لەعێراق بۆ قەربوکردنەوەی فەڵەستینیەکان بەکار دەهێنرێت .

لەم قۆناغەدا دەزگا ئەمنیەکانی عێراق پەردەیان لەسەر تۆڕێکی سەهیۆنی لادا کە هاوکاری جوولەکەکانی عێراقی دەکرد بۆ کۆچ کردن بەرەو ئیسرائیل ئەمەش بووە هۆی هەڵمەتێکی فراوانی دەستگیرکردن لەنێو رەوەندی جولەکەدا و زێدەبوونی

گومانەکان و ڕێگا بە جولەکە عێراقیە گەنجەکان نەدرا لەحکومەت و پیشەکانی دیکەدا کاربکەن و دوارۆژ بۆ ڕەوەندی جوولەکەی عێراقی تاریك دیار بوو بەتایبەتیش کە سەرکردەکانی ئەو ڕەوەندەو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئارەزووی یاخود توانای خۆیان بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی ئەندامانی ڕەوەندەکە وەکو هاولاتی عێراقی دەرنەبری بەم جۆرەو بەهاندانی حکومەتە عەرەبیە یەك لەدوا یەکەکانی دەسەلاتدارێتی ئیسرائیلی زۆربەی زۆری ئەو ڕەوەندە کە ژمارەیان لە سەد هەزار زیاتر بوو یاسایەکیان قۆستەوە کە لە ساڵی ١٩٥٠دەرچوو و ڕێگای بە جوولەکەکان دا تەنازول لە ڕەگەزنامەی عێراقی بکەن و بە یەکجاری عێراق جێ بهێڵن. و بە هاتنی ساڵی ١٩٥٢ بەشێوەیەکی کردەیی ئەو ڕەوەندە بوونی نەماو بە شێکی زۆری سەروەت و سامانیان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دەستی بەسەر داگیرا و تەنها چەند هەزار جوولەکەیەك لە عێراق مانەوە.

لەو کاتەی کە نوری سەعید ئەو هەنگاوانەی دەگرتەبەر، لە هەمان کاتیشدا چارەسەرێکی بۆ مەسەلەی فەلەستین دەخستە روو ولەگەڵ ئەوەی ئیسرائیل لە زۆر لەو دەسکەوتە هەرێمایەتیانەی کە لەجەنگدا بەدەستی هێنابوو بێبەشدەکرد ، بەلام دانی بە واقیعی دابەشکردنی فەلەستین دەناو بەشێوەیەك لە شێوەکانی دانی بە ئیسرائیل دادەنا . جا ئەو پێشنیارە جدیی بوو یان نا لەلایەن سەرجەم لایەنەکانی ململانێکە ڕەتکرایەوە سەرباری هێزەمەزنەکانیش ، هەر ئەمەش پێشبینی کراوبوو . ئەمەش ئەو بەهانەیەی دابەدەست نوری سەعید کە پێویستی پێی بوو و فەرمانی کشانەوەی سەرجەم هێزەکانی عێراقی لە پێگەکانیان لەبەرەی شەرداو بەشێوەیەکی لەناکاو عێراقی لەململانێیەك دەرهێنا کە حکومەتەکانی هیچ سەروەریەکیان لێدەست نەکەوت کە شایەنی باسکردن بێت بەلام ڕەنگدانەوەی سیاسی مەترسیداری لەبەغدا گونجاند.

لەم کاتانەدا شکست لە فەلەستین ڕەنگدانەوەی بەسەر سوریا دەردەکەوت و بەکودەتاکەی حوسنی زەعیم لە ئاداری ساڵی ١٩٤٩دا قۆناغێك لە کودەتا و دژە کودەتا دەستی پێکرد ، لەهەمانکاتدا هەندێك بیرۆکە دەرکەوتن کە لەلایەن

هەندێك لە حزبەکانی سوریاوە پاڵپشتی لێدەکرا لەبارەی یەکگرتنێك لەگەڵ عێراق . بەلاّم روون و ئاشکرا بوو کە نوری سەعید لەهەمبەر پرۆژەیەکی وەها گوور نەبوو چونکە ترسی لەوە هەبوو کە ئەو پرۆژەیە ببێتە قوربانی گۆرانکاریەکانی سەر شانۆی سیاسی لە سوریا لەبەر ئەوە نوری هەوڵەکانی زەعیمی بۆ دەستپێکردنی وتووێژ لەبارەی یەکگرتن لەنێوان هەردوو وڵات شکستی هێنا ئەمەش هاوکار بوو لە راکێشانی سەرنجی زەعیم بەرەو ئۆردوگای بەرامبەر کە میسرو سعودیەی لە خۆگرتبوو و هەردولاشیان سووربوون لەسەر دانانی سنورێك بۆ هەژموونی هاشمیەکان ، لەگەڵ ئەوەش عەبدولئیلا بە بیرۆکەی یەکگرتنی سوریاو عێراق سەرسام بوو و ئامرازێکی تێدا بەدیدەکرد بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی . کاتێکیش کە حوسنی زەعیم لە کودەتایەکدا کە کۆلۆنێل هانی حنناوی لە ئابی ساڵی ١٩٤٩دا لەسەر کار لادرا بەپاڵپشتی پارتی گەل کە ئاراستەیەکی عێراقیانەی هەبوو ، عەبدولئیلا دیتی کە رەوشەکە بۆ وەدیهێنانی یەکگرتن گونجاوەو نارەزایی لەبەرامبەر ساردی نوری لە هەمبەر پرۆژەکە دەربری و بووە هۆی نانەوەی ناکۆکی لەنێوانیان و لەگەڵ دروستبوونی ناکۆکیش لە نێو وەزارەتدا نوری سەعید لە تشرینی دووەمدا دەستی لەکار کێشایەوە لەسەرەتاکانی کانوونی یەکەمی ١٩٤٩دا عەلی جەودەت حکومەتێکی پێکهێنا بەلاّم دوای چەند رۆژێك لە دیمەشق روویداو هیواکانی عەبدولئیلای لەناوبردوو ئەدیب شیشکلی هێنایە سەر دەسەلاّت کە دژی یەکگرتن بوو لەگەڵ عێراق .

پێدەچوو کە پرۆژەی یەکگرتنی سوریا و عێراق لەباربردرا، بەلاّم هەروەکو کە بۆ علی جودت دەرکەوت ، هێشتا لە بیر نەکراوەو. کاتێك کە موزاحیم پاچەچی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق هەوڵی بنیاتنانەوەی پەیوەندیەکانی نێوان عێراق و میسری دا لە رێگای گەیشتن بە رێککەوتنێك لەگەڵ حکومەتی میسردا بەڵێنی دا کە عێراق بەلایەنی کەم تا پێنج ساڵی دیکە هەوڵی یەکگرتن لەگەڵ سوریا نەدات ، ئەمەش زۆر کەسی لەعێراق تورە کردو هەستیان دەربارەی یەکگرتن لەگەڵ سوریا هەرچۆنێك بوویێت. بەلاّم ئەو هەنگاوەیان بەملکەچیەکی

سەرشۆڕانە لەلایەن سیاسەتی دەرەوەی عێراقەوە بۆ ئیرادەی میسر لەقەڵەمدا . و عەبدولئیلاش ئەم رایەدابوو. لە شوباتی ١٩٥٠دا عەلی جەودەت دەستی لە کار کێشایەوە دوای ئەوەی کە هەستی کرد متمانەی عەبدولئیلای لە دەست داوەو ئەمەش داوای لە تۆفیق سویدی کرد کە حکومەتێك پێك بێنێ، ئەمەش بەزۆر شێوە ئاماژەیەك بوو بۆ گەڕانەوەی نوری سەعید بۆ شانۆی سیاسی . هەر چەندە جڵەوی سەرکردایەتی نەگرتەدەست، بەڵام لەو شوێنەی کە هەڵیبژارد بوو لە پشت پەردەوە رۆڵێکی کاریگەری گێراو لەمەشدا ئەو هەژموونەی بە شێوەیەکی ئاشکرا لە پەرلەمان بەکارێهێنا هاوکاری بوو.

## گەشەسەندنی ئابووری و سیاسەتی حزب

لەو ماوەیەی کە نوری سەعید پۆستی سەرۆکایەتی حکومەتی گرتەدەست، هەڵسا بە بڵاوکردنەوەی (میساقی نیشتمانی) کە لە بەیانامەیەك پێکهاتبوو تیایدا باسی لە چاکیەکانی دروستکردنی دەوڵەتی تاکە حزب دەکرد و ئەو حزبە تاکە رێکخراوی سیاسی شەرعی دەبێت لە وڵاتداو سەرجەم سیاسەتمەداران ناچار دەبن بەشداری تێدا بکەن و لەسەر بنەمای ئەو هاریکاریەی کە ئەو دەیگوت لەو یەك هەڵوێستیەدا دروست دەبێت حزب خۆی بۆ کارە سیاسیە راستەقینەکان تەرخان دەکات کە لەدیدی نوریدا خۆی لە پتەو کردنی گەشەی ئابووری و چارەسەرکردنی بێ سەرووبەریی دەبێنێتەوە . لەراستیدا بروا بوون بە چاکەکانی تاکە حزبی کە ئاراستە کرابێت بۆ سەرکردایەتی کردنی نەتەوەو پەرەپێدانی کە ئامانجەکەی زاڵبوونە بەسەر ناکۆکیە حزبیەکان ، لەسەردەمی ئەتاتورکدا باوبوو و لەچەند ساڵی داهاتووشدا لە زۆربەی وڵاتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا پتر باو دەبێت . لەگەڵ ئەوەش ئەم بانگەوازە لە عێراق لەساڵی ١٩٤٩بەگەرم و گوڕیەکی کەم پێشوازی لێکراو زۆربەی خەڵك وایان لێکدایەوە کە دەربرینێکی شەفافانەی

ئارەزووەکانی نوری سەعیدە بۆ ملپێکەچکردنی شانۆی سیاسی عێراقی بۆ کۆنترۆڵی تەواوی خۆی .

سەرەڕای ئەوە نوری سعید بەردەوام بوو لە هەوڵەکانیدا بەدوای بیرۆکەی دروست کردنی حزبێکی سیاسی و ، لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٩دا و بەرلە دەست لە کار کێشانەوەی لە سەرۆکایەتی حکومەت حزبی ئیتیحادی دەستووری پێکهێنا و. ئەو رێکخراوە نەك هەر لایەنگرو شوێنکەوتووانی نوری سەعیدی لەخۆگرتبوو بەڵکو شوێنکەوتووانی ساڵح جەبریش، کە بڕوای پێ هێنا بێتە نێو ئەو حزبە، سەرەرای زۆربەی سەرۆك هۆزەکانی نێو کوتلەی پەرلەمانیی ئەوانەی تا ئەو کاتیش لایەنگری عەبدولئیلا بوون، بەم جۆرە نوری سەرکەوت لە پتەو کردنی ئەو پاڵپشتیەی کە لە پەرلەماندا هەیبوو و تۆری لایەنگرانی فراوانکرد بۆ هەندێك شوێن کەپێشتر هاوپەیمانە سیاسیەکانی کۆنترۆڵیان کردبوو ،لە دەرەنجامی ئەوە، کاتێك کە تۆفیق سویدی لە شوباتی ١٩٥٠ بە سەرۆك وەزیران دامەزرا نوری لە پێگەیەکی گونجاو بوو تا پاڵپشتی خۆی و حزبەکەی لە پەرلەمان پێ ببەخشێ و، ئەگەر هەلیش رەخسا جێگای بگرێتەوە .

ئەو هەڵە زووتر هات لەوەی کەنوری پێشبینی دەکرد و. هۆیە سەرەکیەکەشی ئەو ناکۆکیانە بوو کە وەزارەتی کردە دوو لەتەوەو رووبەروو بوونەوەی نێوان کەسایەتیە سیاسیەکان رۆڵی لەوەدا هەبوو سەرەرای گومان لە . سیاسەتە تایەفیەکان ساڵح جەبری دوای ئەوەی جارێکی دیکە پۆستی وەزارەتی ناوەخۆی گرتەدەست. هەروەك لە ساڵانی رابردوودا. گومانی ئەوەی لێدەکرا کە گوێ بەو تۆمەتانە نادات کە ئاراستەی کەسانێکی سەر بە تایەفەی شیعەن دەکرێن، هەروەها بەوە تاوانبار کرا کە لەدامەزرادندا رەچاوی مەحسوبیەت دەکات . بەچاو پۆشینیش لە راستی ئەو تاوانانە ، ئەوە روون بوو کە هەرکاتێك کەسایەتیەکی شیعە پۆستێکی وەزاری باڵای لە دەوڵەتدا بگرتایەتە دەست ئەو تۆمەتانە دەردەکەوتن ، لەبەرامبەردا کاتێك کە کەسێکی سوننە هەمان ئەو پۆستەی وەربگرتایە ئەو تۆمەتانە کەمتر دەخرانە روو. ئەم هاریکاریە تایفیە دیارەی نێو

دەستە بژێری سیاسی عەرەبیی سوننە هەتا ئەوانەی کە ئیدیعای ئەوەیان دەکرد لە سالح جەبرەوە نزیکن ، هەستێکی بەبێزاری لادروستکردو هانی دا بۆ دامەزراندنی رێکخراوی سیاسی تایبەت بە خۆی ، و جودا بوونەوە بەشێوەیەکی کۆتایی لە نوری سەعیدو حزبی ئیتیحادی دەستووری .

بە هاتنی ئەیلولی ۱۹٥۰ گیروگرفتەکانی سالح جەبر و ناکۆکی دیکەی ناو وەزارەت وایان لە سویدی کرد دەست لە کار بکێشێتەوە، ئەو کات عەبدولئیلا لە لەندەن بوو، نوری ئەو هەلەی قۆستەوە بۆ داواکردنی پێکهێنانی حکومەت لەلایەن خۆیەوەو بڕوای وابوو کە دوو دلی عەبدولئیلا لە بریاردان هاندەر بوو بۆ دروستبوونی ئەو بەرهەلستیە کراوەیەی کە ، سالی ۱۹٤۸ بەخۆوەی دیت. بەلام عەبدولئیلا ناچار بوو کە دانبەوە دابنێت کە نوری لە رابردوودا سەرکەوتوو بوو لە کۆنترۆل کردنی تورەکانی تایبەت بەو لە عێراق ئەمەش وایکرد ، نوری بە پێکهێنانی حکومەتێکی نوێ راسپێرێت. بەمجۆرە نوری توانی دەست بەجێبەجێکردنی دیدی خۆی بۆ عێراق بکات، سەرەرای ئەوەی هەولی نەدا بۆ پەیرەوکردنی سیستەمی تاکە حزب کە لە رابردوودا بانگەوازی بۆ دەکرد بەلام بالکێشانی بەسەر ژیانی سیاسی عێراقیدا وایکرد لە زۆر رووەوە ئەم کارە پێویست نەبێت ، هەر ئەوەش ئەو باگراوندە بوو کە بیرۆکەکانی خۆی لەبارەی پەرەپێدانی ئابووری لە ولاتدا لەسەر بنیات نا بوو و هیوای وابوو داهاتە گەشەسەندوەکەی عێراق لە نەوت رەورەوەی گەشەسەندن بەرەو پێشەوە ببات و خۆی بەدوور گرتبوو لە مەسەلەکانی مایەی چەندوچوون وەکو چاکسازی کشتوکالی و دووبارە بنیاتنانەوەی ئابووری گوندەکان بەتایبەتیش کە زۆربەی ئەو پالپشتیەی کە لێیدەکرا لە پیاوماقول و سەرۆك هۆزەکانی ئەو ناوچانەوە بوو .

لە سالی ۱۹٥۰ نوری بڕوای بە کۆمپانیای نەوتی عێراق هێنا بۆ زیادکردنی ئەو باجەی دەیدانە حکومەتی عێراق، بەلام زۆران بڕوایان وابوو ئەو هەنگاوە بەس نیەو . لە سالی ۱۹٥۱دا رێککەوتنێك لە نێوان ئارامکۆو سعودیە مۆرکرا وباسی لە دابەشکردنی قازانج بە نیوەیی لەنێوان هەردوو لادادەکرد، هەروەها لە ئێران نەوت

خۆماڵی کرا، کە هانی نوری دا بۆ سەرلەنوێ کردنەوەی دەرگای دانوستاندن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراقی و، ئەو گفتوگۆیانە بە رێککەوتنی ١٩٥٢ کۆتایی هات کە هەردوولا رێککەوتن لەسەر دابەشکردنی قازانج بە نیوەیی لەنێوانیاندا . سەرەرای ئەوەش، کۆمپانیای نەوتی عێراقی ئاستێکی کەمی داهاتی بۆ حکومەتی عێراق مسۆگەرکرد هەروەها رازیبوو بەوەی کە عێراق لە ١٢,٥٪ بە دەست بێنێ لە بەرهەمهێنان وەك بەشێك لە پشکی خۆی و نەوت بفرۆشێت بە دەرەوە ، سەرەرای رەزامەندی دەربرین لەسەر دامەزراندنی بەرێوبەرە عێراقیەکان لە ئەنجومەندا کاتێك کە مەسەلەی نرخی نەوت دەخرێتەبەر گفتوگۆ. ئەو رێککەوتنە چوارچێوەیەکی پێکهێنا بۆ پەرەپێدانێکی گەورە لە پیشەسازی نەوتدا و زیادکردنی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق چوار بە قەد جاران لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤١ــ١٩٥٨ (داهاتەکانی حکومەتیش شەش کەرەت بەرز بۆوە) ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ داواکاریی زۆری جیهانیی بۆ نەوت.

هەر لەسەرەتاوە نوری برپاری دا ٧٠٪ی داهاتەکانی نەوت بۆ پەرەپێدانی ژێر خانی ئابووری تەرخان بکات، کە لەلایەن ئەنجومەنێکی بوژانەوە کە لە بنەرەتدا لە سەردەمی حکومەتەکەی تۆفیق سویدی دامەزرا بوو بەپێی مەرجەکانی قەرزێکی گرنگی بانکی نێودەوڵەتی دامەزرا بوو . ئامانجی دروست کردنی ئەو ئەنجومەنە سەرپەرشتی کردنی خەرجکردنی پارەکان بوو لە پرۆژەکانی بوژاندنەوە لە کەشێکی دوور لە مەحسوبیەتی سیاسی . بەم هۆیە ، سێ لە شەش ئەندامەکانی ئەنجومەنەکە شارەزای تەکنیکی بوون یەکێکیان بەریتانی و ئەوی دیکەیان ئەمەریکی . بێگومان بوونی بیانی سەرباری رێککەوتنەکەی کۆمپانیای نەوتی عێراقی لە لایەن رەخنەگران لە نوری ئەوانەی داوای خۆماڵیکردنی هەموو سامانە نەوتیەکانی عێراقیان دەکرد رووبەرووی هێرشێکی زۆر توند بوونەوە ، کە تا رادەیەك بەوەی کە لە ئێران روویدا کاریگەر بوون . بەڵام لەگەڵ بوونی نوری کە کۆنترۆڵێکی توندی بەسەر دەزگای دەوڵەتدا هەبوو ، توانای دەنگ هەڵبرینیان نەبوو و کاتێکیش لە تشرینی دووەمی ١٩٥١دا ویستیان رۆژێك بۆ نارەزایی

نیشتمانیی تەرخان بکەن ، دیتیان بەهۆی بلاّوبوونەوەی چری پۆلیس و ئەو ڕێوشوێنانەی کە وەزیری ناوخۆ گرتبوویە بەر هیچیان بۆ ناکرێت و ئەمەش بەڵگەیەك بوو بۆ بەهێزی ڕژێمەکەی نوری بەتایبەتیش کە ئەو و عەبدولئیلا لەو ڕۆژەدا لەدەرەوەی وولاّت بوون .

لەو قۆناغەدا سالّح جەبر لە نوری جیا بۆوەو حزبێکی تایبەت بە خۆی دروستکرد ئەویش (حزبی نەتەوەی سۆشیالستی )بوو . لەکاتێکدا تەها هاشمی وەك سەرکردەی بەرەی جەماوەری یەکگرتوو دەرکەوت کە گردبوونەوەیەکی دوژمنانی نوری سەعید رکابەرانی لەریزەکانی دەستەبژێری سیاسی بوو . بەلاّم جەبر هەولّی وەدەستهێنانی لایەنگریی گەنجانی رۆشنبیرو توێژی خاوەن پیشەکان لەشارەکاندا بەتایبەتیش لە تایەفەی شیعەدا بەدەست بێنێت ، هەتا ئەگەر ئەوەش نیازی ئاشکرای حزبەکەی نەبێت .

دامەزراندنی ئەو دوو حزبە نوێیە دەستیکرد بە بالّکێشان بەسەر ژیانی سیاسی لە بەغدا نوری سەرەرای دەسەلاّتی بەسەر پەرلەمان و ئاماژەدان بەوەی کە یاسای هەلّبژاردن هەموار دەکات لەگەلّ پاراستنی هەردوو قۆناغی پرۆسەی هەلّبژاردن ( کەلەو بروایەدابوو رێگە بە حکومەت دەدات یاری بە هەلّبژاردنەکان بکات) نوری تاکتیکەکەی خۆی لە هەلّسوراندنی رووداوەکان لەپشت پەردەوە دووبارەکردەوەو لەتەمموزی ١٩٥٢دا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەشکردو حکومەتێك بەسەرۆکایەتی مستەفا عومەری و رەزامەندی نوری سەعید بۆ سەرپەرشتیکردنی هەلّبژاردنەکان پێکهات . لەم کاتانەدا سالّح جەبری دۆستی پێشووی نوری زیاتر لە ریزەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە نزیك بوو کەنەك تەنیا جەختی دەکردەوە سەر زولّم و زۆری نوری سەعید بەلّکو جەختی دەکردەوە سەر پرسی چاکسازی هەلّبژاردنەکان و داوای هەلّبژاردنی پەرلەمانیی راستەوخۆی دەکرد . لەگەلّ نزیکبوونەوەی هەلّبژاردندا ئەم داوایە توندتر بوو . چاکسازی هەلّبژاردن بووە دروشمێك کە زۆربەی ئۆپۆزسیۆن لەدەوری کۆبوونەوەو بەمەش خەلّکێکی زۆریان بۆ لای خۆیان راکێشا کە نارەزایی قوولّتریان هەبوو لەهەمبەر رەوشەکەدا .

بەمجۆرە سەرلەنوێ حزبی شیوعی عێراقی تێکەڵ بە رێکخستنی کرێکاران و تێکەڵی دامەزراندنی کوتلەیەکی سیاسی بوو کە ناوی لایەنگرانی ئاشتی لێنرا ئەم کۆمەڵەیە لەساڵی ١٩٥٠ دەرکەوت بەپێی گووتەی ئەوان لە وەلامی پشێویی پەرەسەندووی کاتی جەنگی ساردا و بووە مایەی تێرامانی سەرجەم عێراقیەکان کە دەیانویست وولاتەکەیان هەڵوێستێکی بێلایەنە پەیرەو بکات ، ئەم بۆ چوونەش بەتایبەتی لەگەڵ بۆ چوونەکانی نوری سەعید تێکینەدەکردەوە کە پاڵپشتیەکی کراوەو ئاشکرای لەو ململانێ نێودەوڵەتیەدا لە هێزە رۆژئاواییەکان دەکرد لەپایزی ١٩٥٢دا ئەو هێزانە بەیەکەوە کۆبوونەوەو بریاری حکومەتیش بەدواخستنی هەڵبژاردنەکان هاندەرێکی ئەو گردبوونەوەیە بوو . و ئەوەی دەشبینرا ترسی عومەری بوو لە هێزی ئۆپۆزسیۆن لەشەقامدا سەرەرای پاڵپشتی نوری و عەبدولئیلا لێی لەراستیدا ، گەرانەوەی عەبدولئیلا لەتشرینی یەکەمدا کەمی متمانەی بەتواناکانی عومەری دەرخست بۆیە خەریکی پلانداتان بوو بۆهێنانی یەکێکی دیکە بۆ جێگرتنەوەی و کاتێکیش ئەو پلانانە بەرگوێی سەرۆك وەزیران کەوت خودی خۆی هەستی بەوە کرد کە کەوتۆتە نێوان سێ هێزەوە کە هەریەکەیان رایدەکێشێت و کۆنترۆڵیشی بەسەر هیچ یەکێکیان دا نیە ، ئەو هێزانەش عەبدولئیلاو نوری سەعیدو ئۆپۆزسیۆنە کە ( لێژنەیەکی پەیوەندی ) پێکهێنابوو و هاوپەیمانیەکی چاوەروان نەکراو و کاتیش لەنێوان لایەنگرانی ئاشتی ، حزبی نیشتیمانی دیموکراتی ، بەرەی جەماوەریی یەکگرتوو بەسەرکردایەتی تەها هاشمی و حزبی سەربەخۆیی کە حزبی گەلی سۆشیالستی بەسەرکردایەتی سالح جەبر نیمچە پشتیوانیەکی لێدەکرد لەسایەی ئەم رەوشەدا لە کۆتاییەکانی تشرینی دووەم عومەری دەستی لەکارکێشایەوە کە هەمان ئەو رۆژە بوو خۆنیشاندانەکانی ئۆپۆزسیۆن لە شەقامەکانی بەغدا دەستی پێکردوو ئەمەش قەناعەتی بە لێژنەی پەیوەندی هێنا کە بزوتنەوەکەی ئەو بوو سەرۆك وەزیرانی رووخاند

هەروەکو راپەرینەکەی ١٩٤٨ ، خۆشیەکانی سەرکەوتن هەموو ئەوانەی گرتەوە کە لە رەوشەکە نائومێد بوون و خۆنیشاندانەکان لە شەقامەکانی بەغدا بەردەوامبوو و بەگوندەکانی دیکەشدا بلاّوبۆوەو داواکاریەکانیشیان هاوشێوەی داواکارییەکانی ١٩٤٨ بوو لەبەر ئەوەی زۆربەی هۆیە سەرەکیەکانی نارەزایی وەکو خۆی مابۆوە . سەرەرای ئەوەی کە توندی خۆنیشاندانەکان نەگەیشتە ئاستی ئەوەی کەلە ١٩٤٨ روویدا بەلاّم سوپا بە هاوکاری ئەندامانی پۆلیس دەستی لە رەوشەکە وەرداوو بووە هۆی کەوتنەوەی ژمارەیەك قوربانی لەنێو خۆنیشاندەراندا و ئەم رووداوە بە راپەرین ناسرا ، جارێکی دیکە ئاماژەدان بوو بەوەی کە (گەلی)عێراق بۆ نارەزایی دەربرین دژی ئەوانەی فەرمان رەوایی دەکەن شۆرشی کردوە . هەروەکو بووە بەشێکیش لەو ئەفسانە شۆرشگێریەی کە دوای رووخاندنی پادشایەتی لەساڵی ١٩٥٨دا لەدایك بوو و باسی لەوە دەکرد کە ئەو راپەرینە هەنگاوێکی پێویست بوو لە پەرەسەندنی شۆرشگێرانەی کۆمەڵگەی عێراقی و لە زێدەبوونی راستگۆیەتی شۆرشگێری ئەو کەسانەی کە ئیدیعای ئەوەیان کرد سەرکردایەتی ئەو بزوتنەوەیان کردووە .

پێدەچوو کە دامەزراندنی ژەنەراڵ نورەدین مەحمود سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق بەسەرۆك وەزیران لەلایەن عەبدولئیلاوە هەولێکی بێئومێدانەبوو بۆ بەرپەرچدانەوەی شۆرشێکی پێشبینی کراو و یاسای عورفی لە ویلایەتی بەغدا راگەیاندو بەڵێنی ئەنجامدانی چاکسازیی هەڵبژاردنیشی دا . لەگەڵ ئەوەش ئەم هەنگاوانە رێوشوێنی نائومێدانە نەبوو بەو ئاستەی کە ئەوانەی راپەرینەکەیان بەوە ناودەبرد کە ئاماژەیەکە بۆ شۆرش . بەپێچەوانەوە ئەو رێگە چارەی عەبدولئیلا پەیرەوەی کرد تارادەیەك دەگەرایەوە بۆ پێویستیی بە کەسایەتیەکی توند بۆ گێرانەوەی ئارامی بۆ پایتەخت . هەروەها هۆیە سەرەکیەکەی دیکەشی ئەوە بوو کە خۆی لەوە لادەدات کە جارێکی دیکە قەرزاری نوری سەعید بێتەوە . هەرئەمەش هێزی پاڵنەری سیاسەتەکەی پێك دەهێنا لەوەتای گەرانەوەی بۆ عێراق لەپایزی هەمان ساڵدا و هاریکار بوو لە پەرەسەندنی ئەو قەیرانەی کە ئەو

هەڵەی بۆ ئۆپۆزسیۆن رەخساند و وایدەبینی کە سەرۆکی ئەرکان کەسێکە دەتوانێت سەقامگیری بگێڕێتەوە بێتەوەی شوێنکەوتووانی سیاسی هەبێت ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەتوانێت بێ پاڵنەری شاراوە سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکان بکات . هەروەها عەبدولئیلا بەوهیوایە بوو کە ئەم کارە رێگە بەکۆشك بدات جارێکی دیکە رۆڵێکی یەکلاکەرەوە لە پێکهێنانی حکومەتدا بگێرێت.

## نوری سەعید: سیاسەتی چاکسازی و سەرکوت کردن

مایەی گاڵتە جاریە ،کە حزبەکەی نوری سەعید سەرکەوتنێکی گەورەی لەو هەڵبژاردنە گشتیەدا بەدەستهێنا کە لە سایەی ئەو سستەمە نوێیەدا ئەنجامدرا کەلەسەر بنەمای دەنگدانی راستەخۆ دامەزرابوو و نوری سەعیدی خستە پێگەیەك کە بتوانێت کاریگەری بەسەر ئەو حکومەتەدا هەبێت کە لە کانوونی دووەمی ١٩٥٣دا جەمیل مەدفەعی پێکیهێنا . و نوری بەسیفەتی ئەوەی کە وەزیری بەرگریە لە حکومەتی نوێدا ئەوەی مسۆگەر کرد کە هێزە چەکدارەکان بگەرێنەوە ئەو دۆخەی ملکەچی بێمەرج کەپێشتر هەبوو و توانی ئەوە بەسەر ئەفسەرە بەتەمەنەکان بسەپێنێت ، بەلأم کاردانەوەی ژمارەیەك لە ئەفسەرە گەنج و تەمەن مامناوەندیەکان زۆر جودابوو .لەراستیدا تۆوی رووخانی پادشایەتی لێرە چێندرا ، نەك لە شەقامەکانی بەغدا یان لەنێو ریزەکانی گەلدا . چونکە ئەو ئەفسەرە گەنجانە نارەزاییەکی کۆمەلأیەتی و سیاسی زۆریان بۆ شانۆی گەورەی سیاسی هەبوو هەروەها سەرشۆری شکستەکەی فەلەستین هێشتا هەر بەدوایانەوە بوو . بۆیە شتێکی سەیر نەبوو کە کودەتاکەی ئەفسەرە سەربەخۆکان لەمیسر لە تەمموزی ١٩٥٢دا هانی هەندێکیان بدات بۆ بیرکردنەوە لەرێکخستنی گروپێکی هاوشێوە لەعێراقدا .

ڕەفعەت حاجی سری بە شێوەیەکی تایبەتی دەستی بەدەربڕینی ئارەزووی خۆی بۆ هاتنە ڕیزی ئەو ڕێکخراوە دەکرد . ئەم پیاوانە حەماسەتیان لە دامەزراندنی سەرۆك ئەرکان بەسەرۆك وەزیران وەرگرتبوو و کە ئاماژەیەکی لای ئەوان دروستکرد بەوەی کە سوپا تاکە هێزە کە لەنێوان ڕژێم و هێزەکانی ئۆپۆزسیۆندا دەوەستێت و ژمارەیەکیش لە ئەفسەرە گەنجەکان هاوسۆزیان بۆ ئامانجەکانی حزبە جوداکانی ئۆپۆزسیۆن دەربڕیبوو ، و ئەمەش هاندەرێك بوو بۆ ئەوەی هەوڵەکانیان پەرە پێبدەن بۆ کەسبکردنی کەسانی دیکە لە نێو ئەفسەرەکانداو خۆئامادەکردن بۆ ئەو ڕۆژەی کە پشت بەستنی حکومەت لە هێزە چەکدارەکان دەبێتە هۆی دۆزینەوەی ئەو خاڵەی لاوازی کە ڕێگە بە گروپێکی بچوك لە ئەفسەران دەدات بزوتنەوەیەکی یەکلاکەرەوە ئەنجامبدات . ئەمە لەو کاتەدا ئەو بنەمایە بوو کە دواتر دەبێتە ئەفسەرانی سەربەخۆی عێراق .

چالاکی بەرهەڵستی جەماوەریی بەشێوەیەکی دیاریکراو بەردەوامبوو و هەوڵەکانی خۆی بەشێوەیەکی تایبەتی چڕکردبۆوە لە دژایەتیکردنی یاسای عورفی لە ناوچەی بەغداو ئەو چاودێری و کۆنترۆڵەی کە هەبوو بەلام توانای بەرەنگار بوونەوەی حکومەتێکی نەبوو کە نوری سەعیدو عەلی جەودەت و تۆفیق سویدی لە خۆگرتبوو و عەبدولئیلاش متمانەی پێهەبوو . عەبدولئیلا هەژموونی خۆی پاراستبوو و ناوەناوەش بەدوا داچوونی بۆ کارەکانی لە هەردوو بواری سیاسەتی دەرەوەو ناوەوە دەکرد سەرەرای ئەوەی کە مەلیك فەیسەڵی دووەم لە ئایاری ١٩٥٣دا گەیشتبووە تەمەنی یاسایی و تەواوی دەسەڵاتە دەستوریەکانی گرتبووە ئەستۆ . بەمجۆرە عەبدولئیلا دەسەڵاتە فەرمیەکانی وەکو سەرپەرشتیاری سەر کورسی پادشایەتی لەدەستداو پلەی جێگرەوەی پادشای پێدرابوو . بەلام ئەم گۆرانکاریە کاریگەریەکی زۆری بەسەر سووربوونی لەسەر پەیرەوکردنی ڕۆڵێکی سەرەکی لەشانۆی سیاسی یان توانای بۆ ئەنجامدانی ئەمە لەرێگەی ئەو تۆرەی لایەنگرانی کە لەماوەی چەندین ساڵدا دروستی کردبوو ، نەبوو . خودی مەلیکیش لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو کەلەژێر چاودێری عەبدولئیلادا گەورە بوو و

بەشێوەیەکی نیمچەیی دیدی سیاسی نەبوو و ئەو کاتەوهەڵەشی بۆ نەرەخسابوو تا کەسایەتیەکی سیاسی تایبەت بەخۆی گەشەپێبدات و بازنەی ناسیارەکانیشی هەمان ئەو بازنەیە بوو کە لە چواردەوری عەبدولیلادا بوون . لە دەرەنجامی ئەوەش کاتێك کە لەمانگی ئابدا جەمیل مەدفەعی ( بەهۆی تا رادەیەك نائومێدی و هۆکاری تەندروستی ) دەستی لە کارکێشایەوە مەلیك بەر لەوەی فازل جەمالی بەپێکهێنانی حکومەتی نوێ ڕاسپێرێت راوێژکاریی لەگەڵ عەبدولئیلاو نوری سەعید کرد .

جەمالی ناوی بە ژمارەیەك لە بیرۆکەی چاکسازی بەسترابۆوە کە لە دەیەی رابردوودا لەعێراق باسکرابوو . بەڵام دوور لە حزبە سیاسیەکان مابۆوەو لەبری ئەوە پلاندانانی بۆ رەوتێکی تاکە کەسی هەڵبژاردبوو کە خۆی ببێتە سەنتەری گردبوونەوەی ئەفسەران و ئەو ئەکادیمیە گەنجانەی کە دوور لە بەرهەڵستی رادیکالی و شۆرشگێری بیر لەئایندەی دەوڵەتی عێراق دەکەنەوە . ئەو ئەزموونە تاڵەش کە رووبەرووی ببۆوە کاتێك کە وەزیری کاروباری دەرەوە بوو لەسەردەمی حکومەتەکەی ساڵح جەبردا کەساڵی ١٩٤٧ دانوستانی لەبارەی رێکەوتنامەی پۆرتسماوس ئەنجامدابوو وایلێکردبوو سەرنجی خۆی ئاراستەی بەرژەوەندییە کۆنەکانی بکات لەبواری چاکسازی ناوخۆییدا بەهیوای پتەوکردنی کاریگەری دەوڵەت و دەسەڵاتەکەی هەربۆیەش ئەو حکومەتەی کە پێکی هێنا گەنجانی تازە پێگەیشتووی لە خۆگرتبوو کە زۆربەیان بەهەزری چاکسازیان لە بواری یاسای کشتوکاڵی و رێکخستنی حکومەت و دابینکردنی خزمەتگوزاری کۆمەلایەتی ناسرابوون . ئەوەی تێبینیش دەکرا ئەوەبوو کە نیوەی وەزیرەکانی حکومەت( بەخودی سەرۆك وەزیرانیشەوە) سەربەتایەفەی شیعەبوون ، بەمەش گەورەترین ژمارەو گەورەترین رێژەی شیعەبوون کە حکومەتێکی عێراقی لە خۆی گرتبێت .

سەبارەت بەو شیعانەی کە نارزیبوون لەسیاسەتی باڵکێشانی عەرەبە سوننەکان ئەم حکومەتە پێشکەوتنێکی گەورە بوو . سەرەرای ئەوەش کە داواکارییەکانیانی بەجێنەگەیاند بەڵام کەش و هەوایەکی پتر گەشبینی خولقاند بەوەی کە بەڵێنی

چاکسازی هاوشانی بەڵێنەکان بە نوێنەرایەتیەکی تایەفی باشتر دەروات . ئەمەش ئەوەمان بۆ لێکدەداتەوە کە بۆچی نوری سەعید لەسەرەوە پاڵپشتی لە حکومەتە ریفۆرمخوازەکەی جەمالی دەکرد ، چونکە نوری نیگەران بوو لە بەرزبوونەوەی ئاستی داواکارییەکانی شیعە لە نێو ڕۆشنبیرانی شیعە لەشارەکاندا ، ئەو داوا کاریانەش لە دژی بەرژەوەندیەکانی نوری لەلایەن سالح جەبرەوە پاڵپشتی لێدەکرا . ئەوەی مایەی سەرنج راکێشانیشە دامەزراندنی کەسایەتیەکی کورد بوو کە ئەویش سەعید قەزازە لە پۆستێکی هەستیاری وەکو وەزیری ناوخۆ سەرپەرشتیاری ئاسایشی گشتی ، و لەم بوارەدا قەزاز بەسووربوون و دڵرەقی ناسرابوو . بەڵام وەکو وەزیرێك دەسەلاتێکی فراوانی هەبوو ئەمەش موژدە بەخشبوو سەبارەت بەوەی کە بەرژەوەندی کوردەکان مایەی گرنگی پێدان دەبێت ، کەئەمەش کارێکی پێویست بوو لەگەڵ دەستپێکردنی پێگەیشتنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی . دوابەدوای هەڵبژاردنی ئیبراهیم ئەحمەد بە ئەمینداری گشتی حزبی کوردی دیموکراتی ساڵی ١٩٥١ ، حزب بە ئاراستەیەکی پتر رادیکالیانە رۆیشت و سەرۆکەکەشی هێشتا مەلا مستەفا بارزانی بوو ، کەدوای رووخانی کۆماری مەهاباد لە مۆسکۆ دەژیا . هەربۆیە لە پێگەیەکدا نەبوو کە رێگەی پێبدات رێگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان بگرێت لەوەی کە بەرنامەیەکی چاکسازی کشتوکاڵیی پەیرەو بکات کە دان بە مافەکانی کرێکاران و جوتیاران دابنێت . هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستان داوای خۆماڵیکردنی سەرچاوە نەوتیەکانی عێراق و سەرفکردنی بەشێك لەداهاتە گرنگەکانی نەوت لە پرۆژەکانی پەرەپێدانی تایبەت بە ناوچە کوردیەکان دەکرد . سەبارەت بە جەمالی شتێکی گرنگ بوو کە سیاسەتی رازیکردن و خۆنزیکردنەوە بەکاربهێنێت نەك تەنیا بۆ رازیکردنی سەرۆك هۆزە تەقلیدیەکان لە کوردستان بەڵکو بۆ ئەوەی رێگەش لە سوود وەرگرتنی پارتی دیموکراتی کوردستان بگرێت لە داواکارییە نیشتیمانی و کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان لە ناوچە کوردیەکاندا .

حکومەتی نویێ یاسای عورفی هەڵپەسارد ، هەروەها چاودێری لەسەر رۆژنامەکان هەڵگرت و لە ئەیلولی ساڵی ۱۹۵۳دا رێگەی بە گەڕانەوەی چالاکی حزبی بۆ ژیانی سیاسی دا لە هەمان کاتدا بەردەوامیی بە فشارخستنە سەر حزبی شیوعی داو جودابوونەوەی نێو خودی حزبەکەش هاندەر بوو بۆ ئەمە . حکومەت لە هەمبەر کاری رێکخراویشدا لە حکومەتەکانی پێشتر ئاسانکارتر نەبوو و دوای مان گرتنێکی کرێکارانی نەوت کە داوای زێدەکردنی موچەو باشترکردنی رەوشی کاریان دەکرد حکومەت یاسای عورفی لە ویلایەتی بەسرە راگەیاند . لەگەڵ ئەوەش حکومەتەکەی جەمالی بەهۆی بەرهەڵستی لە شەقامەکانی یان بەرهەڵستی حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن نەرووخا بەڵکو بەهۆی دژایەتی کردنی رەوتە پارێزگارەکان بۆ ئەو پرۆژە بچوکانەی چاکسازی کە دەیویست لە دەوڵەتدا ئەنجامیان بدات چونکە کاتێك کە ئەو چاکسازیانە گەیشتە مەسەلەکانی موڵکدارێتی زەوی و چارەسەرکردنی کشتوکاڵیی یاخود باجەکان مەترسی لای خاوەن بەرژەوەندیە کشتوکاڵیەکان لە پەرلەماندا نایەوەو لە کانوونی یەکەمی ۱۹۵۳دا بەرهەڵستیکردنی ئەوانە زێدەتر بوو . مەترسیەکانی ئەوانەش هاوکات بوو لەگەڵ هەستکردن بەنیگەرانی لەلایەن چەند بەشێکی دیکەی کۆمەڵگەدا کاتێك کە حکومەت پلانەکانی بۆ چاکسازی خزمەتی مەدەنی راگەیاند کە ئامانجەکەی بنیاتنانی دەوڵەتێکی پتر کاریگەرو پتر هاورابوو لەگەڵ ئەو کۆمەڵگانەی کە ئیدیعای نوێنەرایەتی کردنیانی دەکرد . ئەمەش هەرەشەیەك بوو بۆ سەر ئەوانەی پەنایان بردبووە بەر مەحسوبیەت و مەنسوبیەت بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان لەسەر حیسابی گەلی عێراق کە سروشتی پێکهاتەی دەسەلآت تێیداو بەکارهێنانی ئالیەتەکانی دەوڵەت وایکردبوو هەر هەنگاوێکی چاکسازی پرۆژەیەکی مەترسیداربێت چونکە هەرەشەی لە بەرژەوەندی ئەو کەسانە دەکرد کە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان لە نێو حکومەت و دەرەوەی دا تێکهەڵکشابوو .

لە بەهاری ساڵی ۱۹۵٤دا خاوەندارانی زەوی لە سوننەو شیعەکان لە پەرلەمان و دەرەوەی پەرلەماندا هاریکاری یەکتریان کرد بۆ ناچارکردنی حکومەت بۆ

دەستهەڵگرتن لە هەندێك لە پێشنیارەکانی لە بواری چاکسازی کشتوکالیدا هاوکات لە نێو ئیدارەی حکومەتیشدا هەڵمەتێك لە پێناو سرکردنی پلانە چاکسازیەکانی جەمالی لە بواری خزمەتی مەدەنیدا رێکخرابوو کە لەچوارچێوەی تاوانبار کردن بە پێشخستنی شیعەو ناکۆکی نانەوەی تایەفیدابوو ، ئەمەش وایکردبوو جەمالی لە هەرکاتێکی دیکە زیاتر پتر پشت بە نوری سەعید و هەژموونەکەی ببەستێت ، بەلام بیری نوری پەرش و بلاوبوو بەهۆی ئارەزووی عەبدولئیلا بۆ سەر لەنوێ دەستوەردان لەکاروباری سوریا دوای رووخانی رژێمەکەی شیشکلی و بۆیە نوری سەعید نەیدەتوانی لەوە زیاتر پاڵپشتی لە جەمالی بکات ، هاوکات دۆستەکانی جەمالیش کە نائومێد بوون لە چاکسازیەکانی خەریك بوو وازیان لێدەهێنا ، هەربۆیە کاتێك کە لەنیسانی ١٩٥٤دا جەمالی دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەشکرد نوری هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ پاشگەز کردنەوەی ، هەروەها رازی نەبوو کە خۆشی حکومەت پێك بهێنێت بەڵکو لەبری ئەوە بەرەو ئەورووپا چوو و کاری چارەسەکردنی کێشەکانیشی کە عەبدولئیلا تارادەیەك بەشداربوو لە ئاڵۆزکردنیان بۆ کۆشك جێهێشت .

مەلیك و جێگرەکەی لە کاردانەوەکانی رووخانی جەمالی و دەرەنجامەکانی سەرنەگرتنی چاکسازیەکانی دەترسان و ئەرشەد عومەریان بۆ پێکهێنانی حکومەت و ئەنجامدانی هەڵبژاردن دەست نیشانکرد . لەترسی دووبارە بوونەوەی ئەو سیاسەتی سەرکوت کارانەی کە ئیدارەی عومەری ساڵی ١٩٤٦ پەیرەوی دەکرد حزبی نیشتیمانی دیموکراتی حزبی سەربەخۆیی یاداشتنامەیەکیان ئاراستەی کۆشك کرد بەلام سەری نەگرت ، دواتر هەردوو حزب کەوتنە دانووستان لەگەڵ حزبی شیوعی و ئەو دانوستانانەش دامەزراندنی بەرەی نیشتیمانی لەئایاری ١٩٥٤ لێکەوتەوە . کە ئەو کات لە هەر سێ رێکخراوەکە پێکدەهات ( لایەنگرانی ئاشتی نوێنەرایەتی حزبی شیوعی دەکرد کە هێشتا بوونی نایاسایی بوو ) بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی گشتیدا لە مانگی دواتر و بە پێچەوانەی هەموو پێشبینیەکان دەرکەوت کە ئەو هەڵبژاردنە ئازادترین هەڵبژاردن بوو کە لە

عێراقدا کرابێت ، بەلایەنی کەم لەشارەکاندا . حزبی یەکێتی دەستوری هەروەکو خۆی مایەوە کە زۆرترین ژمارەی کورسیەکانی داگیرکردبوو سەرەرای ئەو ژمارە زۆرەی سەربەخۆکان کەلایەنگری پارێزگارەکان بوون لەدێهاتەکاندا . سەرەرای ئەوەش بەرەی نیشتیمانی توانی ١٤کورسی بباتەوە ، عومەری بڕوای وابوو کە ئێستا ناتوانێت هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن بگرێتە خۆ بۆیە لەمانگی حوزەیراندا دەستی لە سەرۆکایەتی وەزیران کێشایەوە .

ئەم هەنگاوە هانی بەرەی نیشتیمانی داو ئەندامانی هەستیان بە بەهێزی خۆیان کرد بەڵام مەترسیان لەکاردانەوەی کۆشك هەبوو بۆیە فشاری جەماوەریان بۆسەر کۆشك بەکارهێنا تاکو سەرۆك وەزیرانێکی گونجاو دابمەزرێنێت هەر بۆیە خۆنیشاندان لەبەغدا رێکخرا بەڵام ئەم بزوتنەوەیە دەرەنجامێکی تەواو پێچەوانەی هەبوو و عەبدولئیلا چووە ئەوروپاو داوای لە نوری سەعید کرد بگەرێتەوەو حکومەت پێکبهێنێت ئەمەش نوری سەعیدی خستە پێگەیەکەوە کە بتوانێت مەرجە تایبەتیەکانی خۆی بسەپێنێت و ئامازەیەکیش بوو بۆدانانی کۆتایی عەبدولئیلا بەوەی کە نوری سەعید ئەو پیاوە بەهێزەیە کە کۆشك پێویستی پێیەتی بۆ سەرکردایەتی کردنی رژێمەکە لەچەند ساڵی داهاتودا سەرەرای گومانەکانی عەبدولئیلا لەهەمبەر نوریدا .

لەئابی ١٩٥٤دا نوری حکومەتێکی پێکهێناو مەرجەکانیشی بە ئاشکرا راگەیاند . پەرلەمان هەڵوەشایەوەو نوریش حزبەکەی خۆی حزبی یەکێتی دەستوری هەڵوەشاندەوەو رایگەیاند پێویستە لەسەر سەرجەم حزبەکانی دیکە هەمانشت بکەن و ، نوری گەرایەوە سەر قسەکەی خۆی کە دەیگوت حزبەکان نیشانەی بەش بەش بوونن و بوونیان پێویست نیەو پێویستە لەسەریان لە چوارچێوەی یەك رێکخراودا کاربکەن بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندی دەوڵەت ، کە نوری سەعید خۆی پێناسەی دەکات . هاوکات رێوشوێنی توندتر لە دژی حزبی شیوعی عێراقی و رێکخراوە شیوعیەکان بەلایەنگرو نوێنەرانیانەوە پەیرەو کرا ، و چاودێریەکی توند خرایە سەر ئەو حزبانەی کە مابوون و رۆژنامەکانیان و ئەو حزبانەش

کەبەتووندی نارەزاییان دەربری وەکو حزبی نیشتیمانی دیموکراتی ئەوا هەڵوەشێندرانەوەو رۆژنامەکانیشیان داخران .

ئەو هەڵمەتەی سەرکوتکردن کە بەناوی بەرەنگار بوونەوەی شوعیەت رێکخرا ئاراستەی رکابەرانی سیاسی نوری و سەرجەم ئەو نوسەرو رۆژنامە نوس و ئەکادیمیانەش کرا کە نوری بەرەخنەگرانی رەوشەکەی دادەنان ، هەندێکیان لە پۆستەکانیان لادرانو هەندێکی دیکەشیان یان دەستگیرکران یان رایانکردە دەرەوە . لەم چوارچێوەیەدا هەڵبژاردن ئەنجامدرا و ١١٦پەرلەمانتار لەکۆی١٣٥ بێبەرهەڵستی گەرانەوەو ، ئەمەش رێگەی دا بەحکومەت کە مۆڵەتی سەرجەم حزبە سیاسیەکان پوچەڵ بکاتەوە چاودێریەکی توندی سەرجەم کۆمەڵەکانیش بکات . لە هەمانکاتدا هەندێك یاسای واسەپێندران کە لەهەندێك بواردا وەکو هەڵسوکەوتی قوتابی و مامۆستایان و ئازادی رۆژنامەوانی مافی بەستنی کۆبوونەوە گشتیەکان و رێکخستنی خۆنیشاندانەکانی سنوردار دەکرد .

نوری سەعید هەستیکرد کە ئێستا توانای هەوڵدانی هەیە بۆ جێبەجێکردنی دوو لە ئامانجەسیاسیە گەورەکانی یەکەمیان پەیوەست بوو بە پەرەپێدانی ئابووری کە پشتی بە داهاتە پەرەسەندوەکانی نەوتی دەولەتی عێراق دەبەست ، کەلەو بروایە دابوو دەوڵەت و رژێم بەهێز دەکات ، لەساڵی ١٩٥١ داهاتی نەوت ٣٠٪ی داهاتی حکومەتی عێراقی پێکدەهێنا لەساڵی ١٩٥٤ ئەو رێژەیە بەرزبۆوەو گەیشتە ٥٦٪ (بەبەراورد لەگەڵ کشتوکاڵدا کەلەساڵی ١٩٥٤ تەنیا ٣٪ی داهاتی حکومەتی پێك دەهێنا). لەگەڵ ئەوەشدا بەشداریکردنی پیشەسازی نەوت لە ئابووری نیشتمانیدا هاوسەنگ نەبوو و ئەم پیشەسازیە نزیکەی سەرجەم کەرستە سەرەکیەکانی لەدەرەوەی عێراق دەکری و رێژەیەکی کەمیشی لە هێزی کارکردن بەکاردەهێنا . بەرزبوونەوەی داهاتی نەوتیش هێزێکی ئابووری گەورەی خستبووە دەست ئەوانەی دەستیان بەسەر دەوڵەت و تێروانینی پیاوەکانی وەك نوری سەعید تا رادەیەکی زۆر بریاردەر بوو لەوەی کە چۆن ئەو هێزە بەکاردێت وە کێ تێیدا سوودمەندە .

لەوەتـەی سـاڵی ١٩٥٢. ئەنجومـەنی بوژانـەوە زۆربـەی سـەربەخۆیی خـۆی لـە دەستدابوو راسپاردەکانیشی پێویستی بە ڕەزامەندی وەزیری بوژانەوە هەبوو، بەو شێوەیە ئەنجومەن ڕێچکەیەکی گرتە بەر کە چەند سـاڵێکی خایانـد، پلانـی دانـاو دەستی بە دابەشکردنی پارەکردو خاوەن پیشە کشـتوکاڵیەکان سـودێکی زۆریـان لێـوەرگرت، ئـەویش لـە رێگـەی ئـاودێری و پـرۆژەی چـاککردنی زەوی وزار. ئـەو هەنگاوە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن زۆر گرنگ بوو، هـەروەها بیرۆکـەی جۆراوجـۆری سەبارەت بـە بوژاندنـەوەی عێـراق وەك وڵاتێکـی کشـتوکاڵی هێنـا ئـاراوە. لەگـەڵ ئەوەشدا راستەوخۆ سودوەرگرتن لەسەر ئەو رێچکانەو ئەو کەسانە چڕبوونەوە کە خاوەنی ئەو زەویە بەراوانە بوون کـە تـازە کاریـان تێداکردووە. بـەلام دواتـر ئـەو سیاسەتە بەرەو هاندانی بە جێهێشـتنی ئـەو زەویانـەی سـوێرن لاربـوەوە چـونکە ئاودێری ئەو زەویانە پێشتر بە ناڕێکی بەڕێوە دەچـوون. دوور لـەو بەرژەوەندییـە تایبەتیانـەی کـە بـەهزرو سیاسـەتی حکومەتـە یـەك لـە دوای یەکـەکانی عێـراق دادەهـات. ئەنجومـەن دووچـاری گیروگرفتـی ئـەوتۆ بووەتـەوە کـە پەیوەنـدی بـە هەوڵی بەکارهێنانی داهاتی نەوت هەیە بۆ هاریکاری بوژانەوە بـەمانای گشـتی. لـە پێنـاو چارەسـەری گیروگرفتـەکان. ئەنجومـەنی بوژانـەوە لۆردسـارتەر شـارەزایی ئـابووری دامەزرانـد بـۆ ئـەوەی لـە توانـای بوژانـەوە لـە عێـراق بکۆڵێتـەوە، ئـەو راپۆرتەش کە بلاویکردەوە لە ساڵی ١٩٥٥ رەخنەی زۆری لـێگیرا چـونکە جـەختی لە پەرەپێدانی ژێرخان دەکردەوە بەبێ هیچ شتێکی دیکە، چجای کشـتو کـاڵ لـە رووبـەری زیـاترو زەوی تـازە. لـە جیـاتی ئـەوە داوایکردبـوو ئەنجومـەن هـەموو هەوڵەکانی خۆی بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی رێـژەی بەرهـەمی زەویـە چـێنراوەکان زیـاد بکرێت، ئەویش لـە رێگـەی بە دروسـتی بـەکارهێنانی پـارەو پـول لـە پرۆژەکـانی ئاوەڕۆ. هەروەها بنچینەیەکی سیاسی زیاتر لەوە ئابووری تر بێـت بـەکارهێنا بـوو ئامۆژگـاری ئەنجومـەنی دەکـرد برەپـارەی گـەورە بـۆ پرۆژەکـانی تەندروسـتی و تۆڕەکانی ئاوی خاوێن و پـەروەردە و نیشـتەجێ بـوون خـەرج بکـات. بـۆ ئـەوەی خزمەتگوزاری راستەوخۆ پێشکەش بە گەورەترین کەرتەکانی دانیشتوان بکات.

کار لەسەر زۆربەی راسپاردەکان کرا. بە جۆرێك برە پارەی زۆر گرنگ بۆ ئەو پرۆژانە تەرخانکرا کە دەستنیشانی کردبوون، بەڵام خەرجکردنی راستەقینە لە سێ ساڵی دواییدا زۆرکەمتر بو لەوەی کە پلانی بۆ دانرابوو. لەوەشدا خاوەن بەرژەوەندییە کشتوکاڵیەکان سوودمەندی یەکەمی ئەو پرۆژانە بوون. بەو شێوەیە داهاتە نەوتیەکان بنچینەی یەدەگی دەوڵەت و بوژانەوەی گەرەنتی کرد، بەڵام بەو شێوەیەی کە باڵا دەستەکانی بەسەر دەوڵەت دەیانوسین. ئەوەش سەلماندی نەبوونی دادوەری و یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەبێ رکەبەر دەمێنێتەوە.

## نوری سەعید: ئارەزووە دەرەکیەکان و ئاستەنگە نێوخۆییەکان

ئەوەی لەو ساڵانەی دوایی نوری سەعیدی سەرقاڵ کردبوو لە سیاسەتی دەرەوەی عێراقدا تێبینی دەکرا، نوری سەعید بڕوای وابوو لاگیری عێراق بۆ وڵاتانی رۆژئاوا پەرەپێدانی پەیوەندییەکان لەگەڵ تورکیا و ئێران دووکاری زۆر زیندوون بۆ پارێزگاری کردنی لە ئەمنی دەوڵەت و سیستەمی حوکم.

بەڵام لاگیری نەکردن هەر لە بنچینەدا نهێنی برینی پەیوەندیەکان بوو لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا کە نوری بڕوای وابوو کە گرەنتی دەرەکی سەرەکی بوو بۆ مەلەکیەت. لە هەمان کاتدا نوری لە هەمبەر پرسە عەرەبیە گرنگەکان دوودڵبوو. گیانی عەرەبچیەتی خانەوادەی دەسەڵاتدار وەك نەوەی میرنشین بانگەوازی بۆ کردبوو بە تێڕوانینی نوری سودێکی دیاریکراوی هەبوو، پێویستی بە دەستێکی ئاسنینی عێراقی هەبوو تاکو کۆنترۆڵی بکات و رەنگە ئالۆزی وای لێبکەوێتەوە کە ئەو پەی پێنەبردبێت لە پەیوەندیەکانی عێراق و میرنیشینی عەرەبی سعودی و میسر. چجای ئەوانە نوری سەعید زۆر بۆ عروبە بەجۆش نەبوو کە رەوتی قەومیەی عەرەبی لە سیاسەتی عێراق بانگەشەیان بۆ دەکرد.

راستە لە کاتی پێویستدا ئەو جۆشە کەمەی خۆی دەشاردەوە بەڵام لە زۆربەی ژیانی سیاسی خۆی کۆسپی دەخستە بەردەم ئارەزووە سیاسیەکانیان.

نوری سەعید وای بۆ دەچوو بەدواداچوونی ئەتنی بۆ ئامانجەکانی عروبە دەبێتە هۆی بەش بەشبوونی دەوڵەت. هەرچەندە سۆزی بۆ داواکارییەکانی کورد بە سەربەخۆیی زاتی نەبوو، بەڵام دەیزانی عروبە پرسی کۆنترۆڵی مەرکەزی لە کوردستان ئاڵۆزکردووە. هەروەها دەیزانی شیعە وای بۆ دەچن کە پرۆژەکانی قەومیەی عەرەبی و وەحدەی عەرەبی هەوڵن کەمینەی عەرەب سونە کە باڵا دەستبوون لە عێراق پەنای بۆ دەبەن و گەرەکیانە پاڵپشتی گەورەترین رووبەری عەرەبی سوننە هەزار نیشینەکان بەدەست بێنن کە لە کاتی روخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دەستیان دابوو. نوری خۆشی لەو نێوەندە عەرەبیە سونیەدا هاتبوو ئاگاداری لاگیری هەستنەکردنیان بوو بە ئەمان لە هەمبەر تایەفەکانی دیکەی عێراق. لەگەڵ ئەوەی ئەو بەشداری هەندێك لە مەینەتیەکانی کردبوو بەڵام بڕواشی بە ئایدیۆلۆژیەتی نەتەوەی عێراقی نەبوو. بەڵام توانیبووی کاریگەری رەوتی عروبە لەسەر لاوازکردنی کۆمەڵگەی سیاسی عێراق ببینێت. ئەو چارەنووسی عێراقی بە ڕەوشە سیاسیە ناسەقامگیرەکانی وڵاتە عەرەبیەکان گرێنەدەدا چجای هەڕەشەکانی بۆ سەرکردە عەرەبەکانی دیکە کە نابێ هیچ وشەیەکی لاسەنگ لە هەمبەر کاروباری عێراق بکەن، بەوەش نەوەستا بوو لەوە دوورتر چوو بوو زۆربەی چینەکانی گەلی عێراقی لە شانۆی سیاسی دوورخستبووەوە و بەردەوام ناکۆکیەکانی خۆی لەگەڵ عەرەبی سوننە بە دیار دەخست کە دەستیان بەسەر دەوڵەتدا گرتبوو.

لە بەرامبەردا نوری سەعید نەتەوەیەتی عێراقی خۆی بە شێوەیەکی کردەیی پەیرەو دەکرد. بڕوای وابوو نابێت عێراق پرسە عەرەبیەکان فەرامۆش بکات. بەڵام پێویستە لە هەمان کاتدا گرنگی بە دراوسێ غەیرە عەرەبەکان و دوورتریش لەوان بدات، بە تایبەتی لە کاتی پێویست بۆ پاراستنی سیستەمی هەرێمیی کە پارێزگاری لە سنوری وڵات و پێکهاتەکانی دەوڵەت دەکات. نوری سەعید لەکاتی سەردانیکردنی بۆ تورکیا لە پایزی ١٩٥٤ بۆ پتەوکردنی پەیوەندیەکانی ئەو بیرۆکانەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت لەو کاتەی سەرۆکایەتی حکومەتی کرد بۆ

ماوەیەکی کورت. لەو ماوەیەدا ڕێکەوتنی تورکیا پاکستان کە لە نیسانی ١٩٥٤ گرێدرا سەرەنجی ڕاکێشا. تیایدا بنچینەیەکی دۆزیەوە پێی وابوو دەکرێت تۆڕێکی گەورەی هاوپەیمانیەتی هەرێمی پێکبهێنرێت کە یارمەتی گلدانەوەی فراوانبوونی دەستڕۆیشتووی سۆڤیەت بەرەو باشوور دەدات. تێوەگلانی سۆڤیەت لە کاروباری دەوڵەتی ئێرانی دراوسێ لە چلەکان و گومانی نوری لەو ڕۆڵەی یەکێتی سۆڤیەت کە لە عێراق دەیبینی لە ڕێگەی حزبی شیوعی عێراقی. عێراقی بەرەو ئەوە برد پەیوەندییە دیپلۆماسیەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٥ هەڵبپەسێرێت.

لە هەمان کاتدا لە دانوستان لەگەڵ عەدنان مەندرێس سەرەوەزیرانی تورکیا دەستبەکاربوو لە کانونی دووەمی ١٩٥٥ و ڕاگەیاندنی هاوبەشی لێدەکەوێتەوە. تیایدا عێراق و تورکیا لە سەر ئەوە ڕێککەوتن کە دوژمنداری لەسەر ناوچەکە ڕەتبکەنەوە و ڕێکەوتنی ڕەسمی ئیمزاکراو ئەو بنچینانەو وردەکارییەکانی و جێبەجێ کردنی لە شوباتی ساڵی ١٩٥٥ تێدا چەسپاوە. دواتر بەریتانیای گەورە هاتە نێو پەیمانی بەغداو هەردوو بنکەی ئاسمانی حەبانیەو شوعێبە درایەوە دەست عێراق لە بەرامبەر تێپەڕبوونی ئاسمانی و سووتەمەنی پێدان. هەروەها بەریتانیا پەیمانیدا یارمەتی عێراق بدات ئەگەر هاتوو دووچاری هەر هێرشێك ببێتەوە. هاوکات بەردەوام دەبێت لە مەشق پێکردنی هێزە چەکدارەکانی عێراق و کەل و پەل و پێداویستی سەربازییان بۆ دابین دەکات. هەرچەندە نەچوو بۆ نێو هاوپەیمانیەتەکە، بەڵام هاوکات تەواوی دەکرد (دواتر ئێران و پاکستان لە ساڵی ١٩٥٥) بێ گومان ئەوە زۆر سەرکەوتوو نەبوو لە ڕازیکردنی ئەو کەمینە بچووکە لەو ئەفسەرانەی کە هۆکاری زیاتریان بە دەستەوە بوو بۆ پیلانگێڕان لە دژی سیستمی حوکم. لە هاوینی ساڵی ١٩٥٦ یەکێك لەو پیلانانە ئاشکرا بوو. سەرەڕای ئەوەی لێکۆڵینەوە لەو پیلانە یەکلاکەرەوە نەبوو، جارێکی دیکە ئەو ئەفسەرانەیان لە ڕێزەکانی سوپا دامەزراندەوە کە گومانیان لە سەر هەبوو.

نوری وای بۆ دەچوو سەرەتا تەنگژەی سوێس هەلێکە بۆ دابڕاندنی میسر لە جیهانی عەرەبی. بەلام زنجیرەی ڕووداوەکانی دوای ئەوە کە گەیشتە ترۆپکە لە هێرشەکانی بەریتانیا–فەرەنسا بۆ سەر میسر و نەرمی نواندنیان لەگەڵ ئیسرائیل. بە توندی نوریان توشی شۆك کرد و لە ڕاوبۆچوونی چەسپاو کاریگەری لە سەر دروستکرد. وای لێکرد بڕوا بە گروپە عێراقیەکان بکات کە بەردەوام بەوە تۆمەتباریان دەکرد پەیوەندی بە کرێگیراوی لەگەڵ بەریتانیای مەزن گرێداوە. لە ئەنجامی ئەوە نوری سەعید ناڕەزاییەکی ڕەسمی ئاڕاستەی بەریتانیای مەزن کردو قانونی عورفی ڕاگەیاند. هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ فەرەنسا پچڕاندو بەریتانیای مەزنی لە کۆبوونەوەکانی بەغدا دوور خستەوە و مەلیکی ڕاسپارد کە لە کۆنگرەی عەرەبی بە پەلەی بەیروت ئامادە بێت تاکو هاریکاری عەرەبی نیشانبدات. گرتنە بەری ئەو ڕێوشوێنانە وایکرد دەنگی ئۆپۆزسیۆن لە عێراق کەمبێتەوە. بەلام ئەو ڕێوشوێنانەی نوری گرتیە بەر هەر جۆرێك بێت ناتوانێت یادگاری هاوڕێیەتیە دوورو درێژەکەی لەگەڵ بەریتانیا بسڕێتەوە. سەبارەت بە هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنیش کە لە سیاسەتی سەرکوتکردنی توندی نوری سەعید بێزار ببوون لەوەتەی ساڵی ١٩٥٤، هەلێك بوو بۆ ئەوەی بەو تاکە ڕێگایە جموجۆڵ بکەن کە لە پێشیاندایە. ئەویش گرتنە بەری شەقامی شارە گەورەکانی عێراق بوو. خۆپیشاندانی گەورە نەوەك بە تەنها لە بەغدا بەڵکو لە موسڵ و نەجەفیش بەرپابوو. لە بەغدا نوری پەنای بردە بەر هێزەکانی ئەمن بۆ ئەوەی سنورێك دابنێت و ڕێگەنەدات پشێوی پەرەبسێنێت. نوری دانینا کە کاریگەری سیاسی خۆپیشاندانەکان لە پایتەخت تا ڕادەیەکی زۆر زیاترە لەوەی کە لە هەرێمەکان ڕوویداوە. دواتر پەنای بردە بەر هێرشکردن و جارێکی دیکە تۆمەتی کۆنی زیندوو کردەوە کە شیوعیەت و زایۆنیزم بە یەکەوە گرێ دەدات. بە ڕەچاوکردنی پەیوەندی حزبە شیوعیە عەرەبیەکان بە یەکێتی سۆڤیەت و پێگەی سۆڤیەت لە فەلەستین، ئەوە خاڵی لاوازی بەردەوامیبوو. بەلام نوری لە هەمبەر تەنگژەی سوێس هەستی بە دڵە ڕاوکێیەکی زۆر دەکرد، بە تایبەتیش لە هەمبەر ئەو

سەرکەوتنە گەورەی کە حزبی شیوعی عێراقی بەدەستی هێنا لە بەدەرخستنی شەرمەزاری لە نێوچەوانی و دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ کەرتەکانی دیکە لە ئۆپۆزسیۆن لە سەر بنچینەی پەیمانی عروبەی دژ بە ئیمپریالیەت.

هۆکاری سەرکەوتنی ئەو ڕێکارانەی نوری گرتیە بەر بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە توندی خۆپیشاندانەکان لاواز ببوو ماوەکەشی تا رادەیەك کەم ببوو. بەڵام ئاسایی بوو ئەو پرسانەش کە خۆپیشاندان و ناڕەزاییەکانی لێکەوتبووەوە کەرتێکی فراوانی گەلی عێراقی نەگرتبووەوە وەك ئەوەی لە خۆپیشاندانەکانی پێشوو هەبوو. بەمەش بەشێك لە جیهانی سیاسی بایەخی بە پرسە عەرەبیە گەرمەکان و هاوپەیمانیەتیەکانی ئێران لە سیاسەتی جیهان دەدا. بەڵام ئەوە خەمی گەورەی زۆربەی گەلی عێراق نەبوو. بۆیە زۆربەی ناڕەزاییەکانی بەغدا قوتابی و مامۆستایانی لەخۆ گرتبوو کە بەردەوام زۆر بە جۆش بوون بۆ ناڕەزایی لە سەر پرسە پەیوەندارەکان بە کاروباری گشتی و ئەوانەی مانای رەمزیان هەیە. بۆیە نوری قوتابخانەکانی داخست، ئەوەش وایکرد خۆپیشاندانەکان تا رادەیەك کەم ببنەوە.

بەڵام شاری نەجەف و دەوروبەری کە زۆربەی دانیشتوانی شیعە بوون. بە شێوەیەکی گشتی خۆپیشاندانەکان شێوازی دژ بە سیستەمی حکومییان گرتبووە بەر. ئەوەش هەلی ئەوەی رەخساندبوو ناڕەزایی نەك هەر دژی نوری سەعید و حکومەتەکەی بەڵکو دژی دەوڵەتیش بەرزببێتەوە کە ئەو حکومەتەی بەرهەم هێناوە لەگەڵ ئەو زوڵم و زۆرداریەی کە پێوەی گرێدراوە. هێزەکانی ئەمن بە توندی بەرەنگاری ئەو خۆپیشاندانانە بوونەوەو. بە بۆچوونی نەیارەکانی نوری رووداوەکانی پایز سەلماندی چونکە نوری نوێنەری –کۆشك– سوپا بوو. ئەستەم بوو لە سەر حوکم لابدرێت. حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن بەرەی نیشتمانی یەکگرتوویان لە شوباتی ١٩٥٧ پێکهێناو حزبی سەربەخۆیی و حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراقی لە ژێر باڵی خۆی گرت. (کە لەو کاتەدا لە ژێر سەرکردایەتی حوسێن ڕەزەوی) و حزبی بەعس تازە دروستبوو بوو.

لە ساڵانی چلەکان حزبی بەعس لە سوریا دروستبوو، دواتر لقێکی لە ئێران دروستکرد، لەوەتەی ساڵی ١٩٥١ فوئاد روکابی سەرۆکایەتی کرد کە ئەندازیارێکی شیعەی خەڵکی ناسریە بوو، کە حزبێکی عەرەبی نەتەوەیی عەلمانی بوو. بەڵام کۆمۆنیست نەبوو، تێڕوانینێکی سۆسیالستی نادیاری هەبوو، رەخنەی لە نەبوونی یەکسانی لە رادەبەدەری لە سیاسەتی سەرمایەداری لە جیهانی عەرەبیدا دەگرت. لەو روانگەوە بیری قوتابیان و ئەوانی دیکەی بۆ خۆی راکێشا ئەوانەی کە بێزار بوون لە باڵا دەستی بژاردەیەك لە عەرەبە نەتەوەییە بەتەمەنەکان و دوورە پەرێزەکان. ئەوەی جێی سەرنجە لە عێراق . حزبی بەعس نەوەیەکی شیعەی تەمەن بچوکی بۆخۆی راکێشا لەوانەی بە دەست پیاوانی ئایینی شیعەو سیاسەتی سەرمایەداری کشتوکاڵیان دەناڵاند جگای بژاردەی عەرەبە نەتەوەییە سوننەکان. بەڵام لایەنگرانی لە شارەکان جەختیان لە سەر قوتابیان و کرێکاران لە هەندێك پیشەی سەرەکی دەکردەوە. هیچ حزبێکی دیکە بە قەدەر حزبی بەعس ئەو هەموو جەماوەرە فراوانەی نەبوو. بەرنامەی بەرەکە کە سەرەڕای رەخنەگرتنی لە نوری سەعید بەڵام بە شێوەیەك لە شێوەکانی رادیکاڵ نەبوو. داوای دیموکراتیەت و سەربەخۆییە دەستوریەکانی دەکرد. داوای رەتکردنەوەی قانونی عورفی و کشانەوەی عێراق لە پەیمانی بەغدای دەکرد. رێچکەی سیاسەتی بێلایەنیی ئیجابی گرتبووە بەر.

## کودەتای ساڵی ١٩٥٨

حزبەکانی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو بۆ ماوەیەکی درێژ پەیوەندیان لەگەڵ هێزە چەکدارەکان دروستکرد. چونکە کەسانی لایەنگری لە نێواندا بوو. یاخود ئەندامیان لە نێو رێزی ئەفسەرەکانی سوپا و سەربازو پلەدارەکانی دیکە هەبوو. هەندێك لەو حزبانە وەك حزبی شیوعی عێراقی. رێکخراوی سەربەخۆی بۆ ئەندامە سەربازییەکانی پێکهێنا بوو. لەگەڵ ئەوەش چالاکی ئەو ئەفسەرانە هەماهەنگ

نەبوو. هەروەها بە روونی دیاربوو هەندێك ئەفسەری دیكە بە شێوەیەكی سەربەخۆ دوور لە حزبە سیاسیەكان كاریان دەكرد. لە ساڵی ١٩٥٦ گروپێك كە ناویان لە خۆیان نابوو ئەفسەرە سەربەخۆكان سەرنجی دەسەڵاتیان راكێشا. بۆیە دەسەڵات هەندێكیانی گواستەوە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەكیان لە سەر بخاتەڕوو. لە بەرامبەر ئەوان لە چالاكیەكانیان بەردەوام بوون، تەنگژەی سوێسیش كاریگەری خۆی لە سەر ئەو نێوەندانە بەجێ هێشتبوو، وایكرد ئەفسەرەكان زیاتر رێگەیەكی بە بەرنامەو پرۆگرام بگرنە بەر. لێژنەیەكی باڵا دامەزرا كە لە یازدە ئەفسەر پێكهاتبوو پلەكانیان لە نێوان (عەمید و رائید) دا بوون زۆربەیان پلەكانیان كۆلۆنێل بوو. هەروەها لێژنەی دیكەی ناوەندیی پێكهێنرا بۆ ئەوەی دیراسە لەسەر ئەگەری جێ بەجێ كردنی كودەتایەكی سەربازی بكەن. زۆربەی ئەو ئەفسەر سەربەخۆیانە لە عەرەبی سوننە بوون. ئەوەش شتێكی ئاسایی بوو بە گوێرەی هەر گروپێكی ئەفسەرانی سوپا لەوكاتەدا. هەروەها زۆربەی ئەندامانی لێژنەی باڵا تەمەنیان لە چلەكاندا بوو دەرچووی ئەكادیمای سەربازی سالانی سییەكانی عێراق بوون. جگە لە بێزاریان لە سیستەمی حوكم و رەوشی ئەو كاتەوە رق و قینیان لە ئیمپریالیەت، بنچینەیەكی سیاسی هاوبەشی زۆر بچوكیان لە نێوان دا بوو. لێژنەی باڵا بڕیاری دا گرنگترین ئەندام لە پیلاندانان بۆ كودەتای سەربازی پێویستە فەرماندەی یەكە سەربازییە سەرەكیەكان بێت یا بەشێك بێت لە رێكخستن یان لایەنگر بێت لە ئامانجەكانی. ئەوە وایكرد لێژنەكە لە عەبدولكەریم قاسم نزیك بێتەوە عەمیدیش لە لایەن خۆیەوە گروپێكی ئاسایی لە هاوكارانی پێكهێنا بوو لەوانەی بیركردنەوەیان لە یەكتر نزیكە. لە ساڵی ١٩٥٧ بانگهێشت كرا بۆ ئەوەی بچێتە ریزەكانی لێژنەی باڵا، دواتریش كرا بە سەرۆكی لێژنەكە و لێهاتوویی و شارەزایی و هەندێك هۆكاری دیكە بۆ ئەوە رەچاوكرابوو.

قاسم کە تەمەنی ٤٣ ساڵ بوو کۆلۆنێل عەبدولسەلام عارفی پێشکەش کرد کە تەمەنی بچوکتر بوو و تەنها ٣٦ ساڵ بوو، کە دواتر بووە ئامرازی بەیەك گەیشتن لەگەڵ گروپێکی ئەفسەرە جوودابووە تەمەن بچوکەکان کە هەر لە بنچینەوە لە لایەن رەفعەت ئەلحاج سرِی دامەزرێنەری بزوتنەوەی ئەفسەرە سەربەخۆکان تەجنیدکرا بوون. لە سالانی پەنجاکان. ئەو گروپە لە کۆتایی سالانی ١٩٥٧خۆیان بە بزوتنەوەی ئەفسەرە سەربەخۆکان گرێدا بوو ، دواتر عارف هەر تیایدا مایەوە بەلام لەگەلیاندا جیاواز بوو. بزوتنەوەکە هانی ئەوەی نەدا پەیوەندی لەگەڵ حزبە سیاسیە مەدەنیەکان دابمەزرێت، بەلام ئەوە سوودی نەبوو. لەو کاتەی حزبە سیاسیەکان بە بوونی ئەفسەرە سەربەخۆکانیان زانی هانی لایەنگرەکانیاندا لە ئەفسەرەکان بۆ ئەوەی بێنە نێو بزوتنەوەکە. جۆراو جۆری ئەو پەیوەندیانە یارمەتی ئەوەیدا ئەفسەرە سەربەخۆکان نەبنە هاوبەشی هیچ حزبێك لە عێراق. لە بەرامبەردا بە هۆی جۆراوجۆری ئینتیمای ئەفسەرە سەربەخۆکان، ئەگەری ئەوە نەبوو ئامانجە هاوبەشەکانیان لە رواڵەتدا بۆ دوای کودەتا بەردەوام بێت. نوری سەعید ئاگاداری ئەو پێشهاتانە نەبوو، بەڵکو هەر گوێی لێنەبوو، چجای بە هەند وەرگرتنی، بۆیە، دوای ئەوە کۆنترۆڵی گرفتەکانی تەنگژەی سوێسی کرد لە ساڵی ١٩٥٦، هەستی بە متمانەیەکی تەواو کرد بۆ ئەوەی تا رادەیەك سیاسەتە سەرکوتکارانەکەی کەمبکاتەوە. قانونی عورفی هەڵگرت و رێنمایی دەرکرد بۆ ئەوەی رێگە بدرێت جارێکی دیکە لە نوێوە جموجۆڵی حزبی پەیرەو بکرێتەوە. هەر چەندە ئەو رێگەدانە بە پێی سیستەمێك بوو کە وردبینی لە بەرنامەکاری حزبەکان و کۆنترۆلکردنی ژمارەیان دەکرد. لەگەڵ نەمانی تەنگەژکە راستەوخۆ نوری لە حوزەیرانی ١٩٥٧بریاری دەست لە کار کێشانەوەی لە سەرۆکایەتی حکومەتدا. ئەوەی بۆ ئەوە پاڵنەری بوو. وەك

هەموو جارێك دابەشبوونی ئەندامانی حکومەت بوو کە جەختیان لە سەر ڕەوشی ئەنجومەنی بوژانەوە بە ڕێڕەوی سەربەخۆ کردبووەوە. دواتریش لێی بێزار بوون. مەلیك ، (عەلی جەودەت)ی ڕاسپارد بۆ ئەوەی حکومەتێکی نوێ پێکبهێنێت تاکو سەرپەرشتی هەڵبژاردن بکات و دەرگە لە قۆناغێکی کاری سیاسی نوێ بکاتەوە کە لەوەی پێش خۆی والا تر بێت. بەلام هەڵبژاردنەکان تەواو نەکرا. عەلی جەودەت ناچار کرا دەست لە کار بکشێنێتەوە. لە بەر ئەوەی لەگەڵ جێ نیشین دووچاری دەمە قاڵی ببوونەوە بە هۆی ئەوەی کە لاگیری میسری پێشنیاز کرد بوو. لە ئەیلولی ١٩٥٧ عەبدولوەهاب مەرجان لە شوێنی ئەو دامەزرا. کە مولکدارێکی زەوی و زاری شیعە بوو یەکێك بوو لە پیاوەکانی نوری سەعید و گرنگیەکی گەورەی دەبێت لە ئیدارەی نوێ. ئەو کارەش گرنگیەکی تایبەتی هەبوو بەو پێیەی ئەو پێشهاتانەی لە چەند مانگی داهاتوو ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەخۆوەی دەبینێت هەڕەشە دەبێت بۆ سەر هەموو ئەوەی نوری سەعید دەیویست بە دەستی بێنێت.

لە شوباتی ساڵی ١٩٥٨ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دامەزرا کە خۆی لە چوار چێوەی یەکگرتنێك لە نێوان سوریاو میسر دەبینێتەوە. دۆڕاندنێك بوو بە گوێرەی ئەو حزبەی لە سوریا پاڵپشتی عێراقی دەکرد. ئەوەش وایکرد دەستڕۆیشتوویی عەبدولناسر بگاتە سنوری عێراق. وای لێهات هەڕەشەکە زیاتر ڕوون بووەوە بە هۆی ئەوەی بە ئاشکرا دوژمنایەتی نوری و سیستەمی پادشایەتی دەکرد. نوری بە دەستپێکردنی دانوستاندن لەگەڵ ئەردەن ڕوو بەڕووی بووەوە بەو هیوایەی بگاتە پێکهێنانی پەیمانێکی بەرگری لە ڕووی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو هەموو ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە و نوێنەرایەتیان دەکات لە جیهانی عەرەبی. دانوستانەکان دامەزراندنی یەکێتی

عـەرەبی بــە پەلــەی لێکەوتــەوە. لــە نێــوان عێــراق و ئــەردەن. هاوکــات بەشداریکردنی کوێت تێیدا لە ئایندە بە کراوەیی بەجێ هێڵرا.

لە سایەی ئەو رەوشە دا ئەوانە وای کرد مەرجان دەست لـە کـار کێشـانەوەی پێشکەش بکات. لە ئاداری ١٩٥٨. رێگە خۆش بوو بـۆ ئـەوەی نـوری جـارێکی دیکـە سـەرۆکایەتی حکومــەت بگرێتــەوە دەسـت. لــەو حکومەتــە کــە دوای حکومەتی نوری سەعید بوو تێبینی دەکرا کـە نـوری زیـاتر لـە هاوسـەنگیەکی دادپەروەرانە لە نێوان پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی عێراق دروسـتکردبوو. سـەرەڕای ئـەوەی حکومەتەکـە رێژەیـەکی هاوسـەنگی لـە وەزیرانـی سـوننە و شیعە لە خـۆ گرتبـوو، نـوری سـووربوو لەسـەر ئـەوەی دوو وەزیـری کـوردیش دابمەزرێنێت. هەستیکردبوو، چ هەستیارییێك لەلایەن شیعەو کـورد لـە هەمبـەر پرۆژەکانی یەکبوونی عەرەبی هەیە. پەرلـەمان هەڵوەشـایەوەو هەڵبـژاردن لـە ئاداردا ئەنجامدرا، پەرلەمانێك هاتە کایەوە کە پەسەندکردنی چەکی یەکبوونی لـە نێـوان عێـراق و ئـەردەن لێکەوەتـەوە و دەسـتووری عێراقـی بـەو پێیـە هەموارکرا. بە پێی ئەو هەموارکردنە حکومـەتی عێـراق لـە هـەموو شـتێك بـەر پرسیار بوو تەنها بەرگری و کاروباری دەرەوە نـەبێت کـە دەکەوێتـە ئەسـتۆی حکومەتی یەکێتی عەرەبی. بـەو هۆیـەوە نـوری سـەعید لـە سـەرۆك وەزیرانـی عێراق دەستی لە کار کێشاوەو کرا بە سەرۆك وەزیرانـی یـەکێتی عـەرەبی. لـە شـوێنی ئـەو ئەحمــەد موختــار بابـان دامــەزرا و راسـپێردرا بـە پێکهێنــانی حکومەتێکی تازە، بەوەش بووە یەکەم سەرۆك وەزیرانی کوردی عێراق.

لــەو کاتــەدا لەگــەڵ ئەنجامــدانی هەڵبــژاردن و دەرچــوونی هەموارکردنــە دەستوورییەکانی دەست بە سەر داگرتنـی نـوری سـەعیدو لایـەنگرانی بـە سـەر حکومەتی نوێی یەکێتی عەرەبی، هێزە چەکدارەکان خۆیان بـۆ ئـەوە ئامـادە

دەكرد مێژوی وڵات بگۆڕن. لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ سەرەڕای بوونی جیاوازی بیروڕای سیاسی شاردراوە ئەفسەرە سەربەخۆكان گەیشتنە ڕێككەوتنێك كە پێویستە عێراق كۆماری بێت و زۆربەی بژاردە سیاسیە كۆنەكان بە تۆمەتی خیانەتی گەورە و دەست تێكەڵكردن لەگەڵ ئیمپریالیەت دادگایی بكرێن. هەروەها ڕێككەوتن كە ئەفسەرانی سوپا سەرجەم پۆستە باڵاكانی ئیدارە بگرنە دەست و خەڵكی مەدەنی نزمترین پۆست وەربگرن. دەسەڵاتی ئەفسەرانیش لە ئەنجومونێك خۆی دەبینێتەوە كە ناوی لێنرا ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش . كە بەئەندامیەتی لێژنەی باڵا پێكهێنراو ئەو ئەنجومەنە دەسەڵاتی جێبەجێكردن دوای روخانی پادشایەتی دەگرێتە دەست.

دواتر ئەندامانی لێژنەی باڵا بەرەو پلاندانان بۆ كودەتا چوون كە دەیان گەیەنێتە ترۆپكی دەسەڵات. هاوكات ئەگەری ئاشكرابوونیان لەگەڵ فراوانبوونی ڕێكخراوەكە و گەورەبوونی قەوارەكەی زێدەتر دەبوو. دواتر خشتەی كار لەسەر گریمانێك چڕ دەبووەوە ئەویش ئەنجامدانی كودەتابوو پێش تەواوبوونی ساڵی ١٩٥٨. هەلەكە لە ناوەڕاستی ئەو ساڵە ڕەخسا دوای ئەو ڕووداوانەی كە لە تەواوی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕوویدا. نوری لەسەرخستنی تەنگژەی لوبنان و نەیاری لەگەڵ كۆماری عەرەبی یەكگرتوو دەترسێت، بڕیاریدا یەكەیەكی سوپای عێراق لە یەكێتی عەرەبی بەشداری بكات ئەگەر بێت و كار وا بخوازێت. بۆیە ئەو جموجۆڵەی كە لە بنچینەدا لە ڕۆژە بەراییەكانی مانگی تەمموزی ١٩٥٨ پلانی بۆ دانرابوو دواخرا بۆ شەوی ١٣-١٤ تەمموز. ئەفسەرە سەربەخۆكان بەتایبەتیش عەبدولكەریم قاسم و هاوپەیمانەكەی عەبدولسەلام عارف بینیایان هەلەكە ڕەخساوە. ئەو یەكە سەربازییانەی كە فەرمانییان پێكرابوو بەرەو سنووری ڕۆژئاوا بڕۆن دەبوایە بەناچاری بەنزیك بەغدا تێپەڕن. بەو شێوەیە كاتێك ئەو یەكە سەربازییانە

فـەرمانی جموجوڵیـان پێکـرا عەبدولسـەلام عـارف ئـەو هێـزەی کـە ئـەو سـەرکردایەتی دەکـردن و ئەوانـەی دیکـەش کـە ئەفسـەرە هاوپەیمانـەکان رابەریـەتیان دەکـرد بـەرەو بەغـدای پایتـەخت ئاڕاستە کـرد، ئـەو سـەربازانە کودەتایـەکی سـەربازی کلاسـیکیان جێبـەجێکرد و سـەرجەم باڵەخانـە ستراتیژییەکانی بەغـدایان داگیرکـرد، لەوانـەش ئێزگـەی بەغـدا کـە تیایـدا عەبدولسەلام عارف لەدایکبوونی کۆماری عێراقی راگەیاند، دوای بۆردومـانێکی کەم پاسەوانی مەلەکی لەناو کۆشکی مەلیکدا خۆیـان بەدەسـتەوەدا و مـەلیك فەیسەڵەی دووەم و عەبدولئیلای جێنشین لەگەڵ چەند ئەندامێکی خانەوادەکە هاتنە دەرەوە و لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا هەر هەموویان کوژران. نازانرێـت کە ئایا ئەفسەرە پیلانگێڕەکان پێشـتر پلانیـان بـۆ کوشـتنیان دانـابوو یـاخود رووداوەکە بەهۆی فشار و جۆش و خرۆشی ئەو کەسانەوە بووە ، دواتـر مـاڵی نوری سەعید چواردەوری گیرا، سـەرەڕای ئـەوەی نـوری تـوانی رابکـات بـەڵام لەڕۆژی دواتر دەستگیرکرا و لەسەر شەقام گوللە باران کرا.

کودەتای سەربازیی تەمموزی ١٩٥٨ کە حوکمی پادشایەتی رووخاند کۆتایی بە قۆناغێك لە مێژووی عێراق هێنا کە، لە بەریتانیای مـەزن دەسـتی بەسـەر ئـەو قۆناغـەدا گرتبـوو لەگـەڵ خانـەوادەی هـاشمی و ئەفسـەر و فەرمانبـەرانی عوسمانی پێشووتر کە هەوڵیاندەدا کۆنترۆڵی دامودەزگەکانی حکومەت بکەن،. جـجای خـاوەن زەویـەکان و دەسـتە بـژێری کۆمەڵگـە جۆراوجۆرەکـانی کـە کۆمەڵگەی عێراقی لێپێکهاتووە. لەو قۆناغەدا پیشتیان بە باڵا دەستی ئابووری خۆیـان بەسـتبوو، لەگـەڵ تۆڕەکـانی سـەربەخۆیان و لایـەنگرانیان بـۆ ئـەوەی گـرەنتی بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان بکـەن. لـە هەمانکاتـدا بـەهیچ شـێوەیەك هەستیان بە پەشیمانی نەدەکرد لەوەی پەنایان بردبـووە بـەر زوڵـم و زۆرداری کاتێـك بەرژەوەندییـەکانیان دەکەوتـە مەترسـییەوە. لەکاتێکـدا کـە هێـزە

چەکدارەکان لە بنچینەدا مەبەستیان بوو هەموو هاوولاتیان بخەنە ژێر باری یاساوە، کەچی بەردەوام بۆ سەرکوتکردنی بەرگریی ناوخۆیی بەکاردەهات هەروەها کاتێك پەتای بەرگریکردن دەگەیشتە شارەکان و دامودەزگە تازەکانی پەیوەست بە پەرەپێدانی کۆمەڵگەی سیاسی ئاڵۆزتر، ئەو رووبەرە میللیانە بەش بەحاڵی خۆیان بەرەو پەنابردنە بەرهێز دەچوون.

ئەو سیاسەتە کە توندی و کاریگەرییەکەی بۆ ماوەیەکی کورتخایەن ناسرابوو نەیتوانی چارەسەری یەکجارەکی ئەو گیروگرفتانە بکات کە کۆمەڵگەی عێراقی بەدەستیەوە دەینالاند . هەروەها نەیتوانی وابکات عێراقییەکان هاوکاری یەك بن و بەشێوەی جۆراوجۆر پارێزگاری لە بەرژەوەندی و بەدەستهێنانی دەستکەوتی زیاتر بکات. ئەوەی وایکرد سیستەمی حوکم لە قۆناغی دوای رژێمی پادشایەتیدا زنجیرەیەك ئاستەنگی بکەوێتە رێگە ئەو ستراتیژییەتەی کە نوری سەعید پشتی پێ بەستبوو ئەوەبوو وای دانابوو سوپا ئامرازی سەرەکی دەوڵەت پێویستە وەفای سیاسی بۆ سیستەمی حوکم هەبێت کەچی نەمێژووی رێچکەی کورتی ئەفسەرە عێراقییەکان و نە کەشو هەوای دامەزراندن و بەکارهێنانی ، ئەو ستراتیژیەتەیان نەسەلماند. بۆیە سروشتی بوو دواتر بەڵکو یەکلاکەرەوە بوو کە نەوەی نوێ لە پیلانگێرە سەربازییەکان ئەو سیستەمە بڕوخێنن کەچەند ئەفسەرێکی دیکتاتۆر و پیلانگێڕ دروستیان کردبوو و دەستیان بەسەرداگرتبوو.

❑

# بەشی پێنجەم
# کۆماریی ١٩٥٨-١٩٦٨

دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی ناوەندیی لەساڵی ١٩٥٨ زۆر ئاسان و خێراتربوو لەوەی هەر کەسایەتییەکی سەربازیی کودەتاچی بۆی دەچوو. کە دواتر خۆیان بینیەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەسەرووی سەرکردایەتی سەرجەم دەرامەتە دارایی و کارگێڕییەکانی دەوڵەتدان.

هەندێك لە هاوپەیمانە مەدەنییەکانیان وای بۆ دەچوون ئەو گۆڕانکارییە دەرگە لەبەردەم شۆڕشێکی جۆریی بەسەر سیستەمی ئیمتیازات و کاریگەری لەسەر دەرامەت و بەروبوومەکانی دەوڵەت دەکاتەوە. کە کۆمەڵگەیەکی عێراقی دوور لە یەکسانی و دادپەروەری هێنابووە ناساندن. هەروەها رێگە دەدات ژیانی سیاسی لەسەر بنچینەی لیبڕاڵی و دیموکراتی زیاتر دابمەزرێت. کەچی ئاسانی گواستنەوەی دەسەڵات بیرۆکەی دیکەی لای ئەفسەرەکانی کودەتای ١٩٥٨ دروستکرد. هەر زوو عەبدولکەریم قاسم و هاوپەیمانە سەربازییەکانی درکیان بەو دەستڕۆیشتوویيە فراوانییە کرد کە خزم خزمانێ و ناسیاویەتی لەسەریان سەریار بووە. بوونە قوربانی وروژاندنەکانی پۆستەکەیان بە تەواوەتی، وەك ئەوەی بەسەر نوریئ سەعید و ئەفسەرە شەریفیەکان هات کە خۆیان لەنێو پۆستەکانی سەرکردایەتی دەوڵەتی عێراقی تازە بینیەوە.

دەوڵەتی عێراق پەیڕەوی سەرنجراکێشی خۆی کرد بەرامبەر بەو کەسایەتیانەی کە ساڵی ١٩٥٨ دەسەڵاتیان گرتە دەست. لەهەوڵەکانیان بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت و گرتنە دەستی کاروباری سەرۆکایەتی، ناچاربوون پێڕەوی ئەوە بکەن کە

سیاسەتی عێراق بۆ گەیشتن بەدەسەڵات دەیخوازێت، لەیەکەم هەنگاودا پیلانگێڕان لەنێو ریزی ئەفسەران و دەرەوەی وەك ئەوەی باوبوو دەستیپێکرد. ئەوەش توندوتیژی لەگەڵدابوو بەو پێیەی توندترین سزای ئەو دەوڵەتەیە کە جیاوازیی قووڵی تێدایە نەك هەر لەسەر ناوەڕۆکی سیاسی بەڵکو لەسەر یاساکانی باری سیاسیش. لەلایەکی دیکەوە لاگیری بۆ مەرکەزیەت و باڵا دەستی هەوڵەکانی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی زاتی هەرێمی یا کۆمەڵایەتی هەرەس بێنێت. هەموو هەوڵەکان بۆ نوێنەرایەتیکردنی سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی عێراقی لەشێوەی یەك دامودەزگە فەشەلی هێنا. لە ئەنجامی ئەوەدا، هەموو ئەو هیوایانە لە دەستچوون کە رووداوەکانی ۱۹۵۸ زیندووی کردبوونەوەو بەو شێوەیە لەرەگەوە لە رابردوو بونیادنانی دەوڵەتێکی زیاتر کراوە جیاکرایەوەو لەدەیەی دواییدا پێ بەپێ بووە مایەی شەرمەزاری. راستە ئەو پێشهاتانەی روویاندا زۆر گرنگ بوون بەڵام بەروبوومە چاوەڕوانکراوەکەی وەك هەموو جارێك سنوورداربوو، چونکە خەڵکانێك دەستیان بەسەرداگرتووە کە بەزەبری هێز کۆنترۆڵی دەسەڵاتیان کردووە. ئەو جۆرە پیاوانە کە خاوەن بیرکردنەوەی سنوردارن سەر قاڵبوون بە ، ململانێی راستەوخۆ لەسەر دەسەڵات ئەوان ئەو قۆناغەیان لەمێژووی عێراق دروستکرد. هەموو ئەو دەنگانەیان کپ کردەوە کە داوایاندەکرد رۆڵ لە جارێکی دیکە بونیادنانەوەی دەوڵەتی عێراق ببینن. لە جیاتی ئەوە عێراقییەکان خۆیان ببیننەوە لەژێر سەرکردایەتی کەسانێکدان زۆر لێهاتوون لە کنۆترۆڵکردنی سیستەمەکانی مەحسوبیەت و رق و کینە. پەیڕەوی دەسەڵاتێکیان کرد هیچ کەسایەتییەکی سیاسی لەسەردەمی پادشایەتی نەیکردووە، رشتبوونی ئەو کەسایەتیانە سەرەڕای وتارەکانیان نابێت هەموو ئەو شۆڕشە جیاوازانەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێت لەرەگەوە بێت تاڕادەیەك هەڕەشە لەو سیستەمە بکات کە خۆیان دەسترۆیشتوویان لێوەی بەدەستهێناوە هەمان شت دەکرێ بگوترێت لەبارەی درك پێکردنە پەرەسەندووەکەی دەسەڵاتدارانی عێراقی تازە، ئەوەش

سەرەڕای جۆش و خرۆشی هەندێکیان لەسەرەتاوە بۆ نوێنەرایەتی نەتەوەی عەرەبی و پرۆژەکانی یەکبوونی عەرەبی پێوەگرێدراوە.

لە توانایاندانەبوو پەیوەندی و هاوپەیمانییەتیەکان لەنێو دەوڵەتدا بەهێز بکەن کە ئەوە زۆر گرنگ بوو بۆ بەردەوامی سیاسی تەنها بەجەختکردنەوە لەسەر خودی حاڵەتی سیاسی عێراق.

ئەوە عێراق بوو بەهەموو مۆزائیکیەوە شانۆیەك بوو بۆ سیاسەتێکی عێراقی ناسراو و جودا. ئەوەش پێش تێرامان لەهەر شتێکی دیکە پێویستی بەهەڵوەستەیەك هەیە.

## عەبدولکەریم قاسم : دیکتاتۆرییەت و لەناوچوونی خەون

کودەتای ١٤ تەممووزی ١٩٥٨ لەلایەن چەند گرووپێکی جۆراوجۆرو کەسایەتی جیاجیا جێبەجێکراو تیایدا ئەفسەرەکانی سوپا ڕۆڵی یەکلایی کەرەوەیان بینی، هێزەکانی کۆلۆنێلْ عەبدولسەلام عارف و عەمید عەبدولکەریم قاسم دەستیان بەسەر خاڵە سەرەکییەکانی پایتەختدا گرت و هێزی دیکەیان بۆ دژە هێرش ئامادەکرد . عارف ئێزگەی تاڕادەیەکی زۆر بەکارهێنا بۆ ئەوەی هێزە کۆکراوەکانی بەرەو ناوەڕاستی بەغدا ببات و داوای لێکردن ئیمپریالییەت و بە کرێگیراوانی بڕوخێنن. لەژێر سایەی ئەو کەشوهەوایەدا هەستێك بە گەشبینییەکی کەم جێگەی ئاهەنگ و خۆشییەکانی گرتەوە. لەو کاتەی ئەفسەرانی سەربەخۆی حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراقی و حزبی بەعس و حزبەکانی دیکە داوایان لەلایەنگرانیان کرد کە دەربخەن پاڵپشتییەکی میللی تەواو هەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر نیاز و دەستێوەردانێکی دەرەکی. لە ڕۆژانی دوای کودەتا بەهەزاران کەس ڕژانە سەر شەقامەکانی بەغدا بەهۆی ئەوەی دەیانبینی. جیهان سەرەونخون بووە، یا بەهۆی ئەوەی تۆڵەیەکی زۆر تووند لە کەسایەتی و سەرانی سیستەمی هاشمی و لایەنگرانی بەریتانیا کراوەتەوە. بێگومان توندی ئەو

خۆپیشاندانانە کاریگەری لەسەر ئەوانە بەجێهێشت کە دیراسەی ئەگەری دەستێوەردانیان بۆ گەڕاندنەوەی سیستەمی کۆن دەکرد. ئەوەش لە دەرەوەو ناوەوەی عێراق. هەروەها دوو دڵی لای ئەفسەرە سەربەخۆکانیش دروستکرد، کە هەر لەیەکەم رۆژ کۆنترۆڵی خۆپیشاندانەکانیان بە قەدەغەکردنی هاتووچۆو قانوونی عورفی کرد.

کاتێکی زۆر تێنەپەری پێش ئەوەی دیمەنی تەمموز١٩٥٨ خۆی لە ئەفسانەی شۆرشێکی عێراقی ببینێتەوە، کە ئەفسانەیەکە هەندێك کەس بەکاریانهێنا بۆ ئەوەی ئەو وتەیە پشت ئەستوور بکەن کە دەیگوت، رووداوەکانی تەمموز دەرەنجامی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی قووڵ بوو نەوەك کودەتایەکی سەربازیی. کەسانی دیکە هەوڵیاندا ئەوە نیشانبدەن کە بەشداریکردنیان یارمەتی دیاریکردنی ئەنجامی ئەو جموجۆڵەیاندا بۆ ئەوەی داواکارییەکانیان بەبەشداریکردن یا بە کۆنترۆڵکردنی بۆماوەی شۆرش بسەلمێنن، لەراستیدا، دەستەی باڵای دەوڵەت هەروەکو خۆی مایەوە. ئێستا سەرکردایەتی کەوتووەتە دەستی جێبەجێکارانی کودەتا. قاسم و عارف و ئەو ئەفسەرانەی کە لەگەڵیاندابوون. بەشداری جەماوەریش بەشێوەیەکی گشتی وەك نیشانەیەك مایەوە.

سەرەرای ئەوەی کە بە هەزاران دانیشتوانی بەغدا لە شەقامەکان دەسوڕانەوەو ئاهەنگیان بە بۆنەی رووخانی رژێمی کۆن دەگێرا. بەلام کە جەماوەر بە رۆڵی پێویست هەستا لە رۆژانی بەراییدا. دواتر زۆربەیان لە شەقامەکان دوور خرانەوە و ئەوانی دیکەش هاندران بگەرێنەوە دەوروو بەری بەغدا. ئیدارە بە شێوەیەکی سروشتی لە کار کردن بەردەوام بوو لە پایتەخت و هەرێمەکان. دیارترین ئەو ئەرکانەش کە جەختیان لە سەر دەکردەوە و رووبەرووی ئەفسەرە سەربەخۆکان دەبووەوە چۆنیەتی دیاریکردنی پلەو پایەکانیان بوو لەو گۆرانکارییانەی کە لە سەرووی دەسەلاتدا ئەنجامدەدرێت. حزبە سیاسیەکان لە هەوڵەکانیان کاریان بۆ دروستکردنی شێوازی بەهێزتر لە پالپشتیی جەماوەر بۆ سەر ئارەزووەکانی بژاردەی تازەی دەسەلاتدار. ئەوەش بێگومان لاواز تر بوو لە هەمبەر

دەستڕۆیشتوویی بژاردەوەو حکومەتەکانی پێشووتریان. بەو شێوەیە قاسم روو بەڕووی هەوڵەکانی حزبی شیوعی عێراقی بووەوە. چەند سەنتەرێکی سەربەخۆی بەرگری میللی دامەزراندو خۆی سەرپەرشتیانی دەکرد. رێگاش نەدرا سەندیکاو کۆمەڵەی جوتیاران کار بکەن تاکو سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٩. ئەویش هیچ تایبەتمەندییەکی سەربەخۆیان نەبوو تەنها بۆ ماوەیەکی کورت نەبێت پێش ئەوەی لەگەڵ رژێمی قاسم تێکەڵ بکرێن کە دەستی بەسەر دامودەزگاکاندا گرتبوو. ئەو پرسە بە هەموو شێوەیەك بە سەر ژیانی کۆمەڵەکاندا پەیرەوی دەکرا کە بە ماوەیەکی کەم دوای رووخانی پادشایەتی سەریهەڵدا. دواتر سەندیکای پیشەیی و رێکخراوی لاوان و ئافرەتان دامەزرا. زۆربەی جارەکانیش بە هاندانی رەسمی ئەقڵیەتی خۆتێهەڵقورتاندنی دەوڵەت جێ بەجێ دەکرا کە هەر هەموویانی بە ئاشکرا خستبووە ژێر رکێفی خۆی (قاسم). وا دەردەکەوێت. قاسم پێی وایە ئەو جۆرە کۆنترۆڵکردنە راستەوخۆیە بۆ بەردەوام بوونی پێویستە. سەرەرای ئەوەی کە سووربوونی لەسەر سەپاندنی هەژموونی خۆی بەسەر هەموو شێوەکانی ژیانی گشتی. ئەوە وای کرد لە پاڵپشتی جەماوەری بێ بەش بێت کە هاوکاری دەبوو کاتێك کە رووبەرووی کودەتاکەی هێزە چەکدارەکان بۆوە ، قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ تەمەنی گەیشتبووە ٤٤ ساڵ لە خانەوادەیەکی ئاسایی دەژیا کە جۆراو جۆریی گەلی عێراقی زیاتر لە هەموو خانەوادەکانی دیکەی ئەفسەرەکانی هاوەڵی پێوە دیار بوو. (باوکی عەرەبی سوننەی دانیشتوی بەغدا بوو، دایکیشی کوردی شیعەی فەیلی بوو). ئەوەش رۆڵی خۆی هەبوو لە تێڕوانینە تەواوکارییەکەی بۆ عێراق کە پێویستە تێیدا هەزارو دەوڵەمەند و کورد و عەرەب و سوننەو شیعە لە پێناو بەرژەوەندی گشتی هاوکار بن.

بەڵام ئەوەی زیاتر ئەو تێڕوانینەی لە هزریدا چەسپاند بوو ئەوە بوو. قاسم بڕوایەکی گەورەی هەبوو کە پێویستە ئەو بە تەنیا دیاریبکات بەرژەوەندی گشتی لە چیدا دەبینێتەوە. قاسم بەلای ئەوەدا دەچوو کە دەریبخات ئەو نوێنەری هەموو شتێکە بە گوێرەی هەمووان. بە تایبەتبەتیش لە سەرەتادا کە هێشتا دڵنیا

نەبوو لەوەی کە چ جۆرە پاڵپشتیەك بە دەست دێنێت. لەنزیکەی ماوەی ساڵێکدا. بە تەواوی گەیشتە ئەو بڕوایەی کە لە کەسایەتی خۆیدا نوێنەرایەتی هەموو عێراق دەکات و وای پێوە دیار بوو کە پیشەیەکی پیرۆز بەجێدەگەیەنێت. هەندێك وای بۆ دەچوون گۆڕانی لە فەرماندەیەکی سەربازیی دوورە پەرێز و ئاسایی بۆ دیکتاتۆرێك هەر لەسەرەتاوە پێوەی دیاربوو کاتێك لە هەوڵێکی کوشتنی رزگاریبوو لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٩دا .لەکاتێکدا هەندێکی دیکە ئەوەیان بۆ ئەو ناسەقامگیریە قووڵە گەڕاندەوە کە لە کەسایەتییە شاراوەو حەز بەتەنیاییەکەیدا هەیە . بەڵام نزیکترین بۆچوون لە راستیدا هی ئەو کەسانەبوو کە پێیان وابوو ئەو گۆڕانکارییەی بەسەریدا هاتووە بەهۆی ئەوەیە کە دەسترۆیشتوویی فراوانبووە لەوکاتەی بۆی ئاشکرا بووە کەسیاسەتی مەحسوبیەت ئاسانکاری زۆری بۆ رەخساندووە بەرەو دەسەڵاتی مەرکەزی و پێ بە پێ و بەهۆی سەرخستنی هەرەمەکی و هەندێك جار بە خۆلێنزیککردنەوەی بێپلان و زۆر جارانیش بەپلان پێشدەکەوێت بەتایبەتیش لەوکاتانەی لەبۆنە گشتییەکان دەردەکەوت ڕووبەڕوویان دەبووەوە.

تاکو ئەو قۆناغە، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥٨، دەسەڵاتی راستەقینە لەنێو دەستی قاسم و پیاوانی دەورووبەریدابوو، بەڵام دواتر وەك ئەوانەی پێشە خۆی لە بیستەکان دەرکەوت دەسترۆیشتوویی گەورە لای ئەو کەسانەیە کە کۆنترۆڵی مەرکەزی دەوڵەت و بەروبووم و داهاتەکانیان کردووە. وەك ئەوەی نەیارانی خۆی بینیان ، قاسم ئەو دەسترۆیشتووییەی بەتووندی و لێهاتوویی بەکارهێنا بۆ ئەوەی حوکمی دەوڵەت بکات، زۆر جیاوازی نەبوو لەگەڵ ئەوانەی پێشە خۆی، ئەوەش زۆر بەگرانی لەسەریان کەوت. بەپێی دەستووری تازە کۆماری عێراق راگەینرا . کە لە دەقەکەیدا هاتبوو ئەنجوومەنێکی باڵا دادەمەزرێت پێکهاتووە لە سێ ئەندام کە پۆستە سەرەکییە رەسمییەکانی دەوڵەتیان پێسپێردراوە . لەگەڵ ئەوەشدا، ئەنجوومەنەکانی نوێنەران دانەمەزرا، قاسم خۆی پۆستی سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری گرتە ئەستۆ سەرباری فەرماندەی باڵای هێزە چەکدارەکان.

هەروەها عارف بە جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ دامەزراو چەند ئەفسەرێکی سەربەخۆشی خستە نێو وەزارەتەکان. پۆستەکانی دیکەش چەند کەسانێکی مەدەنی لێ دانرا کە سەربە حزبی نیشتمانی دیموکراتی و رەوتی نەتەوەیی عەرەبی بوون. ئەوەش بووە مایەی لەباربردنی خەونی ئەو ئەفسەرە سەربەخۆیانەی کە چاوەڕێی رۆڵی سیاسی دیارتریان دەکرد، کە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی پێکهاتوو لە پیاو ماقوڵانی سەر بە قاسم و عارف و فەشەلیان تێدا هێنا بوو. بەڵام هەر زوو پەیوەندییەکانی نێوان قاسم و عارف پشێوی تێکەوت. وایلێهات هەریەکەیان پێشدەستی خۆی لەسەر ئەوی دیکە دەردەخست. عەمید قاسم پلەو پایەی لە عارف گەورەتربوو کە کۆلۆنێل بوو. بەڵام ئەوەی دواتر بڕوای بەخۆی هێنابوو کە ئەو کرۆکی رێکخراوی ئەفسەرانی سەربەخۆی لاوانە و ئەو فەرمانی بە سوپادا لە تەممووزی ١٩٥٨دا بەرەو بەغدا بەڕێبکەوێت. ئەوەش دەخوازێت وەك سەرکردەی شۆڕش دانی پێ بنرێت. لە راستیدا نەیاریی نێوان ئەو دوو پیاوە ناگەڕێتەوە بۆ هۆکاری کەسێتی نێوانیان بەڵکو پرسی ناسنامەی عێراقی کەوتە جێی هاوبەشی و تاکو ئێستاش بێ وەڵام ماوەتەوە. لەسەر ئەوە ناکۆك بوون کە ئایا عێراق دەوڵەتە– یا نەتەوەیەکە یا بەشێکی ئیداریە لە نەتەوەی عەرەبیی گەورە. لەو بوارەدا، بوونی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو ئەزموونێکی راستەوخۆ بوو بۆ حاکمە تازەکانی بەغدا. عارف بە عەبدولناسر سەرسام بوو بەشداری لەراو بۆچوونی عەرەبە قەومییەکان دەکرد لەوەی بەشداربوونی عێراق راستەوخۆ لە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو خۆی لەخۆیدا پێویستە بۆ بەرگریکردن لە سیستەمی نوێدا. هەروەها درکی بەوە دەکرد کە دروشمی " وەحدەی عەرەبی" ژمارەیەکی زۆر لەناوەوە و دەرەوەی سوپا لایەنگیری هەیە. چەند رۆژێك دوای کودەتا سەردانی دیمەشقی کرد و دواتر میشێل عەفلەق دامەزرێنەری حزبی بەعس سەردانی بەغدای کرد بۆ ئەوەی عێراق هانبدات بچێتە نێو کۆماری عەرەبی یەکگرتوو.

لە بەرامبەردا قاسم زیاتر سۆزی بۆ راوبۆچوونی حزبی نیشتمانی دیموکراتی دەچوو، تارادەیەك هەندێك وای بۆ دەچوون بەدەستهێنانی چاکسازی کۆمەڵایەتی نێوخۆ و بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی نەتەوەی عێراقی پێویستە پێش پابەندبوونی راستەقینە بە جیهانی عەرەبی بکەوێت. بۆ ئەوەش هەموو ئەوانە پاڵپشتیان دەکرد کە بەترسەوە تەماشای پرۆژەکانی وەحدەی عەرەبیان دەکرد. ئەوە هەستێك بوو کورد و شیعە بە ئاشکرا دەریانبڕی، جگە شیوعییەکان کە عەبدولناسر و کۆماری عەرەبی یەکگرتوویان زۆر بە دڵ نەبوو، لە ئەنجامی ئەوەدا لەساڵی ١٩٥٨ سنورێك بۆ عارف و لایەنگرانی وەحدە دانرا، لەلایەن ئەو کەسانەوە کە دەوڵەتی عێراقیان وەك هۆکارێك بۆ جێبەجێکردنی بیروڕای خۆیان بەکار دەهێنا. قاسم بەنیازەکانی عارفی زانی کە بە ئاشکرا بەدەرکەوت لەوکاتەی ئەوەی دواتر دەیویست لە رێگەی زنجیرە سەردانێکی هەرێمیی پاڵپشتی میللی بەدەست بێنێت، تیایدا عارف دەیویست تێڕوانینی جوتیاران بەرزبکاتەوە کە بیووە سەرهەڵدانی چەند شۆڕشێك لەدژی خاوەن زەوییەکان لە کۆتایی مانگەکانی هاوین.

لەمانگی ئەیلولدا قاسم عارفی لە پۆستەکانی سەرکردایەتی لاداو حوکمی دوورخستنەوەی لەسەرداو کردیە باڵیۆز لەکۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ. عارف بەناچاری و بە بێزارییەوە ئەوەی جێبەجێکرد، دواتر بەنهێنی گەڕایەوە بەغدا لە کۆتاییەکانی تشرینی یەکەم و دەستبەجێ دەستگیرکرا. بۆ ماوەیەکی کاتی ئەو رێکارە ئەو هەڕەشەیەی نەهێشت کە عارف دروستی کردبوو، بەڵام قاسم نەیتوانی لایەنگرانی لەناو بەرێت کە بانگەوازیان بۆ بەشداریکردن لە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا. ئەو پرسە بەگوێرەی قاسم لە ئارادانەبوو، دەستگیرکردنی عارف بەهۆی چەند هەنگاوێك بوو لەدژی بەعسی و نەتەوە پەرستە عەرەبەکانی نێو ئیدارە، بەمەش ئاماژەی بە گرنگی هێڵی" یەکەمی عێراق" بە سەرۆکایەتی قاسم دەدا. بەڵام ئەویش وەك زۆربەی (ئۆتۆکراتییەکان) قاسم لەهەر دامودەزگایەکی

چەسپاو دەترسا نەوەك دووچاری لێپرسینەوەی بكات، بۆیە هاوكاری كرد لە نهێنییەكانی دەوڵەتی عێراقی. ئەوەش خۆی لە دووشتدا دەبینیەوە، شێوەكانی دامودەزگەكانی دەوڵەتی میللی و وابەستە كە سێتییەكانی كە كەمتر دیاربوون و گرنگتربوون بۆ مەحسوبییەت و پابەندبوونی ئاڵوگۆڕ كەشتە شاردراوەكانی دەسەڵاتی سنوردار دەكرد بۆ ئەو كەسانەی كە نیازیان وایە بگەنە داهاتەكانی دەوڵەت. ئەوەی پەیوەست بوو بە دۆزی كورد بۆ نموونە، دەستووری نوێ دانی بەدوو نەتەوەیی دەوڵەت نابوو، بەڵام نەیتوانی ئەو دانپیانانە كە بۆ یەكەمجاربوو ، لە چوارچێوەی دامودەزگەكاندا بچەسپێنێت.

لە چوارچێوەی ئەو دانپیانانە و لەماوەیەكی كورتدا گەڕانەوەی مستەفا بارزانی لەدوورخراوەییدا پارتی دیموكراتی كوردستانی ژیاندەوە، ئەوەش لەدژی نەتەوە پەرستە عەرەبییەكان یارمەتی قاسمیدا ، جیێ ی زانینە لە راستیدا قاسم نەیدەویست سەربەخۆیی زاتی و ئەو دامودەزگایەی وەك ئەوەی حزب دەیویست، بداتە كوردان. هاوكات نهێنی و شاردراوەیی باڵی بەسەر پەیوەندییەكانی قاسم بە شوعییە عێراقییەكان كێشا كە پێشتر خۆی لەدژی عەرەبە نەتەوە پەرستەكان پاڵپشتیانی كردبوو، ساڵی ١٩٥٨ حزبی شیوعی عێراقی بەرابەرایەتی حوسێن ئەلڕازی سەریهەڵدا بەو پێیەی لەرووی رێكخستنەوە باشترین حزب بوو، هەروەها بنچینەیەكی روون و بناغەیەكی پتەوی لەنێو كۆمەڵگەی عێراقی و شارستانی و گوندەكانی باشوور هەبوو سەرەرای كوردستانیش. حزبی شیوعی عێراقی هاوپەیمانییەكی گرنگی لەگەڵ قاسم دروستكرد. چونكە توانایەكی بەرچاوی هەبوو لە رێكخستن لە ناوچەكانی عێراق كە بە شێوەیەكی گشتی رێكخراوە سیاسیەكانی دیكە كاریگەریان بە سەر دا نەبوو. هەرچەندە قاسم لە رووی ئایدۆلۆژیاوە لە حزبی نیشتمانی دیموكراتی نزیك بوو بەڵام بەو هۆیانەی سەرەوە دوای كودەتای ١٩٥٨ رێگەی بە حزبی شیوعی عێراقی دا بیروباوەڕەكانی خۆی بە ئازادی بڵاویكاتەوە و رێكخستنەكانی بنیاد بنێت و خۆی لە ناو رێكخراوەكاندا بسەپێنێت وەك ئەوەی لایەنگرانی ئاشتی كردیان و چالاكیەكانی دەستی پێكردبۆوە. چجای

رابیتـەی بـەرگری لـە مافـەکانی ئـافرەت و رابیتـەی لاوانـی عێراقـی دواتـریش سەندیکای کرێکاران و کۆمەڵەی جوتیاران.

وە نەبێ ئەو کۆمەڵەو رێکخراوانە تەنها رووپەك بن بۆ حزبە سیاسیەکان، بەڵکو هەوڵ بوون بۆ گرووپە عێراقیە جۆراوجۆرەکان تاکو دەنگی چینەکانی کۆمەڵگەی عێراقی کە تاکو ئەوکاتە فەرامۆش کرابوون بگەیێنێتە شوێنی مەبەست. دیارترین ئەو رێکخراوانەش، رابیتەی ئافرەتان بوو کە ئافرەتـە عێراقیـە خـاوەن پیشـەکان دایانمەزراندبوو، لە رێگەیەوە هەوڵیاندەدا هەلی کار بۆ سەرجەم ئافرەتـانی عێـراق بدۆزنەوە، لە شێوەی ئەوە بێت کە ئاستی کۆمەڵایـەتی ئـەوانی تێدایە. هـەر لـە دەرچـوونی یەکـەم ئـافرەت لـە هـەر دوو کۆلێـژی پزیشـکی و مـاف لـە عێـراق لـە کۆتاییـەکانی چـلەکان، وای لێهـات ژمارەیـەکی زۆر لـە بـواری پیشـەکانی خۆیـان تێکەڵ بەو رابیتەیە دەبوون، بەڵام دیسان نوێنەرانی کەمینەیەکی کەمی ئافرەتانی عێراقیان دەکرد. راستە کە رێژەو هەلی فێر بـوون لـە ئاسـتێکی زۆر نزمـدا بـوو لـە عێراق، کەچی بە گوێرەی ئافرەتـان دەتـوانین بڵـێین هـەر نـەبووە. کۆمەڵگایـەکی پیاوسالاریی وەك کۆمەڵگەی عێراق. زۆر هانی ئـافرەتی نـەدەدا تێکـەڵ بـە ژیـانی گشـتی بـن لـە دەرەوەی مـاڵ. چـجای تێکـەڵبوونی بـە ئاشـکرایان لـە ململانێـی سیاسی.

هەندێك لە هەوڵەکانی ئەو رابیتەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو سلبیاتانە سـەرکەوتوو بوو، بە تایبەتیش لە رووی فێرکردنی سەرەتایی بۆ کچـان. بـەڵام لەلایـەن چـین و توێژەکانی کۆمەڵ دووچاری بەرگریـەکی تونـد بـووەوە. ژن و پیـاو پێیـان وابـوو پێشکەوتنی ئافرەت مەترسیەکی وێرانکارە لە سەر بنەما رۆیشتووە گونجاوەکـان. لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو هەوڵەی یەکەم بۆ رەخساندنی هەلی رادەربڕینی سیاسی لە لایەن چینێکی گەورەی کۆمـەڵی عێراقـی مێـژووی وارۆیشـتووی دەوڵـەتی عێراقـی فەرامۆشی دەکات. دەبوایە روو بەرووی بیرۆکەی کۆمەڵایەتی ئەو تۆ ببێتـەوە کـە پێشتر رەگی قووڵی لە نێو زۆربەی کۆمـەڵگاکانی وڵات داکوتـابوو. ئـەوەی ئـەرکی ئـەو رێکخراوانـەی سـەختتر کـرد ئـەوە بـوو ئافـەرەت ببـووە رواڵـەتی چـالاکی

شـیوعیەکان، ئـەوە وایکـرد فێرکـردن و ئـازادی ئـافرەت بـە کۆمـەڵێك ڕێکـاری شۆڕشـگێڕانە گرێبـدرێت کـە حزبـی شـیوعی هـەوڵی دەدا وەك ئـەوەی نـەیارانی تومەتباریان دەکرد کە دەیەوێت بەسەر کۆمەڵگای عێراقیدا بسەپێنێت.

لە راستیدا شوعیەکان ئەوانەی سۆزیان بۆیان هەبوو بە شێوەیەکی تـەواو پابەنـد نەبوون بە بنچینەکانی مارکسی لینینی، کاتێکیش ئەوانـە بـە هەنـدێك ئیعتبـاراتی تـەکنیکی گرێـدران ڕێگـە بـە حزبـی شـیوعی عێراقـی درا. بـە وەنـدەش نەوەسـتا هەندێك جار پاڵیدەنا بۆ ئەوەی لەگەڵ حزبە سیاسیەکانی دیکە بگاتە تەوافوقێك ، جەختکردنـــەوەی بەردەوامیشـــی لەســـەر نـــەبوونی دادپـــەروەری کۆمەڵایـــەتی دەکـــردەوە لەگـــەڵ ناعەدالـــەتی ئـــابووری و پرســـەکانی مووچـــە و، ڕەوشـــی کارکردنیش پاڵپشتیەکی میللی فراوانی بۆ هێنا و کردیە حزبێکـی ڕابـەر لـە بـواری چاکسازی کۆمەڵایەتی . لەو چوارچێوەیەدا حزبی شـیوعی عێراقـی جـارێکی دیکـە وەك یـەکێك لـە بانگـەوازکارانی سـەرەکی جـێ بـەجێ کردنـی زیـاتری بنـەماکانی دیموکراتیەت لە عێراق دەرکەوت . بەڵام دەبوایە حزبی شیوعی ڕوو بەڕووی پرسی چـۆنیەتی ڕەوشـی نوێنەرایەتیـەکی دروسـتی لـە کۆمەڵگایـەك ببێتـەوە کـە هـیچ دادپەروەرەی تێدا نیە. وەکو ئەوانەی کە بانگەوازی دیموکراتیەت دەکـەن. حزبـی شیوعی عێراقی وەك حزبەکانی دیکەی پـێش و دوای خـۆی وای بـۆ دەچـوو تـەنها سـوپا دەسـتکراوەیە بـۆ ماوەیـەك کـۆنترۆڵی ئـەو هێزانـە بکـات کـە تایبەتمەنـدی ئـابووری و کۆمەڵایـەتیان هەیـە کـە هێشـتا هەڵنەوشـێنراوەتەوە. بۆیـە سـەرەڕای نوێنەرایـەتی لاوازی حـزب لـە ڕیـزی ئەفسـەران، بـەڵام پاڵپشـتی پێشـکەش بـە ڕێکخـراوی ئەفسـەری سـەربەخۆکان کـرد. لەگـەڵ ئـەو ئازادیـە تازانـەی کـە دوای تەمموز ١٩٥٨ دران. حزب هەوڵیدەدا ژمارەی لایـەنگرە مەدەنیـەکانی زیاتربکـات. بەو پێیەی بڕوای بە گرنگی کۆنترۆڵکردنی شـەقام هـەبوو لـە پێنـاو دروسـتکردنی شێوەیەك لە بوونی پاڵپشتی میللی و دوورخستنەوەو سنوردارکردنی بـەکارهێنانی هێزی سەربازیی لە بەرامبەریدا.لەگەڵ لاربوونەوەی هاوسەنگی کۆمەڵگەی عێراقـی

بەرەو شارەکان. وای لێهات شەقامی شارە گەورەکانی عێراق پێگەی گرنگیان هەبوو لە هاوکاری و دواتریش نوێنەرایەتی رەمزیی.

ئەوەی پەیوەستیش بوو بە بەرنامەی چاکسازی لە سیستەمی نوێدا، یەکەم ئامانج لە ئامانجەکانی ، خۆی لە رووبەرە زەویە فراوانەکاندا دەبینیەوە کە خاوەنەکانیان بریتی بوون لە کۆلەگەکانی رژێمی کۆن. بۆیە یاسای ژمارە ٣٠ کە لە ساڵی ١٩٥٨دا دەرچوو ئامانجی ئەوە بوو موڵك لە خاوەن موڵکە گەورەکان بسێنێتەوە کە ژمارەیان کەمتر بوو لە ٣ هەزار کەس و خاوەنی نیوەی موڵکی کشتوکاڵی عێراق بوون. ئەو زەویانە وەرگیرانەوە بۆ ئەوەی بەسەر جوتیارە بێ موڵکەکان و خاوەن موڵکە بچوك و مامناوەندییەکان دابەشبکرێت. بە پراکتیکی رادەی موڵکە تاکە کەسیەکان کە بە رێژەیەك بەرز بوو تیایدا خاوەن موڵك سەر پشك دەکرا لەو زەویە کە دەیەوێت پارێزگاری لێبکات. چجای پێدانی قەرەبوو. ئەوە کەمێك لە توندی ئەو رێوشوێنەی کەمکردەوە. هەروەها دەوڵەتیش ئالیەتێکی گونجاوی بۆ ئەوە نەبوو. سەرباری بەردەوامبوونی ئاستەنگەکان بۆ خستنەرووی داواکاری موڵکایەتیە شەرعیەکان لە زۆربەی پارچەکانی عێراق. شتێکی سروشتی بوو بەهاتنی ساڵی ١٩٦٣ چواریەکی موڵکە گەورەکان موسادەرە بکرێت و جارێکی دیکە کەمتر لەو چواریەکە دابەشبکرێتەوە. لە زۆربەی ناوچەکانیش دابەشکردنەوەی زەویەکان پرۆژەکانی چاکسازی کشتوکاڵی لە هەردوو قۆناغی پادشایەتی و عوسمانیدا هێنایەوە یاد. لە لایەك چونکە سودمەندانی یەکەم ئەو کەسانە بوون کە پۆستی باشیان هەبوو هەلیان بۆ دەرەخسا ئەو سیستەمەی کە هەبوو بقۆستنەوە. بەو پێیەی ئەوان لە خاوەن موڵکە بچوکەکان و مامناوەندییەکانن و خاوەن سەرمایەن یاخود هاورێیان لە نێو دەستەی تازەی سەرۆکایەتیدا هەیە. بەڵام ئەو دەشتەکیانەی کە بێ زەوی بوون. دیسان تەنها برێکی زۆر کەمیان دەستکەوت.

دواتر دەرکەوت یاسای چاکسازی کشتوکاڵی ساڵی ١٩٥٨ بەڵێن بە ئایندەیەکی زۆر جیاواز دەدات ئەوەش سەرنجی جوتیارانی عیمارەو ئەوانی دیکەی راکێشا بۆ

ئەوەی زەوی ئاغاكانیان كە لەویّ ئامادەنین داگیر بكەن. لەگەڵ ئەوەی كرداری داگیركردنی زەویەكان بچوكتر بوو لەوەی چاوەڕوان دەكرا. گەورە موڵكدارەكان لە سەرۆك هۆزەكان و دەرەبەگی شارەكان وەكو یەك هەستیان دەكرد ئەو ڕووداوانە سەرباری لێسەندنەوەی زەوی زارەكان ئاگادار كردنەوەشە لەوەی كە ڕۆژانی دەسترۆیشتوویان و تایبەتمەندییەكانیان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن. ئەو دڵە ڕاوكێیە هاوكار بوو بۆ ئەو پیلانەی كە ڕەشید عالی گەیلانی چنیبووی. بێ ئومێدیەكەی وای لێكرد حكومەتی نویّ فەرامۆش بكات دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق پەیوەندی بە چەند ئەفسەرێكی سەربەخۆ بكات لەوانەی كە لاگیری عروبە و ئەو خاوەن موڵكانە بوون كە زەوی و زاریان لیّ سەنراوەتەوە بە ئومێدی ئەوەی كودەتایەك وەك ئەوەی سالانی سییەكان ڕێكبخات. بەڵام پیلانەكە ئاشكرا بوو. ڕەشید عالی لە كانونی یەكەمی ساڵی ١٩٥٨ دەستگیركراو دادگەیی كراو حوكمی ئیعدامی بۆ دەرچوو. دواتر حوكمەكەی گۆڕا بۆ زیندانی كردن.

دەستگیركردن و دادگایی كردنی ڕەشید عالی كە لەگەڵ دادگایی كردنی عارف هاوكات بوو (كە حوكمی ئیعدامی بە سەر سەپێنرا بوو لەگەڵ دواخستنی جێبەجێكردنەكەی) ئەو ناكۆكیەی كە لە نێوان قاسم و عروبە دا هەیە بۆ چاودێران ڕوونكردەوە. لێرە ڕێگە بۆ شیوعیەكان خۆشبوو بە شێوەیەكی فراوانتر خۆیان ڕێكبخەنەوە. نەك تەنها لە دژی عروبیەكان بەڵكو لە دژی كاریگەری دوورە پەرێزی بە ئاشكرای حزبی نیشتمانی دیموكراتی كە دژی هەر هەنگاوێكی چاكسازی ریشەیی دەوەستایەوە. بەو شێوەیە خۆپیشاندان و ڕێپێوان بووە ڕۆتینێكی بەردەوام لە ژیانی بەغدادییەكانی ئەو سەردەمە، زۆربەی حزبەكان ململانێیان بوو لە سەر ڕابەری كردنی جموجۆڵەكانی سەرشەقام و بە هەڵیاندەزانی ڕەوشی خۆیان بۆ قاسم دەرببرن لە پێكهاتەیەكی سەرنجراكێش و سەیر و فشارێكی بە ئاشكرایان هێنابووە كایەوە ، لەبەرامبەردا قاسم لە قۆستنەوەی ئەو ڕێپێوان و خۆپیشاندانانە سیّ و دووی نەكرد، دەستیكرد بە چاودێری كردنی ئەو ڕێپێوانانەو ئەو حزبانەی پشتی پێدەبەستن بۆ ئەوەی دروشم لە بەرژەوەندی قاسم وەك

رابەرێكی تاك و تەنیا بەرزبكەنەوە. هەروەها دژە رێپێوانیش رێكخراو هەندێك جاریش توندوتیژی لێكەوتەوە و شێوەی راستەقینەی شەقامی عێراقی دەركەوت و تەنگەژەكە بەرەو ئاڵۆزی و توندی رۆیشت.

پەنا بردنە بەر شەقام مەترسی بوو، چونكە رێپێوانەكان ئاڵتەرناتیڤی دەسەڵاتی رێكخراو نەبوون ئەگەر دەستوری بێت یا سەركوتكارانە وەك ئەوەی حزبی شیوعی عێراقی بۆی ئاشكرا بوو. هەروەها رەنگە لاگیری زۆر ترسناك لە نێو كۆمەڵگەیەكی فرە پێكهاتەی وەك عێراق بە ئاگا بێنێتەوە. لە ئاداری ١٩٥٩ دا گروپێكی گەورە بە ناوی لایەنگرانی ئاشتی كە لە حزبی شیوعیەوە سەرچاوەیان گرتبوو لە موسڵ هەوڵێكی كودەتای گەورەیان دابوو یەكێك لە ئەفسەرە سەربەخۆكان كە لاگیری عروبەی هەبوو رابەرایەتی كرد بوو. كاتێك سوپاو میللەت روو بەڕوویان بوونەوە توندو تیژی شارەكەی گرتەوە. رەوشی شەرێكی ناوەخۆی بچوككراوە هاتە ئاراوە لەوە زۆر زیاتر بوو لە قاڵبی نارەزایی یان پاڵپشتی حكومەت خۆی ببینێتەوە. جگە لەوەی ناكۆكی تایفی و ئەتنی و عەشایەری و ئابووری سەریهەڵدا، تیایدا عەرەب و كورد ململانێیان كرد. كرستیان و موسوڵمان كەوتنە ململانێ. عەشایەرە عەرەبەكان لەگەڵ عەشایەرە عەرەبەكانی دیكە، دەوڵەمەند و هەژار. هێزەكانی حكومەت تەنها بۆ دوای پێنج رۆژ توانیان رەوشەكە كۆنترۆڵ بكەنەوە.

ئەو رووداوانە بە هانەی دایە دەست قاسم بۆ ئەوەی پەنا بباتە بەر پرۆسەیەكی چاكسازی گەورە لە نێو رێزەكانی سوپاو ئیدارە ، ئەو ئەفسەر و فەرمانبەرانەی كردە ئامانج كە لاگیری عروبەیان هەبوو چجای ئەوانەی دەستیان لەگەڵ پیلانگێرانی موسڵ هەبوو. لە شوێنی ئەوان لایەنگرانی خۆی دامەزراند بەوەش تۆڕەكانی مەحسوبیەتی خۆی فراوانتر كرد. هەروەها شیوعیەكانیش سودیان لەو رووداوانە وەرگرت. لە هەموو ئەوانە گرنگتر ئەوە بوو حزبی شیوعی ئەوەی سەلماند كە بە هاوپەیمانیەتیكردن لەگەڵ میللەت دەتوانرێ هەر هەوڵێكی كودەتا بە شێوەیەكی راستەقینە ئاشكرا بكرێت. ئەو بۆچوونەی بەوە پشتڕاستكردەوە. كە لەمەودا دەتوانێت رۆڵێكی كاریگەر لە ئیدارەی دەوڵەتی عێراقی ببینێت. بەو

شێوەیە حزبی شیوعی عێراقی زیاتر بە دەرکەوت لە شەقامەکان و لە ئایاری ١٩٥٩دا خۆپیشاندانی زۆر گەورەی ڕێکخست لە ڕێگەیانەوە. قاسم داوای دامەزراندنی شیوعیەکانی لە حکومەت و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی کرد بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنێکی نوێنەران.

لێرەوە دڵە راوکێی عەبدولکەریم قاسم لە بەرامبەر حزبی شیوعی عێراقی دەستیپێکرد. بوونی لە شەقامەکان و هێزو توانای لە کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی جوتیاران و کرێکاران. سەرەڕای بەئەندامبوونی بە کۆمەڵی ئەندامەکانی لە رێکخراوی بەرگری میللی و زۆربوونی ژمارەی ئەندامانی حزب بە نزیکەی ٢٥ هەزار وای لێکرد بە شێوەیەکی بەرچاو ترسناك بێت. گرنگتریش لەوە سەرهەڵدانی حزبێکی بەهێز دڵە راوکێی هەندێك لایەنی دروستکرد کە قاسم نەیدەویست لێی هەڵبگەڕێنەوە. ئەو لایەنانەش بریتی بوون لە بەڵێندەرە ئابورییە بچوکەکان و خاوەن موڵکە کشتوکاڵیە مامناوەندییەکانی نێو حزبی نیشتمانی دیموکراتی. سەرەڕای هاوڕێیە ئەفسەرەکانی قاسم، کە زۆربەیان متمانەیان بە شیوعیەکان نەبوو. ڕووداوەکانی موسڵیش بۆچوونی ڕەوتی دیکتاتۆریانەی لە نێو ئەفسەرە عێراقیەکان و ئیدارەی مەدەنی سەلماند کە پێیان وابوو هەر گومانێك لە دەسەڵاتی ناوەند و هەر هەوڵێك بۆ رادەربڕینی میللەت بڕەخسێنرێت ڕەنگە ببێتە هۆی هاتنە پێشی بارودۆخی شەڕی ناوەخۆ. ئەو کاتەش ناکۆکیە ئەتنی و عەشایەرییەکان بەهۆی ئەو هەڕەشەی لە سەر تایبەتمەندییەکانیان ئاڵۆزتر ببوو. ئەوەش ببوە مایەی مەترسی زۆربەی عێراقیەکان، بە تایبەتیش لە نێوان ئەفسەرانی سوپاو ئەوانەی کە رشتبوونیان لەسەر تایبەتمەندییەکانیان هاوتەریبی دژایەتیکردنیان بوو بۆ نەبوونی یاساو سیستەم. قاسمیش تا ڕادەیەك بۆچوونی لەگەڵ ئەوانە بوو هەروەها بڕوای پێکهاتەی نیشتمانی هەبوو درکیشی بە ئەگەری لێکترازانە شاردراوەکانی نێو کۆمەڵگەی عێراقی دەکرد.

سەرەنجام، قاسم چاودێری لەسەر چالاکیەکانی بەرگری میللی توندتر کرد. گرەتنی ئەوەی کرد کە هەرگیز ناتوانێت شان لە شانی هێزی سوپا بدات.

هەروەها سەرجەم چالاکیەکانی حزب گەمارۆی خرایە سەرو قەدەغەکرا. لە بەرامبەردا پەیمانیدا لە ماوەی ساڵێکدا ڕێگەو مۆڵەت بە حزبە سیاسیەکان دەدات. لە هەوڵێك دا بۆ ئەوەی حزبی شیوعی بخاتە ژێر چاودێری و بە شێوەیەکی پتەوتر بە حکومەتی گرێبدات. یەکێك لە ئەندامانی حزب بە ناوی نەزیهە ئەلدلێمی و دوو لە لایەنگرە ناسراوەکانی شیوعیەکانی لە پۆستی وەزاری دامەزراند. سەرەڕای نوێکاری سەردەمی دلێمی. بەڵام دامەزراندنی هەنگاوێکی گرنگ بوو بەوەی یەکەم ئافرەت و یەکەم ئەندامی حزبی شیوعی عێراقی بوو لە حکومەتی عێراق دابمەزرێت. لە بەرامبەردا ئەو جۆرە هەنگاوانە هەر زوو زنجیرەیەك ڕووداوی توندو تیژی لێکەوتەوە وەك لە کەرکوك. تیایدا ئەندامانی حزبی شیوعی ویستیان هێزی خۆیان لە یەکەم ساڵیادی ڕووخانی پادشایەتی نیشانبدەن. بەڵام دەستنیشانکردنیان بۆ ئەو شارە ژیرانە نەبوو بەو پێیەی لەو شارە دوژمنداریەکی مێژوویی لە نێوان تورکمان و کورد و عەرەب هەبوو؛ بەو هۆیەوە نادادپەروەری ئابووری باڵی بەسەر کێشابوو. بەڵام لە ١٤ تەمموزدا ئەو خۆپیشاندانەی کە شیوعیەکان ڕێکیان خستبوو لەگەڵ خۆپیشاندانێکی دیکەی نەیارە ئایدۆلۆژییەکانیان ڕێکیان خستبوو بەریەك کەوتن و هەموو ئەوانە پاڵپشتیان دەکردن کە ترسیان لە پەیوەندی کورد و حزبی شیوعی عێراق لە کەرکوك هەبوو. ئەوەش کوشتارێکی دوو ڕۆژی لێکەوتەوە. وەك ئەوەی موسڵ تیایدا ناکۆکیە ئەتنی و ئابورییەکان ڕوو بەڕووی یەکبوونەوە دواتریش ململانێیەکی تایفی ترسناکی بەدواوە داهات.

دیسان هێزە حکومیەکان سەقامگیریان بۆ شارەکە گەڕاندەوە. بەڵام نەیارانی حزبی شیوعی عێراقی و کوردەکان ڕشتبوون لەسەر ئەوەی کە ڕووداوەکان زۆرترین ڕادەی پڕوپاگەندە بەدەست بێنێت بە تایبەت لەوەی کە پەیوەست بوو بەو وردەکارییە بێ ڕادەیە کە زێدەڕۆیی تێداکراوە. قاسم لەو پرسەدا هانی خۆیدا. بۆ ئەوەی سنورێك بۆ حزبی شیوعی دابنێت و پەیامەکە ڕوونتر بکاتەوە کە ئەو سەرکردایەتیە بە هێزەی زۆر پێویستە بۆ پارێزگاریکردن لە یەکگرتویی کۆمەڵگەی

عێراقـی. بـەو شـێوەیە لـە مانگـەکانی دیکـە ژمارەیـەکی زۆر لـە شـیوعیەکان دەستگیرکران. یا بە هۆی دەستهەبوونی راستەوخۆیان لـە رووداوەکـانی کـەرکوك یان بە بەهانەی دیکەی جیاواز. هاوکات شیوعیەکان لە سەندیکاکانی جوتیـاران و هەندێك پۆستی سـەرەکی سـەندیکاکانی کرێکـاران دەرکـران و چاودێرییەکی تونـد خرایە سەر چالاکیەکانیان. پاکسازییەکی هاوشێوە لـە ریزەکـانی ئەفسـەران و لـە ئیـدارەی دەوڵـەت ئەنجامـدرا. بـەلام ئـەمجارە کارەکـە کـەمتر جـەختی لـە سـەر کرایەوە چونکە قاسم متمانەی هەبوو کە تۆرە تایبەتـەکانی سیاسـەتە توندەکـەی زۆر توندترن لە هەر هەوڵێك کە حزبی شیوعی عێراقی بیەوێت رێکی بخات.

سەرەرای ئەو پێش هاتانە وەزیرە ئافرەتە شیوعیەکە هـەر لـە پۆستی خۆیـدا لـە حکومـەت مایـەوە و ئـەو رەخنانـەش کـە حـزب ئاراسـتەی قـاسمی دەکـرد بـە شێوەیەکی تێبینی کراو لاواز بـوو. سـەرکردەکانی حزبـی شـیوعی عێراقـی زانیـان هیچ شتێکیان لە دوژمنداریکردنی قاسم دەستناکەوێت چونکە هاوپەیمانیان کەمەو توانای ململانێ کردنیشیان نیـە. چـونکە بـە تـەواوی دەسـتی بەسـەر ئەفسـەرانی سوپادا زاڵە. بەلام حزبی بەعس پێـی وابـوو کـە تاکـە رێگـە کـە پرسـەکەی بباتـە پێشـەوە تیرۆرکردنـی خـودی قاسمـە. بۆیـە لـە تشـرینی یەکـەمی ١٩٥٩دا بـە ماوەیەکی کورت دوای ئیعدامکردنی ئەفسەرە بەرپرسەکان لە رووداوەکانی موسـڵ هەوڵێکی تیرۆرکردنی قاسمیان دا بەلام سەرکەوتوو نەبوون. تیایدا سەدام حوسێن سەرۆکی پێشووی عێراق بەشداری تێیـدا کـرد ئـەو کـات تەمـەنی ٢٢ سـاڵ بـوو. ئەوەش هەڵمـەتی دەسـتگیرکردن و پاکتـاوکردنی لێکەوتـەوە و لایـەنگرانی حزبـی بەعس بوونە قوربانی سەرەرای رێکخستنی خۆپیشاندانی گەورەی پاڵپشـتیکار بـۆ سەرکردەی تـاك و تـەنیا. بـەلام ئـەو خۆپیشـاندانانە لـە شـاردنەوەی راسـتیەکان سـەرکەوتوو نـەبوون کـە مانـەوەی سیاسـی قاسـم پشـت بـە تواناکـانی قاسـم دەبەستێت لە بەدەستهێنانی پاڵپشتی زۆربەی ئەفسەرانی سوپا. لەگەڵ مانـەوەی خۆی و دەزگای هەواڵگری کە لە رژێمی پادشایەتی بۆی مـابووەوە لەسـەر لـە دوو نانی پیلانگێرە گریمانکراوەکان. ئەوە لایەنە شاردراوەکەی سیاسەتی قاسم بـوو.

لە بەر چاوی میللەت دیار نەبوو چونکە جیهانێکی لە پەیوەندییە نارەسمیەکان دروستکردبوو لەگەڵ چەند تۆڕێکی پابەندبوون و مەحسوبیەت. کە لە سەر ئاستێکی فراوان ناسرا بوو لە لایەن چالاکوانانی جیهان. ئەو واقیعەی شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو جیهانە سیاسیە بچوکەی بژاردەی عێراق لە سەردەمی پادشایەتی نەبوو. هەرچەندە لە لایەن رای گشتیەوە تێبینی دەکرا بەو پێیەی بژاردەی پادشایەتی بڕوای تەواویان هەبوو هیچ شتێك ناگاتە گرنگی پارێزگاریکردن لە جیهانە سیاسیەکەیدا. ڕووداوەکانی تەموزی ١٩٥٨ ئەو متمانەو بیروڕایەی بە توندی هەژاند، بەبێ ئەوەی لە رەگەوە ئەو مەرج و بنەما سەرەکیانە بگۆڕێت کە حاکمە تازەکان بەکاریان دەهێنا لە دەسەلاتی دەولەتی عێراقیدا. لە جیاتی ئەوە. نێوەندی ئەفسەرانی سوپا کە ببووە سەنتەری بڕیاردانی سیاسی راستەقینەو ئێستا دەستی بە سەر دەولەت دا زاڵە. زیاتر بە شێوەی پیلانگێڕانە حوکمی کرد، دەبوایە هەر وا بێت. دوای ئەو هەموو هەولانە کودەتا مایەی مەترسی بوو دەنگی رەخنەگرتن بەرزبێتەوە. بۆیە وای لێهات هەر چالاکیەکی نارەزایی بە پیلانگێڕان لە قەڵەم بدرێت.

لە راستیدا. ئەو شێوە دیکتاتۆریە زەبەلاحەی کە باڵی بەسەر سیستەمی حوکمی قاسمدا کێشا بوو پێچەوانەی بەڵێنەکانی بوون بە پەیرەوی کردنی سیاسەتێکی والا تر. بەلام جارێکی دیکە هاتەوەو ڕێگەی بەکاری حزبی دا لە کانونی دووەمی ١٩٦٠. مۆڵەتی بە چەند ژمارەیەکی کەم لە حزبەکاندا، لەوانە حزبی نیشتمانی دیموکراتی. بەلام ئەو ڕێکخراوە جەماوەرێکی فراوانی نەبوو. هاوکات ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی لە سەر قاسم حسێب بوون. ئەوەش وای لێکردبوون نەتوانن رەخنە لە قاسم بگرن. دوای دوو ساڵ ئەو حزبە هەڵوەشایەوە. هەروەها مۆڵەت بە ڕێکخراوێکی تەواو جیاوازدرا. ئەویش پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. کە جارێکی دیکە لە پەیمانێکی لەرزۆکدا لە نێوان دوو حزب کە یەك لە دوای یەك مەلا مستەفا بارزانی سەرۆك و ئیبراهیم ئەحمەد ئەمینداری گشتی بوو. بەو پێیەی قاسم دەیزانی بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەد نوێنەری دوو ڕای جیاواز بوون لە

کۆمەڵگەی کوردی و هەریەکەیان ئارەزووی جیاوازی هەبوو. سەرەڕای ئەوەی بارزانی بە کۆماری مەهابادی تەمەن کورت و دوورخراوەییەکی درێژخایەن لە یەکێتی سۆڤیەت گرێدرابوو هەر کاتێکیش بیویستایە وتاری مارکسی بەکاردەهێنا. بەڵام یەکەم سەرکردەی سەرۆك هۆز و شێخی نەقشبەندی بوو، لە بەرامبەردا، ئیبراهیم ئەحمەد و زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی کوردی دیموکراتی لە رۆشنبیرانی شار بوون. بەشێکی زۆریان پێشووتر ئەندام بوون لە حزبی شیوعی عێراقی. هەر لە سەر ئایدۆلۆژیەتی ئەو حزبە مابوونەوە بەڵام پەیوەندییان لەگەڵیدا ئاستەنگی زۆری تێدا کەوتبوو.

حزبی شیوعی عێراقیش داواکاریی بۆ بە دەستهێنانی مۆڵەت سەبارەت بە دامەزراندنی حزبێکی سیاسی قانونی پێشکەش کرد. بەڵام قاسم رەتیکردەوە. حزبەکە نەیتوانی نارەزایی دەربرێت و بە شێوەیەکی کاریگەر کاردانەوەی هەبێت، چونکە خۆپیشاندان وێنای هێز نیشاندەدات نەوەك خودی هێز. تەنگەژەی حزبی شیوعی عێراقی ئاڵۆزتر بوو کاتێك حزبی ئیسلامی سەریهەڵدا. بەو پێیە پرۆسەی هاوشێوە لە نێوان سوننەو شیعە روویدەدا ئەوە وایکرد داواکاری بۆ پێکهێنانی دوو حزبی ئیسلامی جیاواز. سەرەڕای مۆڵەت پێنەدانیان لە سەرەتادا بەڵام دواتر بە هۆی سروشتی تایفیان رێگە بە حزبێکی ئایینی درا کە حزبی ئیسلامی بوو. نوعمان عەبدولڕەزاق سامەڕائی کە کەسایەتیەکی سوننەی دوور لە ئایین سەرۆکایەتیکرد. بەڵام چاودێری حزبەکە ئایەتوڵڵای ئەکبەر موحسین ئەلحەکیم بوو. سەرەڕای ئەوەی ئامانجی سەرەکی حزب، پێکهێنانی حزبێکی ئیسلامی بوو، بەڵام رق و دوژمنداریەتی ئەو حزبە بۆ خوانەناسی و مەزهەبی ماددی و شیوعیەت لە بەرایی پەیڕەو پرۆگرامەکانیدا بوو. هەر تەنها ئەوەش بوو کە لەو کاتەدا ببووە مایەی سەرنج راکێشانی قاسم.

لە راستیدا سەرهەڵدانی حزبی ئیسلامی. نیشانەیەکی گشتی بوو لەوەی کە نێوەندە عێراقیە سوننی و شیعەکان لە یەك کاتدا هەست بکەن کە پێویستە ژیانی سیاسی سەر لە نوێ ئاراستە بکرێتەوە، نەوەك لە سەر بنەمای مەزهەبی و تایفی

بەڵکو بە پێی ئەرکەکانی ئیسلام کە بەڵگەی گشتی زیاتر یان پێوە دیارە. هەروەها دەتوانین وای دابنێین کە کاردانەوەیەکە لە سەر گریمانە مەزهەبیە زاڵەکان بە سەر وتاری میللی لە نێوان دوو دەیەی رابردوو، لای سوننە کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین گەلا بوو، وەك ئەوەی لە میسر و سوریا روویدا کە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ دوو رێکخراوی هاوشێوە تێیدا چالاك بوون. بەلام لە لایەن شیعەکان گرنگترین رێکخراوی لەو شێوە گروپی دەعوا بوون کە لە کۆتایی پەنجاکاندا سەریهەڵدا و زانایەکی گەنج بە ناوی محمد باقر ئەلسەدر دایمەزراند. ئەو گروپە بیرو بۆچوونی تایبەتیان لە سروشتی رابوونی ئیسلامی رەنگیدایەوە. سەرەرای هەستی پیاوانی ئایینی تەمەن بچوکتر و کەسانی دیکە کە بڕوایان وابوو رەوشەکە پێویستی بە رێکخراوێکی کاریگەرتر هەیە بۆ ئەوەی لە رووی بلاوبوونەوەی ئەو ئایدیۆلۆژیایانە بوەستێتەوە کە هەڕەشە لە لاواز بوونی کۆمەڵگەی عێراقی شیعە دەکات و لە ئایینی خۆیان هەڵیان دەگەڕێنێتەوە. ئەوە بۆچوونی ئەوان بوو.

دەعوا روو بەرووی پیاوانی ئایینی بە تەمەن بووەوە کە زیاتر پارێزگار بوون و حەزیان بەو بیرو بۆچوونە نوێیانە نەدەکرد کە سەدر خستبوویە روو. بیرو بۆچوونیان لە سیاسەتدا لە چوار چێوەی چالاکی سیاسی گونجاو بوو بە نوێنەرایەتیەکی تایفی و دانوستاندن لەگەڵ دەسەلاتدارانی دەوڵەت. لەو قۆناغەدا، گرووپی دەعوا هەروەك ئیخوان موسلیمینی سوننە وابوو، بە دیاریکراوی رکابەری رژێمی حوکمیان نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، لە لایەن هەندێکەوە رادیکالانە دەهاتە بەرچاو چونکە زمانی و هۆکاری سیاسەتی جەماوەری پەیرەوکرد بۆ ئەوەی کەسایەتیە رکابەرەکان و پیاوانی ئایینی بۆ خۆی رابکێشێت. بەلام ئەو دوورە پەرێزییە رێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی ئایەتوڵلا موحسن ئەلحەکیم پاڵپشتی بکات. هەروەها منداڵەکانیشی پەیوەندیان بەو رێکخراوە کرد. کە پێشتر لە پایزی ١٩٥٨ سەرکردایەتی نارەزاییی دەربڕینێکیان کردبوو لە دژی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی. بە بەهانەی ئەوەی کە لێسەندنەوەی موڵکی تایبەت کارێکە دژی شەریعەتە. ئەوەش وایکرد حکومەت بڕیار بدات بە قەرەبوو کردنەوەی خاوەن

زەوییەکان تەنها زەویەکانی وەقف لە و یاسایەدا ئیستسناکرا. کە رادەی کاریگەری توندرەوی یاساکە بەو رێکارە زۆر کەم بووەوە.

بەڵام لەو کاتەی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠، حزبی ئیسلامی رەخنەی لە هەندێك لایەنی بەرنامەی یاسادانانی حکومەت گرت بەو پێیە پێچەوانەی شەریعەتە، ژمارەیەك لە ئەندامانی دەستگیرکران، هەروەها رۆژنامەکەیان راگیراو هەندێك لە لقەکانی حزبەکە داخرا. لە بەرامبەردا حزبی شیوعی عێراقی چاودێری لەسەر توندتر کراو دەزگەکانی هەواڵگری چاودێری توندتریان خستە سەر و رۆژنامەکەی بۆ چەند مانگێك راگیرا. لە هەوڵەکانیشی بۆ دەستبەسەر داگرتنی کاروچالاکی هەندێك کۆمەڵە و رێکخراو دووچاری ئاستەنگی زۆر بووەوە. لە تشرینی دووەمی ١٩٦٠دا دلێمی لەسەر کار لادرا و هەر زوو دوو وەزیری دیکەی لایەنگری حزبی شیوعیش لادران. هەروەها حکومەت لەو قۆناغەدا هەندێك رێکخراو و کۆمەڵەی هەڵوەشاندەوە کە حزبی شیوعی تێیدا باڵا دەستبوو. وەك (ئەنسار و لسەلام و لاوانی عێراق و رابیتە) ئەوەش دەسترۆیشتوویی حزبی شیوعی عێراقی کەمکردەوە.

لە سایەی ئەو بارودۆخە توانای رێکخستنی حزب بەبەردەوام و پێ بەپێ دوو ئەوەندە دەبوو. قاسم رازی نەبوو هیچ دامودەزگەیەکی نوێنەرایەتی دابمەزرێت یا هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجامبدرێت. لە توانای حزبە سیاسیە کەم ژمارەکانیش نەبوو بە تەنها پشت بە بڵاوکراوەکانیان ببەستن کە ئەگەری ئەوە هەبوو لە هەرساتێك بەپێی فەرمانێکی جێبەجێکردن دووچاری داخستن بێتەوە. ئەو ماوەیە نیشانەی سەرەتای کۆتایی گەشە سەندنێکی گەورەی چالاکی رۆشنبیری پێوە دیاربوو بەتایبەتیش دوای دامەزراندنی کۆماری لەساڵی ١٩٥٨دا ئەو ماوەیە جموجۆڵ و بزاڤێکی رۆشنبیری لە عێراق هێناکایەوە کە بەرەو لاوازیبوو، رووخانی رژێمی کۆن و بەڵێندان بە نوێکاری و گۆڕانکاری ریشەی نووسەر و هونەرمەندانی هەر بەتەنیا خاو نەکردەوە بەڵکو رێگەی لێگرتن بیروبۆچوونی نوێ بخەنە روو، زۆر جاریش بۆچوونەکانیان لەهەمبەر ئاییندەی عێراق تێکی نەدەکردەوە، کتێب و

گۆڤار و رۆژنامە سەرەرای کاری پەیکەرتاشی و شێوەکاری و شانۆ یارمەتیاندا بۆ ئەوەی سەنتەری زیندوو بۆ گەلێکی رۆشنبیر و بایەخدەر بەپرسەکانی ولاتەکەی جارێکی دیکە دابمەزرێتەوە. لەوەتەی ساڵی ١٩٤٥ کە رێگە بەو چالاکییانە درا لەژێر سایەی حوکمی پادشایەتی لەگەڵ ئەوەشدا لەسەردەمی قاسم ئەو رووبەرە وەکو سەردەمی پادشایەتی مایەوە، کە هەر چەندە دەسەلاتدارە سیاسییەکان نووسەر و هونەرمەندانیان نەك بەتەنها دەخستە زیندان و ژێر چاودێرییەوە بەڵکو چەندین شێوازی دیکەی مەحسوبییەت. کە هیچی کەمتر نەبوو لە تێکدانی سەربەخۆیی داهێنانیان. دوورخستنەوەی خودیی بووە تاکە چارەسەرێکی گونجاو بوو بۆ زۆربەیان، ئەوەش وایکرد حاڵەتی هونەری و رۆشنبیری عێراق زۆر کز و لاواز بێت کە دواتر وایکرد ولات بۆچەندین دەیەی دیکە پێوەی بناڵێنێت.

لە رووی سیاسییەوە، رێکخراوە نهێنییەکان ببوونە قسەی سەرزار، هەندێکیان وەك حزبی شیوعی عێراقی لەسەر ئەوە راهاتبوون. لە راستیدا کاری نهێنی ببووە پێویستییەکی زۆر گرنگ چونکە خۆی دەبینیەوە کە دووچاری هێرشی ئاژانسەکانی حکومەت دەبێتەوە. سەرەرای گرووپی دەعوا چەند گرووپێکی دیکە کە لەنێو کۆمەڵگەی شیعە دامەزرابوو، خۆیان بۆ دژایەتیکردنی شیوعییەت تەرخانکردبوو. لەهەمان کاتدا جەنگێکی شاراوەی ترسناك لە ئارادبوو. لەبەغدا و موسڵ و چەند شارێکی دیکە شیوعیەکان و خانەوادەکانیان لەلایەن گرووپە عروبیەکان هێرشیان دەکرایە سەر و کوشتن و هەرەشە بۆ دەرکردنیان بەکار دەهات. حزبی بەعس کە لەو کاتانەدا بەنهێنی دەستی بە چالاکی کردبووەوە رۆڵێکی گەورەی لەو بارەوە بینی. دوای ئەو کارەساتەی ساڵی ١٩٥٩ بەسەر حزبەکە هات ئەوجارە عەلی سالح ئەلسەعدی جارێکی دیکە رەوانەی عێراق کرایەوە بەنهێنی ئەرکی بونیادنانەوەی حزبی بەعسی پێ سپێردرا. پشتی بە بنچینەی رێکخستنی نهێنی بەست و دەزگەیەکی دامەزراند لەیەك کاتدا توانی شەر لەگەڵ شیوعیەکانیش بکات و بخزێتە نێو نێوەندەکانی حوکم و لەکاتی پێویست خەڵکێکی زۆر بێنێتە دەروە. لەساڵی ١٩٦٢ ئەلسەعدی بووە سەرۆکی

ڕاستەقینەی حزب لە عێراق و چەند شانەیەکی لەنێو ئیدارەی دەوڵەت و هێزە چەکدارەکان و سەندیکا پیشەییەکان دروستکرد.

پارتی دیموکراتی کوردستانیش، لەلایەن خۆیەوە. سەرەرای پشێویە نێوخۆییەکان ئەو دووساڵەی کە ڕێگەی کارکردنی پێدرابوو قۆستەوەو ئەندامی زۆری کۆکردەوەو توانی دانانی بەدەست بێنێت کە یەکەم ڕێکخراوە لەناوچە کوردییەکانی عێراق. زۆربەی حزبەکان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە سەربەخۆیی زاتی بدرێتە زۆربەی ئەو ناوچانەی کە بەزمانی کوردی قسە دەکەن، زۆر گرنگی بەمانای گەورەی سەربەخۆیی نەدرا کە چ دەگرێتەوەو ئەو خاکەی کە لە خۆشی دەگرێت و سروشتی ئەو سیستەمە قسەی لێنەکرا کە لە ئاییندە لە کوردستان پەیڕەوی دەکرێت. لە ڕاستیدا کەمبوونەوەی ئاراستەی گیانی عروبە لە سیاسەتی عێراق پارتی دیموکراتی کوردستانی هاندا کە لەسەر پەیڕەو پرۆگرامی خۆی ڕشتتر بێت. هەروەها خەبات لەدژی مەرکەزییەتی دیکتاتۆری دەوڵەت بکات. کە بەناوی قەومییەتی عێراقی یەکگرتوو و نیشتمانیی پەیڕەو دەکرا. ئەو هەڵوێستییە کە لە ئیدارەیی دەوڵەتدا ڕەگی هەبوو سنووری بۆ ئەو نەرمی نواندنە دانا کە پێشکەش بە کورد دەکراو دەریخست هیچ هەوڵێك بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنە نەدراوە کە لەدەستوور هاتووە و سەبارەت بە پێدانی سەربەخۆیی زاتی بە کورد. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەرەتا هەوڵیاندا لە جیاتی ڕکابەری ڕژێم داواکانیان بەدی بێنن.

بەهیوای قۆستنەوەی پەیوەندی دروستبووی نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤییەت. لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٦١ بارزانی سەردانی مۆسکۆی کرد ، بەنیازی داواکردن لە سەرۆکی سۆڤییەت کە پرسی کورد لەگەڵ قاسم تاوتوێ بکات . بەڵام دواتر یەکێتی سۆڤییەت ترسا کە لە پرسێکی وا هەستیار تێبکەوێت کە هۆکارەکانی دیارن. و ڕازی نەبوو یارمەتی پێشکەش بکات. لەو کاتانەدا قاسم ، بەشێوازی جۆراوجۆر بەدوای پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بوو بە بەکارهێنانی تەکتیکێکی باو ئەویش پاڵپشتیکردنی نەیارانی بارزانی بوو لە هۆزە کوردەکان . بۆیە ئەو

کاتەی حکومەت یاداشتی بارزانی سەبارەت حوکمی زاتی لە تەموزی ١٩٦١دا رەتکردەوە، بارزانی گەرایەوە بنکەی کلاسیکی خۆی لە کوردستان. هەر زوو شەڕ و کوشتار لەنێوان هێزەکانی بارزانی و هێزە نەیارەکانی لە عەشیرەتەکانی دیکە بەرپابوو کە حکومەت پاڵپشتی دەکردن. لەگەڵ توونـدتر بـوونی شـەڕ و کوشـتار هەندێك بەشی دیکەی گەلی عێراقی چووە پاڵ کە دوژمنداری کۆن هانـدەریان بـوو هەروەها لەسەر چەند پرسێکی دیاریکراو لەرك راچوووبوون، هەروەها دەنگەکان بە داواکردنی ماف سەربەخۆیی زاتی بەرزبوونەوە . کاتێك یەکەکانی سوپای عێراقیش لە ئەیلولدا دووچاری هێرش بوونەوە. حکومەت چەند گونـدێکی کـوردی تۆپبـاران کرد. لەوانەش خودی گوندی بارزان. دوابەدوای ئـەوە سـوپای عێـراق ئامـادەکراو چەند یەکەیەکی رەوانەی کوردستان کرا لە پاییزی ١٩٦١دا بەشێوەیەکی کردەیـی شەڕ هەڵگیرسا.

شەڕ لەناوچە عەشایەرییەکان و چیاکان چڕبووەوە، حکومـەتی عێـراقیش بـەوەی لە قەڵەمدا کە خەباتە لەدژی سەرۆك عەشیرەت و دەرەبـەگ و کۆنـە پەرسـتەکانی ئەو ناوچـەیە. لەلایـەك ئـەوە راسـتبوو، هەنـدێك سـەرۆك عەشـیرەت لـە بنچینەدا لەحاڵەتی یاخیبووندا بـوون لـەدژی یاسـاکانی چاکسـازی کشـتوکاڵی. لـە راسـتیدا بەشـێکی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان لەگـەڵ ئـەو رایـەدابوون و رازی نـەبوون پاڵپشتی بارزانی بکەن. بـەڵام قاسـم هـیچ خزمـەتی بەپرسـەکەی خـۆی نـەکرد لـە کاتێکـدا کـە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانی لـە پاراسـتنی لەلایـەن یاسـاوە دوورخستەوە. وایکرد تەنانەت ئەوانەش کە متمانەیان بە بـارزانی نییـە بچنە نێـو ریزەکانی شۆڕش. سەرەڕای مەترسی و گومانەکانی خۆیان پێیانوابوو بـەلای کـەم بارزانی رشتە لەسەر سەربەخۆیی زاتـی کـوردی و بەتـەنیا توانیویـەتی رابەرایـەتی هێزە چەکدارەکان بکـات کـە پێشـمەرگەبوون. کـە کاریگـەری بـەردەوامی لەسـەر حکومـەتی مەرکـەزی هـەبوو ، لـە راسـتیدا، پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان، بـە پێچەوانەی حزبە سیاسییەکانی دیکـە پێویسـتی بەچـاودێری حکومـەت نـەبوو بـۆ ئـەوەی بـەردەوام بێـت بـەڵکو پێویسـتی بـە پاراسـتنی بـارزانی و سـەرۆك

عەشیرەتەکانی دیکە بوو بۆی. ئەوەش بەدڵنیایی کاریگەری لەسەر پێکهاتە و هاوسەنگی هێزەکان تێیدا هەبوو. بۆیە لایەنگری توندرۆیی نەبوو لەچاکسسازی ریشەیی. لەگەڵ خۆ پیشاندان لەشێوەی خەباتێکی کوردانە. وای لێهات چالاکییەکانی حزب بەشێوەیەکی بەرچاو بە مەنتیقی خەباتی پارتیزانی بەسترایەوە . لێرەدا هۆی سەرەکی توانای بارزانی دەردەکەوێت لەوەی کە خۆراگر بێت لەبەرامبەر هێزەکانی دەوڵەتی عێراق و هاوپەیمانانی حکومەت لەهۆزە کوردەکان (کە بۆ سوکایەتی پێکردن بەجاش ناو دەبران ) .

## سیاسەتی دەرەوەی عێراق لەسەردەمی قاسمدا

هێزەکانی بارزانی توانیان بەشێکی زۆری سوپای عێراق پەکبخەن و ورەی زۆربەی ئەفسەرانی عێراقی دابەزاند. بەشێکی زۆریان وایان بینی ئەوە گەورەترین سەرەکۆنەکردنە بۆ سەرۆکایەتی قاسم . لەو قۆناغەدا چەند پرسیارێکی دیکە سەبارەت حوکمی قاسم دەهاتە پێشەوە، بەتایبەتی شێوازی هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ پرسە سیاسییەکانی دەرەوە کە رەگدانەوەی لەسەر نێوەندە سیاسییەکانی عێراق هەبوو، دوژمنایەتی لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو هەر بەردەوامبوو، بەڵام بە جەختکردنەوە لەسەر هێڵی (عێراق یەکەمجار، ألعراق اولاً) نەلە سەردەمی پادشایەتی و نەلە سەردەمی قاسم نەبووە هۆی دانانی پەیوەندی رێکوپێك لەگەڵ دراوسێکانی عێراق کە غەیرە عەرەبن. لە راستیدا ئەو پرسە زۆر مومکین نەبوو لەوەتای پەیمانی بەغداوە لەنێوان عێراق و تورکیا و ئێران بێتە ئەنجام. کە وا لە قەڵەمدەدرا کە هێمای ملکەچی عێراقە بۆ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا و رۆژئاوا. دواتر جێگەی سەرسورمان نەبوو عێراق لە پەیمانی بەغدا بکشێتەوە لە ساڵی ۱۹٥۹. زیاتر بەرەو یەکێتی سۆڤییەت بچێت و یارمەتی دەرەکی و کەلوپەلی سەربازیی لێداوا بکات.

یەکێتی سۆڤییەتیش هاندانێکی گەورەی لە رووخانی رژێمی پادشایەتی و دامەزراندنی کۆماری بەدیدەکرد. رێگەدانیش بە حزبی شیوعی عێراقی بە ئەنجامدانی چالاکییەکانی. ئەوە بە هێزێکی گرنگ و گەورەی شیوعیەت لە سیاسەتی دەوڵەتێکی گەورەی رۆژهەلاتی ناوەراست چاوەروان دەکرا. هەروەها کشانەوەی عێراق لە پەیمانی بەغدا دەستکەوتێکی ستراتیژی روون بوو چونکە سنورێکی بۆ هەر ئەگەرێکی گەرانەوەی بەریتانیا دانا بەبەکارهێنانی هەردوو بنکەی سەربازیی کە تەسلیمی عێراقییەکانی کردبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بەدیدەکرا کە سۆڤییەت هیوای گەورەیان بە ئارەزووەکانی رژێمی حوکمی نوێ نیە . بە پێچەوانەی زۆران لە رۆژئاواو لەناوچەکە کە شەری سارد هاندەر بوو بۆ زێدەرۆییان لە رادەی کاریگەری شیوعیەت بەسەر قاسم دا . بەلام قاسم لەلایەن خۆیەوە وایدەبینی یەکێتی سۆڤییەت سەرچاوەیەکە دەتوانرێت بۆ پالپشتی دیبلۆماسی و ئابووری و پشتیوانی سەربازیی پشتی پێببەسترێت. بەلام زۆر سۆزداری شیوعییەکان نەبوو وەك مەزهەبێکی ئایدۆلۆژی. هەروەها مەترسی هەبوو لە حزبی شیوعی عێراقی و وای بۆ دەچوو کە مۆدێلی سۆڤییەتی بۆ پێشفەچوونی ئابووری لەسەر عێراق پەیرەو ناکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەیوەندییە پتەوەی کە رۆژبەرۆژ لەنێوان یەکێتی سۆڤییەت و میسر لەسەردەمی عەبدولناسردا رۆژ بە رۆژ پەرەی دەسەند، وای لە قاسم کرد نەتوانێت یەکێتی سۆڤییەت وەك هاوپەیمانێکی هەرێمی ببینێت.

لەلایەکی دیکەوە کشانەوەی عێراق لە پەیمانی بەغدا و دانانەوەی پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤییەت بووە هۆی تەنگژەیەك لەگەڵ ئێران کە لەساڵی ١٩٥٩ سەریهەڵدا بەهۆی ئیدیعاکردنی هەردوولا بۆ مافەکانیان لەشەتولعەرەب. ئێران تەحەدای رێکەوتنامەی ساڵی ١٩٣٧ی کردو داوای تەواوی بەشی رێرەوە ئاوییەکەی کرد بەدرێژایی هێڵی درێژ بووەوە لە قوولترین خالی پانیەکەی. بەلام عێراق ئەوەی رەتکردەوەو داواکاری جۆراوجۆری خستەروو. لەساڵی دواتر پەیوەندییەکانی هەردوو دەوڵەت پشێوەی تێکەوت بەرادەیەك لە رێگەی

شەتولعەرەبەوە تەقەیان لەیەکتر کرد. بێگومان توونـدکردنی بارودۆخەکە لەپەرژەوەندی هیچ لایەکدا نەبوو. بەڵام کەشتییەکان لەبەرکاهێنانی هەردوو بەندەری بەسرەو عەبادان بێبەشکران. دواتر ناکۆکییەکە حەواڵەی هەردوو حکومەت کرا . بەو شێوە لەبەهاری ۱۹٦۱دا رێککەوتنێك لەنێوان عێراق و ئێران گرێدرا، بەو پێیە رێگەدرا جارێکی دیکە رێڕەوە ئاوییەکە بەکار بهێنرێتەوە. هەرچەندە ناکۆکی سەرەکی سەبارەت بەپرسی سەروەری چارەسەر نەکرا بەڵام هەردوولا پابەندبوون بەوەی کێشەکانیان بەدانوستان چارەسەر بکەن.

بەڵام ئاڵۆزی پەیوەندییەکان لەگەڵ عێراق دوو رەنگدانەوەی گەورەی لەسەر حکومەتی قاسم هەبوو هەروەها سەرسەختی هەرێمیی بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتی " عێراق یەکەمجار " دەرخست بەشێوەیەکی چالاکانە، لەلایەکەوە قاسم هەوڵیدا بوارێکی نوێ بۆ بەرەژەوەندییەکانی عێراق لەکەنداو بدۆزێتەوەو ئەوەی بۆ ئەمەش هانی دەدا دانانی سنورێك بۆ دەستە باڵایی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. لەمەش ئامانجی بەیەکەوە کۆکردنەوەی عروبەو بەرژەوەندییە نەتەوەییە تایبەتەکانی عێراق بوو. ئەوەش بووە هۆی سەرنجراکێشانی عێراق بۆ شێخەکانی کەرتی عەرەبی لەکەنداو و ئەو گەلانەی بەزمانی عەرەبی قسە دەکەن لە ویلایەتی خۆزستان باشووری رۆژئاوای ئێران ( کە حکومەتی عێراق بەناوە کۆنەکەی ناوی دەهێنێت عەرەبستان).

ئەو هەنگاوانە دڵە راوکێی لای حکومەتی ئێران دروستکرد و وای لێکدایەوە کە عێراق نیازی وایە شەڕ و کوشتار لەسەر شەتولعەرەب توندبکات و بیباتە قاڵبێکی دیکە کە پرسێکی سیاسی هەستیارە و پەیوەستە بە ئاییندەی بەشێکی گەورەی ئێران. ئەوەش وایکرد حکومەتی ئێران بیر لە کاروباری ئەو وەرەقانە بکاتەوە کە دەتوانێت لەدژی حکومەتی عێراق بەکاریان بهێنێت. بۆیە هەرزوو پەیوەندی بە مستەفا بارزانی کرد کە لەچیاکانی کوردستان نیشتەجێبوو. ئەو کاتەش زۆر سانا بوو سنور ببەزێنرێت و هێزە عێراقییەکانیش نەیاندەتوانی رێگە لە ئاودیوکردنی چەك بگرن. راستە بڕی ئەو چەکانە هێندە زۆر نەبوو لەو قۆناغە بەڵام یارمەتی

بارزانیدا لەماوەی سالآنی ۱۹٦۱–۱۹٦۲ بەرگری سوپای عێراق بکات. هەروەها ئەمە دەستپێشخەرییەك بوو کە لە ئاییندەدا گرنگی زۆری دەبێت.

بەلآم ئەنجامی دووەمی گرنگیدانی نوێی عێراق بە کەنداو، خۆی لەوە دیتەوە قاسم لە حوزەیرانی ۱۹٦۱ داوایەکی پێشکەش بە کوێت کرد.چونکە داخستنی رێرەوی شەتولعەرەب لەسەرەتای سالّ جارێکی دیکە گرفتی مافی دیاریکراوی عێراقی بۆ گەیشتن بە ئاوی کەنداو خستە روو. لە راستیدا لەوەتەی سییەکانەوە هەندێك بیرۆکە سەبارەت بە دامەزراندنی بەندرێك لە ئوم قەسر لە ئارادابوو لە نزیك سنووری کوێت لەوکاتدا. ئەو بیرۆکانە بەداواکارییەکانی عێراق بەسترابوونەوە بەسەروەری بەسەر تەواوی خاکی کوێت یا بەلانی کەم بەسەر هەردوو دوورگەی کوێتی وەربە و بۆبیان کە دەروانەسەر ئوم قەسر. رەنگە هەمان ئەو ئیعتیبارانە رۆلّی هەبوو بێت لەهاندانی قاسم بۆ داواکردنی گەراندنەوەی کوێت بۆ عێراق بەتایبەتیش دوای چەند رۆژێك لە راگەیاندنی کوێت وەکو دەولّەتێکی سەربەخۆ لە حوزەیرانی ۱۹٦۱داو هەروەك لە سییەکان ئیدیعاکانی عێراق لەسەر ئەوە چربووەوە کە کوێت کەرتێك بووە لە ویلایەتی بەسرەی عوسمانی و بەریتانییەکان بە زولّم و زۆرداری لەخاکی سەرەکی دەولّەتی عێراقیان جیاکردووەتەوە لەکاتی دامەزراندنی لە سالآنی بیستەکاندا.

قاسم لەگەلّ داواکارییەکەی هاو پێچ دامەزراندنی حاکمی کوێتی بە قایمقامی کەرتەکە دامەزراند و خستیە ژێر دەسەلآتی حاکمی بەسرە. ئەوەش ئەو پلەیەیە کە دەسەلآتی عوسمانی دەیدایە شێخی کوێت. قاسم لەوەدا هیوای بیرۆکەیەکی دووبارەبووەوەی لە ئەفسانەی نەتەوایەتی عێراقی دەخواست کە دەیگوت عێراق سنووری سرووشتی خۆی هەیە بەلآم بەریتانییەکان بە ئەنقەست دەستکاریان کردووە بۆ ئەوەی نەهێلّن عێراق بگاتە دەریاو دەستی بەسەر کەنداودا نەروات. ئەو بیرۆکەیە لەناوەرۆکیدا ئامارەیدەدا بەوەی کە پێویستە سەرجەم نیشتمان پەروەرە عێراقییە راستەقینەکان لە پاشماوەکانی ئیمپریالییەت خۆیان رزگاربکەن و عێراق ببێتە هێزێکی دەستڕۆیشتوو بەسەر کەنداو. دەسەلآتی قاسم تاڕادەیەکی

زۆر پشتی بەوە دەبەست کە خۆی وەك پاڵەوانێکی نیشتیمانی عێراقی وێنا بکات و هەوڵبدات دەستڕۆیشتویی خۆی لە رۆژهەڵاتی عەرەبی فراوان بکات و لەگەڵ دەستڕۆیشتوویی میسر لە رۆژهەڵات هاوسەنگ بکات و. دواتر دەبوایە لەگەڵ کشانەوەی بەریتانیا لەکوێت لە ساڵی ١٩٦١ رەنگدانەوەی هەبێت.

قاسم هەرەشەی ئەوەینەکرد داواکارییەکەی بەهێز جێبەجێبکات. لە راستیدا زۆربەی سوپای عێراق لە باکووری وڵات بڵاوبووبوونەوە وەك ئامادارییەك بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو رەوشە پشێوە بدەنەوە کە لە کوردستان دروست ببوو. لەگەڵ ئەوەشدا حاکمی کوێت و حکومەتی بەریتانیا نەیانتوانی پروپاگەندەکانی عێراق تەنها بەقسەی نێو وتارێك وەربگرن. بۆیە دوای چەند رۆژێك لە راگەیاندنەکەی قاسم سەبارەت بە مافی عێراق لە کوێت. بەریتانیای مەزن لەسەر داوای حاکمی کوێت هێزی ناردە ئەو وڵاتە بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەگەری هەر هێرشێکی عێراقی بداتەوە، هەروەها داوای لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی کرد کۆبوونەوەی بەپەلە لەنەتەوە یەکگرتووەکان گرێبدات، بەڵام کۆمکاری عەرەبی کە ئەوکات کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دەستی بەسەردا گرتبوو، ئەندامییەتی کوێتی قبووڵکرد هەروەها پەیمانی پاراستنی سەربەخۆیی بوونی داو داوای لە حاکمەکەی کرد داوا لە بەریتانیا بکات هێزەکانی لە کوێت بکێشێتەوە. لە مانگی ئاب. هێزەکانی بەریتانیا کوێتیان بەجێهێشت و هێزێکی دیکە شوێنیانی گرتەوە کە کۆمکاری عەرەبی رەوانەی کردبوو بەشی زۆریشی لە سوپای کۆماری عەرەبی یەکگرتوو پێکهاتبوو. لە ئاکامی ئەوەشدا عێراق نوێنەری خۆی لە کۆمکاری عەرەبی کێشایەوەو پەیوەندی دیپلۆماتی لەگەڵ ژمارەیەك دەوڵەتی عەرەبی بچڕاند کە دانیان بە کوێت نابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، عێراق لە توانایدا نەبوو داواکانی جێبەجێ بکات. سەرەرای ئەوەی ئەو پرۆسە بۆ چەند ساڵێك بە دیاری مایەوە لە میدیاکانی عێراق. بەڵام تەنگەژەی راستەوخۆی پرسی کوێت بەو شێوەیە کۆتایی هات.

ئەو تەنگەژەیە بە تێروانینی رەوتی عروبی لە عێراق، کە حزبی بەعس و کەسانی دیکە نوێنەرایەتیان دەکرد. بە تایبەتیش لە ریزی ئەفسەران. سەرە کۆنەیەکی دیکەی سەربار بوو بۆ قاسم و رژێمەکەی. هەتا ئەگەر سۆزداریشیان بۆ گەڕاندنەوەی کوێت هەبووبێت. بەڵام ئەو پرۆگرامەی قاسم پەیرەوی دەکرد. عێراقی لە جیهانی عەرەبی دابڕاند و هەڵوێستی لە بەرامبەر ئیمپریالیەتی نیشتمانی لاواز کرد. گەڕانەوە بۆ خستنە رووی ئەو پرسە کۆنە جارێکی دیکە برینی کۆنی کولاندەوە و متمانەی هەندێك کەسی تەنانەت لەلایەنگرانی قاسمیش هەژاند. رەنگە ئەوە هاوکاری ئەوەی کرد بێت حکومەت لە کانوونی یەکەمی ١٩٦١دا یاسای ٨٠ دەربکات کە بەهۆیەوە دەستی بەسەر ٩٩٪ی لە تایبەتمەندییەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراقیدا گرتبێت بەبێ قەرەبووکردنەوەو لەمەودوا لە توانای ئەو کۆمپانیایەدا نەبوو کەتا ئێستا ئەو تایبەتمەندیە فراوانەی کەپێیدرابوو بەکاربهێنێت لەعێراق پەرەی زیاتر پێبدات و. وای لێهات ناچار بێت تەنها کێڵگە گرنگەکانی لە بەردەست بێت کە پێشتر کاری تێدا دەکرد.

ئەو هەنگاوانە دوای دانوستانێکی پچڕپچڕ هات کە بە شێوەیەکی رازیکار لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراقی کۆتایی پێنە هاتبوو لە دووساڵی رابردوو. ئەویش لە سەر چەند پرسێك بوو. هەر لە نرخی نەوتەوە تاکو ئارەزووی حکومەتی عێراق لە هاوبشکی دادپەروەرانە. رەوشەکە بە هۆی هەڵوێستی کۆمپانیاکانی نەوت لە ساڵانی فرە زۆری زێڕی رەش ئاڵۆز بوو لەو کاتەی وڵاتە بەرهەمهێنەرەکان ناچارکران بەرپرسیاریەتی دابەزینی نرخەکەی بگرنە ئەستۆ. ئەوە عێراقی پاڵپێوەنا هانی دامەزراندنی رێکخراوی وڵاتانی هەناردەکردنی نەوت (ئۆپیك) بدات لە ئەیلولی ١٩٦٠دا. لەو چوار چێوەدا یاسای ژمارە ٨٠ گورزێك بوو بە تایبەتی بەر کۆمپانیاکانی نەوت کەوت (سەرەڕای ئەوەی ئۆپیك هەنگاوەکەی رەتکردەوە، پێی وابوو توندڕۆیی تێدایە). بەڵام وابەدیکرا کە گورزێکە بەر شەرعیەتی بەریتانیای ئیمپریالی لە عێراق دەکەوێت. هەرچەندە نەگەیشتە ئاستی خۆماڵی کردنیش. کەچی لەو کاتەدا هیچ رادیکاڵیەتێکی کەمی نیشان نەدا. کۆمپانیای

نەوتی عێراقیش هەر ئەوەندەی پێکرا ڕێژەی بەرهەمهێنان کەمبکاتەوە، بەوەش سزای حکومەتی عێراقیدا کە لەو کاتەدا لە ڕەوشێکی ئەوتۆدانەبوو بتوانێت ئەو تایبەتمەندییانە بقۆسێتەوە کە تازە بە دەستیهێناوە، بەوەش زیانی زۆری بەرکەوت بەڵام سەرەڕای نرخە ئابورییەکە بۆ ئەو هەنگاوە کەچی دەنگۆیەکی میللی گەورەی هەبوو ڕەنگە پارەتی قاسمی دابێت بۆ سڕینەوەی یادەوەرەی هەرەسهێنانی لە کوێت .

## سیاسەتی پیلانگێران و کودەتای شوباتی ۱۹٦۳

سەرەڕای هەرەسهێنانی قاسم لە سیاسەتی دەرەوە. بەڵام خەریك بوو وەك سەرکردەیەکی جەماوەریی ڕاستەقینە دەردەکەوت لە عێراق. لە سەردەمی خۆیدا داهاتی نەوت بۆ پڕکردنەوەی ڕاستەوخۆی پێداویستی چینە هەژارەکانی کۆمەڵگە دەگەڕایەوە. بودجەی تەرخان کراوی بۆ پڕۆژەکانی ژێرخانی درێژخایەن کەمکردەوە، لە جیاتی ئەوە بۆ نیشتەجێکردنی گشتی و قەرزی نیشتەجێبوونی تەرخان کرد. بە تایبەتیش دانیشتوانی دەوروبەری بەغدا سودی زۆریان لێوەگرت. هەروەها ژمارەی قوتابیان سێ ئەوەندە زیادیکرد و جموجۆڵی دروستکردنی قوتابخانەکان زیادی کرد. بەڵام ژمارەی مامۆستایان بە شێوەیەکی گونجاو زیاد نەبوو؛ ئەوە گیرگرفتی فێرکردنی لێکەوتەوە. هەروەها گرفتێکی هاوشێوە لە کەرتی تەندروستی سەریهەڵدا. بە شێوەیەك دروستکردنی نەخۆشخانەکان دەستپێکرد و بووە هۆی زۆربوونی ژمارەی تەختەکان بەبێ ئەوەی لە بەرامبەردا ژمارەی دکتۆرەکان و کارمەندانی تەندروستی بە خێرایی پێویست زیاد بکات ئەویش بە هۆی درێژەی ماوەی مەشق پێکردنیان و گرانی تێچوونەکەی . هەروەها یاسای کار دەرچوو بەو ئامانجەی کاتژمێرەکانی کارکردن کەمبکرێتەوە و کەمترین ئاستی کرێ زیاد بکرێت و هەندێك پارێزگاری بۆ کرێکاران لە دژی ڕووداوو و بێکاری دابین بکرێت. سەرەڕای جێبەجێنەکردنی ئەو یاسایانە وەکو پێویست،

بەڵام وێنایەکی وای دروستکرد کە سەرکردەی وڵات گرنگی بەخۆشگوزەرانی گەلەکەی دەدات و رشتە لە سەر باشکردنی ئاستی بژێوی ژیانی. ئەو وێنایە هۆکارەکانی راگەیاندن دووپاتیان کردەوە. ئەوانەی لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدان، هاوکار بوون بۆ ئەوەی قاسم بکاتە کەسایەتیەکی شایەنی رێزلێنان و سەرسوڕمان. وا پێدەچوو قاسم زۆر بڕوای بەو چیرۆکە ئەفسانەییانەش بوو بێت کە لە بارەی ئەودا باس دەکران . لە راستیدا لەو ماوەیەدا قاسم هەستی بە دڵنیاییەکی تەواوکرد، بۆ ئەوەی ئەو کەسانە ئازاد بکات کە لە لایەن دادگەی باڵای سەربازیەوە حوکمیان لەسەر درابوو.

ئەو دەزگەیەی کە ناسراو بوو بە دادگەی گەل کۆلۆنێل مەهداوی سەرۆکایەتی دەکردو . بە ماوەیەکی کەم دوای کودەتای تەموزی١٩٥٨ دامەزراو و ئەنجامدانی دادگەی بە ئاشکرای ئەندامانی رژێمی پادشایەتی کە تۆمەتبار بوون بە تاوانەکانیان لە دژی گەلی عێراق گرتە ئەستۆ . ئەو دادگایە کە هەر لە بنچینەدا وەك گۆرەپانێکی گشتی بۆ سەرەکۆنەکردنی تاوانبارانی رژێمی کۆن بە کاردەهێنرا. سەرەڕای ئەو ژمارە زۆرەی پیاوانی سیاسەت و فەرمانبەرانی لە بەرامبەریدا ئامادە بوون لە دادگاییکردنی ئەو کەسانەی کە پیلانیان لە حکومەتەکەی قاسم دەگێڕا و ژمارەی ئەو کەسانەش لە زیادبووندا بوو. کەچی لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٢ قاسم دڵنیا بوو لەوەی لایەنگرانی کۆنترۆڵی دەوڵەتیان کردووە و ئۆپۆزیسیۆن پشێوی و بێ سەروبەری تێکەوتووە. حزبی نیشتمانی دیموکراتی هەڵوەشایەوەو رێگەی پێنەدرا بگاتە زۆربەی رێکخراوە جەماوەریەکان و خرایە ژێر چاودێری بەردەوامی دەزگا هەواڵگریەکانی قاسم ، پارتی دیموکراتی کوردستانیش کە پشتی بە شەڕی پارتیزانی دەبەستێت. هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی بەسەر شارە گەورەکانی عێراقدا نەبوو کە تیایدا ژمارەی لایەنگرو هاوپەیمانانی زۆر کەمبوون. هەر چەندە جەنگی کورد داهاتی دەوڵەتی بە هەدەر دەداو ورەی ئەفسەرانی سوپای کەمدەکردەوە. بەڵام دۆزی کورد لە لایەن قاسم و حاکمەکانی پێشوو و دواتری بەغداش وەك پرسێکی لاوەکی سەیر دەکرا.

کەچی لە زستانی ١٩٦١-١٩٦٢، هەندێك لە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەستنیشانیانکرد کە تاکە رێگە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان لەگەڵ بەغدا خۆی لە گۆڕینی رژێمەکە دەبینێتەوە. دوای ئەوەی هەر دوو حزب کە لە رووی ئایدۆلۆژیاوە لێی نزیك بوون ـــ حزبی نیشتیمانی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراقی رەتیان کردەوە هاریکاری بکەن پارتی دیموکراتی کوردستان رووی لە ، گروپەکانی عروبی و حزبی بەعس کرد ، ئەوەش بە هۆی کاریگەری بەردەوامیان بەسەر سوپاو. ئاگر بەستی خستە روو ئەگەر هاتوو قاسم لەسەر حوکم لادرا. ئەو بیروبۆچوونانە هاوکات بوو لەگەڵ زێدەبوونی متمانەی حزبی بەعس بەخۆی . ئەندامە سەرەکیەکانی حزب ژمارەیان زۆر نەبوو؛ بەڵام پۆستی چاکیان لە دەوڵەتداو لە سوپا هەبوو. هەروەها لە رووی تیۆرییەوە بۆیان دەلوا ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرانیان ئامادە بکەن لە کاتی تەنگژەکاندا. لە ماوەی ساڵی ١٩٦٢ ئەو حزبە پێشڤە چوونێکی گەورەی لە رێگەی لێژنەکانیەوە بە خۆیەوە بینی کە کاریان بۆ کۆکردنەوەی خەڵکێکی زۆر لە سەر شەقام دەکرد لەو کاتەی دەزگایی سەربازیی هەنگاوە یەکلاکەرەوەکە ئەنجامدەدات. بەعس گرنگی کۆنترۆڵکردنی شەقامی لە کاتی تەنگژە سیاسیەکان درك پێکرد. یا وێنایەکی لا گەڵاڵە بوو کە ئەو توانایەی هەیە لەو بوارە ململانێی حزبی شیوعی لە ناو بەرێت و بەڵگەی ئەوە بداتە دەست کە حزبێکی جەماوەری و دەستڕۆیشتووە.

بەڵام ئەلسەعدی، کە کەسایەتیەکی مەدەنی بوو. وای بۆ دەچوو. زۆر گرنگە پەیوەندی لەگەڵ ئەفسەرە نەتەوە پەرستە عەرەبەکانی وەك عەبدولسەلام عارف گرێبدات. کە بەو دواییانە ئازاد کرا بوو هاوبەشی خەمی بەعسیەکان بوو لە دابڕانی عێراق و جیهانی عەرەبی و رق وکینەی بۆ شیوعیەکان. بە پێی بۆچوونی ئەوان قاسم هەر دوو مەترسی تێدا کۆدەبێتەوە. ساڵی ١٩٦٢ مەکتەبی عەسکەری حزبی بەعس دامەزرا کە پێکهاتبوو لە ئەلسەعدی و ئەفسەرە بە عسیە کۆنەکان وەك (عەمید ئەحمەد حەسەن بەکر و کۆلۆنێل ساڵح مهدی عەماش) دواتر مەکتەبەکە ژمارەیەکی دیکەی ئەفسەرانی بۆ خۆی راکێشا. زۆربەی جارانیش ئەوە

لە رێگەی جۆش و خرۆشیان بوو بۆ دروستکردنی کەسایەتیەك بۆ خۆیان وەك ئەوەی ئەحمەد حەسەن بەکر. لێرەدا. پیلانی روخاندنی رژێمی قاسم دانرا. هەرچەندە مەکتەبەکە دەیویست دوای کودەتاش حزبی بەعس هەر زاڵ بێت بەسەر رەوشەکە. سەرەرای ناچار بوونی هاوکاری لەگەڵ ئەفسەرە غەیرە بەعسیەکانیش .

قاسم راپۆرتی لە بارەی پیلانێك لە دژیدا باسدەکرێت، پێگەیشت. وەك ئەو پیلانەی رژێمی پادشایەتی روخاند، لە بەرامبەردا قاسم بەو متمانە زۆرەی بە دەسەلاتی خۆی هەبوو تەنها ئەلسەعدی و عەماشی دەستگیر کرد. ئەو رێکارە وای لە پیلانگێرەکان کرد جموجۆڵ بکەن. نەوەك حکومەت پرۆسەی پاکسازی فراوان دەسپێبکات.لە ٨ شوباتی ١٩٦٣دا ، عەمید جەلال ئەوقاتی تیرۆرکرا، کە فەرماندەیەکی شیوعی هێزە ئاسمانیەکان بوو، هێرشیان کردو شوێنی دابەزینی فرۆکەکانیان پەکخست لە بنکەی رەشیدی سەربازی و یەکە سەربازییەکانیشیان بەرەو بەغدا بەرێکەوت. حکومەت هەواڵی لە بارەی کودەتایەك بڵاوکردەوە. کەچی حزبی شیوعی ئەندامانی خۆی کۆکردەوە سەرەڕای ئەوەی پەیوەندیشی لەگەڵ قاسم سەقامگیر نەبوو. بە هەزاران کەسی هێنایە سەر شەقام بۆ ئەوەی بەرگری لە رژێم بکەن. هەر هەموویان بەرەو بارەگای قاسم لە وەزارەتی بەرگری بەرێکەوتن بۆ شکست پێهێنانی کودەتاکە لەرێگەی داگیرکردنی شەقامەکانی پایتەخت .

قاسم داواکەی ئەوانی بۆ بەدەستهێنانی چەك رەتکردەوە. بڕوای وابوو هێزە تایبەتیەکەی دەتوانێت چارەسەری رەوشەکە بکات. بەو پێیەی ئەفسەری سەربازی بوو نەیدەتوانی چەك بخاتە ژێر دەستی گەل. هەرچەندە لە زۆر بۆنەدا دەیویست ئەو گەلە بەکاربێنێ بۆ هەرەسهێنانی هەوڵی کودەتایی لە نێو دەزگا سەربازییەکاندا . بەڵام حزبی بەعس و هاوپەیمانەکانی بە ئاسانی لاواز نەبوون و. بەڵکو رێکخراوە جەماوەرییەکانیان هاتنە سەر شەقام بە تەواوی چەکەکانیان بە نیازی لە ناو بردنی نەیارە سیاسیەکانیان. لەو کاتەدا یەکە سەربازییەکان

بەرابەرایەتی ئەفسەرە بەعسیەکان و نەتەوە پەرستە عەرەبەکان راستەوخۆ بەرەو وەزارەتی بەرگری رۆیشتن لە رێگەی خۆشیاندا بەرگریە میللیەکانیان لە ناو برد. دوای رۆژێك لە شەڕوکوشتار هێزە یاخیبووەکان توانیان بچنە نێو وەزارەتی بەرگری و قاسم و هاورێکانی لە ٩ شوبات بەدیل بگرن. دواتر راستەوخۆ دادگەیەکیان ئامادە کرد کە پێکهاتبوو لە ئەفسەرە بەعسی و نەتەوە پەرستە عەرەبەکان و حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرکردن و حوکمەکە بە پەلە جێبەجێکراو گوللە بارانیان کردن.

لە راستیدا بارودۆخی روخاندنی قاسم و مردنی بەزۆر شێوە دەربڕی هەموو ئەو گیرگرفتە سەرەکیانەبوو کە سیاسەتی عێراق روو بەڕووی دەبووە و خۆشی هۆکاری بوو. توانای بڕیاردان لە چارەنووسی حکومەت لە نێو دەستی پیلانگێڕە سەرکەوتووەکان لە نێو ئەفسەرانی سوپادا بوو. بە تەواوی وەك ئەوەی دەسەڵاتەکەی پشتی بە گرەنتیکردنی لایەنگیری یەکە سەرەکیەکان لە سوپا بەستبوو. ئەوەی گومانی تێدانیە ئەوەیە خاوەن جەماوەرێکی زۆری عێراقیەکان بوو چجای بە هێزی کەسایەتیەکەی. ئەوەش لە راستیدا دوژمنانی دانیان پێنا کاتێك تەرمە گوللە بارانکراوەکەی لە سەر شاشەی تەلەفزیۆن نیشاندرا بۆ ئەوەی مردنی بسەلمێنن.

لە لایەکی دیکەوە. ئارەزوو نەبوون یا بێ توانایی قاسم لە گواستنەوەی دەسەڵات و دامەزراندنی ئەو دەزگایانەی کە پاڵپشتی جەماوەریی راستەقینەیان بۆ زێدە دەکرد.نەك تەنیا وایکرد هەموو دوژمندارییەکان لەسەر خودی کەسێتی قاسم کۆبێتەوە بەڵکو وایکرد توانای هیچ بەرگریەکی نەبێت دژی کودەتایەکی رێکخراو بەشێوەیەکی باش. لە راستیدا قاسم – یا بە هۆی باگراوندی خانەوادەیی یا بەهۆی پەروەدەکەی– هەستی بە هەمەرەنگی پێکهاتەی گەلی عێراق و پێویستی بۆ بوژاندنەوەی هەستی کۆمەڵگەی نەتەوەیی دەکرد. ئەگەر سیاسەتی عێراق بیەوێت بەردەوام نەکەوێتە نێو تۆڕی گومان و هەستی نارەزایی تایەفی. بەلام نەیتوانی ئەوە ببینێت کە هەستی گشتی گەشە ناکات تا ئەو کاتەی گەل نەبینێت

كە بیرو بۆچوونەكانی بە شێوەیەكی راست و دروست لەو دامودەزگایانەی كە متمانەی پێیانە نوێنەرایەتی كراوە.

بە نەبوونی ئەو دابەشكردنەی دەسەلات. خاوەن تایبەتمەندیەكان و ئەو كەسانەی توانای راستەوخۆیان هەیە لە پەیرەوكردنی سیاسەتی رق و كینە بەردەوام دەبن لە بڕیاردان لە سەر چارەنووسی حكومەت بە پێی یاساكانیان و ئارەزووی خۆیان . قاسم وەكو ئۆتۆكراتێك حوكمی دەكرد و هەر بەو شێوەیەش مرد. هاریكار بوو لە بونیادنانەوەی پێكهاتە تایبەتمەندەكانی سیاسەتی عێراقی و حەزە سەركوتكارەكانی.

## حزبی بەعس، دەسەلات گرتنەدەست و لە دەستدانی سالی ١٩٦٣

لەرۆژی یەكەمی كودەتاوە، ئەنجومەنێكی نیشتمانی بۆ سەركردایەتی شۆرش پێكهێنرا. لە سەرەتادا لە دوازدە ئەفسەری بەعسی و چوار ئەفسەری نەتەوەیی عەرەب پێكهاتبوو. تیمی بەعسیەكان پێكهاتبوو لە ئەفسەرو خەلكی سڤیل لەگەل شەش ئەندامی مەكتەبی عەسكەری، ئەنجومەنی نیشتمانی سەركردایەتی شۆرش پەیرەوی دەسەلاتی بالای دەكرد. بەلام هەندێك لە ئەندامانیشی لە دەزگای رەسمی حكومەتدا پۆستی دیكەیان پێ سپێدرا. بەم شێوەیە كورسی سەرۆكایەتی بەر عەبدولسەلام عارف كەوت كە سەركردایەتی ژمارەیەكی زۆر لە لایەنگرانی كرد لە ریزەكانی سوپا، بەلام بەعسی نەبوو. بەلام جێگری سەرۆك درایە ئەحمەد حەسەن بەكر كە بەعسی بوو. هەروەها پۆستی سەرۆك وەزیرانیشی وەرگرت. پۆستی جێگری سەروەزیران و وەزیری ناوەخۆ درایە عەلی سالح ئەلسەعدی كە ئەویش ئەمینداری گشتی سەركردایەتی بەعس بوو لە عێراق و سەرۆكی حزب بوو لە عێراق. ئەلسەعدی كەسایەتیەكی زیاتر دەستڕۆیشتوو كاریگەر بوو لە نێوان ئەو سێ كەسایەتیەدا لەو كاتەدا.

لە راستیدا. لە توانای ئەو رژێمە نەبوو تەمەنی درێژ بێت، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چەند کێشەیەك بە هەڵپەسێردراوی لە نێوان جێبەجێکارانی کودەتا لە دژی قاسم مابووەوە. ئەو کێشانەش زۆربەی کێشەی کەسێتی بوون، ئەو کێشانە بە پێی تەنگی شانۆی پیلانگێڕان بۆ چالاکی نهێنی لە سالآنی رابردوو ئاڵۆزتر بوون. دواتریش خۆیان لەوەدا بینیەوە بیرۆکەی هاودژ لە بارەی ناسنامەی عێراق و ئیدارەکەی بێننە ئاراوە. کەلە سالآنی رابردوودا زۆربەی هەر بە شاردراوەیی مایەوە بەو ئامانجەی پارێزگاری لە یەك پارچەیی ریزەکانی ئۆپۆزیسیۆن و هێزە نوێنەرەکانیان بکەن. بەڵام دەست بەجێ دوای ئەوەی نەتەوە پەرستە عەرەبەکان و بە عسیەکان دەسەلآتیان گرتە دەست. خەریك بوو بە پەلە ناکۆکیەکان پەرەیان          دەسەند لە بارەی ئیدارەی دەوڵەت. ئامانجی یەکگرتن دیارنەماو لێکترازان شوێنی گرتەوە ، لە نێوان بەعسیەکان و غەیرە بەعسیەکان بە هۆی رای جیاوازیان لە بارەی ئایندەی عێراق و پێگەی خۆیان تیایدا.

لە سەرەتا دا سەرجەم حزبەکان لەسەر پێویستی لادانی لایەنگرانی رژێمی پێشوو رازیبوون. هەڵمەتێکی دڕاندنەی دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدان و لە سێدارەدان لە دژی حزبی شیوعی عێراقی و لایەنگرانی بە تایبەتی دەستپێکرد. لە چەند هەفتەی یەکەمی دوای کودەتاکە هەڵمەتەکە گەیشتە ئەو پەڕی، لەبەر ئەوەی بەعسیەکان دەترسان شیوعیەکان بەرپەرچیان بدەنەوە، دواتر بە درێژایی مانگەکانی ساڵی ١٩٦٣ درێژەی کێشاو نزیکەی سێ هەزار قوربانی لێکەوتەوە. لە راستیدا سروشتی شێوەی چالاکی شیوعیەت و ئەو چالاکیانەی لە ماوەی پێنج ساڵی رابردوو لێکەوتەوە سەرەڕای دوژمنە زۆرەکانی حزب لە بەعسیەکانەوە بۆ نەتەوە پەرستە عەرەبەکان و رێکخراوە ئیسلامیەکان وایکردبوو حزبی شیوعی و لایەنگرانی لەو پەڕی لاوازیدابن. زۆرترین ئەو کەسانەش لەو هەڵمەتەدا چالاکیان دەنواند پاسەوانی نیشتمانی بەعسی (حەرەس قەومی) بوون، بەسەرکردایەتی کۆلۆنێل ئەلوەنداوی و لەو کەسانە بوون لەو تۆڕە لێژنانەی کە ئەلسەعدی بۆ

کۆنترۆڵکردنی شیوعیەکان پێکیهێنابوو. لە کاتی کودەتا حەرەس قەومیەکان چەکیان هەڵگرتبوو دواتر بوونە میلیشیایەکی چەکدار ژمارەیان زیاتر بوو لە ۳۰ هەزار کەس کە بە تەنیا ملکەچی سەرکردایەتی حزبی بەعس بوون.

لەو کاتە هەڵمەتەکانی دژ بە شیوعیەت بەردەوام بوو، حکومەت رووی کردە پرسێکی دیکە کەلە پاشماوەکانی رژێمی قاسم بوو. بریتی بوو لە ناسەقامگیری کوردستانی عێراق. بارزانی ئاگر بەستی راگەیاند بەو پێیەی بەڵێنیدابوو، حکومەت دەستی بە دانوستانکرد لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان. ئەلسەعدی باسی لە ئاشت بوونەوەی نیشتمانی کرد، دوو کەسایەتی کوردی لە وەزارەت دامەزراند و گەمارۆی ئابووری لە سەر کوردستان هەڵگرت و هێزەکانی حکومەت لە زۆر ناوچەکشانەوە. بەڵام دانوستانەکان زۆر لە سەرخۆ بوون. حکومەت ئامادە نەبوو لە حوکمی زاتی ئیداری دیاریکراو بداتە کورد. لە بەرامبەردا داواکاری پارتی دیموکراتی کوردستان خۆی لە ویلایەتێکی کوردی فراوان کە کورد ئیدارەی بکات و هێزی چەکداری کوردیش پارێزگاری بکات دەبینیەوە. هەروەها سیستەمێکی دارایی سەربەخۆی هەبێت. پشت بە باجی نێوخۆیی و بە رێژەیەکی دیاریکراو لە داهاتی نەوت ببەستێت ، ئەوە سەرەڕای بەشداریکردنی راستەقینەی کورد لە دامودەزگا سەرەکیەکانی حکومەتی عێراق بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کورد. حکومەت بە درێژبوونەوەی هەرێمیی ویلایەتێکی کوردی رازی نەبوو کە پێشنیار کرابوو کەرکوك و بیرە نەوتە گەورەکانی تێدا بێت. هەروەها بە سەربەخۆیی زاتی و دارایی و سەربازیش رازی نەبوو. ئەوەش وایکرد جارێکی دیکە بارزانی هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوە و مانۆرێکی سەربازیی ئەنجامدا کەوایکرد پێگەیەکی چاکی هەبێت کاتێك کە شەڕوکوشتار لە حوزەیران دەستی پێکردەوە. حکومەت لەوە دەترسا ئەفسەرانی سوپا هەست بە ورە دابەزین بکەن. هێرشێکی بۆ سەر کوردستان دەست پێکرد و تیایدا سوپای عێراق زنجیرەیەك سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەوانە لە مانگی ئاب دەستی بە سەر بارزاندا گرت. بەڵام سەرەڕای ئەو دەنگۆیە رەمزیە بۆ ئەو رووداوە گەیشتن بە بارزان شتێکی ئاسایی بوو لە

ڕێگەی ئەو ڕێگایانەی کە سوپای عێراق کۆنترۆڵی کردبوو. بەڵام بەبێ ئەو ڕێگایە سەرەکیانە سوپا نەیدەتوانی بگاتە بارزان. هێزەکانی بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان بەردەوام بوو لە چالاکیەکانی و سوودی لە کۆنترۆڵکردنی ناوچە شاخاویە سەختەکان وەرگرت کە لەسەر سنوری ئێران و تورکیا بوو. ئەو ڕێگەی خۆش کرد حوکمێکی زاتی لە ژێر ئەمری واقیع لە ناوچەیەکی فراوانی کوردستان دابمەزرێنێت. حکومەتی بەعس بینی کە سەرکردایەتی شەڕێك دەکات کە تێچوویەکی ئێجگار زۆری هەیە و ورە دابەزێنەرە و متمانەی ئەفسەرانی سوپا لاواز دەکات و هەستێکی بێزاری ترسناکی خستووەتە نێوانیان.

بە هەر حاڵ، ئەو هەستە ئاڵۆز تر بوو بەهۆی ئەو پشێویەی نێو خودی حزبی بەعسی گرتبووەوە. پاڵپشتی حزبی بەعس بۆ عروبە و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی لەژێر دروشمی (یەکگرتن و ئازادی و سۆشیالیزم) بەردەوام لێکدانەوەی جیاجیای هەبوو. لە عێراق وەك ئەوەی لەوڵاتانی دیکە هەیە، لەبەر چەند هۆکارێك خەڵك هاتنە ناو ریزەکانی بەعس، باڵی عێراقی حزب ژمارەیەك گرووپی لەیەك دووری لەخۆگرتبوو، بۆچوونیان لەلایەن ئەو کەسانەوە دیاریدەکرا کە سەرکردایەتیان دەکردن و ئەو هێڵەش کە لەسەری دەڕۆیشتن . ئەلسەعدی و هاوڕێکانی حزبەکەیان بە نهێنی دامەزراندبوو، وای بۆ دەچوون دەبێ ئەوان دەسەڵاتی راستەقینە بگرنە دەست و هەلیان لە پێشدایە. حەرەس قەومیان دامەزراند نەك هەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی شیوعیەکان، بەڵکو بۆ ئەوەی لەدژی عروبییەکانیش هاوپەیمانەکانی بەعس بەکاری بێنن. ئەگەر کار پێویست بکات. هەروەها وایاندەبینی قەڵغانێکە ڕێگە نادات ئەفسەرە سەربازییە بەعسییەکان دەست بەسەر حزبدا بگرن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەلسەعدی بە ئاشکرا هاوپەیمانی لەگەڵ ڕەوتی ئیشتراکی گرێدا کە زیاتر رادیکالی بوون لەو ململانێیەی کە لەنێو حزبی بەعس لەناوچەکەدا هەبوو.

هەندێك کەسی وەك حازم جەواد و تاڵب شبیب (وەزیری کاروباری دەرەوە)، کە هەردووکیان ئەندامبوون لە ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش و

مەکتەبی عەسکەری، لە ئاراستەی جیاجیاوە هاتبوونە نێو بەعس و وایاندەبینی هۆکارێکە بۆ جێبەجێکردنی بەرنامە جیاوازەکانیان. سەرەڕای ئەوەی ئەلسەعدی بە "راستڕۆکان" لە قەڵەمیدەدان، بەڵام جیاوازیان ئەوەندەی ستراتیژی بوو ئەوەندە ئایدیۆلۆژی نەبوو. تارادەیەکیش کەسێتی بوو ، جەواد و شبیب پەیوەندییەکی توندیان بەباڵی عروبی غەیرە بەعسی هەبوو، گرنگی پارێزگاریکردن لەو پەیوەندییەشیان دەزانی. بەو پێیەی ئەو باڵە لەنێو ریزی ئەفسەران دەستڕۆیشتوو بوو. دواتر ئاگایان لەو ترسە هەبوو کە ئەو نێوەندە هەستی پێدەکرد سەبارەت بە ئەو گیانی رادیکالیەتە پەرەسەندوەی کە لە پرۆگرامی سەعدیدایەو هەروەها لەگەشەکردنی حەرەس قەومیش.

سەرەڕای ئەو دوو رەوتە بوژاوەیەی نێو باڵی مەدەنی حزب، گروپی جۆراوجۆر لەنێو ئەفسەرە سەربازییە بەعسییەکان بەدیدەکرا کە یەك لەدوای یەك عەمید ئەحەد حەسەن بەکر و ژەنەراڵ ساڵح مەهدی عەماش (وەزیری بەرگری) و ژەنەراڵ تاهیر یەحیا (سەرۆکی ئەرکانی گشتی) سەرۆکایەتیان دەکردن، هەر هەمووشیان ئەندامبوون لە بزووتنەوەی ئەفسەرە سەربەخۆکان و هەریەکەیان لە ریزەکانی سوپادا لایەنگری خۆی هەبوو. ئەو لایەنگریە لەسەر سیاسەتی مەحسوبیەت وردببووەوە . لە حاڵەتی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکردا بەلانی کەم باگراوندی هەرێمی هاوبەش و پەیوەندی عەشایەری هەبوو نەوەك نزیکبوونەوەیەکی ئایدیۆلۆژی روون. لە راستیدا خۆیان وەك گرووپێك رەوتێکی ئاشکرایان لەناو حزبدا نەنواند. بەڵام وەك ئەفسەری سەربازی کە دەیانزانی بەعسییەکان پێویستیان بە هاوکاری ئەو کەرتەی ئەفسەرانی سوپا هەیە کە لە چواردەوری سەرۆك عەبدولسەلام عارف کۆببوونەوە. هەروەك چۆن دواتر رووداوەکان دەریدەخەن کە چەند خاڵێکی هاوبەشیان لەگەڵ ئەفسەرە غەیرە بەعسیەکان لە نێواندا بوو بۆ ئەو روو بەڕوو بوونەوەی لەگەڵ ئەلسەعدی سەریهەڵدا بوو.

ئەو ناکۆکیانە گەیشتە ترۆپکە دوای ئەو زنجیرە رووداوەی کە لە سەرەتادا لە سەر شانۆی جیهانی عەرەبی دەرکەوت. وەك ئەوەی ساڵی ١٩٥٨. رژێمی تازە

دەست بەجێ لە بەغدا ساڵی ١٩٦٣ دووچاری دوو پرس لە پرسە سیاسیە عەرەبیەکان بووەوە، زۆر کەس بە ئەزموونی راستەقیەنەیان بۆ پابەند بوونی عەرەبی لە قەڵەم دا. پرسی یەکەم لە پەیوەندیکردن بە کەسایەتی ناسراوی میسری عەبدولناسرەوە خۆی بینیەوە. لە سەرەتادا رژێمی تازە رایگەیاند ئارەزووی یەکگرتنی لەگەڵ میسر هەیە.هەرچەندە بە پراکتیکی ئەو ئارەزووە پەیرەونەکرا. بەڵام ئەو راگەیاندنە هاوکارییەك بوو بۆ رازیکردنی ئەندامە عروبیەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش، وەك عارف کە زۆر سەرسام بوو بە عەبدولناسر. بەعسیەکانیش لە هەمبەر سەرۆکی میسر رای جیاوازیان هەبوو. ئەوەش بە پێی ئەزموونی حزب لە سوریا لە ژێرسایەی کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا. سەعدی درکی بە هەستیاری پرسی یەکگرتن دەکرد لە کاتێك لەگەڵ کورد لە دانوستان بوو.

کەچی هەموو ئەوانە لەگەڵ کودەتای بەعس لە سوریا لە ئادار گۆڕانکارییان بەسەرداهات. دەستبەجێ تەوژمێکی گەورە کەوتە سەر دانوستانی یەکگرتن ، کە بەعسییەکان لەبەغدا نەیانتوانی بەرگری بکەن. حکومەت لە نیسانی، ١٩٦٣دا لەگەڵ میسر و سوریا چووە نێو رێککەوتننامەی یەکگرتن، سەرەڕای رەنگدانەوەی ئەو هەنگاوە لەسەر پەیوەندییەکانی لەگەڵ کورد، ئەوە پەیوەندیەش لەگەڵ رژێمی تازە، کاریگەرییەکی ترسناکتری هەبوو لەسەر چارەنووسی حکومەتی عێراق، عێراقییەکان تێوەگلان لەوناکۆکییە ئاڵۆزەی کە لە سوریا لەنێوان سەرکردایەتی نیشتمانی حزبی بەعس کە هەریەك لە دامەزرێنەرانی حزب میشێل عەفلەق و سەلاحەدین بێتار نوێنەرایەتیان دەکرد لەگەڵ سەرکردایەتی دەوڵەتی سوریا بۆ حزب.

لە عێراقدا. ئەو ململانێیە سەرنجی لایەنگیر و دژەکانی عەبدولناسری لەنێو حزبی بەعس و بزوتنەوەی عروبی بەگشتی راکێشا. لەسەر شەقام لەنێوان چەند گرووپێکی حەرەس قەومی و بزوتنەوە ناسرییەکان (بزوتنەوەی قەومیە عەرەبییەکان) رووبەڕوو بوونەوە روویدا. لە ئاکامدا ئەلسەعدی پۆستی خۆی وەکو

وەزیری ناوخۆ دۆڕاند. بەڵام سەرکەوتوو بوو لە بەرپەرچدانەوەی داواکاری عەقیدی سەربازیی بە هەڵوەشاندنەوەی پاسەوانی نیشتیمانی. لە ئەیلولی ١٩٦٣دا دەسەڵاتی خۆی لە لقی عێراقی حزبی بەعس بە تین کردەوەو ئەو ساتەی هەڵبژارد بۆ ئەوەی پاڵپشتی خۆی بۆ مارکسیەت رابگەیەنێت. رەنگە لە پەنای ئەوەدا دەیویست یەکێتی سۆڤیەت رازیبکات بۆ ئەوەی یارمەتیە سەربازییەکانی بۆ عێراق دەستپێبکاتەوە کە لە سەردەمی هەڵمەتە دڕاندانەییەکان لە دژی شیوعیەکان ساڵی ١٩٦٣ وەستاندبووی. هەروەها ئەو راگەیاندنەی لە باڵی ئیشتراکی رادیکاڵی حزبی بەعسی سوریا نزیکی کردەوە، کە ئەو کاتە لە دیمەشق رۆژ بە رۆژ لە دەرکەوتنی زیاتردابوو.

بەڵام ئەو پێشهاتانە هاندانێك بوو بۆ حازم جەواد بۆ ئەوەی جموجۆڵ بکات سەرباری ژمارەیەك لە سەربازە بەعسیەکان . لەکۆبوونەوەیەکی کۆنگرەی قوتری بەعس لە تشرینی دووەم ئەوانە بەهاوکاری چەند ئەفسەرێکی سەربازی کودەتایەکیان ئەنجامدا و سەرکردایەتیەکی قوتری تازەیان دامەزراند کە جەواد بۆ خۆی سەرکردایەتی دەکرد. دواتر دەستبەجێ ئەلسەعدی و چەند لایەنگرێکی خستە نێو فرۆکەیەك و ناردیانیە دەرەوەی وڵات. حەرەس قەومی رژانە سەر شەقامەکانی بەغدا و نارەزاییان لە هەمبەر ئەو کودەتایە دەربڕی، لەلایەکی دیکە ئەلوەنداوی هێرشێکی ئاسمانی بۆ سەر بنکەی رەشیدی سەربازیی ئەنجامدا و هۆشداری دایە هێزە چەکدارەکان. ئەوەش رێگەی بۆ خۆشکرد بەسەر بەغدا زاڵ بێت بەڵام نەوەك بەسەر هەموو وڵات.

لە بەرامبەر ئەو تەنگەژەیەدا. هەردوو سەربازی بەعسی ئەحمەد حەسن بەکر و عەماش هەلەکەیان قۆستەوەو داوایان لە ئەندامانی سەرکردایەتی نیشتمانی کرد بێنە بەغدا بۆ ئەوەی چارەسەری ناکۆکی ناوخۆیی بەعس بکەن. عێراقیەکان پێشوازیەکی گەرمیان لە گەیشتنی عەفلەق و چەند کەسایەتیەکی سوری دیکە نەکرد. بەڵام ئەوان توانیان لە ماوەی چەند رۆژێك بەعسیەکان و غەیرە بەعسیەکان لە یەك ئاستدا دووربخەنەوە، ئەوەش بەهۆی پێشنیازیان کە خۆیان

ئـەرکی کاروبـاری عێـراق دەگرنـە دەسـت. بـەڵام پێویسـتیان بـە دەسـەڵاتێکی جێبەجێ کردن هەبوو . بۆیە شەقامەکانی عێراق هـەر لـە ژێـر کـۆنترۆڵی حـەرەس قەومی مایەوە کە میلیشیایەکی نارێکخراو بوون.

دوای چەند رۆژێك لە دوو دڵی سەرۆك عەبدولسەلام عارف بڕیاری جموجۆڵکردنیدا. لە ١٨ی تشرینی دووەمدا چەند یەکەیەکی سوپای لەوانەی دەیتوانی پشـتیان پـێ ببەستێت کۆکردەوە. ئەویش لـە رێگـەی تـۆڕە کەسـێتی و عەشـایەرییەکانی کـاری خـۆی هەماهـەنگ کـرد لەگـەڵ ئـەو بەعسیە سـەربازیانەی کـە بـێ ئومێـد ببـون، ژەنەڕاڵ تـاهیر یـەحیا (سـەرۆکی ئـەرکانی گشـتی) و عەمیـد حـەردان ئـەلتکریتی (فەرماندەی هێزە ئاسمانیەکان). هێزەکانی عارف هێرشیان کـردە سـەر حـەرەس قەومی لە بەغداو سەرتاپای وڵات. لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەسەڵاتی خۆی بە سەر وڵاتدا سەپاند.

لە راستیدا، بەعس سەلماندی کـە حـزب نـەبووە بـەڵکو یـەککگرتنی چـەند گروپێـك بـووە. هەنـدێکیان بـەهۆی ئایـدیۆلۆژیاوە یـەکیانگرتووە هەنـدێکی دیکـەیان بـە هۆکاری پیشەیی. لە بەرامبەردا هەندێکی دیکـەیان بـە هۆکـاری ئەسـڵی هاوبەشـی ئەندامەکانی. ئەو هۆکارانە کە ببووە هـۆی هاریکـاری ئـەو گروپانـەی حـزب. هـەر خۆیان لە کاتە ناسکەکاندا بە سەرخۆیان هەڵگەڕاندەوە.

لە راستیدا. شتە شاردراوەکانی حـزب لـە هەمبـەر ئەولەویـەتی دەوڵـەتی عێراقـی، وایکرد ببێتە مایەی گومان لە چاوی ئەو کەسانەی کە پێگەی بەهێزیان لە دەزگای ئیداری ئەو دەوڵەتە داگیرکرد بوو، بە تایبەتیش هێزە چەکدارەکان. ئـەو پیاوانـە بینیان راستی دروسـتکردنی بڕیـاری عـەرەبی کـەمتر ورووژێنـەر بـوو لـەوەی خـۆی نیشاندەدا. دەسەڵاتیان سنووردار بوو لە چوارچێوەی پێکهاتەی سەربازی دەوڵەتی عێراقـی و لەسـەر پلـەو پایـەی کۆمەڵگـەی عێراقیـەوە وەسـتاوە کـە ئـەو تایبەتمەندییـەی پێـداون. ئـەو دوو بنیـادە بـەهۆی گەرانـەوەی سـەعدی و رێکخراوەکـانی وەك حـەرەس قـەومی دووچـاری مەترسـی دەبێتـەوە. کاتێـك

هاوپەیمانی لە نێو گروپەکانی سوپا جموجۆڵێکی یەکلا کەرەوەی ئەنجامدا لە دژی حزبی بەعس لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا . دەرکەوت کە تاکو ئێستا خزانە نێو هێزە چەکدارەکان تاکە کلیلی گەیشتنە بە دەسەڵات. بەبێ گوێدانە شێوەی رێکخستنی مەدەنی کە لەسایەی هەردوو رژێمی پێشوو بەدیار کەوت.

## عەبدولسەلام عارف: ئارەزووە ناسرییەکان و واقیعی عێراقی

ئەوە وانەیەك بوو هەردوو سەردەمی هەریەك لە عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕەحمان عارف جەختی لە سەر کردەوە کە یەك لە دوای یەك حوکمی عێراقیان کرد لە ماوەی پێنج ساڵی دواییدا. عەبدولسەلام بە روونی پێوەی دیار بوو کە دەیەوێت دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت و جگە لەلایەنگرانی کەس لەگەڵی بەشدار نەبێت. کە زۆر متمانەی پێیان هەیە یا بڕوای وایە شایانی پاداشتن. بەو شێوەیە بە سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی باڵی هێزە چەکدارەکان مایەوە، بەمەراسیم حوکمی دەکرد و کەسی دانەمەزراند تەنها هاوڕێکانی نەبێت کە لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوون، کە ئێستا خۆی سەرۆکایەتی دەکات. دواتر پاسەوانی کۆماری وەك بژاردەی هێزە چەکدارەکان دامەزراندو خستیە ژێر دەستی یەکێك لە خزمەکانی لە هۆزی ئەلجومێله ، کە کۆلۆنێل سەعید سلێبی بوو. کەڕشتبوو لە سەر ئەوەی زۆربەی ژمارەی ئەو حەرەسانە لە هۆزی ئەلجومێله بن لە چوار دەوری رومادی. ئەو یەکەیە تەواوی چەکیان بۆ دەستەبەر کراو لە شوێنێکی ستراتیژی نزیك بەغدا نیشتەجێ کران بۆ پارێزگاری کردن لە رژێم و دوور خستنەوەی لە هەر هەوڵێکی کودەتا لە ئاییندە.

لە راستیدا عارف، بە پێچەوانەی سەرکردەکانی پێشە خۆی لە عێراق، هیوای زۆری لە سەر هێز و لایەنگیری هاوپەیمانیەتیە ئایدیۆلۆژیەکان بونیاد نەنا. هەروەها پشتی بە رێکخستنی مەدەنی نەبەست لە بەرامبەر هێزی سەربازیی یا توانای بۆ مقاوەمەکردنی کودەتایەکی سەرکەوتووی هێزە چەکدارەکان.

دوای مێژوویەکی درێژ کە کودەتاکان لە دوای خۆیان هێڵابوو؛ عارف هەستی بە بایەخی گرێبەستە کەسێتیەکانی پشت بەستوو بە متمانە لە دامەزراندی دەسەڵات کردبوو . ئەوەش وای لێکرد ببێتە ئەفسەرێکی جەماوەری و سەرکەوتوو. ئەو ناکۆکیە سەر کێشەی کە ساڵی ١٩٥٨ بە ئاشکرایی بەدەرکەوت و وایلێکرد لە بەرامبەر قاسم کە زیاتر بێ دەنگ بوو و لایەنگیری پلاندانان بوو زۆر لاواز بێت پێدەچوو کۆتایی پێهاتووە . دواتر دوای ئەوەی عارف هاوکار بوو بۆ لەناو بردنی قاسم وا دەرکەوت کە ئەو تەنیا خۆی جێگەی شانازییە لە کودەتای رووخانی پادشایەتی. ئەوەش بەلایەنی کەم وایلێکرد لە خۆی رازی بێت. ئەو کاتەی عارف لە پۆستەکەی وەك سەرۆك کۆمار جێگیر بوو، دەستی بەوە کرد سیستەمێك دابمەزرێنێت لەگەڵ خۆی و ئەو کەسانەی پشتیان پێدەبەستێت بگونجێت بەو ئومێدەی پارێزگاری لە ئاسایشی سەنتەری دەوڵەت بکات. بە ئاشکرا پشتی بەو سیستەمانە بەست کە لە سەر مەحسوبیەت و خزمایەتی و عەشایەری بەندن بۆ ئەوەی دەستڕۆیشتوویی خۆی لە نێو سوپادا پتەو بکات. بەو پێیەی ئەو رێکارە هۆکارێکی گرنگە بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەندێك گرووپی نەیار کە رەنگە کاتی گونجاو بۆ روو بەڕوو بوونەوەی بقۆستنەوە. لە مانگەکانی یەکەمدا کە بەدوای کودەتاکەی هات. عارف شارەزایی لە بنچینەکانی ئەو یارییە قۆستەوە و حزبی بەعسی هەڵوەشاندنەوە. لێکترازانی نێوان ئەندامەکانی زیاتر کرد. گەورە بەعسیە سەربازییەکانی لە پۆستەکانی سەرکردایەتی لاداو ئەحمەد حەسن بەکری ناچارکرد لە ژیانی گشتی بکشێتەوە. تا رادەیەك، وای لە عارف کرد پشت بە عروبیەکان ببەستێت، زۆربەیان بە توندی پاڵپشتی عەبدولناسریان دەکرد کە عارف زۆر پێی سەرسام بوو بەڵام نەوەك بە تەواوەتی. ئەوەی زیاتر سەرنجی راکێشا بوو، هێزی دەوڵەت بوو کە عەبدولناسر دروستی کردبوو، لە هەرێم و ناوچەکە وەکو یەك. گومانی تێدا نیە جیاوازیەکی گەورە لە نێوان هەردوو کۆمەڵگەدا هەبوو. جیاوازی لە نێوان مێژووی میسر و عێراقدا هەبوو. ئەوە رێگەی خۆش کرد دەوڵەتێکی خاوەن شێوەیەکی دیاریکراو سەرهەڵبدات لە یەکێك لەو

لایەنانە بەبێ ئەوی دیکە. وەك مۆدێلێك بۆ دەوڵەتی عەرەبی بەهێز کە دەستە بالایە بەسەر ناوچەکەو کۆمەڵگەی خۆی، میسر بە سەرۆکایەتی عەبدولناسر نمونەیەکی وروژێنەر بوو بۆ سەرۆکی عێراق. ئەو رەهەندانە رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو بۆ ئەوەی لە سەرەتادا ململانێی نمونەی ناسریەت بکات. بەو هەنگاوە توانی لایەنگیری بزاڤکارە عەرەبەکان بۆ خۆی رابکێشێت کە پێیان وابوو عەبدولناسر پاڵەوانی عروبەیە. هەروەها رێگەی بۆ خۆش بوو کەسانی ئەوتۆ لە ئیدارەی دەوڵەت دابمەزرێنێت کە زیاتر بایەخدار بوون بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی عێراقی رێکخراو و یەکگرتوو و بە هێز. هەروەك چۆن عارف خۆی لە سەردەمی قاسمدا دۆزییەوە ، ئەو گیانە هێشتا لە کۆمەڵگەی سیاسی عێراقدا بە هێز بوو، هەروەها لە رێزی ئەفسەراندا . لە راستیدا بە قۆناغی نوێ بوونەوەدا تێپەڕ دەبوو و گرنگیەکەی روو لە زێدە بوون بوو بە شێوەیەك کە عارف رازی نەبوو هانیبدات.

ئەوانە بوونە هۆکاری ئەوەی مەرسومەکانی تەمموزی ١٩٦٤ دەربچێت. کە بانك و کۆمپانیاکانی دڵنیایی و دامودەزگا پیشەسازییە گەورەکانی خۆماڵی کرد. بەلام هەر زوو پەیرەویکردن دەریخست کە عێراق میسر نیە. روون و ئاشکرایە گرنگترین کەرتی ئابووری عێراق نەوت بوو. یاسای ٨٠ سنوری بۆ فراوانبوونی کۆمپانیای نەوتی عێراقی دانا. بەلام نەیتوانی ئەو کەرتە ئابوریە بشارێتەوە کە بە دەست لایەنی بێگانەوە بوو. دواتر مەراسیمی خۆماڵیکردن، لەو روانگەوە کە رێگەیەکە بۆ چارەسەری کێشەکانی عێراق لە رووی ئابوریەوە. ناکرێت بە مەراسیمەکانی خۆماڵیکردنی میسر بەراورد بکرێت. هەروەها بە شێوەیەکی راستەقینە رووی لە لایەنە سەرەکیەکانی ژێرخانی ئابووری نەکرد. لە راستیدا بە شێوەیەکی راستەقینە دەستی بە شێوەی را دەربڕین کرد لە لاساییکردنەوەی مۆدێلی میسری. وەك ئاماژەیەك بۆ هاریکاری عێراق لەگەڵ سەرکردەی سیاسی میسر. بەو شێوەیە ئەو رێکارانە رەوتی "عێراق یەکەم جار"ی بۆخۆی رادەکێشا کە هەوڵی دەدا دەوڵەتێکی بە هێزو زیاتر یەکگرتوو بونیات بنێت لە عێراقدا. هەروەها

سەرنجی عروبی و ناسریەکانی بۆخۆی راکێشا کە بەردەوام بە دوای ئەگەری یەکخستنی جیهانی عەرەبی دەگەڕان.

لەو کاتەدا ،وادەرکەوت ئەو رەوتەی دوایی لە پێشەنگدایە. لە ئایاری ١٩٦٤دا. دەستورێکی کاتی دانرا. جەختی لە سەر بە عەرەب بوونی گەلی عێراق دەکردەوە. دواتر رێککەوتنێکی سەرەتایی لەسەر یەکگرتنی عێراق و میسر لە ئاییندەدا بەدواداهات. لە راستیدا دارشتنی رێککەوتنەکە ئەو ئاگادارییەی ئاشکرا کرد کە عارف و عەبدولناسر هەیان بوو لە ئارەزوویان بۆ دامەزراندی یەکگرتنێکی بە پەلە لە شێوەی مۆدێلە سەرنەکەوتووەکەی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. بەلام ناسرییەکان و ئەوانی دیکە لە عروبیەکانی عێراق هەستیان بە جۆش و خرۆش کرد و دلنیا بوون لەوەی کە بایەکە بەو شێوەیە هەلی کردووە کە لەگەلیان دەگونجێت. بەو شێوەیە ناسریەکان پێیان وا بوو مەرسوومەکانی خۆمالی کردن، کە لە تەمموزدا دەرچوو، دواتر راگەیاندی عارفی بەدوا داهات. دامەزراندنی حزبێکی سیاسی بە دواوە دێت وەك ئیتیحادی ئیشتراکی لە میسر. کە بەشێکە لە پێشڤە چوونێکی گونجاو بە مەبەستی لێکچواندنی دامودەزگا عێراقیەکان لەگەل دامودەزگا میسرییەکان پێش بە دەست هێنانی یەکگرتنی راستەقینەی نێوان هەر دوو دەولەت.

بە پێی بۆ چوونی عارف واقیعی عێراق تەواو جیاواز بوو، رەنگە بۆ ماوەیەك پێی وابوو بێ کە دروستکردنی دامودەزگا هاوشێوەکان عێراق دەکاتە دەولەتێکی توندو تۆل و یەکریز لەگەل میسر، بەلام ئەو بۆ چوونە زۆری نەکێشا. بەردەوام بوونی کێشەکان لەگەل کورد، کە جارێکی دیکە شەرو کوشتاری پچر پچری لە سالی ١٩٦٤ لێ کەوتەوە. ئەوەی بە بیر هێناوە کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان عێراق و میسر هەیە. عارف دوای ئەو کودەتایەی ئەنجامیدا رایگەیاند کە نیازی هەیە کۆتایی بە شەرو کوشتار لە کوردستان بێنێت بە رێگەی ئاشتیانەو چووە نێو دانوستانێکی بە نهێنی لەگەل بارزانی دا ، دانوستانەکە بە رێکەوتنێك لەسەر ئاگر بەست لە شوباتی ١٩٦٤ کۆتایی پێهات. بەبێ راوێژ کردنی مەکتەبی سیاسی لە

پارتی دیموکراتی کوردستانی کە لەو کاتەدا جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد سەرۆکایەتیان دەکرد. سەرەکۆنەی ڕێککەوتنەکەیان دەکرد. بەڵام بارزانی هێزەکانی خۆی بۆ یەکلا کردنەوەی ڕەوشەکە بەکارهێنا. دواتریش داوای گرێدانی کۆنگرەیەکی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان کرد و پاڵپشتی لە ئاگر بەست کرد و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی جوداخوازو لایەنگرانی دەرکرد. تەنها ئەوەیان لە پێشدا بوو لە ڕێگەی سنوری ئێران رابکەن.

ڕەنگە عارف پێی وابێ بە هۆی لێکترازانی ریزەکانی کورد و دەستەباڵایی بارزانی ئاشتی لە کوردستان سەقامگیر کردووە. بەڵام ئەوەی بە هەند وەرنەگرتبوو کە بارزانی رشتە لە سەر ئەوەی کە خۆی بکاتە سەرکردەیەکی نیشتمانی راستەقینە بۆ کورد. کە دواتر هەڵمەتێکی بۆ داواکردنی مافی چارەنووسی کورد بەرپا کرد. بارزانی مەترسی ئەوەی هەبوو کە لە ژێر چەتری ئاگر بەست سوپای عێراق سەر لە نوێ بڵاوبوونەوەی خۆی رێکبخاتەوە بۆیە رازی نەبوو داواکەی بەغدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی هێزە تایبەتیەکانی خۆی جێبەجێبکات. لە ژێر رۆشنایی ئەو بارودۆخە دەبوایە عارف لەگەڵ عەبدولناسر رێك بکەوێت و نیشانەی ئەوەی لێ دەربکەوێت کە پابەندە بەوەحدەی عەرەبی، ئەوەش ڕەوشەکەی پشێو تر کرد. بەو شێوەیە بەیەکدا چوون روویدا، سەرەڕای جەخت کردنەوە لە سەر ئاگر بەست و دانوستانی پچڕ پچڕ لە نێوان بارزانی و عارف دا. ئەو ڕووداوانە بۆ عارفی دووپات کردەوە رێك کەوتن لەگەڵ میسر ئەگەر ئەو بەجیدی هەوڵی بۆ بدات. بۆشایی نێوان بەغداو سەرکردایەتی کورد فراوانتر دەکات. هەروەها بۆی روون بۆوە کە مەترسی مەراسیمەکانی ئیشتراکیەت کە لە تەمموزی ١٩٦٤ دەرچوو بوون بۆ بارزانی و هاوپەیمانە عەشایەرییەکانی هیچ کەمتر نەبوو لە بەرنامەی رادیکاڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان. بەو پێیە لاسایی کردنەوەی مۆدیلی میسری ناسری زۆر بە گران لە سەر عارف دەوەستێت لە کوردستان ئەوەش جیاوازەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە کورتر دەکاتەوە.

وەك ئەوەی نێوەندو كۆمەڵە ئیسلامیەكانی عێراق لە هەر دو تایفەی سوننەو شیعە نارەزاییان بەرامبەر ئەو ڕێكارە سۆسیالیستانە دەربڕی. ئەوەش جیاوازییەكی دیكەی زۆر گرنگی لە نێوان عەبدولناسر وەك سەرۆكی میسرو عارف وەك سەرۆكی عێراق بەدەرخست. عارف هەوڵی زۆریدا بوو بۆ ئەوەی خۆی وەك موسڵمانێكی تەواو دەربخات. ئەوە دوو دڵی لە سەر پێگەی ئیسلام لە ژیانی گشتی هێنابووە ئاراوە. لە ساڵی ١٩٦٣ عارف كاری بۆ رەتكردنەوەی یاسایەك كرد، كە مەرجەعە ئیسلامیەكان دووپاتیان كردەوە كە لەگەڵ شەریعەت هاودژە. هەروەها ساڵی ١٩٦٤ ژمارەیەك فەرمانی دەركرد كە پابەند بوونێكی گشتی زیاتری بە ئیسلامەوە دەسەپاند. بەڵام پەیڕەوی كۆنتڕۆڵ كردنی نەكرد وەك ئەوەی عەبدولناسر لە میسر دەیكردە سەر دامودەزگا ئیسلامیەكان. بەردەوام بوونی چالاكی ڕێكخراوە ئیسلامیەكان لە كۆمەڵگەیەك كە زۆرینەی شیعەیە، سەربەخۆ بوونی شوێنە پیرۆزەكان و ئەوانەی موجتەهیدەكانی لە ڕژێمەكەی دووپاتكردەوە. ئەوە بوو سەرەكۆنەی ڕێوڕەسمە سۆسیالیستەكانی تەمموزی ١٩٦٤ كرد. وەك ئەوەی لە كاتی ڕێو شوێنەكانی چاكسازی كشتوكاڵی لە سەردەمی قاسم ئەنجامیدا و بە سەر پێچی كردن لە بنەمای موڵكداری تایبەتی لە قەڵەمدا و پێچەوانەی حوكمەكانی شەریعەتی ئیسلامیە. عارف بە تەنیا ئەفسەرێكی تایبەتی بۆ چاودێریكردنی ڕێكخراوە شیعەكان دامەزراند كە نارەزاییان روو لە زێدە بوون بوو. بەڵام هۆكاری پۆلیسی سەرنەكەوت لەوەی سنورێك بۆ كاریگەریان دابنێت. هەروەها نەیتوانی بڕوا بە موجتەهیدەكان بێنێت بۆ ئەوەی پاڵپشتی سیاسەتی سۆسیالیستی حكومەت بكەن وەك ئەوەی زانایانی ئایینی میسری كردیان.

كاتێك كە كودەتایەكی بەعسیەكان لە ئەیلولی ١٩٦٤دا لە سوپا ئاشكرا بوو بۆ روخانی عارف ، عارف زۆر سوپاسی ئەو یارمەتیەی عەبدولناسری كرد بۆ ئەو پاڵپشتیەی بە ناردنی هێزەكانی میسر بۆ عێراق. لە بەرامبەر دا ناسریەكانی پاداشتكرد و بە ئاشكرا كورسی زیاتری لە وەزارەتەكان پێدان. لە كانونی یەكەم سەركردایەتی سیاسی یەكگرتوو، لە نێوان میسرو عێراق دامەزرا بۆ ئەوەی

پرۆژەی یەککگرتن هەنگاوێك پچێتە پێشەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەنگاوە راستی پێوە دیار نەبوو چونکە لەگەڵ ئاواتەکانی عەبدولناسر یان عارف نەدەگونجا. هەردوو سەرکردە ئەوەندەیان بەس بوو هانی بیرۆکەی یەککگرتن بدرێت، چونکە دەکرێتە پروپاگەندە بۆ وێنای عروبە کە بووەتە بەشێکی گرنگ لە ستراتیژیەتەکانی یاساکانی هەر دوو پیاو. هەرچەندە بە شێوازی جیاش بێت. بەلام هەنگاوە راستەقینەکان بە ئاراستەی یەککگرتن شتێکی دیکە بوو، عەبدولناسر تیایدا زۆر هۆشیار بوو لەوەی چارەنووسی میسرو راستگۆیی کەسێتی خۆی بە سیاسەتێکی پڕ پشێوی و ناسەقامگیری وەك سیاسەتی عێراق ببەستێتەوە. هەروەها عارف هۆشیار بوو لە پرسی یەککگرتن چونکە پێگەی ئەو لە دەسەلات لاواز دەکات و رێگە دەدات حزبی ناسریەکان کە حزبێکی بچوکە دەستی بە سەر عێراقدا بڕوات.

ناسریە عێراقیەکان جەماوەرێکی فراوانیان نەبوو، بەلکو پشتیان بە چاودێری خودی عەبدولناسر بەستبوو، جگەی عارف و تۆڕەکانیان لە ریزی ئەفسەران و ئیدارەی دەولەت. هەر بە هەمان شێوە لەگەڵ بەعسیەکانیش، ئەو کەسانەی خۆیان بە ناسری ناساند بوو کوتلەیەکی یەك پارچە و توندو تۆلیان پێك نەهێنا بوو، ناسریەتیش خۆی لە خۆیدا ئەوەندەی بەعسیەت دیاریکراو نەبوو، بەلکو پێکهاتبوو لە کۆمەلێك هەستی چڕ بووەوە لەسەر نەتەوایەتی عەرەبی و پێشڤەچوونی دەولەتی سۆسیالیستی و "جیهانی سێیەم" یەتی. دواتر ئەو کەسانەی چوو بوونە ریزی رەوتی ناسری لە عێراق ئینتیمای جۆراوجۆریان هەبوو، سەختبوو پێگەی ئایدۆلۆژیان لە ئارەزووە کەسێتی و سیاسی و حزبیەکانیان جیابکرێتەوە. ئەوەش پێگەیەکی لە جیهانی سیاسەتی حزبیی عێراقیدا پێدابوون. هەندێکجار هاوپەیمانیان هەبوو. هەندێکجاریش دوژمن. متمانەیان بە سەرکردەو تۆڕەکانی هەژموونیان و ئەو سیاسەتەی پەیرەوی دەکەن نەبوو.

لە زستانی ١٩٦٤-١٩٦٥دا رەنگدانەوەی سیاسەتی "ناسری" بە ئاشکرا لە عێراق دەرکەوت. جارێکی دیکە شەڕو کوشتاری توند لە کوردستان هەلگیرساو

بووە هۆی ئاشتبوونەوەیەکی کاتی لە نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی لەپارتی دیموکراتی کوردستاندا کە هەردوولا بینیان دانوستان لەگەڵ حکومەت بێ سوودە. چونکە حکومەت سوورە لەسەر بەرەوپێرچوونی پرۆژەی یەکگرتنی عەرەبی و تێکهەڵکێشانی کورد لە ناسنامەی عەرەبی دەوڵەت. لە هەمان کاتدا، رێوشوێنەکانی خۆماڵی کردن لە هاوینیساڵی ١٩٦٤ دەستی پێکردبوو، باری ئابووری خەریك بوو قورس دەبوو. رێژەی بێکاری بەرز بۆوەو کەمبوونەوەی سەرمایە دەستی پێکرد، هاوکات دەست بەسەراگرتنی زەوی بووە هۆی ئەوەی کە وەبەرهێنانی کشتوکاڵی تێیدا لە کورتی بدات. لەو کاتانەدا، دانوستاندن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراقی دەستی پێکرد ئەوەش هەوڵێك بوو بۆ یەکلاکردنەوەی کێشە هەڵپەسێردراوەکان و چارەسەری هەندێك لە کاریگەرە سلبیەکان کە یاسای ٨٠ بەدوای خۆیدا هێنابووی بەسەر داهاتی حکومەت. لەم چوار چێوەیەدا دەست رۆیشتوویی ناسریەکان هەر یەکلاکردنەوەیەکی هەرەس پێدەهێنا. چونکە ناسریەکان هەوڵیاندەدا پیشەسازی نەوت و بازرگانی دەرەکی بەگشتی بخەنە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت بە شێوەیەکی فراوانتر.

## بۆماوەیی و حوکمی عەشیرەت

عارف لەبەر دڵنیایی و متمانەی بە کەمبوونەوەی مەترسی بەعس رشتبوو لەسەر حوکمی عێراق بە پێی بۆچوونە سیاسیەکانی خۆی. کە پێشبینی حوکمێکی بۆماوەیی لێدەکرا نەوەك عەقڵانیدی. بەو هۆیەوە ناچار بوو کەرتە ئابوریە پارێزگارەکانی کۆمەڵگە رازی بکات سەرباری ئەوانەی لە رووی ئاینەوە پارێزگار بوون. ئەوەش بە زۆر شێوە گەرانەوە بوو بۆ ئەو سیاسەتەی کە حکومەتی پادشایەتی پەیرەوی دەکرد. سەرۆك هۆزەکان لە گوندەکان، موڵکدارو کۆنتەراتچی شارەکان و خاوەن پێگە ئاینیەکان هەر هەموویان بەیەکەوە تۆرێکی پەیوەندییان لە نێوان گەورەو شوێنکەوتوو پێکهێنابوو ، داهاتەکانی هەناردنە

دەرەوەی نەوت بۆ حکومەتی ناوەندی تێری دەکرد. ئەوەش هەل و پاداشتی بۆ هاولاتیانی حکومەت رەخساند. لە هەمانکاتدا رێگەیدا جموجوڵ دژی دەست رۆیشتوویی ناسری لە چەند بەرەیەکەوە بێتە ئاراوە.

بۆ هەلگرتنی کۆت لە سەر بازرگانی دەرەکی، حکومەت پلانی ناسریی بلۆك کرد و لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراقی لە حوزەیرانی ١٩٦٥دا گەیشتە رێککەوتنێك. ئەو هەنگاوە دەستبەجێ بووە هۆی زیاد بوونی داهاتی حکومەت. بەلام مافی ئەوەی بۆ کۆمپانیای نەوتی عێراقی گەڕاندەوە بۆ ئەوەی بگاتە سەرجەم ئەو زەویانەی لێی دوورخرابووەوە بە پێی یاسای ٨٠. لەو کاتەدا کۆمپانیای ناوبراو بە یەککرتوویی لەگەڵ کۆمپانیای پترۆڵی عێراقی نیشتمانی کاریدەکرد کە لە شوباتی ١٩٦٤ دامەزرابوو. دوای ئەوەی کۆمپانیای نەوتی عێراقی بە سەرکەوتوویی بەرگری بەشداری حکومەتی عێراقی کرد بە نیوەی داهاتی نەوت، ناسریەکان لەوە ترسان کە کۆمپانیاکە جارێکی دیکە بتوانێت رێژەی بەرهەمهێنانی عێراقی دیاری بکات، دواتریش داهاتی دەوڵەت لە سەر بنچینەی بەرژەوەندییە تایبەتەکان، نەوەك بەرژەوەندی عێراق دیاری بکات. لە ئاکامدا شەش وەزیرە ناسریەکە هەر ئەوەیان بۆ مایەوە کە دەست لەکار بکێشنەوە لە تەمموزی ١٩٥٥ و هەڵمەتێکی ناڕەزایی توندیان لە دژی رەشنوسی رێکەوتن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراقی رێکخست، بۆ ئەوەی جێبەجێنەکرێت. ئەوەی پەیوەست بێت بەو پرسە، دەبوایە عارف هۆشیار بێت چونکە هەر رێکەوتنێك لەگەڵ کۆمپانیا دەبێتە هۆی ورووژاندنی قسەوباس و رەنگە بێتە هۆی هاوپەیمانی نەتەوە پەرستە عێراقیەکان لەگەڵ ناسریەکان.

حزبە ناسریەکان ئەوەیان لا گەلالە بوو عارف خەریکە واز لە عروبە و رێوشوێنەکانی سۆسیالستی دەهێنێت کە پێشتر پێیوابوو زۆر گرنگە بۆ پەرەپێدانی ئابووری و دەوڵەتی عێراق.

ئەو حزبانە نوێنەری تەواویان لە ڕیزی ئەفسەران هەبوو، ڕەنگە ئەوە هۆکارێك بوو بێت ــ سەرباری شۆڕش بەسەر ڕێکەوتنی نەوت ــ بۆ ئەوەی عارف بە کتوپڕی یەکێك لە کەسایەتیە ناسریە سەربازییەکان (عەمید عارف عەبدولڕەزاق) بە سەرۆوەزیران و وەزیری بەرگری دابمەزرێنێت لە ئەیلولی ١٩٦٥دا. بەو هەنگاوە وا دەردەکەوێت عارف ناسریەکان ڕازی دەکات، بەڵام خستیانیە پۆستێك بە ناچاری بەرپرسیارەتی شەڕ لە کوردستان بگرنە ئەستۆ. بەو هیوایەی عەبدولرەزاق و لایەنگرانی ڕوو بەڕووی ئاڵۆزی ڕەوشەکە بکاتەوە و زیان بە بانگەوازەکان بۆ عروبە بگەیەنێت.

ئۆپەڕاسیۆنە سەربازییەکان بەتەواوی لە ئاداری ١٩٦٥ دەەستی پێکردەوەو حکومەت بە هێرشێك دەستی پێکرد کە هەردوو گروپەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕووبەڕووی بوونەوە. بەڵام هێزە عێراقیەکان توانیان سەرکەوتنێکی سنوردار بە دەست بێنن. لە زۆربەی ئەو ناوچانەی کە بەناو عێراق کۆنترۆڵی کرد بوو ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان توانیان بەبێ زیانی گەورە جموجۆڵی تێدا بکەن، لە بەرامبەردا کۆنترۆڵی حکومەت لە ناوچەکانی دیکە بە تەواوی بزر بوو. لە پێناو چارەسەری لاوازی سەربازیی حکومەت. عارف جارێکی دیکە هەوڵیدا بۆشایی بخاتە نێوان بارزانی و هێزەکانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان. بەڵام تەنگەژەی سەربازیی کۆتایی نەهات و هەربەردەوامبوو.

بەهەرحاڵ، عەبدولرەزاق و ناسریەکان سەبریان نەماو هەڵی دوورکەوتنەوەی عارفیان لە عێراق بۆ ڕەخساو، کودەتایەکیان جێبەجێ کرد لە ئەیلولی ١٩٦٥دا . بەڵام عەمید سلێبی فەرماندەی پاسەوانی کۆماری، هەوڵەکەی لە بار برد، ئەوە وای کرد عەبدولڕەزاق و هاوەڵەکانی بەرەو دەرەوەی عێراق رابکەن. ئەوە ڕێگەی خۆشکرد عارف بە تەواوی لە ناسریەکان دابڕێت. ڕاستە عارف وەکو عروبیەك دەستی پێکرد، بەڵام پێ بەپێ بەرەو بنەمای "یەکەمجار عێراق" ڕۆیشت. بۆ ئەوەش ئەزموونی لە حوکمکردنی وڵاتێك کە بیرۆکەی عروبە تێیدا ترس دەخاتە ناو چین و توێژێکی زۆری دانیشتوانی عێراق هاریکای بوو. مەنتیقی دەوڵەتی

هەرێمی بە سەر مەنتیقی ژێرخانی تایفی و ئەتنی لە کۆمەڵگەی عێراقی زاڵبوو. کە هەندێك عەرەبی سوننە وای بۆ دەچوون عروبە تاکە رێگەی "تەواوکاری ئەوانە"وەك زۆرینە. مایەی مەترسی و جیاکاری بوو ئەو کۆمەڵگە ئیتنیە، هەستێکی بەرامبەر بوو، بە شێوەیەکی رادەبەدەرو چڕ لە بە هێزترین دام و دەزگاکانی ئەو دەوڵەتە. کە بریتیە لە سوپا.

عارف بە دامەزراندنی پارێزەر و ئەکادیمی عەبدولڕەحمان بەزاز کە موحافزکاربوو وەك سەروەزیران جارێکی دیکە ئاڕاستەی خۆی گۆڕی ، هەر چەندە بەزاز ئایدیۆلۆژیەتێکی نەتەوەیی عەرەبی هەبوو و پروپاگەندەی ئەوەی دەکرد کە مونەزرێکی گەورەیە لە نەتەوەیی عەرەبیی، بەڵام پەیوەندی بە هیچ حزبێکی سیاسی و گروپێکی سوپا نەبوو کە. لە راستیدا زۆربەی دەسەڵاتی خۆی لە دەستدابوو بەهۆی هەوڵەکانی کودەتای یەك لە دوای یەك و پرۆسەکانی پاکسازی کە بەعسیەکان و ناسریەکان و شیوعیەکان و خەڵکی دیکەی دوورخستنەوە. لە جیاتی ئەوە ئەفسەران پێیان باشبوو لە فەلەکی کەسێتی عارف بسوڕێنەوە و بوونە پیاوی ئەو لە چوارچێوەی تورێکی فراوان کە زۆر لێهاتوو بوو لە بونیادنانی. عارف دڵنیا بوو لەوەی پاسەوانی کۆماری قەلایەکی پۆلایینە دژی هەر هەوڵێکی کودەتا. بەو پێیەی متمانەی بە ئینتمای قەبەلی هەبوو بۆ ئەندامانی پاسەوان کە راستەوخۆ بە کەسێتی ئەو گرێدراون بە رادەیەکی زۆر دوورتر لە رەوتەکانی ئایدیۆلۆژی . چونکە پاسەوانەکان بەهۆی بەرنامە سیاسیەکەی پاڵپشتی لێناکەن بەڵکو تەنها لە بەر ئەوەی لە هۆزی جومێلیە کە هۆزی ئەوانە. ئەوە وایکردووە شایستەی پاڵپشتی ئەوان بێت لە هەر نەیارێکی دیکەی سەربازی ئەو لە رێزی ئەفسەران، لە بەرامبەردا چاوەڕواندەکرا عارف وەك ئەندامی هۆز ئیلتیزامی ئالوگۆڕ جێبەجێبکات، ئەویش لە رێگەی ئەندامانی هۆزەکەیەوە مامەڵەیەکی تایبەتی بە دەست بێنن و سود لە داهاتی دەوڵەت وەربگرن.

بەو شێوەیە عارف سەرکەوتوو بوو لە کۆکردنەوەی هەر دوو رووی دەسەڵاتی بۆماوەیی کۆن لە سیاسەتی عێراق. عارف تۆڕێکی لە لایەنگرانی خۆی لە نێو

ریزەکانی هێزە چەکدارەکان دامەزراند. کە چەند شتێکی دیکەی دەرهاوێشتە لە پێکهاتەی گوندەکانی عێراق. پاڵپشتی هەموو ئەوانە بۆ عارف بەبێ مەرج نەبوو. بەڵکو پشتی بە پابەند بوونی بە هەندێك لە بنەماکان بەستبوو کە زۆربەی ئەوانی دیکە بەپێی ناسنامەکانیان نەیان دەتوانی رکابەری لەگەڵدا بکەن . لە راستیدا بنەماکانی ئەو پارییە و کۆگەی پاڵپشتی کە لێوەی کەوتبووەوە وەك هەموو دامەزراوەکانی ژێرسایەی رژێمی پادشایەتی هاشمی زۆر پابەند بوو. بەڵام زانینی عارف بۆ پاریەکەو ئەو ئاسایشەی کە لە بنکەوە دەستەبەری کردبوو. توانای جموجۆڵێکیان پێدابوو کە تا رادەیەك زۆر زیاتر بوو لەوەی سەرکردە عێراقیەکانی پێشە خۆی هەیان بوو.

ئەوانە باگراوندەکانی دامەزراندنی بەزاز بوو. یەکەم کەسایەتی مەدەنی بوو کە پۆستی سەروەزیران وەربگرێت لە دوای رووخانی رژێمی پادشایەتی. بۆ پشت ئەستورکردنی وێناکە بە لە دایکبوونی سەردەمێکی تازە بۆ حکومەت کە زیاتر واڵا بێت. ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش هەڵوەشایەوە درایە دەسەڵاتی پاسادانان لە وەزارەت. بەزاز پەیمانی دا کە سنورێك بۆ دەستگیرکردنی نەیارە سیاسیەکان دادەنێت و هەلی رادەربڕینی زیاتر دەداتە گەل. هەروەها ئاماژەیدا کە جارێکی دیکە رێگە بە حزبە سیاسیەکان دەداتەوەو پەرلەمان زیندوو دەکاتەوەو هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێتەوە. لە هەمان کاتدا بەزاز وەستاندنی رێوشوێنی خۆماڵی کردنی راگەیاند و چەند کارێکی دیکەی بە مەبەستی گەڕاندنەوەی متمانە بۆ بواری کارکردن و هاندانی دامەزراندنی کۆمپانیا تایبەتەکان ئەنجامدەدات. سەرەڕای ئەوەی پرۆسەی لێ سەندنەوەی موڵکی پوچەڵ نەکردەوە، بەڵام هەوڵی دا بڕی ئەو قەرەبوو کردنەوەیەی دەدرێتە موڵکدارەکان و خاوەن زەویەکان زیاد بکات. لە ژێر دروشمی ((سۆسیالستی بە ئاگاداریەوە)) بەزاز هەوڵیدا سەرپەرشتی دامەزراندنی ئابوریەکی تێکەڵاوو کاریگەر لە عێراق بکات.

بەڵام دەرکەوت، ئەو پرۆژەیە پێویستی بە خەباتێکی دوورودرێژ هەیە، بەو پێیەی کە ئابووری دووچاری گیرگرفتی ژێرخانی بووەتەوە و لەگەڵ بەردەوامی

ناسەقامگیری سیاسی. پیشەسازیە گەورەکان کە گەشەکردنی تا رادەیەك زۆر کەمبووەوە دوای ساڵی ١٩٦٤. سەرەڕای ئەوەی کەرتی تایبەت کە مابووەوە بە شێوەیەکی کاریگەر لە کارکردن بەردەوام بوو. بەڵام جۆشی وەبەرهێنانی سەرمایە گەورەکان دیار نەما. بەو شێوەیە ڕێژەی گەشەکردن لەو کەرتەش کەمبووەوە، چونکە ئەوانەی ئارەزووی وەبەرهێنانیان هەبوو دەیانزانی لاگیریە ناسری و سۆسیالستەکان هێشتا بوونی هەیە لە لای ئەندامانی ئیدارەی دەوڵەت و ژمارەیەك لە گروپەکانی سوپا. بەلام لە سەر ئاستی کەرتی کشتوکاڵی گومانی هاوشێوە. سەرەڕای گۆڕانکارییەکانی ئەولەویەتی حکومەت لە چەند ساڵی رابردوو بووە هۆی ئەوەی وەبەرهێنان بە ڕێژەیەکی ئێجگار زۆر کەم بکات . کاتێك هەموو ئەمانە بە زنجیرەیەك کارەساتی سروشتیەوە (وشکە ساڵی و تاعون...هتد) گرێدران بەرهەمی کشتوکاڵی بە بەردەوامی لە ساڵی ١٩٥٨ ەوە روو لە دابەزین بوو. لەگەڵ هاتنی شەستەکان وای لێهاتبوو عێراق ڕێژەیەکی زۆری دانەوێڵەی لە دەرەوەی وڵات دەهێنا کەچی دەکرا خۆی سەرچاوەی هەناردنە دەرەوەی بێت. لە راستیدا بارودۆخی گوندییەکان لە عێراق. بە تایبەتیش لە باشوور. کە زۆربەی وەبەرهێنانی عێراقی تێدا بوو. یارمەتی ئەوەیدا کۆچ لە گوندەوە بۆ شار زیاتر بێت ئەوەش دیاردەیەکە لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان لە ئارادا بوو. ئەوەش گیروگرفتەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی ئاڵۆزترو قورستر کرد لە سەر شانی حکومەت لە بوارەکانی نیشتەجێ کردن و خۆشگوزەرانی کۆمەلایەتی.

لەگەڵ ئەوەشدا. بەزاز سەرەرای ئەو گیروگرفتە گەورانەی رووبەرووی بوونەوە، بووە جێی هیوای زۆربەی عێراقیەکان. بە پێی لێکدانەوەی هەندێك کەس بەزاز بووە نوێنەری گەڕانەوەی حوکمی یاسا و جۆرێك لە مەدەنیەتی سیاسی . کە بە هۆی رووداوەکانی ساڵانی رابردوو خەڵکی لەدەستیان دابوو . بەلام بە پێی لێکدانەوەی هەندێکی دیکە بەزاز پابەند بوو بە سیاسەتێکی ئابووری زیاتر لیبرالیەتانەو پاڵپشتی کردن لە بەرژەوەندی موڵکدارەکان . هەوڵی گەڕاندنەوەی دامەزراندنی سیستەمێکی سیاسی پشت بەو ڕێکارانە دەبەستێت کە لەسەر

سەروەت وەستاوە. هەرچەندە ئەگەر جیاوازیشی هەبێت لەگەڵ ئەو سیستەمەی کە لەسەردەمی پادشایەتی پەیڕەودەکرا. ئەوەش نیشانەی ئەوە بوو. بەزاز خۆی بەوەگرێدابوو کە حوکمی عێراق دەگەڕێتەوە دەستی خەڵکی مەدەنی و سوپاش ناچار دەکرێت رۆڵی راستەقینەی خۆی ببینێتەوە کە پارێزگاریکردنە لە دەوڵەتی مەدەنی. ئەو بیرۆکەیە هاوسەنگیەکی لە نێوان لایەنگرو رەخنەلێگرانی بەزاز دروستکرد. بەڵام پێچەوانەی رەوشەکە بوو لە عێراق. دەوڵەت هێشتا لە ژێر چەپۆکی سەربازان دابوو کە خۆیان لە کەسێتی عارف و ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانی دەدیتەوە ، کەدوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی سەرکردایەتی شۆرش دامەزرابوو بۆ گەرەنتیکردنی مانەوەی دەسەڵاتی سەربازیی لە پێگەی هەژموونی بەسەر ئیدارەی دەوڵەتی عێراقدا . لە راستیدا ئەو پاسەوانیەی کە عارف گەرەنتیکرد بوو رێگەی بۆ بەزاز خۆشکردبوو بەو شێوەیە کاریکات بەڵام ئەوەی دوایی و هەندێك لە لایەنگرانی کە پاراستنی عارف رێگەی کارکردنی بۆ خۆشکردبوون. دەستیان بە پشتگوێ خستنی سروشتی ئەسڵ و رەسانایەتی خۆیان کرد بوو و دەیانویست هەندێك هیوای شاراوەی خۆیان بەدەست بێنن. لە ئەنجامدا پارێز بەندی خۆیان لە هەمبەر دوژمنانیان لە رێزی ئەفسەران لە دەستدا بوو.

## عەبدولرەحمان عارف: لاوازیی دەسەڵات

مردنی لە ناکاوی عەبدولسەلام عارف لە تێکشکانی کۆپتەرەکەی لە نیسانی ١٩٦٦دا پاشکۆیی و لاوازیی رێژەیی ئەو کەسانەی دەرخست کە تەنها پشتیان بە چاودێری کەسیی ئەو بەستبوو. وا دەرکەوت مردنی عارف رووداوێکی راستەقینە بوو. هیچ حزبێکی ئۆپۆزسیۆنیش ئامادە نەبوو رەوشەکە بقۆستەوە، بەڵام یەکێك لە گرنگترین خاڵەکانی لاوازی سیستەمی بۆ ماوەیی بە دەرخست. سەرجەم هێڵەکانی خۆلێنزیکردنەوە تۆرەکانی پابەندبوونی ئاڵوگۆڕو لە یەککەیشتن و وەفا

لە نێو دەستی یەك کەسدا بوو کە بازنەیەکی سەرەکی تێدا کۆببووەوە کە سەقامگیری دەوڵەت تا رادەیەکی زۆر لە سەری بەند بوو. مومکین نەبوو هەموو ئەوانە لە کەسێکی دیکە هەبێت جێگەی عارف بگرێتەوە. دوای مردنی عارف راستەوخۆ هەستی وەفاداری کە بە زۆر لە هاورێکانیەوەی گرێدابوو بەزیندویی. وایکرد عەبدولرەحمان عارفی برای کە سەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو بە وەکالەت هەڵبـژێرن بە سەرۆك کۆمـار. ئەوەش لە دانیشتنێکی هاوبەشی حکومەت و ئەنجومەنی نیشتمانی.

سەرۆکی نوێ. جارێکی دیکە بەزازی بە سەروەزیران دامەزراندەوە. ویستی بە شێوەی برای حوکمی وڵات بکات. بەڵام هەمان متمانەی نەبوو. هەروەها ئەو پەیوەندیە نهێنیانەی کە رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە دامەزراندنی تۆری لایەنگیری لە چواردەوری عەبدولسەلام. لەسەر دەمی عەبدولرەحمان تا رادەیەکی زۆر بوونیان نەبوو. وەك دوا گرەنتی بۆ حوکمەکەی عەبدولرەحمان پشتی بە پاسەوانی کۆماری دەبەست. بەڵام پەیوەندی بە ئەفسەرانی پاسەوانی کۆماری وەك سەردەمی براکەی گەرموگوڕ نەبوو. هەروەها شارەزا نەبوو لە پتەوکردنی پەیوەندی پابەندی ئاڵوگۆڕیەکی زۆر کە پێویست بوو بەردەوام تێربکرێت. بۆ ئەوەی پاسەوانی کۆماری بە شێوەیەکی توندتر بە کەسێتی خۆی ببەستێتەوە. لە جیاتی ئەوە وای بۆچوو کە وەفاو لایەنگیری هۆزی ئەلجومێلە بۆ ئەو پرسێکی سەلمێنراوەو . رێگەی بە ئەوانی دیکەدا ئەرکی رێکخستنی یەکەکان بۆ ئەو بگرنە ئەستۆ. بەڵام نەیتوانی تێکەڵی بکات بەبازنەی کەسە نزیکەکان لەخۆی وەك ئەوەی براکەی کردبووی. ئەو پەیوەندیە جۆراوجۆرە لەگەڵ ئەندامە سەرەکیەکان لە ریزی ئەفسەران وایلێکرد نەتوانێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر گروپە حزبیەکانی نێو ئەفسەران بسەپێنێت و بە لێهاتوویی بۆ مەبەستەکانی خۆی بەکاری بێنێت. هەروەها وایلێکرد نەتوانێت لە بەرامبەر دوژمنداریەتی ئەفسەرانی سوپا بۆ بەزاز پارێزگاری لە حوکمی مەدەنی بکات.

دوای مردنی عەبدولسەلام عارف ، دوژمنایەتی ئەفسەران لە دوو پرس تەوەری گرت. هەردووکیان پەیوەندی بە بەرژەوەندی پیشەییان و رۆڵی ئاساییان وەك ناوبژیوانێکی سیاسی لە سیاسەتی عێراق هەبوو. پرسی یەکەم پەیوەندی بە بودجەی بەرگری هەبوو. بەزازو هاورێکانی ویستیان بە پارمەتی داهاتی نەوت ئابووری عێراق نوێبکەنەوە. نیگەرانی خۆیان لەو رێژە زۆرە نیشاندا کە بۆ سوپا تەرخانکرابوو. کاتێکی هێندە زۆر تێپەڕ نەبوو کە پێشنیازی کەمکردنەوەی بودجەکانی بەرگریاندا. ئەو هەنگاوانە مەترسی ئەفسەرانی ورووژاند لە رەنگدانەوەی لەسەر ئەو تایبەتمەندیانە تاکو ئێستا هەیانبوو. بەهانەی ئەوەیاندا کە شەڕ لەگەڵ کورد بەردەوامە بۆیە دەبێ رێژەی خەرجیەکانی سەربازیی بەردەوامبێت.

زۆر ئەستەم بوو بۆ بەزاز لەوپرسەو لەبابەتی هەڵمەتەکان لە دژی بارزانی ، لە بەرامبەریان بوەستێت چونکە ئەمە بەکاری دامودەزگای سەربازیی لە قەڵەمدەدرا . بە گوێرەی گەورە ئەفسەران. هەڵمەتی سەربازیی بەشێك لە ناسنامەی پیشەیی ئەوانی پێکدەهێنا کە راستەوخۆ پەیوەندی بە شەرەفیان و هەیبەتی سوپا و رۆڵی سیاسیان هەبوو. بەڵام دوای مردنی عەبدولسەلام عارف. بەزاز حکومەتێکی تازەی دامەزراند . تیایدا توانی وێنای سەربازیی کەمبکاتەوە. ئەوەش وایلێکرد بتوانێت پەیوەندی بە بارزانی بکات و رێگە بۆ ئاگر بەست خۆشبکات. لەو کاتەی سوپای عێراق و هاوپەیمانە کوردەکانی لە ئایاری ١٩٦٦دا دووچاری زنجیرە شکستێك بە دەستی پێشمەرگەی سەر بە بارزانی ببونەوە. بەزاز پاشەکشەی کاتیی ئەفسەرانی قۆستەوە و ئارەزووی خۆی بەدان پێنانێکی توند بە نەتەوەی کورد و مافی نەتەوەیی کورد نا. تەنانەت وەکو نەتەوە خوازێکی عەرەبی جۆرە رێزێکی بۆ نەتەوەی کورد نیشاندا . ئەوەش پارمەتیدا لەلادانی هەندێك لەو گومانەی کە بەردەوام لە تێڕوانینی سەرکردەکانی کورد بە دیدەکران بۆ نەتەوەی عەرەبی کەلای بژاردەی عێراقی گەڵاڵە ببوو. ئەوەش دەرگای دانوستانی لە نێوان بارزانی

و حکومەت کردەوە کە پێشتر دانوستانی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دەستپێکردبوو.

دانوستانەکان بە راگەیاندنێکی بەزاز لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٦٦ کۆتایی پێهات. تیایدا بەرەسمی بەرنامەیەکی خستبووە ڕوو کەلە دوازە بەند پێکهاتبوو . تیایدا دان بە دوونەتەوەیی دەوڵەتی عێراقی دەنا. دواتریش بە ناسنامەی رۆشنبیری و زمانی تایبەت بە کورد. هەروەها بەڵێندرا نوێنەرایەتیەکی تەواو لەگەڵ حوکمی زاتی بداتە کورد لە چوارچێوەیەکی دیموکراتی پەرلەمانیی لە عێراقدا. بەرنامەکە سەرجەم داواکاریەکانی کوردی جێبەجێنە دەکرد، بەلام شتێکی ئەوتۆی پێشکەش بە کورد کرد کە هیچ حکومەتێکی پێشەخۆی پێشکەشی نەکردبوو. هەروەها بەبوونی چەند بەندێکی نهێنی کە باسی لە پرسەکانی وەك درێژبوونەوەی هەرێمی ئەو ولایەتە کوردیە و پێدانی مۆڵەتی یاسایی بە پارتی دیموکراتی کوردستان. بەرنامەکە وەك بنچینەیەك بۆ چارەسەرکردن رەزامەندی بارزانی بەدەستهێنا.

بەلام زۆربەی ئەفسەران بە ترسەوە لە رێچکەی پێشهاتەکانیان دەڕوانی. هەندێك رازی نەبوون. هیچ نەرمیەك پێشکەش بکرێت کە دەرەنجامی شکستە سەربازییەکان بێت، بەو پێیە کاریگەری لەسەر هەیبەتی سوپا دەبێت. هەندێکی دیکە لەوە ترسان لە هەمبەر مافی چارەنووسی کورد نەرمی بنوێنرێت. کەچی هەندێکی دیکە لەوە ترسان ئەو ئاشتیە ببێتە هۆی ئەوەی خەرجیەکانی سەربازیی نەمێنێت. ئەوەش رێگە بۆ بەزاز خۆشدەکات بودجەی جەنگی کەمبکاتەوە. سەرباری ئەوانە نزیك بوونەوەی سەر لەنوێ جێبەجێ کردنەوەی سیستەمی پەرلەمانی ببوە مایەی وروژانی دڵە ڕاوکێ لای زۆران. لەگەڵ هاتنی ئابی ١٩٦٦ هەستی دوژمنکاری لای ئەفسەرانی سوپا گەیشتە ئەو پەڕی ئەوەش عەبدولرەحمان عارفی هاندا بەزاز لە سەر کار لابدات و ناجی تاڵیب لە شوێنی ئەو دابمەزرێنێت، کە ئەندامی پێشووی بزووتنەوەی ئەفسەرە سەربەخۆکان بوو. دەست بەجێ حکومەتێکی پێکهێنا. تیایدا سەربازەکان زۆربەی پۆستە

سەرەکیەکانیان گرتە دەست. لە ئاکامدا دانوستاندن لەگەڵ بارزانی وەستا و جارێکی دیکە ئاگر بەستێکی چەکدارانەی بە هوشیاریەوە هاتە ئاراوەو تیایدا سوپای عێراق نەیتوانی شتێکی ئەوتۆ بەدەست بێنێت.

عارف لاوازی خۆی لە بەرامبەر سوپاو بێ توانایی لە دامەزراندنی تۆرەکانی مەحسوبیەت دەرخست کە پێشتر براکەی دەستەبالاییەکی گەورەی بە هۆیەوە هەبوو. ئەوە سروشتی سیاسەتی بۆماوەییە کە حزبەکان لە ژێر سایەیدا گەشەیاندەکرد. بەلام لە عارفی نەدەروانی بەڵکو بۆ هەندێك کەسی دیکە لە دەسەلاتدا کە لە توانایاندا بوو لایەنگر لەناو ریزەکانی هێزە چەکدارەکان دروستبکەن. گیانی لێکترازان لەناو سوپا خودی ناجی تالبی لاواز کردبوو. عارفیش هاریکاری چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی نەکرد، کاتێك بۆخۆی سەرۆکایەتی حکومەتی لە ئایاری ١٩٦٧دا گرتە دەست و وەزارەتەکەی پرکرد لەو ئەفسەرە سەربازییانەی کە سەر بە حزبە گەورەکانی نێو سوپان.

پێش دەرکەوتنی نیشانەکانی هەر ئاراستەیەکی تازە، عێراق و زۆربەی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست بە رووداوە کارەسات ئامێزەکانی جەنگی حوزەیرانی ١٩٦٧ سەرقالبوون. خێرایی و قەوارەی سەرکەوتنەکانی ئیسرائیل رێگەی بە بەشداری عێراق نەدا سەرەرای وتارە شەرئامێزەکەی رژێم و راگەیاندنی رەسمی. لە جیاتی ئەوە هێزێکی سەربازیی رەمزی رەوانەی ئەردەن کرا. بەلام هێزەکە درەنگ گەیشت و نەیتوانی ئەنجامی جەنگ بگۆرێت. هەر چەندە عێراق لە رێزەکانی پێشەوەی جەنگ نەبوو. هیچ زیانێکی ئەوتۆی لێنەکەوت باسی بکەین. بەلام شکست پرسی زۆری لە هەمبەر راستگۆیی رژێمە سەربازییە یەك لە دواییەکەکان دەرخست کە لەوەتەی ١٩٥٨ەوە حوکمی ولاتیان دەکرد بەلام ئەمە رێگەی لە عارف نەگرت کە سەربازێکی دیکە کەتاهیر یەحیا بوو بە سەروەزیران دابمەزرێنێت لە تەمموزی ١٩٦٧.

لە چوارچێوەی ئەو دامەزراندنەو بەردەوامبوونی گیرگرفتی سەربازیی لە کوردستان و. هەوڵنەدانی زۆر لە دانوستانەکاندا . لە ناوچەکانی باشووری ناوەڕاستی فورات و زۆنگاوەکاندا . سەرهەڵدانی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی حزبی شیوعی عەزیز ئەلحاج (سەرکردایەتی مەرکەزی) لە پایزی ١٩٦٧دا زنجیرەیەك جموجۆڵی چەکداری لەگەڵ هێزەکانی ئەمن لێکەوتەوە. لە راستیدا جودابوونەوەی ئەلحاج لە حزبی شیوعی سەرەکی (لێژنەی مەرکەزی). بە سەرۆکایەتی عەزیز مەحەمەد. چالاکیە نووستووەکانی حزبی هاندا و. پاڵی پێوەنا هەڵوێستێکی زیاتر دوژمنکارانە لە هەمبەر عارف بگرێتە بەر. ئەوەش توورەبوونی یەکێتی سۆڤیەتی بۆ هێنان و دواتریش چاودێری توندی هێزە ئەمنیەکانی عێراق.

حکومەتی تاهیر یەحیا پشتی بە گروپە جۆراوجۆرەکانی نێو ریزەکانی سوپا بەست. ئەو پرۆگرامەش کە پەیرەویکرد نمونەیی بوو بۆ ئەو ماوەی کە دوای جەنگی حوزەیران هات لە ناوچەکانی دیکەی جیهانی عەرەبی. پەیوەندییەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا پچڕاند، لە بەرامبەردا پەیوەندی چاکتری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و فەرەنسا دامەزراند. ئەو دوو دەوڵەتە رۆڵی گرنگیان لە یارمەتیدانی عێراق دەبێت لە پەرەپێدانی کێڵگە نەوتییە تازەکان کە تەرخانکراوە بۆ وەبەرهێنان لەلایەن کۆمپانیای نەوتی عێراقی نیشتمانی کە چالاکیەکانی روو لە زێدە بوون بوو. سەرەرای نەهاوێشتنی هیچ هەنگاوێك بۆ خۆماڵیکردنی کۆمپانیای نەوتی عێراقی(IPC) ، بەڵام روون و ئاشکرا بوو کە رۆڵی کەمتر دەبێتەوە لە بەرژەوەندی کۆمپانیای نەوتی عێراقی ، کە بۆندی لەگەڵ چەند کۆمپانیایەکی فەرەنسی گرێدابوو بۆ وەبەرهێنان لەو ناوچانەی کە کۆمپانیای نەوتی عێراقی لێدوورخرابووەوە. هەندێك ئەوەیان وا لێکدەداوە دووپاتکردنەوەی دەست بەسەر داگرتنی عێراقە بەسەر بناغە ئابوریەکەیی لە ئەنجامی ئەوەشدا هەیبەتی یەحیا زیادیکرد. هەندێکی دیکە وایاندەبینی یەحیا زۆر هۆشیارە و وێنایەکی دروستکردووە ئەویش ئەوەیە عێراق هێشتا رشتە لە سەر رازیکردنی بەرژەوەندییە بیانیەکان.

لەو کاتەدا هەندێك لە دوژمنانی تاهیر یەحیا لاوازیی سەربازیی هێزە چەکدارەکانی عێراقیان لە کوردستان و هەستکردن بە مەترسی شیوعیەکان کە بەهۆی چالاکیەکانی عەزیز ئەلحاج لە باشوور هاتووەتە ئاراوە دەقۆستەوە . لە راستیدا ئەو هەڕەشەیە هێندە ترسناك نەبوو بەڵام مەترسیە کۆنەکانی شیوعیەتی نهێنی ووروژاند. ئەوەش کاردانەوەیەکی جەماوەری لەلایەن پیاوانی ئایینی موسوڵمان و رێکخراوە ئیسلامیە سوننە و شیعەکان وەکو یەك لێکەوتەوە، کە هەندێکیان پاڵپشتیی فەرمی رانەگەیەنراویان پێدەگەیشت. خۆپیشاندانیان لە شەقامەکانی بەغدا رێکخست و دواتریش شارەکانی دیکەی گرتەوە. حکومەت داوای رزگارکردنی وڵاتی کرد لەو کوفرەی کە هاتووەتە ناو وڵات. حزبی بەعسیش هەڵەکەی قۆستەوە بۆ زیندووکردنەوەی جەماوەری خۆی و تێکەڵ بە خۆپیشاندانەکان بوو و سودی لەو ترس و دڵە راوکێیە وەرگرت کە بەهۆی هەڕەشەی شیوعیەت لە ئارادابوو. وەکو پێشتر سودی لێوەرگرتبوو.

حزبی بەعس لەوەتەی دوورخرابووەوە لە دەسەڵات چەند گۆڕانکارییەکی ئەنجامدابوو. لە ساڵی ١٩٦٤ ئەلسەعدی و زۆربەی لایەنگرانی لە حزب دەرکران ئەندامانی دیکەی مەکتەبی سەربازیی بەسەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکایەتیان گرتە دەست. لەپایزی ١٩٦٤دا ئەحمەد حەسن بەکر سەدام حوسێنی خزمە لاوەکەی خۆی کردە ئەمینداری سەرکردایەتی قوتری کە جارێکی دیکە دامەزرێنرابووە وە و ئەرکی دامەزراندنەوەی حزبی پێ سپارد بوو. بەیارمەتی ژمارەیەك لە خزمەکانی و لایەنگرانی هەر لەو رۆژانەی دژایەتی بەعس بۆ قاسم. بەڵام ئەو هەوڵەی کودەتا کە ساڵی ١٩٦٤ جێبەجێی کرد. ژمارەیەك لە چالاکوانانی حزبی کردە قوربانی. لەوانەش ئەحمەد حەسن بەکر و سەدام حوسێن کە تاکو ساڵی ١٩٦٦ بەندکران. بەڵام ئەوە ئاستەنگی زۆری نەخستە بەردەم کۆکردنەوەی بە نهێنی خەڵك و دامەزراندنی شانەکان لەناو رێزەکانی سوپاو سەرتاپای وڵات. هەروەها ئەزموونی بەندیخانە جۆرە هاوکاریەکی لە نێوان سەدام

حوسێن و ژمارەیەك لە هاوڕێ بەندکراوەکانی دروستکرد کە لە ئایندەدا سوودی باشی بۆی دەبێت.

لە سەردەمی عەبدولرەحمان عارف هەڵمەتەکان لە دژی بەعس پاشەکشەی کرد بوو. رەنگە بەهۆی ئەوەی کە گوایە حزبی بەعس ماندوو بێ هێز بووە. یاخود بەهۆی ئەوەی زۆر بەسادەیی بێ دەسەڵات بووە لە بەرامبەر زێدەکردنی گروپەکان لە نێو ریزی ئەفسەران. کە لایەنگرە بەعسیەکانی ئەحمەد حەسەن بەکر بە رەسمی تێیدا ئەندامبوون. بەهەرحاڵ ژمارەیەك بەعسی لە زیندان ئازادکران و چوونە نێو رێکخراوەکەی سەدام حوسێن کە خەریك بوو فراوان دەبوو. لە بەرامبەردا ئەحمەد حەسن بەکر خزمەکەی خۆی پاداشت کرد و لە پایزی ساڵی ١٩٦٦ کردیە جێگری ئەمینداری گشتی سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس لە عێراق. سەدام لەو پۆستەیەدا توانی بەردی بناغەی میلیشیای حزب و رێکخراوەکە دابنێت کە یارمەتیان دەدات جارێکی دیکە وێنەی کۆنترۆڵکردنی بە عسیەکان بۆ شەقام بخاتەوە روو. لە رۆژانی پڕ لە رووداوو پێشهاتی دوای جەنگی حوزەیرانی ١٩٦٧. کاتێك خۆپیشاندان و رێپێوان لە بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق دەستپێکرد، هەل لەبەردەم سەدام حوسێن رەخسا بۆ ئەوەی رێکخراوی حزب فراوان بکات. ئەوەش رێگەی بۆ بەعسیەکان خۆشکرد کە بە هێزەوە دەربکەون لە ساڵی ١٩٦٧ لە دژی پەرەسەندنی شیوعیەکان و دواتر بە شێوەیەکی راستەوخۆتر، دژی خودی حکومەتی تاهیر یەحیا و هێرشیان کردە سەر بێ تواناییەکەی لە هەمبەر پرسی عەرەب و ئیسرائیل و گەندەڵی ئەندامانی حکومەتەکەی.

ئەوە کەشوهەوای تەنگژەکە بوو کە بەعسیەکان هاوکاربوون بۆ ئاڵۆزکردنی تا رادەیەك هانی عارفی دا کە بیر لە گۆڕینی تاهیر یەحیا بکاتەوە. لەبەر ئەوەی عارف پێگەیەکی گرنگی لە ریزی ئەفسەران نەبوو. کە لە چواردەوری سەرۆك وەزیرانێك بناڵێن کاتێك دەستنیشانی دەکات. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٦٨ راوێژکاری ژمارەیەك کەسایەتی ناو هێزە چەکدارەکانی کرد کە پێشتر پۆستی

حکومیـان وەرگرتبـوو، هەنـدێك لـەو کەسـایەتیانە بەعسـی بـوون. سـەرەرای رەوتەکانی دیکـە. بـەڵام راوێژکاریـەکانی ئـەنجامی یەکلاکـەرەوەی لێنەکەوتـەوە. هەرزوو عارف زانی هیچ کۆدەنگیەك لەسەر پێکهێنانی حکومەتی تـازە و ئیـدارەی وڵاتدانیە. بەڵکو بە پێچەوانەوە. کاتێك سەرجەم گروپەکان بۆنی ئـەوەیان کردبـوو سەری دەسەڵات لاوازەو رەنگە گۆڕانکاری بە سەردا بێت. دوژمنکاری لە نێوانیاندا گەیشتە ئەو پەڕی و داواکانیان زیاتر جەختی لەسەر دەکرایەوە. عارف ناچار بـوو گفتۆگۆکانی رابگرێت. هەندێك لەو کەسـانەی راوێـژکاریان کرابـوو لەوانـە ئەحمـەد حەسن بەکر و چەند بەعسیەکی دیکە داواکارییەکیان نووسیبوو تیایـدا داوایـان لـە عارف کرد بوو حکومەتێکی یەکگرتووی نیشتمانی پێك بهێنێت.

کەچی لەو قۆناغەدا مەکتەبی عەسکەری بەعس و سەرکردایەتی قـوتری دەسـتیان بەدانانی نەخشەکرد بوو بۆ دامەزرانـدنی رژێمێکی بەعسـی لـە نوێـوە . بەهـەمان شێوەی کودەتای ١٩٦٣. زانیان کە پێویستیان بە هاوپەیمانان لە ریزەکانی سوپا هەیـە. بـە تایبـەتیش لـە حاڵـەتی هەڵوەشـاندنەوەی پاسـەوانی کۆمـاری. پەیوەندییـەکان بـە چـەند گـەورە ئەفسـەرێکی نزیـك لـە ناوەنـدی رژێمـی حـوکم دەستپێیکرد. بە تایبەتیش ئەو ئەفسەرانەی لە ژێر سایەی عارف هەستیان بـەبێ ئومێدی دەکرد و بێ هیوابوون بەهۆی سیاسەتەکەی. سـێ ئەفسـەرە سـەرەکیەکە کـە هەریـەك لـە عـارف و سـلێبی زۆر متمانـەیان پـێ بـوون. بریتـی بـوون لـە عەبدولرەزاق نایف (یەکێك لـە کـوڕە مامـەکانی سـلێبی). کـە سـەرۆکی هـەواڵگری سەربازیی بوو. ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داود کە سەرۆکی پاسەوانی کۆمـاری بـوو، سەعدون غێدان کە فەرماندەی فـەوجی تانکـەکانی پاسـەوانی کۆمـاری بـوو، هـەر هـەموویان لـە پێگـەی وادابـوون کـە جموجۆڵیـان بزوتنەوەیـەکی یەکلاکـەرەوەی لێدەکەوێتەوە. بەڵام ژمارەی لایەنگرانیان لە ریزەکـانی سـوپا زۆرکـەم و سـنوردار بـوو. ئـەوە وایلێکـردن رووبکەنـە بەعسیـەکان کـە وای بـۆ دەچـوون پاڵپشـتیەکی تەواویان بۆ دەستەبەر دەکەن لە کـاتی جـێ بـەجێ کردنـی کودەتاکـەدا ملکەچـی سەرجەم هێزە چەکدارەکانیان بۆ مسۆگەر دەکەن.

لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨دا ئەو سێ ئەفسەرە هەڵی ئامادە نەبوونی (عەمید سلێبی)یان قۆستەوەو بە هاوکاری هاوپەیمانە بەعسیەکانیان جموجۆڵیان کردو دەستیان بەسەر ئێزگەو تەلەفزیۆن و وەزارەتی بەرگری و بارەگای پاسەوانی کۆماریدا گرت. سەرۆوەزیران و زۆربەی ئەندامانی حکومەتەکەی دەستگیرکران و (عەبدولڕەحمان عارف)یش سواری فڕۆکەیەك کراو ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کرا. دواتر رژێمێکی تازە پێکهێنراو ئەحمەد حەسن ئەلبەکر کرایە سەرۆك کۆمارو نایف بووە سەرۆوەزیران. ئەلداود بووە جێگری وەزیری بەرگری. ساڵح مەهدی عەماشی بەعسیش کرا بە وەزیری ناوەخۆ. بەڵام لە هێزە چەکدارەکان. حەردان تکریتی کرا بە سەرۆکی ئەرکان و فەرماندەی هێزە ئاسمانیەکان، سەعدون غێدان کرا بە فەرماندەی پاسەوانی کۆماری. هەروەها ژمارەیەك پۆستی وەزاری دیکە بەسەر بەعسیەکان دابەشکرا. بەڵام زۆرینە درا بە سەرکردەکانی کودەتا کە بەعسی نەبوون. یان نوێنەری ئەو گروپانەی کە ڕای جیاوازیان لەسەر عێراق هەبوو.لەوانە سەرۆکی ئیخوان و موسلمین، سەرباری چوار کورد کە یەکێکیان بۆ بەرژەوەندی بارزانی کاری دەکرد.

پەیوەندی نێوان بەعسی و غەیرە بەعسیەکان پشێوی پێوە دیار بوو. چونکە هیچ کامێك لەو دوو لایەنە نەیدەویست لەگەڵ ئەوەی دیکە بەشداری دەسەڵات بکات. حەردان تکریتی دەست بەجێ و چالاکانە دەستیکرد بە پتەوکردنی دەسەڵاتداریێتی خۆی لە نێو هێزە چەکدارەکان بەو ئومێدەی تا رادەیەك هەر هەوڵێکی وەزیری بەرگری پوچەڵبکاتەوە بۆ زێدەکردنی لایەنگرانی تایبەتی خۆی . لەگەڵ ئەوەشدا زۆر روون بوو کە بەعسیەکان لە کۆتاییدا دەستڕۆیشتوییان لە بەرژەوەندی زۆرینە لە دەستدەدەن کە بەعسی نەبوون لە نێو ریزەکانی سوپا. بۆیە بڕیاری جموجۆڵی دەست بەجێیان دا. ئەحمەد حەسەن بەکرو حەردان تکریتی سەعدون غێدانیان رازی کرد بۆ ئەوەی ببێتە لایەنگریان و سەرکەوتووبوون لە هەڵوەشاندنەوەی پاسەوانی کۆماری. لە هەمان کاتدا. توانیان فەرماندەی حامیەی بەغدا حەماد شەهاب تکریتی بۆ لای خۆیان رابکێشن کە بەعسی نەبوو بەڵکو یەکێك بوو لە

ئەندامانی هۆزەکەی ئەحمەد حەسەن بەکر. کاتێکیش ئەلداود بەسەردان چووە ئەردەن و عێراقی بەجێهێشت. بەعسیەکان گورزی خۆیان وەشاندو لە ٣٠ تەمموزدا فرقەیەکی چەکدار دەستیان بەسەر باڵەخانە ستراتیژییەکانی بەغدا گرت و . (نایف)یش وەکو عارف خرایە نێو فڕۆکەیەك و ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کراو. بەمجۆرە بەعسیەکان هاتنەوە سەر دەسەڵات.

سەرەڕای ئەو پشێویانەی لە دە ساڵی رابردوودا کە بەسەر سیاسەتی عێراقدا هات. هەندێك دیاردەی حوکم هەر وەکو خۆی مایەوە. گەلی عێراق هەر بەبێ نوێنەرایەتی مایەوە. حاکمە سەربازییەکان بە پێویستیان نەزانی کەس لێپێچینەوەیان لە سەر کارەکانیان لەگەڵدا بکات لە دەرەوەی ئەو بازنە تەنگەی کە وای بۆ چوو بوون بەردەوام بوونیان لەسەری بەندە. مەنتیقی ئەو پڕۆسەیە هانی پیلانگێران و هانی سەرکردایەتی کەسێتی دا. هەر کاتێکیش هەوڵ بۆ دەرچوون لەو لاساییکردنەوە دەدراو بۆ ئەوەی جۆرە چالاکییەکی سیاسی بێتە ئاراوە کە تایبەتمەندی بەشداری کۆ دەنگی زیاتری هەبێت. وەکو ساڵانی بەرایی حوکمی قاسم. یا وەك ئەو ماوە کەمەی کە بەزاز سەرۆکایەتی حکومەتی وەرگرت. خودی حاکمەکە یان ئەو کەسانەی پشتی پێ دەبەستن هەستیان بە ترس دەکرد و سنوورێکیان بۆ ئەزموونەکە دادەنا.

ئەوەش ئەو هەستەی بەهێزتر کرد کە دەوڵەت ئامرازێکە بە دەست دەسەڵات و. لەژێر دەستی ئەو کەسانەیە کە جڵەوی دەسەڵات دەگرنە دەست. جا ئارەزووە دوورخایەنەکەی ئەو کەسانە هەرچیەك بێت کە لە سەرکردایەتیدان. چ چاکسازی ئابووری و کۆمەڵایەتی یا ئاراستەکردنی عێراق بەرەو پەیامی عروبە یا دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی عێراقی، سەرقاڵ بوون بە ئیدارەکردنی ئەو داهاتانەی. کە ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات تۆڕەکانی مەحسوبیەت و دەزگەکانی سەرکوتکردن تێر بکەن بۆ ئەوەی مانەوەی دەسەڵات بەدەستی خۆیانەوە گرەنتی بکەن. بە پشت بەستن بەو لێکدانەوانە بێ گومان دەبوایە کەرتەکانی کۆمەڵگە کە هەر لە بنچینەوە تایبەتمەندی دەستڕۆیشتوویی دەسەڵاتیان هەیە. بەشێکی زۆری ئەو

تایبەتمەندیانەیان دەستبکەوێت. بەڵام ئەوانەی لە دەسەڵات بێبەشکرابوون و هیچ دەنگیان نەبوو، ووتارەکان دەیانیگرتەوە. بەڵام لە لێکدانەوەی دەستکەوتە سیاسیەکان دوورخرابوونەوە و هیچ رۆڵێکی دیاریان لەو چیرۆکە نیە کە خاوەن پەیوەندییە بە هێزەکان دەستیان بەسەردا گرتووە و زۆربەی کات پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەنتەری ئیدارەی دەوڵەت بوو.

❑

# بەشی شەشەم
# بەعس و حوکمی سەدام حوسێن

ئەو رژێمەی کە لە هاوینی ١٩٦٨ دامەزرا بەناو بەعسی بوو بەڵام ئەمە مانای ئەوە نەبوو وەك رووداوەکانی دواتر دەری دەخەن. ئەو پیاوانەی دەسەڵاتی مەرکەزییان گرتە دەست تەنها بەوە ناسراون کە تەنیا ئینتیمایان بۆ حزب هەیە. ئەوەش تەنها یەکێك بوو لە ناسنامەکانیان و تەنها نیمچە کاریگەرییەکی لەسەر بیرۆکەیان لەسەر عێراق و هۆکارەکانی پەیرەوی سیاسەتی عێراق هەبوو.لە راستیدا ئەوەی لە هەموویان زیاتر دیار بوو، زۆربەی کەسایەتیەکانی رژێمی نوێ لە ئەفسەرانی سوپا بوون. ئەوەش تەنها کاریگەریان لەسەر هەڵسوکەوتیان و راوبۆچوونیان لە هەمبەر رژێمی سیاسی گونجاو نەبوو. بەڵکو پەیوەندی زۆر پتەوی لەگەڵ تۆرە کۆمەڵایەتیەکان پێ بەخشین کە مێژوو دەریخست زەویەکی بە پیتە بۆ وەدەست هێنانی ئەفسەرانی سوپا. ئەو گروپانە کەلە تۆری خانەوادەیی و عەشایەری و هۆزگەری فراوانی عەرەبی سوننە لە گوندەکانی باکوورو رۆژئاوای عێراق پێکهاتبوو. بەشێوەیەکی نایەکسان لە رژێمی نوێ نوێنەرایەتیان هەبوو. یاساو رێوشوێن و مەترسیەکانیان و هەماهەنگیان و دەستڕۆیشتووییەکی مەرکەزی دیکەی لەسەر تێڕوانینی ئەو کەسانە هەبوو کە لە ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتیان گرتە دەست.

لە دەرنجامەکانی ئەو هەموو کاریگەریانە پابەندبوونیانی بە عروبە کەمکردەوە. وەك هەردوو سەردەمی عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕحمان عارف. ووتاری نەتەوە خوازی عەرەبی بەدڵنیایەوە بەشێك بوو لە راستگۆیی ڕەسمیان. وەك نمونەیەکی

بالاّ ژمارەیەکی زۆری بەعسیەکان و ئەوانی دیکە لە عێراق پابەندی بوون . کەچی ئەو کەسانەی لە سەنتەری سەرکردایەتی بوون رشتبوونی خۆیان لەسەر سەروەری عێراق نیشاندا و سەرقالّ بوون بە رێکخستنی دەسەلاّت لە چوارچێوەی دەولّەتدا بەشێوەیەك کە هیچی لە ئەوانەی پێشە خۆیان کەمتر نەبوو. لەگەلّ بەرزبوونەوەی داهاتەکانی حکومەت و بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە سالاّنی حەفتاکان. رووکردنە هێلّی "یەکەمجار عێراق" زێدەتر بوو. وای لێهات رژێم جیهانی عەرەبی وەك شانۆیەك تەماشا دەکرد بۆ دەرخستنی عێراق و دواتر گرنگی و سەرکەوتوویی سەرکردەکەی. ئەمانەش پێگەی سەدام حوسێنیان بەهێزتر و زێدەتر دەکرد. بەتایبەتیش کەسایەتیە زالّەکەی. سەرهەلّدانی سەدام و دامەزراندنی دیکتاتۆریەتێك کە گەلی خستە ژێربارو توندوتیژی تێدا بەکارهات، بە شێوەیەك لە مێژووی عێراقدا ئەو شێوازە نەبوو. ئەوە سیاسەتێك بوو کە زالّبوو بەسەر سیاسەت لەو ماوەیەدا. ئەو هۆکارانەش کە رێگەیان بۆ خۆشکرد، سەرباری کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسی لە عێراق ئامارە بە جیاوازیەکی ریشەیی لەرابردوو نادەن، بەلّکو بە پێچەوانەوە ئەو هۆکارانەی سەدام پەنای بۆ بردو ئەو بنەمایانەی پەیرەویکردو ئەو مەنتیقە سیاسیەی کە لە عێراق دایمەزراند، پێشتر لە رژێمەکانی پێشوو بە پلەی جۆراوجۆر بۆی چوو بوون. لە راستیدا لە زۆر رووەوە لەو تایبەتمەندییەوە هاتبوون کە خودی دەولّەتی عێراق هەیەتی. لە رووی گەشەکردن و ژێرخانەوە. دەتوانین بلّێین پێچەوانەی ئەو حالّەتە . ئەگەر رژێم رەگی خۆی لە قولاّیی تۆرە کۆمەلاّیەتیە گرنگەکان دانە کوتابێ . دەسەلاّتەکەی زۆر لەوە سنوردار تر دەبێت، ئەگەر ئارەزووەکانی سەرۆکەکەی هەر چییەك بێت.

هەروەها. ئەوەندە بۆ ئەو ماوە درێژە خۆی نەدەگرت لە هەمبەر ئەو کێشەو تەگەرانەی کە خۆی بەرپرسیار بوو لە بەسەر هێنانی بەسەر گەلی عێراقدا لە هەردوو دەیەی رابردوو. ئەوەش مانای ئەوە نیە کە سەدام حوسێن ئەنجامێکی پێویستی مێژووی عێراق بوو، هەر وەك خۆی دەیگوت، نە سیفەتەکانی رژێمەکەشی ئەنجامێکی حەتمی رووداوەکانی پێشەخۆی بوو. لە راستیدا سەدام

حوسێن و ڕژێمە دیکتاتۆریەکەی بڕیتین لە دیاردەکانی چیرۆکێك لە مێژووی دەوڵەتی عێراقی کە بە دەسەڵاتێکی فراوان ناسرابوو و ڕەگەزە سەرەکیەکانیشی خۆی لە دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات و نەبوونی متمانە لە نێوان سەرجەم کۆمەڵگاکان (پێکهاتەی کۆمەڵگەی عێراقی) دەدیتەوە. سەرەرای پەنا بردنە بەر توندوتیژی. ئەوەش لە سیستەمێکدا هۆنرایەوە کە گوێڕایەڵی ژمارەیەکی کەمی کەسایەتیەکانی لە مەرکەزی دەوڵەت پێوەدیار بوو. ئەوەش بەناوی کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی و چارەنووسی نیشتمانی. دواتر شتێکی گرنگە پێکهاتەی ئەو بەسەرهاتەو ئەو بارودۆخەی تێبگەین کە ڕێگەی پێدا. ببێتە ئەو وێنایەی کە سیاسەتی عێراقی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستدا پێناساند.

## ئەحمەد حەسەن بەکرو پتەوکردنی دەسەڵات

دوای ئەوەی ئەحمەد حەسەن بەکرو حەردان تکریتی و سالح مەهدی عەماش خۆیان لەو هاوپەیمانانە رزگار کرد کە بۆ دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات یارمەتیاندان. هەر یەکێکیان دەیویست لایەنگران بۆخۆی زیاتر بکات لە سەر حسێبی ئەوی دیکە. هەروەها ئەحمەد حەسەن بەکر لە پێگەیەکدابوو ڕێگەی پێدەدا بەسەرکەوتوویی لەو ململانێیە بێتە دەرەوە. بەو سیفەتەی سەرۆك کۆمار و سەروەزیران بوو. سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو. ئەمینداری گشتی حزبی بەعس بوو. دەسەڵاتی فراوانی هەبوو بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتی خۆ خۆشەویست کردن. ئەو دەستڕۆیشتووییەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێنا بە تایبەتی لە نێو هێزە چەکدارەکاندا . کە تیایدا لایەنگری هەبوو نەك هەر بەتەنها لە بەعسیەکان بەڵکو بە گشتی لە ریزی ئەفسەراندا. ئەحمەد حەسەن بەکر ئەفسەرێکی نموونەیی بوو لەگەڵێك رووەوە. گرنگی بە حەسانەوەی لایەنگرانی دەدا توانای بەکارهێنانی زمانی کۆلێژی سەربازیی هەبوو بۆ دروستکردنی خۆ نزیك کردنەوە لەگەڵ ئەفسەرانی هاوکاری سەرەڕای وتاری رادیکالی بەعس کە

بەکاریدەهێنا هەر کاتێك پێویست بوایە. کەچی لە بیروڕای خۆی پارێزگاربوو کە لەگەڵ باگراوندە گوندییەکەی دەگونجا تاڕادەیەك عروبی بوو بەلام تێر تێگەیشتن بوو بەو جیاکارییانەی کە ئەو و ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەران هەستیان دەکرد کە عەشیرەتە عەرەبە سوننەکان هەیانبوو و لە هۆزە عەرەب و شیعە و کوردانی دیکە لە عێراق جیایان دەکاتەوەو بگرە لەوان گەورەتریان دەژمارد .

ئەحمەد حەسەن بەکر بەیارمەتی سەدام حوسێنی خزمەکەی دەستی بەسەر حزب و دەزگا سەرەکییەکانی هەوالگریی داگرت ، دەزگای تایبەت (دەزگای ئەمنیی سەربە حزب) و دەزگای ئەمنیی سەرۆکایەتی. سەرەڕای دەزگای ئەمنی دەوڵەت کە نازم گەزار سەرۆکایەتی دەکرد و یەکێك بوو لە پیاوەکانی سەدام حوسێن ، سەدام بەو پێیەی مەدەنی بوو شارەزای کاری نهێنی بەعسی و ئەندازەی شاری بەغدا بوو رشتبوو لەسەر کۆنترۆڵکردنی شەقامەکانی بەغدا بەیارمەتی میلیشیا حزبیە گەورەکەی کە نەیارانی ترساندبوو و وێنایەکی ئەوتۆی دروستکردبوو کە بریتیبوو لەوەی رژێمی نوێ پاڵپشتییەکی جەماوەری گەورەی هەیە. بەو شێوەیە جارێکی دیکە سیاسەتی سەرکوتکردنی کۆن گەڕایەوە سەر شانۆی سیاسی و هەڵمەتەکانی دەستگیرکردن لە پاییزی ١٩٦٨ دەستیپێکردەوەو شیوعی و ناسریەکان و بەعسیە جودابووەکانی کردە ئامانج سەرەڕای کەسایەتییە سیاسییەکانی پێشوو لەگەڵ ئەو سەرمایەدارانەی کە بۆچوونی رۆژئاواییان هەیە. لەهەمان کاتدا. پاکسازی لەنێو فەرمانبەرە مەدەنیەکانی دەوڵەت و لەریزی ئەفسەران لەنێو کەشوهەوایەکی پڕ لە سیخوڕی ترسناك بە بەهانەی پیلانگێڕی و ئیدیعای کودەتا دەستیپێکرد . هەندێك کەسی دیکەی نێو کۆمەڵگەی بچوکی جولەکەی عێراق و خەڵکی دیکە بەوە تۆمەتبار کران کە سیخوڕی بۆ ئیسرائیل دەکەن و هەندێکی دیکە بە بەکرێگیراوی شای ئێران تاوانبار کران. کەشوهەوای تەنگژکە بەهۆی ئەو دادگایکردنە کارەسات ئامێزانەی کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن نیشاندەدران و ئەو لە سێدارەدانانەی کە لە گۆڕەپانە گشتییەکانی بەغدا ئەنجامدەدران ئاڵۆزتربوو.

زیاترین ئەوانەی کە لەو رژێمە نوێیە دەترسان شیوعییەکان بوون کە هێشتا یادگارییەکانیان لە هەڵمەتەکانی سەرکوتکردن بەدەستی بەعسییەکان لەساڵی ١٩٦٣ زیندوو بوو. کەچی ئەحمەد حەسەن بەکر بە پێدانی چەند پۆستێکی وەزاری شاگەشکەی کردن لە ئابی ١٩٦٨. سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی ئەو دەستپێشخەرییەی رەتکردەوەو حزب نرخێکی گەورەیدا لە رێگەی هەڵمەتێکی رێکخراوی دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدان و زیندانیکردن. بەو شێوەیە یارییەکی سەیر دەستیپێکرد حکومەت تێیدا ناو بەناو حزبی دەچەوساندەو ئەو جارە خۆلێنزیکردنەوەی بەرامبەر نیشاندەدا، تا ئەو کاتەی ئەحمەد حەسەن بەکر لەساڵی ١٩٧٢-١٩٧٣ سەرکەوتوو بوو لە تێکەڵکردنی حزبی شیوعی عێراقی بە بەرەی نیشتمانی . بیروبۆچونەکانی ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حوسێن چەند هۆکارێکی لەپاڵدابوو. لە راستیدا هەردووکیان ئەوەیان بەبیردا دەهات کە دەیانویست رەزامەندی یەکێتی سۆڤییەت بۆ رژێمی نوێ بەدەست بێنن. بەتایبەتیش کەروسیا سەرچاوەی سەرەکی چەك و یارمەتییە بۆ عێراق سەرەرای ئارەزووەکانیان بۆ لێکرتازان و بۆشایی دروستکردن لەنێو خودی حزبی شیوعی عێراقی ویستیان رادەی هێزی جموجۆڵی حزبی شیوعی لە عێراق بزانن. لە راستیدا هێزەکانی ئەمن رێوشوێنی خێراو یەکلاکەرەوەیان دژی عەزیز ئەلحاج و حزبی شیوعی جودا خواز (سەرکردایەتی مەرکەزی) وەرگرت کاتێك جەنگێکی شۆرشگێرانەی میللی بەرپاکرد و هێرشی کردبووە سەر چەند بنکەیەکی پۆلیس و بانکەکان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٨دا. بەهاتنی نیسانی ١٩٦٩ عەزیز ئەلحاج و زۆربەی ئەندامانی گروپەکەی دەستگیرکران و ناوبراو بەئاشکرا رایگەیاند کە تۆبەی کردووە . بەڵام بە گوێرەی بەعسیەکان، شیوعیەت بووەتە رێچکەیەکی ئەفسانەیی و وێنایەکی لەرادەبەدەر بۆ هێزەکەی دروستکراوە. ئەحمەد حەسەن بەکر هیوادار بوو لە رێگەی بەئاشکرا کارکردنی حزب. حزبی شیوعی عێراقی خۆی لاواز بکات وەك ئەوەی لە سەردەمی قاسم کرا. رێگە بۆ رژێمی نوێ خۆشبکات کە ئەو بزوتنەوە لە ریشەوە دەرکێشێت.

ئەحمەد حەسەن بەكرو سەدام حوسێن لە بەرامبەر بەعسیە سۆزدارەكانیش دوودڵ و نیگەران بوون، كە هەر چەندە دژی حزبی شیوعی عێراقی بوون و لە بیرۆكەدا لایەنگیری گیانی رادیكاڵی حزبی بەعسی سوریا بوون بە سەركردایەتی سەلاح جەدید. ئەو كەسایەتیە ئایدیۆلۆژیانە ببوونە مەترسی لە سەر سەدام حوسێن و ئەحمەد حەسەن بەكر، چونكە ببوونە كۆڵەگەی پاڵپشتی بۆ ئەو بیرۆكانەی كە حزبیان لاواز كرد بوو لە ساڵی ١٩٦٣. ببووە نیمچە ئاستەنگێك لە بەردەم باڵكێشانی روو لە زێدەبووی سەدام حوسێن بەسەر دەزگای حزبی بەعس و شێوازی دارشتنەكەی. ئەو مەترسیە باڵی بەسەر ساڵانی یەكەمی رژێمی نوێدا كێشابوو. دواتر ئەو مەترسیە كاتێك نەما كە سەدام گرەنتی ئەوەی كرد كە حزب بوونێكی سەربەخۆی نییە لەو ئاراستەیەی كە خۆی بۆی داناوە.

لەو قۆناغەدا سەدام حوسێن ـــ سەرەرای باڵا دەستی لە نێو حزبدا ـــ نەیتوانی حزب وەك پێگەیەكی ململانێی حزبی و مەترسیەكی چاوەروانكراو وەلاوە بنێ. هەروەك كۆنگرەی قوتری حەوتەمی حزبی بەعس دەریخست. سەدام حوسێن و ئەحمەد حەسەن بەكر ناچاربوون پارێزگاری لەو پێكهاتە فراوانەی ئاراستەكانی نێو حزب بكەن. لەو ماوەیەدا ململانێیەكە لەگەڵ عەماش و حەردان تكریتی خۆی دیتەوە، كە تۆرەكانیان لە نێو رێزی هێزە چەكدارەكان گەورەترین مەترسی چاوەروانكراون. بەو شێوەیە چەپرەوەكانی حزب و حزبی شیوعی عێراقی وەكو یەك هاندران كە خۆیان ئاشكرا بكەن و زمانی سۆسیالستی رادیكاڵی باڵی بەسەر كۆنگرەی حەوت كێشا، بە توندی جەختی لە سەر مافی كرێكار و جوتیاران كردەوە. هەروەها باسی چاكسازی كشتوكاڵی زیاترو دامەزراندنی هاریكاری كشتوكاڵی زیاتری كرد. سەرەرای پێویستی جێبەجێكردنی بنەماكانی سۆسیالیستی بە شێوەیەكی قووڵتر لە عێراق. لە هەمان كاتدا ئەو دامەزراندنانەی كە لە سەركردایەتی قوتری حزب ئەنجامدران ئاماژەی بە گەورەبوونی بارستایی رەوتی چەپرەودا، كە لە بنچینەدا عەبدولخالق سامەرائی نوێنەرایەتی دەكرد. كە حزب بە ئامرازی گۆران بەرەو سۆسیالیستی دادەنا. هەندێك كەسایەتی دیكە

هەبوون لـە گۆڕەپانەکـە سـەریانهەڵدەدا، وەك تـەها یاسـین رەمـەزان جـەرزاوی و عیزەت ئیبراهیم دوری، کە زۆر نزیکیبوون لە سەدام حوسـێن، بـەبێ ئـەوەی هـیچ پەیوەندییـەکیان بـە حـزب هـەبێت تـەنها لـە رێگـەی ئـەودا نـەبێت. دواتـر رۆڵ و گرنگیان زیادیکرد کە لە تشـرینی دووەمـی ١٩٦٩دا لـە ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش دامـەزرێنران. لـە هـەمان کاتـدا سـەدام حوسـێن بـە جێگـری سـەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دامەزرێنرا، کە دووەم گرنگترین پۆستی دەوڵەت بوو. هەروەها نیشانەیەك بوو بـۆ پاشەکشـەکردنی کەسـایەتی حـەردان تکریتـی و عەماش. تکریتی مەترسیەکی تایبەتی هـەبوو. بـەو پێیـەی وەزیـری بـەرگری بـوو جێگـری سـەرکردەی بـاڵا بـوو، هەوڵیـدەدا پیـاوانی خـۆی لـە پۆسـتی هەسـتیاردا دابمـەزرێنێت و پشـتی بـە عەشـایەرەکانی تکریـت دەبەسـت. سـەرەڕای عەرەبـە سـوننەکانی بـاکووری رۆژئـاوای وڵات. بـەڵام لەگـەڵ تکریتیـەکانی دیکـەو عەشایەرەکانی موسڵ و سامەڕاو رومادی روو بەروو بووەوە کـە ئەحمـەد حەسـەن بـەکر هانیـدەدان بۆ لـەناوبردنی هـەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی ئـەو هەژموونـەی هەردوو عارفی برا کەماوە.

ئەو ململانێیە تاڕادەیەکی زۆر لەرای گشتی شاردرا بووەوە، بـەڵام هەنـدێك رووداو ئاماژەیان پێدا. بە تایبەتیش بۆ لە ئەفسەرانی سوپا، لـەبارەی توانـاو هەولـەکانی سەرجەم گروپ و رەوتەکان. ئەوەش بە پێی رۆڵـی خـۆی کاردانـەوەی هـەبوو کـە بووە هۆی کەمبوونەوەی هەژموونی دۆڕاوەکان و رێگە بۆ ئەحمەد حەسـەن بـەکرو سەدام حوسـێن خۆشـبوو و هـەلی زیاتریـان بـۆ رەخسـا. لـە مـاوەی سـاڵی ١٩٧٠. هەریەك لە حـەردان و عـەماش لـە پۆسـتە وەزارییـەکانیان لادران، دواتـر حـەردان تکریتی دوور خراوە و پاشانیش لە ئاداری ١٩٧١ لە کوێت تیرۆرکرا. بەڵام عـەماش لەو چارەنووسە رزگاربیوو تەنها دوورخرایەوە لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس. هەروەها نازناوی جێگری سەرۆك کۆمـاری لێ سەنرایەوەو وەك باڵیۆز نێردرایە یەکێتی سۆڤیەت.

بەو شێوەیە هەریەك لە ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن دەسەڵاتی خۆیان لە دەوڵەت بە هێزتر کرد. هیچ جیاوازیەکی ئایدیۆلۆژی روون لە نێوان ئەوان و نەیارەکانیان نەما. هەروەها لە سەر زۆر پرس جیاوازیان نەبوو، لەوانە کێ لە سەرووی حزب و دەوڵەت بێت، خەڵکی مەدەنی یا سەربازیی . سەدام حوسێن ویستی وەك ئەحمەد حەسەن بەکر حزب لە یەك کاتدا پاڵپشتیەکی نەرم و یاسای دابین بکات. واتە بێتە گۆرەپانی دیالۆگ و پێگەیەك بێت بۆ ئاراستەکردنی هەندێك تۆمەتی چاوەروانکراو بۆ خودی سەرکردایەتی. سەبارەت بەوان حزب درێژە پێدەری هەژموونی کەسێتیان بوو، ئەویش لە رێگەی سیستەمێکی خۆ خۆلێنزیکردنەوە کە تەنیا ئەوان دەیانتوانی بەرێوەی ببەن. لێرەدا دەسەڵات لە نێو دەستی کەسانێك دایە کە توانیان بازنەیەکی تەسك لەو کەسانە بەکاربێنن کە جێگەی متمانەن، نەوەك لە پێناو بیرۆکەیەکی سود بەخش بەڵکو تەنها لە پێناو پرسی کەسێك کە چاکترین پێگەی هەیە بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندی گروپەکە ، لە بنچینەدا ئەو بەرژەوەندیانەش ماددی بوون . کە سامانی پێویستی بۆ خاوەنەکانیان دابین دەکرد کە بۆ پاڵپشتیکردنی تۆرەکانیان و لایەنگرانیان پێویستیانە و پێگە و پایەی کۆمەڵایەتی ئەوانی دیاریکردووەو بەهێز کردووە . ئەوە پێوەرێکی هەستپێکراو بوو لە ناسنامەی کۆمەڵایەتی کە سێتیان ، کە لەگەڵ بنچینە و بنەمای پێشتردارێژراوی ئەو کەسانە دەگونجێت کەلای ئەوان گرنگن.

لە تێروانینێکی پێوەری و براگماتیەوە، کەسە گرنگەکان لەو بوارە ئەوانەن کە باگراوندی گوندییان هەیە. کە هەریەك لە ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حوسێن لێوەی هاتوون و زۆربەی جاریش پەیوەندی لاواز لە چوارچێوەی عەشایەری گردبوونەوەی بە ژمارە گەورە لە هۆزی ئەلبوناسر لە تکریت لە یەکتری نزیك دەکردنەوە. ئەو هۆزە کە پێکهاتبوو لە ٢٠ هەزار کەس و بریتی بوو لە تۆرێکی ئامادەی پەیوەندیکردن کە ئەندامەکانی چاوەروانبوون تایبەتمەندییان پێبدرێت و سودیان پێبگەینرێت لە گەیشتنی یەکێك لە ئەندامانی عەشیرەتەکەیان بۆ

دەسەلات. هەروەها گروپێکی باوەڕپێکراو بۆ خزمەتکردنی گەورەکانیان لە سەرتاپای دەوڵەت دەستەبەر دەکات. دەسەلاتی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن گەورەتر بوو . لەم بوارەدا بەهێنانی ئەندامانی دیکە لە هۆزە عەرەبە سوننەکانی هاوپەیمان لە باکووری رۆژئاوا بۆ ئەو تۆرەی کەدەکرێ پشتی پێببەسترێت بۆ بەرگریکردن لەو سودانەی کە پێیان دەگات .

سەرچاوەی زانیاری و لایەنگرانیان تەنیا لەو گروپە هۆزگەریی دێهاتیانە نەبوو ، سەرەڕای ئەوەی لە هەندێك بواری کارگێڕیدا بەئاشکرا دەرکەوت بوو . بە تایبەتی لە دەزگای سەربازی و دەزگای ئەمنیدا. بەڵکو هەندێك کەسی گرتەوە کە وەفای کەسێتی خۆیان لە کاتی کودەتاکانی حزب دەرخستبوو لەو کاتەی حزبی بەعس ئۆپۆزسیۆن بوو. هەروەها لە ماوەی مانگە پڕ لە پشێویەکانی حوکمی بەعسی لە ساڵی ١٩٦٣دا. بەو شێوەیە بە سیستەمێکی دەسەلات تێکەڵکران کە پەیوەندی خانەوادەیی و عەشایەری و باگراوەندە هاوبەشەکانیان لەگەڵ سودمەندە سەرەکیەکان بەهێزی کرد بوو. بەشێك لە داهاتی دەوڵەتیان بۆ بەکرێگیراوانی خۆیان تەرخانکرد و بەعسیان بەکارهێنا بۆ راییکردنی کارێکی بۆ کۆمەڵ. لە ژێر سایەی ئەو بارودۆخە، ناکرێت بە وردی ئەو تێڕوانینە دیارییبکرێت کە ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن پێکیانهێنابوو. نقوومبوونیان لە چەمکە پیلانگێڕی و عەشایەرییەکانی خۆیان لە سیاسەتی دەوڵەت وایلێکردن نەرمیەکی رێژەیی بنوێنن لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە مەترسی راستەوخۆیان نیە. ئەوەش بوارێکی فراوانی مانۆری بۆ رەخساندن.

## تەحەدیەکانی کورد و شیعە و پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێران

لەگەڵ ئەو تەنگەژانەی رووبەڕووی رژێمی نوێ دەبوونەوە نیشانەکانی چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو تەنگژانە بە روونی دیاربوون و دیارترینی ئەو تەنگژانەش مەسەلەی کورد بوو . لە تەمموزی ١٩٦٨ ئەحمەد حەسەن بەکر سێ وەزیری کوردی دامەزراند. دوانیان سەر بە بارزانی بوون و ئەوی دیکەیان سەربە باڵی

تاڵەبانی بوو لە پارتی دیموکراتی کوردستان. ئەوەش بوو کە دەرگەی دانوستانی کردەوە. بەڵام رێگەشی بۆ ئەحمەد حەسەن بەکرو هاوڕێکانی خۆشکرد تا ئەو گروپانە دژی یەك بوەستێننەوە. لە ماوەی مانگێکدا وەك نارەزایی دەربڕین هەردوو لایەنگرانی بارزانی دەستیان لە کارکێشایەوە، دانوستاندن بەردەوام بوو. بەڵام بارزانی خۆی بۆ دەرخستنی توانای سەربازیی ئامادە دەکرد. لە کانونی یەکەمی ١٩٦٨دا شەڕێکی توند بەرپا بوو. کۆنگرەی حەوتەمی بەعس بەڵێنیدا، دوای مانگێك، بگەڕێتەوە سەر راگەیاندنی سەربەخۆیی زاتی کە ساڵی ١٩٦٦ بڕیاری لە سەر درابوو، ئەوەش بارزانی هاندا کە فشارەکانی دووبەرابەر بکات، لە هەمان کاتدا پشێوی توندی پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێرانی قۆستەوە. لە ئاداری ١٩٦٩دا هێزەکانی بارزانی هێرشێکی توندییان کردە سەر کەلوپەلە نەوتیەکانی کەرکوك و بەرهەمهێنانی نەوت لە عێراق بۆ چەند رۆژێك وەستا.

حکومەتی بەغدا بەرپەرچی رەوشەکەی دایەوەو لە هاوینی ساڵی ١٩٦٩دا هەڵمەتێکی سەربازیی دەستپێکرد بەڵام بەپەلەش دەستی بە دانوستانی نهێنی لەگەڵ بارزانی کرد . بە گوێرەی ئەحمەد حەسەن بەکر سەرەڕای لە یەکتر نزیکی ئایدیۆلۆژی باڵەکەی تاڵەبانی لەگەڵ هەندێك لە هزرەکانی بەعس ، هەر بارزانی نوێنەری راستەقینەی دەسەڵات بوو لە کوردستان. دانوستانە نهێنیەکان کە سەدام رابەرایەتی دەکرد بەیانی ئاداری ١٩٧٠ی لێکەوتەوە. کە تێیدا حکومەت دانی بەمافی کورد نا بە شێوەیەك کە نەرمی نواندنی وای تێدابوو پێشتر نەکرابوو. دان بە ناسنامەی نەتەوەیی تایبەتی کورد و زمانی کوردی نرا، هەروەها پەیمانیان پێدرا کە بەشداری لە حکومەت بکەن و زۆرینەیان هەبێت لە کارە ئیدارییە نێوخۆییەکاندا. هەروەها بەڵێنیان پێدرا ناوچەیەکی کارگێڕی یەکگرتووی تایبەت دابمەزرێنرێت و رێوشوێنی تایبەتی تێدا جێبەجێ بکرێت و لەسەر سەرجەم ئەو ناوچانە پەیڕەو بکرێت کە کورد تێیدا وەك زۆرینە دەژی، ئەوەش بە پێی سەرژمێرییەك کە دواتر ئەنجامدەدرێت. دواتر لێژنەیەکی هاوبەش لە نوێنەرانی

حکومەت و کورد پێکهێنرا بۆ ئەوەی گفتوگۆی تێرو تەسەل لەسەر بنەماکانی بەیاننامەکە بکەن لەماوەیەکدا کە تاکو ساڵی ١٩٧٤درێژە دەکێشێت.

بارزانی لەلایەن خۆیەوە، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران پچڕاند، هەروەها فەرمانی ئاگربەستی دا و دەستی بە هاوکاری کردنی لیژنە نوێیەکە کرد. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا متمانەی بە حکومەت نەکرد. هێزی پێشمەرگەی وەکو خۆی هێشتەوە و چاوی بەرامبەر بەغدا کردەوە. لەو کاتەدا. لیژنە هاوبەشەکە پلانی لە پێناو یاسادانان و پرۆگرامی خوێندنی کوردی لە قوتابخانەکان دانا لەگەڵ هەندێك ڕێوشوێنی سەربەخۆیی زاتی ئیداری. بەلام کاتێك سەدام حوسێن سەرۆکایەتی لیژنەکەی گرتە دەست لە ئاياری ١٩٧١دا . بە ئاشکرایی دەرکەوت پرسە سەرەکییەکانی پەیوەست بە بەرگری و دارایی و نەوت لە دەرەوەی تاوتۆکردنە. بە تایبەتیش ئەوە لەسەر چواردەورەی کەرکوك جێبەجێ کرا. حکومەت ڕشتبوو لە سەر ئەوەی کێڵگە نەوتیەکانی لە دەرەوەی کۆنترۆڵی کورد بهێڵێتەوە. دواتر چەند هەوڵێکی تیرۆرکردنی بارزانی ساڵی ١٩٧١ وایکرد بارزانی متمانەی زۆر بە حکومەت کەم بێتەوە. لەبەر ئەو گومانە بە هێزە لە ئەگەری ئەوەی سەدام حوسێن دەستی لەو هەوڵانە هەبووە. بارزانی جارێکی دیکە کەناڵەکانی وتووێژی لەگەڵ دەسەلاتدارانی ئێران لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٢ دەستپێکردەوە و ئەگەری دەستپێکردنەوەی ڕووداوێکی سەربازیی لە ئایندەدا پێشبینی دەکرد.

پشێوی پەیوەندییەکانی عێراق و ئێران لەگەڵ دەستپێکردنی سەردەمی ڕژێمی نوێ سەریهەڵدابوو. شا وتاری سۆسیالیستی و نەتەوەیی و عەرەبی حکومەتی بەعسی هەر بە ڕواڵەت ، وەرگرتبوو. بەلام دەربڕینە ڕزگاریخوازە یەکگرتووەکان لەبارەی عەرەبایەتی ویلایەتی خۆزستانی ئێرانی شێوەیەکی هەستپێکراوتری گرتەخۆ کاتێك کە گروپە بچوکە جوداخوازە عەرەبیەکەی خۆزستان خۆیان لە عێراق داڵەدا. سەرەڕای ئەوەی نەبووە مایەی هەڕەشە لەسەر وڵات. بەلام بوونیان تووڕەیی شای دەوروژاند. جگە لەوە وتاری سۆسیالیستی ڕژێمی بەعس کە گرێدرا بوو بە پەیوەندییەکی دروستبوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت ئەوەیان

دەرخست کە هێزێکی دژ لەسەر کەناری کەنداو دروستبووە. لە کاتێکدا ئێران دوای کشانەوەی بەریتانیا خۆی بەدەستڕۆیشتووی هەرێمەکە دەزانی لە ساڵی ١٩٧١دا. لە هەمان کاتدا، رژێمی نوێی عێراق لاواز دەردەکەوت. وا پێدەچوو بەعسیەکان هاوپەیمانی زۆریان نەبێت لە عێراق و جیهانی عەرەبی، ئەوەش لە هەڵمەتەکانیان بۆ سەر نەیارە سیاسیەکانیان دەرکەوت. هەروەها بەهۆی ئەو گیانی جودا خوازییە روونەی کە لە نێو رێزەکانی ئەفسەرە عێراقیەکان هەبوو، هێزە چەکدارەکانی لاوازکرد بوو، کە بەهەموو شێوەیەك بەشەڕی کوردەوە سەرقاڵبوو.

سەبارەت بە ئێران. حکومەتی عێراق لاواز دیاربوو، بەڵام لە هەمانکاتدا وتارەکەی مەترسیداربوو. ئەوەش شای هاندا لە شوباتی ١٩٦٩دا جارێکی دیکە پرسی سنوری هاوبەش بخاتەوە ڕوو. داوایدەکرد هێڵی ناو قولایی شەتولعەرەب درێژەبکرێتەوە. هەر زوو پەیوەندییەکان پشێویان تێکەوت، لەمانگی نیساندا. ئێران سەرپێچی لە پەیماننامەی شەتولعەرەب ١٩٧٣ کرد. پڕوپاگەندەکانی عێراقی سەبارەت بە سەروەری بەسەر شەتولعەرەب پشتگوێخست و بەشێوەیەکی گەورە دەستی بە یارمەتیدانی کورد کرد. عێراق هیچ رێگە چارەیەکی بە دەستەوە نەبوو، بەهۆی لاوازیی سەربازیی بەرامبەر ئێران. جوداخوازەکانی (خۆزستان) کە ناوە ئێرانیەکەی (عەرەبستان)ە بە بەراورد لەگەڵ کورد هەڕەشەیەکی ئەوتۆیان پێکنەدەهێنا. هەروەها ئەحمەد حەسەن بەکریش لە هەوڵێکی بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی جەماوەری و پیاوانی ئایینی شیعەو سوننە لەسەر کێشەی عێراق و ئێران سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە کەوتە نێو ململانێیەکی روو لە زیادەبوون لەگەڵ گروپەکانی کۆمەڵگەی شیعە لە سەر سروشتی رژێمی عێراق. ساڵی ١٩٦٨ سەرکوتکردنی بەعسی بۆ شیوعیەت هێنایەوە بیر. بەڵام رادەی هێزی سۆسیالیستەکانیشی لەناو حزب هێنایەوە یاد . هەروەها هەر لە سەرەتاوە دیاربوو کە رژێمی نوێ کەوتووەتە ژێرباڵی هۆزەکانی ئەفسەرانی سوننە مەزەبی سوپا کە هیچ جیاوزییەکیان لەگەڵ ئەوانەدا نیە کە حوکمی عێراقیان کرد بوو

لەسـەردەمی رابـردوو. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەحمـەد حەسـەن بـەکر کەسـایەتیەکی بۆخۆی دروستکرد بوو لە پابەندبوون بە ئایین و پاکی و پیاوانی ئایینی هەستیان بە رەزامەندی کرد بەو پێیەی ئیسلام ئایینی دەوڵەتە لە دەستوری کاتیدا.

بـەڵام هـەر هیوایـەك لـەو بـوارەدا هـەر زوو بـەهۆی پشـت بەسـتنی حکومـەت بـە پـەیرەوکردنی شـێوازی سۆسیالیسـتی کـە زۆربـەی خـۆی لـە نێـو وتارەکانـدا دەبینیەوە بە شـێوەیەکی روو لـە زێدەبوون بـە هـەدەر دەچـوو. لەگـەڵ هەنـدێك دیاردەی هەستپێکراو، وەك راگرتنی قەرەبووی زەویە دەست بەسەردا گیراوەکانی کانونی دووەمی ١٩٦٩و، دامەزراندانی کەسانی سەربە باڵی چـەپی عـەلمانی حـزب لە پۆستە گشتییەکان. لە بەرامبەردا ئەو رووە راگەیـەنراوە کـە شـێوازی عـەلمانی دەسەڵاتی پێـوە دیـاربوو. لەبەرامبـەردا شـێوازێکی کـەمتر عەلمانیـەتی حکومـەت هەبوو کە پشتی بە تۆرەکانی خزمایەتی نێو کۆمەڵگەی عەرەبی سوننە لە باکوری رۆژئاوای عێراق دەبەست. لە بەرامبـەر ئەو باگراوەنـدە دێهاتیـەدا رێبـازی سیاسـی لەسەر بنەمای تەواو جودا لـەوەی کـە لـە ئیسـلام وەرگـیراوە بنیـاتنرابوو. رەنگـە ئەوە بـۆ هەنـدێك بـواری میللـی غـەیرە ئـایینی گونجـاوبوو. بـەڵام سـەبارەت بـە زانایانی ئایینی پێشڤەچوونێکی ئاگادار کەرەوەی رەشبینی پێکهێنا بوو.

بەو شێوەیە هەر زوو نـاکۆکی سـەریهەڵدا. لـە نیسـانی ١٩٦٩دا ئەحمـەد حەسـەن بەکر هەوڵیدا گەورە زاناکان رازی بکات لەوانە ئایەتوڵلا موحسین ئەلحەکیم، داوای لێکـرد بـە ئاشـکرا سـەرەکۆنەی حکومـەتی ئێـران بکـات لـە هەمبـەر کێشـەی شەتولعەرەب. کاتێك ئەلحەکیم ئەوەی رەتکردەوە. ئەحمەد حەسەن بەکر زنجیرە رێوشوێنێکی گرتە بەر لە هەمبەر کەسایەتیە ئاینیـەکان لـە عێـراق و ئێـران وەکـو یەك. قوتابیانی ئایینی ئێران دەستگیرکران و دەرکران و زانکۆی کوفەی سەربەخۆ لە نەجەف داخرا و موڵکەکەشی دەستی بەسەرداگیرا. دواتر نزیکەی ٢٠,٠٠٠ کـەس بە بەهانەی ئەوەی بە رەسەن ئێرانین بە پەلە دەرکران و لە رێگەی سنور رەوانەی ئێران کران. ئەو هەڵمەتەی سەرکوتکردن لە چەوساندنەوەو ئازاردانی شیعەکان لـە ژێر دروشمی ریشەکێشـکردنی (مەترسـی شـیعە) بـووە هـۆی نـارەزایی دەربڕینـی

زانایانی ئایینی شیعە. لە حوزەیرانی ١٩٦٩دا . ئایەتوڵڵا موحسین ئەلحەکیم ڕێپێوانێکی نارەزایی لە نەجەف بۆ بەغدا سازکرد تیایدا بە هەزاران شیعە بەشداریان تێداکردو پاڵپشتی خۆیان بۆ دووپاتکردەوە. قەوارەی ئەو نارەزاییە دەسەڵاتدارانی ترساند بە رادەیەك گەیشتە ئەوەی هێزەکانی ئەمن کوڕەکەی سەید مەهدی ئەلحەکیم بە تۆمەتی سیخوڕی بۆ ئیسرائیل دەستگیر بکەن. دواتر ئەو تۆمەتە هەڵبەستراوە بەکارهێنرا بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەن بەخەڵکی سەردانی ئایەتوڵڵا بکەن. بەڵام ئەوە نارەزاییەکانی نەوەستاند کە ئەو جارە لە ڕێگەی نووسینی داواکاری و یاداشت دەردەکەوت. داوا دەکرا سنورێك بۆ هەڵمەتەکانی دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدان دابنرێت و دەرکردنی ئێرانیەکان رابگیرێت و چیدیکە دەست بەسەر موڵك و سامانیان دانەگیرێت. کە ڕژێم بە نەیارانی خۆی دادەنان .

لە بەرامبەردا حکومەت بە دەستگیرکردنی زانایانی ئایینی وەڵامی دایەوە. ئەو زانایانەی دەستگیر دەکرد کە بە بوێری نارەزاییان لە بەرامبەر دەستگیرکردنی خەڵك و هەروەها زانایەکی ئایینی سوننەشی لە سێدارەدا . کە شێخ عەبدولعەزیز ئەلبەدری بوو، کە پاڵپشتی خۆی بۆ ئەلحەکیم لە یەکێك لە مزگەوتەکانی بەغدا دەربڕیبوو. جگە لەو ڕێوشوێنە وەقفە ئایینیەکان لە نەجەف دەستیبەسەرداگیرا و قەدەغەکردنی مەوکیبە ئاینییەکان و داخستنی قوتابخانە ئیسلامیەکان لە زۆربەی ئەو شارانەی کە زۆربەی دانیشتوانیان شیعەن بەدوا داهات . حکومەت ترسی لەو بەرە ئیسلامیە هاوبەشە هەبوو کە پێدەچوو لە نێوان سوننە و شیعەدا پێکدێت ، بەعس لە ئیدیعاکانی پێشووتری پاشکەزبووەوە کە گوایە ڕێز لە بنەماکانی ئیسلام دەگرێت، دواتر خوێندنەوەی قورئان لە میدیاکانی حکومەت قەدەغەکرا. هەروەها گوتنەوەی ئاین لە قوتابخانە حکومیەکان راگیرا. بێگومان ئەو ڕێو شوێنانە، نارەزایی فراوانی لێکەوتەوە. پاشانیش کاری توندوتیژی و خۆپیشاندانی بەدواداهات. کە لەناوچەکانی باشور بۆ چەند ڕۆژێك درێژەیان کێشا. بە تایبەتیش لە نەجەف و کەربەلا و بەسرە. بەڵام هێزە ئەمنیەکان بە توندی

سەرکوتیان کردن. لە ئاکامدا ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم لە فەتوایەکدا بە ئەندامبوون لە حزبی بەعسی بە حەرام لە قەڵمدا. کوڕەکەشی کە تازە ئازادکرا بوو، پێی باشبوو رابکات و لە دوورە وڵاتدا ژیان بەسەر ببات.

سەرکوتکردنی زانایانی ئایینی شیعە لەلایەن حکومەت بەردەوامبوو، سەرەڕای پەلاماری هێزەکانی ئەمن بۆ کەسە نەیارەکانی سەر بە گروپە ئیسلامیە جۆراوجۆرەکان. لە ساڵی ۱۹۷۰دا ئەو رێوشوێنانە گەیشتە ئەو پەڕی. کاتێك دەزگای ئەمن ئیدیعای ئاشکرا کردنی پیلانێکی بۆ روخاندنی حکومەت کرد، کە گوایە ئێران لە پشتیەوەیە. ئەوە کرا بەهانەیەك بۆ پرۆسەیەکی پاکسازی و دەستگیرکردن و لە سێدارەدان لە دژی ئەفسەرو ئەو فەرمانبەرانەی کە گومانیان لێدەکرێت سەربە بەعس نەبن. سەرەڕای چەند پیاوێکی ئایینی کە بە پێی بۆچوونی ئەمن سەربە گروپی ئیسلامی سوننەو شیعەن. وەك ژەنەراڵ موحسین ئەلجەنابی و ژەنەراڵ محمد فەرەج. لەگەڵ ئەوەشدا دەرکردنی ئێرانیە نیشتەجێکانی عێراق هەر بەردەوامبوو. کە زۆر کەس وای بۆ دەچوون ئەوە هێرشێکی راستەوخۆیە بۆ سەر تایەفەی شیعە. بەتایبەتیش دانیشتوانی شارە شیعیەکان زیاتر دووچاری گومان دەبوونە لە بە ئەندامبوونیان لە گروپە ئۆپۆزسیۆنە چالاکەکان وەك حزبی دەعوەی ئیسلامی شیعی.

مردنی ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم لە هاوینی ۱۹۷۰دا رێگەی بۆ یەکێك لە دامەزرێنەرانی دەعوە خۆشکرد. سەید محمد باقر ئەلسەدر کە زیاتر دەربکەوێت. بەوەی زۆربەی لایەنگرانی ئەلحەکیم پاڵپشتیان ئاراستەی ئەو کرد. زۆربەی گەورە زانا ئایینیەکان پێیان وابوو بیروبۆچوونە رادیکاڵیەکانی ترسناکن، سەرەڕای هەندێك کەس دوورە پەرێزیان هەبوو لەوەی کە زۆر چالاکانەتێکەڵ بەکاری سیاسی دەعوا و شیکردنەوەی بوێرانەی فیقهی ئیسلامی دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا پاڵپشتیەکی زۆری بەدەستهێنا. کەچی هەندێکی دیکە لەسەر ئەوە مانەوە کە پاڵپشتی ئایەتوڵڵا ئەبولقاسم ئەلخوئی بکەن، کە بەوە ناسرابوو خۆی لە جیهانی سیاسی بە دوور دەگرت. هەندێکی دیکە بەو گفتوگۆو راجیاوازانەی نێوان زانایانی ئایینی و

کەسانی ئاسایی کاریگەر بوون کە باڵی بەسەر نێوەندەکانی خوێندن لە نەجەف و کەربەلا کێشابوو.

ئەو گفتوگۆو راجیاوازانە کە پەیوەست بوون بە پرسەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و رێکخستنی ئیسلامی گونجاو بۆ ئابووری و سروشتی دەسەلاتی ئیسلامیی راستەقینە لە بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی سیاسی لەو کاتەدا لە سەرەتاکانی ۱۹۷۰ بەردەوامبوو، لەو بارەیەوە زانای ئێرانی دوورخراوە. ئایەتوڵڵا رووحەڵڵا خومەینی زنجیرەیەك موحازەرەی لەسەر حوکمی ئیسلامی لە نەجەف پێشکەشکرد. تیایدا داوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی کرد، هەروەها جەختی لەسەر رۆڵی سیاسی رابەرایەتی پیاوانی ئایینی لەو دەوڵەتە کردەوە. سەرەڕای دوژمنایەتی بۆ شای ئێران کە فەرمانی دوورخراوەیی خومەینی دابوو (بەو هۆیەوە حکومەتی عێراق بە هەندێك لێبوردەییەوە راوبۆچوونەکانی وەرگرت)، بەڵام باسی پرسێکی دەکرد کە بەردەوام مایەی نیگەرانی بوون. کە پەیوەست بوو بە ئایندەی ئیسلام لە جیهانێك کە دەسەلاتی دونیایی بەسەریدا زاڵە و بنەما دیاریکراوەکانی ئیسلام پەیرەوناکرێت. لە راستیدا ئەو نیگەرانیە لە زۆر رووەوە لە خەمی تایەفی ئاسایی شیعەی تێپەڕاند. سەدر هەوڵیدا بانگەوازەکەی سەرجەم موسوڵمانان بگرێتەوە. بەڵام رەوشی تایبەتی شیعەکانی عێراق کە لە وڵاتێکدان عەسکەری سوننە حوکمیان لە دەستە. تەنگژەکەی توندترکرد و گۆڕو تین و رەواجێکی زیاتری دایە پەیامەکەی.

پیاوانی ئایینی شیعەو ئەندامانی تایەفە کە گرنگیان بە پرسەکە دەدا، بەرێژەیەك بێ دەسەلات بوون لە بەرامبەر ئەو هێزەی رژێم کە رووبەروویان دەبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا. توانای هەندێك کەسایەتی شیعە بۆ سەپاندنی رێزی خۆی و پەیرەویکردنی دەسەلات لە چوارچێوەی تایەفەدا بە روونی مەترسی رژێمی وروژاند کە پشتی بە ناوچەیەکی تەنگ دەبەست لە ناوچە سوننیەکانی باکوری رۆژئاوا. ساڵی ۱۹۷۲ خودی ئەلسەدر دەستگیرکرا، بەو پێیەی سەرکردەیەکی شیعە بوو خاوەن پێگەیەکی دیاریکراو بوو. چالاکوانێکی سیاسی بوو سەرنج

ڕاکێشیی سنوری تایەفەی تێدەپەڕاند و ڕژێم گومانی زۆری لێدەکرد. لە ڕاستیدا توانا شاردراوەکانی ئەو جۆرە کەسانە لە هاریکاری کۆمەڵایەتی بوونە جێی تێڕوانینی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن. هەردووکیان وەك حاکمەکانی پێشووی عێراق هەوڵیاندا هەندێك لە داهاتەکانی حکومەت بە شێوەیەکی گشتی بدەنە کۆمەڵگەی شیعە. هەندێك تایبەتمەندی بدەنە چەند خانەوادە و کەسایەتیەکی دیاریکراوی شیعە لەوانەی کە دەستیان دەڕوات. بەو شێوەیە تۆڕێکی خۆلێنزیکردنەوە سەریهەڵدا کە ژمارەیەکی زۆر شیعەی خستە نێو بازنەی ئەو کەسانە کە بەشێوەیەك لە شێوەکانی لەگەڵ ڕژێمی عێراق کاریان دەکرد.

## مەحسوبیەتی ئابووری، کۆنترۆڵی سیاسی و لاگیریەکانی سیاسەتی دەرەوە

بنەمای مەحسوبیەتی بژاردەیی لە سەر هەمو گەل جێ بەجێ کرا لە سەر هەموو کاروبارەکانی پەیوەست بە سیاسەتی ئابووری ڕژێمی نوێ. حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکر لەگەڵ سیاسەتی کشتوکاڵی و کۆمپانیاکانی کارو ئیدارەی گشتی ئابووری عێراق وتاری سۆسیالیستی ڕادیکالی بەکارهێنا. بەلام لە ڕاستیدا ڕشتبوو لەسەر ئەوەی سەرجەم ڕێنماییە ئابوریەکان بەرەو پتەوکردنی کۆنترۆڵی ئەحمەد حەسەن بەکر و لایەنگرانی بێت. بەو شێوەیە سیاسەتی سەرەکی ئابووری حوکم دوو شێوازی سەرەکی گرتە بەر. یەکەمیان تا ڕادەیەکی زۆر میللی بوو. خۆی لەوە دا بینیەوە لە ساڵی ١٩٦٩ قەرەبوو کردنەوەی زەویە دەستبەسەر داگیراوەکانی رەتکردەوە. ئەوەش سودمەندانی دڵخۆشکرد کە جارێکی دیکە زەویەکان دابەشدەکرێتەوە کەمێك لەو بارە قورسەی دارایی کەمدەکاتەوە کە لە قەرەبوو کردنەوەی زەویەکان کەوتبووەوە هەروەها بەمەش بەشێکی گرنگی لە بەشەکانی خەرجی حکومەت نەهێشت. سەرەڕای ئەوانە پاڵپشتی کەل و پەلە سەرەکییەکان کرا. لەگەڵ پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکی سنورداری کۆمەلایەتی ، هاوکات رسوماتی باج کەمکرایەوە. ئەو ڕێوشوێنانە پێشڤەچوونی

بەخۆیەوە نەدیت تا ئەوکاتەی. دەرامەتێکی زۆر بە هۆی داهاتی نەوت لە ناوەڕاستی حەفتاکان، دابینکرا. بەڵام وێنایەکی دروست کرد لەوەی حکومەت بە شێوەیەکی گشتی گرنگی بە خۆشگوزەرانی ئابووری گەلی خۆیدەدات.

لەلایەکی دیکەوە، وەبەرهێنانی کشتوکاڵی زیادی کرد، لە ئایاری ۱۹۷۰دا چاکسازی کشتوکاڵی ئاڵۆزتر هاتە ئاراوە بەو ئومێدەی چارەسەری هەندێك ئەنجامی نیگەتیڤانەی چاکسازیەکانی پێشوو بکات. وەك لە بەر چاو گرتنی پەیوەندی جۆری زەوی بە (سیستەمی ئاودێری) و قەوارەی موڵکدارییەتی ڕێگە پێدراو. هەروەها هەرەوەرزییە کشتوکاڵیەکان دامەزرێنراو جوتیاران ناچارکران ببنە ئەندام بۆ ئەوەی ئەو یارمەتیانە وەربگرن کە حکومەت دەیبەخشێت. وەك تۆو پەینی کیمیاوی و شتی دیکە، کە حکومەت بەکاریهێنا بۆ ئەوەی لە کەرتی کشتوکاڵ وەبەرهێنان بکرێت. لە هەمان کاتدا چەند کێڵگەیەکی بەکۆمەڵ دامەزرا بۆ ئەوەی ئەندامە چەپڕەوەکان ڕازی بکرێن لە حزب، کە ئەحمەد حەسن بەکرو سەدام وایان دەبینی پێویستە لەو کاتەدا خۆیان لێنزیك بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی ئەندامانی کەمبوو. دەرکەوت ئەزموونی جێبەجێکردنی بنەماکانی بە کۆمەڵ لە عێراق ئەنجام و دەرهاوێشتەی سیاسەتێکی ڕەمزیە کە لەسەر ئاستی خاوەن پۆستە گەورەکان لە ڕژێمدا دەکرێت نەك بەهۆی سیاسەتێکی هەڵقوڵاو لە بڕوایەکی ئایدیۆلۆژی. بەڵام ڕێوشوێنەکانی دیکە کەلەو کاتەدا جێ بەجێ دەکران. نەیتوانی سنورێك بۆ ئەو ڕەوشە کشتوکاڵیە روو لە پشێویەی عێراق دابنێت. هەرچەندە سودێکی زۆری بە ژمارەیەکی زۆر لە موڵکدارە کشتوکاڵیەکان گەیاند. ڕێژەکانی بەرهەمهێنانی بەردەوام روو لە کەمبوون بوو. بەرامبەر بەو گەشەیەی دانیشتوانیش کە لە ساڵانی رابردوو روویدا. حکومەت ناچار بوو بڕێکی زۆرتری خواردەمەنی هاوردە بکات. لەگەڵ هاتنی سەرەتای حەفتاکان عێراق بووە هاوردەکارێکی تەواوی گەنم و نرخی خۆراکە هاوردەکان دوازدە بەرابەر بە گوێرەی سەرەتای شەستەکان زیادیکرد.

مسۆگەرکردنی یارمەتیـە خۆراکیـەکان و نەهێشـتنی گیرگرفتـە داراییـەکان لەسـەر شانی جوتیاران، سەرەڕای تێچوونەکەی. نیازێکی میللی و بـە شـێوەیەکی گشـتی کاریگەریەکی میللی هەبوو. بەڵام لەگەڵ ڕژێمی بۆماوەیی ئەحمەد حەسـەن بـەکرو لایەنگرانیشـی دەگونجـا. ئامانجیشـی لـەوەدا پێکهێنـانی بناغەیـەك بـوو بـۆ پاڵپشتییێکی میللی کە پشت بە ڕژێم ببەستێت، ئـەوەش لـە ڕێگـەی بـەکارهێنانی ئینتیقـایی دەسـەڵاتی ئـابووری کـە وای لێهـاتبوو بەسـەرکردەکانی ڕژێـم بەستراببووەوە. ئـەوەش خـۆی لەگـەلێك شـێوەدا بینیـەوە. دەستبەسـەرداگرتنی مۆڵکی نەیارە سیاسیەکان لەسەر ئاستێکی فراوانتر. دەستبەسـەرداگرتنی زەوی و زار هەلی زۆر گەورەی لە بەردەم سەرکردەکانی حوکم ڕەخساند کە داهاتی بەسـەر هەندێك باراندو هەندێکی دیکەشی لەو هـەنگاوە بـێ بەشـکرد. بـەهۆی نەهێشـتنی قەرەبووەکان خێرایی دابەشکردنی زەویەکان تارادەیەك زیـادیکرد. بـەڵام دەوڵـەت هەر بە گەورەترین خاوەن موڵکی کشتوکاڵی مایـەوە. بـەو پێیـەی کـە وەکـو یـەك موڵکـداری زەویـە دەستبەسـەر داگیراوەکـان و ئـەو زەویانـەش بـوو کـە بـەهۆی پرۆژەکانی ئاودێری نـوێ کشـتوکاڵیان تێـدادەکرد. لـە ئـەنجامی ئـەوەدا سـەرانی دەوڵـەت دەسـەڵاتێکی خۆلێنزیکردنـەوەی فراوانیـان پێکهێنـا، چ لـە ڕێگـەی دابەشکردنەوەی زەویەکان بێت یا لە ڕێگەی بە کـرێ دانـی زەویـە دەسـت بەسـەر داگیراوەکـان. سیاسـەتی خۆلێنزیکردنـەوە هـەر لەسـەر موڵکایـەتی زەوی چـڕ نەبووەوە، بەڵکو هاوکارییەکان شێوازێکی گرنگی لە شێوازەکانی دەستپێشتوویی کۆمەڵایەتی نواند. ئەویش لە ڕێگەی ڕێکخستنی بەرووبووم و دابەشکردنی پەیین و ئالیەتەکانی فرۆشتن.

هاوشێوەی هەموو ڕژێمەکانی پێشوو، حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکر ڕشتبوو لە سـەر ئـەوەی دەبـێ خـاوەن دەسـەڵاتەکان سـود لـە دابەشـکردنی زەوی و ڕۆڵـی دەوڵەت وەربگرن وەك گەورەترین خاوەن موڵکی کشتوکاڵی. لە ئـەنجامی ئـەوەدا کەسـە نزیکـەکان لـە سـەرکردایەتی سیاسـی بوونـە خـاوەنی ڕووبـەری زەوی زۆر فـراوان کـە پێشـتر عێـراق بەخۆیـەوە نـەبینیبوو، لـە وەتـەی پرۆسـەکانی دەسـت

بەسەرداگرتنی گەورە بەسەر زەویە فراوانەکان کە چینی بژاردە لە سەردەمی مەلەکیەت ئەنجامیاندا. بەو شێوەیە، لەگەڵ هاتنی ناوەڕاستی حەفتاکان، سێیەکی زەویە کشتوکاڵیەکانی عێراق هێشتا لە دەستی نزیکەی ٣٪ی خاوەن موڵکەکانە. کە گروپێك بوون تێ ئاڵابوون لە هاوبەشی تۆڕەکانی خۆلێنزیکردنەوەی سەر بەحکومەت. پشتیان بەو کەسانە دەبەست کە ڕێگەیان پێ دراوە سەروەت و سامان پێکبهێنن و بیپارێزن. ئەوەش بووە ئامرازێك بە دەست ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵگەی پێبکەن و ڕژێمیش لە دژی گروپە زیاتر رادیکالیەکان بەهێز بکەن. چ لەنێو حزب دابێت یان لە دەرەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەو سوودمەندانە بە هیچ شێوەیەك بڕوای تەواویان بە بنەماکانی بەعس نەبوو، بەڵام دانیان بەو سستەمی تایبەتمەندیەنا کە بەدەست کراوەیی پاداشتی کردن و ئەوانیش ڕێزیان لێنا.

هەمان ئەو سیاسەتەش لە بواری پرۆژەکانی کار پەیڕەوی دەکرا، سەرەڕای ڕژێمی سۆسیالیستی. هیچ خۆماڵیکردنێکی دیکەی سەرەڕایی لە بوارەکانی کاردا جێبەجێنەکرا. بەڵکو بەڵێندەرە تاکە کەسیەکان هاندران بۆ ئەوەی یارمەتی بودنیادنانی بنکەیەکی پیشەسازی لاواز لە عێراق بدەن. لە هەندێك بواردا ، وەك بەڵێندەرایەتی و بیناسازی، لەو قۆناغەدا چەند کەسێك دام و دەزگەیان دامەزراند. پەیوەندی پێویستیان گرێدا لە بواری کارە گەورەکان کە دەبێتە هۆی زێدە بوونێکی گەورەی داهاتی نەوت لە ناوەڕاستی حەفتاکان. بەڵام ئەو قۆناغە. ئەگەر بە شێوەیەکی کەمتریش دانانی ئەو بنەمایانەی بەخۆەدیت کە بەهۆیەوە سیاسەتی ئابووری بەکاردەهێنرێت بۆ بەهێزکردنی چەپۆکی سەرانی ڕژێم بەسەر چالاکیەکانی جیهانی کۆنتراکت کە ڕوولە فراوان بوو. ئەوە بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی سیاسەتی خۆلێنزیکردنەوە بەدیهات. کە بەڕەسمی سیاسەتی دەوڵەت ڕێگەی پێدابوو. بەڵام دیاریکردنی سوودمەندەکان هەر بەدەستی سەرانی دەسەلات مایەوە.

دامەزراندنی پڕۆەکانی کارو بەخشینی بۆندەکان لەلایەن دەزگاکانی دەوڵەتەوە و دەرکردنی مۆڵەت بۆ هاوردەکردنی کەل و پەل و کەرەستەی سەرەکی و چاودێری دەرەکی ئاڵوگۆڕ و کۆنترۆڵکردنی دانوستان لەگەڵ یەکێتیەکانی کرێکاران کەسەر لەنوێ رێکخرابووەوە. هەندێك بوو لەو هۆکارانەی دەوڵەت بۆ رێکخستنی چالاکی ئابووری بەکاریهێنا. رێگەی بە خاوەن پۆستە ئیداریەکاندا دەسەڵاتێکی تایبەت بەخۆیان بونیاد بنێن. بە شێوەیەکی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ. بەو شێوەیە پێکهاتەیەك دامەزرا کە بە شێوەیەکی سەرەکی مەبەستی چاکترکردنی رەوشی ئابووری وڵات نەبوو. بەڵکو دامەزراندنی تۆڕەکانی بەشدار بووان بوو لە سود وەرگرتن لە تایبەتمەنییەکان و پشتبەستووان بە خاوەن دەسەڵاتەکان کە هاوکار دەبێت بۆ پتەوکردنی پێگەی ئەوانەی لە دەسەڵاتدان.

هەردوو بابەتی بەجەماوەری بوون و خۆلێنزیکردنەوە بە روونی لە کێشەیەکی دیکەی ئابووری دیار بوون کە روو بەڕووی ئەحمەد حەسەن بەکر و لایەنگرانی بووەوە. کە بریتی بوو لە بەروبوومە نەوتیەکانی عێراق. رژێمی تازە هێشتا تێوەگلابوو لە ناکۆکیەکان لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراقی پەیوەست بە ئەنجامەکانی قانونی ٨٠ کە لە ساڵی ١٩٦١ دەرچوو بوو کاتێك چووە نێو دانوستان لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت لە هەمبەر وەبەرهێنان لە کێڵگە نەوتیە تازەکانی عێراق. بە تایبەتیش کێڵگەی باکوری رومێلە لە باشوری وڵات. دانوستانەکان کۆتایی هات بە رێکەوتنێك لە نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت لە هاوینی ١٩٦٩دا کە لە دەقەکەیدا هاتووە، روسیا یارمەتی عێراق دەدات لە وەبەرهێنانی کێڵگە نەوتیەکانی و بونیادنانی بۆڕی نەوت تا دەگاتە وێستگەی پاڵاوتن و هەناردە کردنی نەوت لە فاو لەسەر کەنداوی عەرەبی. رێکەوتنەکە نیشانەیەك بوو بۆ کۆتایی هاتنی دەستبەسەرداگرتنی کۆمپانیای نەوتی عێراق بەسەر پیشەسازی نەوتیی لە عێراق. هەروەها پەیوەندی نێوان عێراق و کۆمپانیای نەوتی عێراقی تێکداو بۆچوونی ئەحمەد حەسەن بەکری بۆ پتەوکردنی کۆنترۆڵی دواتری بەسەر کۆمپانیاکە بەهێزتر کرد. لە کانونی یەکەمی ١٩٧١دا

دانوستان دەستپێکرد. بەهاتنی ئاداری ١٩٧٢ کۆمپانیاکە رەزامەندی لەسەر داواکاری کۆنی عێراق بە هەبوونی بەشێك لە پشکەکانی خودی کۆمپانیای نەوتی عێراق دەربری. بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی بەرهەمهێنانی نەوت لە کێڵگەی باکوری رومێلە لە نیساندا کۆمپانیای نەوتی عێراقی بەرهەمهێنانی خۆی لە کەرکوك کەمکردەوە و کردیە نیوە، سەبارەت بە حکومەت ئەم هەنگاوە رادەی ملهوری و دیکتاتۆریەتی کۆمپانیاکەی دەرخست و درکی بەوە کرد کەجێگەی مەترسیە بریاری لە دەستدابێت لە دیاریکردنی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق ، بەوشێوەیە حکومەتی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٧٢ خۆماڵیکردنی کۆمپانیای نەوتی عێراقی رایگەیاند.

ئەو رێوشوێنە گرنگترین و دوا توخمەکانی کۆنترۆڵی بیانی بەسەر ژیانی نیشتمانی عێراق هەڵگرت. سەرەرای ئەوەی حکومەت سیاسەتی تەقەشوفی پەیرەو کرد بۆ ئەوەی بەخێرایی کەموکورییەکان لە داهات پر بکاتەوە. کەچی خۆماڵیکردن کاریگەرییەکی جەماوەری فراوانی هەبوو. سەرباری ئەوە. ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن چەند رێکارێکیان بۆ کەمکردنەوەی کاردانەوەکانی ئەو هەنگاوە گرتەبەر. لە کانونی دووەمی ١٩٧٢دا سەدام حوسێن سەردانی مۆسکۆی کرد بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەسەر شێوازی یارمەتیەکانی سوڤیەت بۆ عێراق بکات و دانوستانەکان بەستنی رێکەوتنامەی دۆستایەتی و هاوکاری عێراقی ــ سۆڤیەتی لێکەوێتەوە. لە نیساندا ئیمزای لەسەر کرا. سەرباری رێکەوتنە بازرگانیەکان کە کرینی روسیا بۆ نەوتی عێراقیشی لە خۆ دەگرت بۆ سوککردنی کاریگەری هەر بایکۆتێکی رێکخراو کە رەنگە کۆمپانیای نەوتی عێراقی پێیهەڵسێت. بە پێدانی مامەڵەکردنێکی تایبەتیش بۆ ئەندامە فەرەنسیەکانی یەکێتیەکە کرینی چواریەکی بەرهەمی کۆمپانیای نەوتی عێراقی لەلایەن فەرەنساوە گەرەنتیکرا، لە ئاکامی ئەوەدا دانوستانی خێرا لە نێوان عێراق و کۆمپانیای نەوتی عێراقی لەبارەی دۆزینەوەی چارەسەرێك ئەنجامدرا و رێکەوتن لەسەر مەرجەکانی قەرەبووکردنەوە لە شوباتی ١٩٧٣ هاتە ئاراوە. ئێستا عێراق لە بارودۆخێکدایە دەتوانێت بەتەواوی

سود لەو نرخە بەرزەی نـەوت وەربگرێت کـە دوای جـەنگی عـەرەب ئیسـرائیل لـە تشرینی یەکەمی ۱۹۷۳دا روویدا. ئـەوەش وایکـرد سـەروەتێکی خـەیاڵی بکەوێتـە دەست بازنەیەکی بچوك لەو کەسانەی کە کـۆنترۆڵی دەوڵـەتی عێراقیـان کـردووە، رێگەی بۆ خۆشکردن هۆکاری جۆراوجۆر بۆ مەحسوبیەت بەکاربێنن بـە رادەیـەکی زۆرتر لەوەی بۆ خەڵکانی پێش خۆیان رەخسابوو.

ئـەوە لـە رووی سیاسـیەوە لەگـەڵ زنجـیرە رووداوێـك هاوکـات بـوو کـە ئەحمـەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێنی خستە سەرووی دەسەڵاتی باڵای دەوڵەتی عێـراق. رێگـەیان بـۆ خۆشـبوو بـۆ ئـەوەی دوا جـێ پەنجـەیان بخەنـە سـەر چوارچـێوەی دەسەڵات کە بنچینەی پێکهاتەی جوداو دیاری دەوڵەت پێکدەهێنێت کە لـەماوەی سـاڵانی دادێ دەسـەڵاتی سـەدامی زێـدەتر کـرد. لـە تشـرینی دووەمـی ۱۹۷۱دا . ئەحمەد حەسەن بەکر پەیماننامەی کاری نیشـتمانی راگەیانـد. کـە جـارێکی دیکـە پابەنـد بـوونی بەعسـی بـە کـۆنترۆڵی دەوڵـەت بەسـەر ئـابووری و ئـارەزووی بـۆ سـەرهەڵدانی هاوپەیمانیـەك لـەنێوان سـەرجەم رەگـەزە پێشـکەوتووخوازەکان دووپاتکردەوە. ئەوە لەو کاتەدا راگەیەنرا کـە هێزەکـانی ئـەمن بـەردەوامبوون لـە دەسـتگیرکردنی شـیوعیەکان بـە شـێوەیەکی رێکخـراو. بـەڵام خـەریك بـوو گۆڕانکارییەك لە پەیوەندی پتەوی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و عێراق سەریهەڵدەدا، کـە خـۆی لـە سـەردانەکەی کـۆزیجین بـۆ عێـراق لەنیسـانی سـاڵی ۱۹۷۲دیتـەوەو سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقی رەزامەندی نیشاندا بۆ ئەوەی بێتە نێوبـەرەی نەتـەوەیی نیشـتمانی لەگـەڵ بـەعس. لـە ئایـاردا دوو ئەنـدامی حزبـی شـیوعی لـە وەزارەت دامەزران (راسـتەوخۆ پـێش خۆمـاڵیکردنی کۆمپانیـای نـەوتی عێراقـی). دەستبەجێ سەرکوتکردنی شیوعیەکان وەستا.

ئەوە ئەو کاتە بوو، کە نازم گزار سەرۆکی دەزگا ئەمنیەکانی دەوڵەت کودەتایەکی سەرنەکەوتوی ئەنجامدا. هەرچـەندە هۆکارەکـانی هەربـە نادیـاری مایـەوە، بـەڵام پێگەکەی نەبوونی راستیەکی دەستوری بۆ پێکهاتـەکانی دەسـەڵاتە بەهێزەکـە لـە رووالەتـدا دەرخسـت. رەنگـە وای بۆچـووبێ کوشـتنی سـەرجەم ئەنـدامانی

سـەرکردایەتی سیاسـی وای لێـدەکات دواتـر لـە ململانێیـە خوێناویەکـە لەسـەر دەسەڵات سەربکەوێت.

بەڵام پلانەکـەی لـە حـوزەیرانی ۱۹۷۳دا سـەرینەگرتو بـووە هـۆی روودانـی لـە سێدارەدان . سەدام رووداوەکەی زوو قۆستەوە بۆ ئەوەی خۆی لەوانە رزگاربکـات کە رەنگە نەیاری بن و زیـاتر لـە ۳۰ ئەفسـەری بـالاّ لـە سـێدارەدران کـە سـەرۆکی مەکتەبی سەربازیی حزبی بەعسیان لە نێو دابوو و چەند کەسێکی دیکـەش خرانـە زیندانەوە لەوانە عەبدوڵخالق سامەرائی کە ببووە مایەی تێڕوانینی ئەوانەی هێشـتا بڕوایـان بـە ئایدیۆلۆژیـەتی بـەعس هـەبوو. لـەبری دوا کـەوتنی سـەرکردایەتی بـێ ئەوەی هیچ رەخنەیەك ئاراستە بکرێت هەبێت. ئەحمـەد حەسـەن بـەکر وەزارەتـی بەرگری گرتە دەست. لەکاتێکدا کە سعدون شاکرو بەرزان تکریتی (زڕ برای سەدام حوسێن) دامو دەزگا ئەمنیەکانی دەوڵەتیان رێکخستەوە.

لە ژێر سایەی ئەو بارودۆخە. عەزیز مەحەمەدی ئەمینداری گشـتی حزبـی شـیوعی عێراقی و ئەحمەد حەسەن بەکر ئیمزایان لەسەر پەیماننامەیەکی کـاری نیشـتمانی کرد کە پێدەچوو ئامـانجی سۆسیالیسـتی هاوبەشـی لـەخۆ دەگرێت. ئـەوەش لـە تەمموزی ۱۹۷۳دا. بە رەسمی دان بە حزبی شیوعی عێراقی نرا. رێگـەی پێدرا بیرو بـاوەڕی خـۆی بـە ئاشـکرا بـڵاو بکاتـەوە ریزەکـانی رێکبخـات. جـارێکی دیکـە چالاکییەکانی لـە سـەندیکاویەکێتی جوتیـاران و رێکخراوەکـانی لاوان و ئافرەتـان دەستپێکردەوە. سەرباری زانکۆ و قوتابخانەکان کە ببونە بوارێکی کلاسیکی بـۆ چالاکیەکانی حـزب. هـەروەها لایـەنگران و سـۆزداران بـۆ شـیوعیەت سـەردانی بنکەکانی حزبیان دەکرد لە سەرتاپای عێراق. ئەوەش بیرۆکەیـەکی باشـی لەسـەر لق و پۆپەکانی حزبی شیوعی دایە دەزگاکانی ئەمن. بەڵام چەند مـانگێکی پێچوو تا حزبی شیوعی عێراقی زانـی کـە کاروبارەکـانی بـە شـێوەیەکی گونجـاو بـەرێوە ناچێت. چەند جارێك فشار خرایە سەر ئەندامانی حزبی شیوعی عێراقی کاتێـك کـە هەوڵی رێکخستنیاندەدا. هەروەها بەعسـیەکان بەسـەرکەوتوویی لـە سـەندیکاکانی کرێکـاران و رێکخراوەکـانی دیکـە تەحـەدایان کـردن، لـە پـایزی سـاڵی ۱۹۷٤دا

پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو حزب پشێوی تێکەوت. کاتێك سەرکردایەتی حزبی شیوعی هەستی بەلاوازی رێکخستنەکانی کرد. چالاکیە ئاشکراکانی کەمکردەوە و هەوڵیدا بە نهێنی کاربکات.

لەو سالانەدا پەیوەندییە پێشکەوتووەکانی نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت گەیشتبووە ئەو پەڕی، فشار بە ئاشکرا لەسەر حزبی شیوعی هەبوو بۆ ئەوەی بەشداری رژێم بکات. لەسەر ئاستی هەرێمی، لە بەرژەوەندی سۆڤیەت دابوو هاوکاری هەردوو هاوپەیمانەکەی سوریاو عێراق بکات. بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لە پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان ئەو دوو رژێمە بەعسیە. لە راستیدا، رق و دوژمنکاری ئالۆگۆڕ لە نێوان بەغداو دیمەشق لەوەتای تەمموزی ١٩٦٨دا باڵی بەسەر پەیوەندییەکانیاندا کێشا بوو، سەلاح جەدیدی سەرکردەی سوریا وای لە قەڵەمدەدا کە سەرکردە بەعسیە تازەکانی عێراق بەرپرسیارن لە پلاندانان بۆ رووخانی رژێمی بەعسی عێراقی ساڵی ١٩٦٣. لێکترازانی ئایدیۆلۆژی ئالۆزتر بوو. گومانەکان گەورەتر بوون، بەلانی کەم لەلایەنی سوریاوە ، کاتێك ژمارەیەك بەعسی دوورخراوە روویان کردە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠دا. خودی میشێل عەفلەق، دامەزرێنەری حزبی بەعسیش کە سوریایی بوو. لە بەغدا بارەگای داناو، وا دەردەکەوت بەبوونی ئەو ، رژێمی عێراق جۆرە شەرعیەتێکی دیکەی دەبێت.

کاتێك حافز ئەسەدیش کە زۆر جیاواز نەبوو لە بەعسیەکانی عێراق، سەلاح جەدیدی لەسەر کار لاداو لە ساڵی ١٩٧٠ دەستی بەسەر دەسەلاتدا گرت. شەڕە قسە هەر بەردەوام بوو، هەرچەندە کەمێك سوکتر بوو. هەردوو رژێم دڵنیا نەبوون لەو پاڵپشتیە ناوەخۆییەی کە هەیانە. ململانێیان لە سەر شەرعیەتی یەکتر بوو ، هەریەکەشیان دەستبەرداری قەناعەتی خۆی سەبارەت بە نیازە خراپەکاریەکانی ئەویدیکە نەدەبوو. ئەو شێوازە باڵی بە سەر رێگە چارەی زۆربەی پرسە سەرەکیەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت کێشا لەو چەند ساڵەدا، هەر لە رسوماتە سەپێنراوەکان لەلایەن سوریاوە لەسەر نەوتی عێراق کە لە رێگەی ئەو بۆرییەوە دەنێردرێت کە بەناو خاکەکەی تێپەڕدەبوو، تا دەگاتە ئالۆگۆڕکردنی تۆمەت کە

لەدوای شەڕی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ هات. حکومەتی عێراق ئیدیعای ئەوەی کرد لە پلاندانان بۆ ئەو شەڕە لەلایەن سوریاو میسر دوورخراوەتەوە کەچی حکومەتی سوریا رشتبوو لەسەر ئەوەی عێراق بەشداری کردنی رەتکردووەتەوە بەهۆی ئەوەی لە سنوری رۆژهەلاتی خۆی لەگەڵ ئێران ترسی هەیە.

بەهەر حاڵ، عێراق فرقەیەکی زرێپۆشی بۆ پاڵپشتی سوریا لە جۆلان رەوانە کرد، بەلام کاتێکی درەنگی رۆژ گەیشتبوون کاتێك کە شەڕ تەواو ببوو و واپێدەچوو کە هێزەکانی ئیسرائیل بەرەو دیمەشق دەخشان. سەرەڕای ئەوەی هێزە عێراقیەکان رۆڵێکی کاریگەرییان هەبوو و برینداریکی زۆریاندا، بەلام هەرگیز حکومەتی سوریا بە ئاشکرا دانی بەو کارە نەنا. عێراقیەکانیش بەوە تۆمەتباریان کرد کە یارمەتیان نەداون و بەڵکو بەئەنقەست دووچاری بۆسەیەکی ئیسرائیلیان کردبوون. بە هەفتەیەك دوای گەیشتی هێزە عێراقیەکان. حکومەتی سوریا رەزامەندی لەسەر ئاگر بەست دەربڕی لەگەڵ ئیسرائیل بەبێ ئەوەی راوێژکاری عێراق بکات. ئەوەش بەهانەیەکی دایە دەست عێراق. بۆ ئەوەی ناچار بێت هێزەکانی خۆی لە سوریا بکشێنێتەوە. وەك دەربرینێك بۆ ئەوەی کە لەسەر ئاگربەست رازی نەبووە. ساڵی ١٩٧٣ سەرە کۆنەی سوریای کرد لەوەی رێکەوتنامەی کشانەوەی لە شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل ئیمزاکردووە. بەو شێوەیە سەرکردایەتی عێراق هەلی بۆ رەخسا تا پێگەیەك بۆخۆی بدۆزێتەوە کە تایبەتمەندییەکی عەرەبی چەسپاوی هەیە کە هەڵە ناکات، نەك هەر لەگەڵ ئارەزووەکانی بۆ رووخاندنی رژێمی سوریا ناگونجێت بەڵکو لەگەڵ چاوتێبرینە هەرێمیە پەرەسەندووەکەشی.

## جەنگی کوردستان

لەگەڵ ئەوەش، هەڵگیرسانی شەڕ لە کوردستان بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێك ئەو چاوتێبرینانەی راگرت. بارزانی رازی نەبوو بچێتە نێو بەرەی نەتەوەیی پێش ئەوەی لەوە دڵنیا نەبێت کە چوونە ریزی ئەو بەرەیە کۆنترۆڵێکی گەورەی بەسەر

کاروباری کورد پێدەبخشێت. ئەو پرسە بەدینەدەهات بەهۆی تەگەرە تێکەوتنی دانوستان. لە ئەنجامی ئەوەدا بارزانی دەستی بەخۆ ئامادەکردن کرد بۆ ئەگەری سەرهەڵدانەوەی سەر لەنوێی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری. پشێوی پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێرانیش لەمەدا یارمەتیدا. دابڕانێك لەو پەیوەندییانە هاتە ئاراوە. بەهۆی ئەوەی ئێران هەردوو دوورگەی تونب و ئەبو موسای لە کەنداو داگیرکرد کاتێك هێزەکانی بەریتانیا لە کانونی دووەمی ١٩٧١دا کشانەوە. هەرچەندە ئەوە لە ڕەوشێکی چەندوچون ئامێزدا لە بارەی شەتوئەلعەرەب و هاوکات دەرکردنی ئەوانەی کە بە ئێرانییە شیعەکان لە عێراق ناوزەدکران ڕوویدا. یەکێك لەو پرۆسانەی دەرکردن لە پایزی ١٩٧١دا تووڕەبوونی بارزانی و سەرکردە کوردەکانی دیکەی وروژاند کاتێك ٤٠ هەزار کوردی فەیلی شیعە مەزەبی گرتەوە. دوابەدوای پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت ـ عێراق لە ساڵی ١٩٧٢ حکومەتی ئێران لەلایەن خۆیەوە ناکۆکییەکانی لەگەڵ ڕژێمی عێراق خستەڕوو. لە ژێر ڕۆشنایی ڕۆڵی سەرەکی لەو سستەمە ئەمینەی کە ئەمەریکا چاودێری دەکات و وەك بەشێك لە شەڕی سارد دامەزرابوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا . وا دەرکەوت هەر دوژمنێکی ڕژێمی عێراقی ڕەنگە هاوپەیمانێکی پێشبینی کراوی ئەمەریکا بێت. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ئەمەریکا یارمەتی پێشکەش بە بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان بکات لەوەتەی ساڵی ١٩٧٢ وە. ئەوەش هاوکات بوو لەگەڵ یارمەتی سەربازیی ڕاستەوخۆی ئێران. ئەوەش بوێری زیاتری بە بارزانی بەخشی و. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٢، سەرەرای بەردەوامبوونی دانوستان ڕوو بەڕوو بوونەوەی چەکدارانە ناوە ناوە بەرێکخراوی لە نێوان حکومەت و پێشمەرگە ڕوویدەدا .

بەشداری کردنی عێراق لە جەنگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠دا، بووە هۆی دەستپێکردنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتیەکان بە خێرایی لەگەڵ ئێران. بە ئامانجی پاراستنی سنوری ڕۆژهەڵاتی عێراق. لەکاتێکدا هێزەکانی خۆی لەلای خۆرئاوا چڕکردبووەوە. بەڵام هەمەهانگی بەڕواڵەت هەرزوو هەڵگەڕایەوە و بووە ناکۆکی و

زنجیرەیەک رووداوی توندوتیژی لێکەوتەوە لەسەر سنوری هاوبەشی هەردوو دەوڵەت. لە شوباتی ١٩٧٤دا ئەو رووداوانە گەیشتە ئاستێکی ترسناک کە وای لە ئێران و عێراق کرد داوای ناردنی چاودێری نێو دەوڵەتی بۆ ناوچەکە لە UN بکەن ، بەڵام داواکەیان وەلامی نەبوو. سەبارەت بەکورد ئەوە مانای وایە هەردوو پاڵپشتی گەورەی ئێران و ئەمەریکا بارزانی هاندا کەوای بۆ بچێت دەتوانێت بە رووی هەوڵی بەغدا بۆ سەپاندنی بیرۆکەی خۆی لە هەمبەر سەربەخۆیی زاتی کوردی بە هاتنی ئاداری ١٩٧٤ بوەستێت. لەبەر رۆشنایی ئەو مەرجانە ناوچە کوردیەکان کۆمەڵەیەکی یاسادانانی هەڵبژێردراوی دەبێت، کە سەنتەرەکەی هەولێر دەبێت. دواتریش دەستەیەکی جێبەجێکردنی لێدەکەوێتەوە. بەڵام سەرۆکی دەستەکە لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە دادەمەزرێنرێت، هەروەها دەسەڵاتی لەسەر کار لادانیشی دەبێت و دەتوانێت هەر کاتێك بیەوێت کۆمەڵەی یاسادانان هەڵوەشێنێتەوە. کاروباری دەرەوەش هەر لە ژێر کۆنترۆڵی بەغدا دەمێنێتەوە لەگەڵ کاروباری بەرگری و ئەمن و نەوت و بودجەی نێوخۆیی، سەرەرای ئەوە سێیەکی ناوچە گرنگەکانی کوردستانی عێراق لە ناوچە کوردیە دیاریکراوەکان جودا کرانەوە لەوانە کێڵگە نەوتیەکانی کەرکوك.

بارزانی پێشنیازەکەی رەتکردەوە، بەڵام حکومەت رشتبوو لەسەر جێبەجێکردنی و ژمارەیەکیش لە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستانی رازیکرد هاوکاری بکەن بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی یاسادانان لە هەولێر. ئەو گروپە بە سەرۆکایەتی عەزیز عەقراوی چوونە نێو بەرەی نەتەوەیی نیشتمانی لەگەڵ دوو رێکخراوی دیکەی بچوکی کوردی، بۆ ئەوەی بوونی وێنایەك لە هاوپەیمانیەکی نەتەوەیی راستەقینە نیشانبدەن. بەڵام لە واقیعەکە تەواو جیاواز بوو ، چونکە زۆربەی گروپە کوردیەکان لەوانەش کە هەندێکیان ناکۆکی کۆنیان لەگەڵ بارزانی هەبوو بەیارمەتی ئێران هاوپەیمانیان لەگەڵ بەست و رووبەرووی حکومەتی بەغدا بوونەوە. لە هاوینی ساڵی ١٩٧٤ بەتەواوی شەڕ هەڵگیرسا. پێشتریش هەندێك رووداوی دیکە روویدابوو لەگەڵ دەستبەسەرداگرتنی هێزەکانی عێراق بەسەر

هەندێك شار كە گەیشتن پێیان ئاسانبوو، بەبێ ئەوەی كۆنترۆڵی گوندەكان بكات. لەسەر ئەو بنچینەیە بارزانی وپارتی دیموكراتی كوردستان وەڵامی هێرشەكەیان دایەوە. بە شێوەیەكی بەرچاو پشتیان بە پاڵپشتی سەربازیی ئێران دەبەست. شەرە تەنگژەئامێزەكە خەریك بوو سوپای عێراقی ماندوو دەكرد، وای لێهات پێویستی بە بانگكردنی ئەندامە یەدەگەكان كرد و دارایی یەدەگی حكومەت تەواو بوو. دەنگی نارەزایی لە هەندێك ناوچەی دیكەی وڵات بەرزبووەوەو كاتێك لەو ساڵەدا زانایانی ئایینی شیعە لە وتارەكانی عاشورادا نارەزاییان دژی جەنگ دەربری حكومەت بە توندی وەڵامی دانەوە. ٣٠ سەركردەی شیعە دەستگیركران و پێنجیان لە سێدارەدران كە پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ حزبی دەعوە هەبوو.

بەڵام بەشداریی سەربازیی ئێرانی راستەوخۆ لە شەردا بواری رەخساند بۆ ئەگەری روودانی جەنگێكی راستەقینە لە نێوان عێراق و ئێراندا ، كە هەر دوو دەوڵەت ئارەزوویان لێی نەبوو. دانوستان لە نێوان تاران و بەغدا دەستپێكرد، بەبێ ئاگاداری بارزانی. لە ئاكامدا، بە شێوەیەكی كتوپر لە جەزائیر ئەنجامەكەی لە ئاداری ١٩٧٥ راگەیەنرا، تیایدا. بەدەست پێشخەرییەكی سەدام حوسێن عێراق رازیبوو دان بە ئیدیعاكەی ئێران بنێت لەوەی هێڵی درێژبووەوە لە قووڵترین خاڵی شەتولعەرەب پێویستە ببێتە سنوری هاوبەشی نێوان هەردوو دەوڵەت لە رێرەوی ئاوی. ئێرانیش رازیبوو كە پاڵپشتی بۆ بارزانی و پارتی دیموكراتی كوردستان رابگرێت. لە ماوەی چەند رۆژێكدا ئێران یارمەتیە سەربازییەكانی كێشاوەو سنوری داخست. هێزەكانی بارزانی كە بەتەواوی پشتی بە پاڵپشتی ئێران بەستبوو نەیتوانی هێرشەكانی لە دژی هێزەكانی عێراق بەردەوامی پێبدات، لەماوەی چەند هەفتەیەكدا شۆرش شكستی خوارد. بە هەزاران پێشمەرگە لێبوردنی گشتیان قبوڵكردو تەسلیم بوونەوە، لەكاتێكدا خودی بارزانی و سەركردایەتی پارتی دیموكراتی كوردستان لەگەڵ ژمارەیەكی زۆری لایەنگرانیان پەرینەوە ئێران و چوونە پاڵ نزیكەی ١٥٠ هەزار پەنا بەری مەدەنی كە پێشتر چووبوونە ئێران . هەر زوو لێكترازان لە نێو رێزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان بووە هۆی

لێکجودابوونەوەیەکی گەورە لە نێوان بارزانیەکان ـــ مەلامستەفاو هەردوو کوڕەکەی ئیدریس و مەسعود ـ و جەلال تاڵەبانی روویدا. ئەوەی دواتر لە پارتی دیموکراتی کوردستان جیابووەوە و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی پێکهێناو سەرنجی خەڵکێکی زۆری راکێشا لەوانەی کە نەیاندەتوانی سەرکردایەتی بارزانی و بیروباوەڕە نەتەوەیی سۆسیالیستیەکانیان بگەیننەوە یەك. لە ساڵی ١٩٧٩دا بارزانی لە دوورە وڵات لە ئەمەریکا کۆچی دوایی کرد.

سەبارەت بە ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن لێکترازانی پارتی دیموکراتی کوردستان و کۆتایی هاتنی شۆڕشی کورد دەسکەوتی راستەقینەی رێکەوتنامەی جەزائیر بوون و. رێگەی بۆ خۆشکردن سەرنج نەدرێتە راستی تەنازولکردنیان لە برێك لە خاکی عێراق بۆ ئێران. بەو شێوەیە بەغدا لە پلانی خۆی پەیوەست بە کوردستان بەردەوام بوو. کۆمەڵەیەکی یاسادانان دامەزرا و دانیشتنەکانی لە هەولێر دەستیپێکرد، تەها محێدین مەعروف کە کورد بوو بە جێگری سەرۆك کۆماری عێراق دامەزرا. پرۆسەی گواستنەوەی بە کۆمەڵی کۆمەڵگەی کورد. لە ناوچەکانی سنوری تورکیا و ئێران دەستیپێکرد و بردرانە کۆمەڵگەی نیشتەجێکردنی تازە لە نزیك شارە گەورەکان. هەندێکی دیکە گواسترانەوە باشووری عێراق و سەرلەنوێ نیشتەجێ کران لە کۆمەڵگەیەك کە زۆرینەی شیعە بوو. بە پێی راپۆرتەکان. لە کۆتاییدا نزیکەی نیو ملیۆن کورد لە گوندەکانیان راگوێزران و لە ژێر هەرەشەی کوشتن رێگەیان پێنەدرا بگەڕێنەوە و زۆربەی ئەو گوندانەش تەختکران.

لەهەمان کاتدا، حکومەت بەردەوامبوو لە هاندانی خانەوادە عەرەبەکان بۆ گواستنەوە بەرەو باکوور ، بۆ ئەوەی تەرازووەکە لە هەندێك ناوچەدا بەلای دانیشتوانی عەرەب لاسەنگ بێت و پاکانەش بۆ دوورخستنەوەیان لە کوردستان بهێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پرۆسەی وەبەرهێنانی زۆر گەورە و گرنگ لە باکوور هاتە ئاراوە. ئەوە تا رادەیەك بۆ ئەوە دەگەڕایەوە. تۆڕی خۆلێنزیکردنەوە فراوان بکرێت و ناوچە کورد نشینەکانیش بگرێتەوە بە شێوەیەك لە جاران زیاتر بێت.

حکومەت ویستی بە کورد نیشانبدات کە مامەڵە کردن لەگەڵ بەغدا پاداشتی مادی گەورەی بەدواوە دەبێت. تا ئەو کاتەی پابەند دەبن بە بنەماکانی ئەو یاریەی بەسەریاندا سەپێنراوە. هەروەها حکومەت جەختی لەسەر پڕۆژەکانی پەرەپێدانی رێگەکان و هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندن کردەوە بۆ ئەوەی توانای گەیشتنی هێزەکانی حکومەتی ناوەندی بۆ سەرتاپای کوردستان لە ئاییندەدا گەرەنتی بکات.

## داهاتە نەوتییەکانی دەسەڵات، سیاسەتی دەرەوەو دەسەڵات گرتنەدەست لە لەلایەن سەدام حوسێنەوە

لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕ لە کوردستان و ئەو گەرم و گوڕییەی کەلە پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێران سەریهەڵدا، لە توانای حکومەتدا بوو تواناکانی کۆبکاتەوەو زۆری داهاتەکانی نەوت بقۆسێتەوە ئەو داهاتانە لەوەتای تشرینی یەکەمی ١٩٧٩دا هەشت ئەوەندە زیادبوو . بەرێژەیەك تێکڕای ساڵانەی داهاتی نەوتی عێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ گەیشتە ٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی. هەر زوو حکومەت ئەو هەلانەی قۆستەوە کەبۆی رەخساوە لە زێدە بوونی داهاتی دەوڵەت، ئەوە وای کرد جارێکی دیکە جەخت لەسەر سیستەمی بیمەی کۆمەڵایەتی بکرێتەوە لەگەڵ پڕۆژەکانی نیشتەجێ بوونی نوێ و وەبەرهێنانی فراوان لە بوارەکانی تەندروستی و فێرکردندا . لەو چەند ساڵە کەمە ئەنجامی ئەو پڕۆژانە لە سەرتاپای وڵات خەریك بوو دەردەکەوتن. ئەوەش هاوکاریەکی چاك بوو بۆ ئەوەی گەل بڕوا بهێنێت، خەریکە حکومەت بەڵێنەکانی جێ بەجێ دەکات. تەنانەت ئەگەر لە هەمان کاتدا رێژەی ٤٠٪ داهاتی نیشتمانی بۆ کڕینی چەك خەرجبکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا عێراقیەکان و ئەوانی دیکە زۆر بە سەختی دەیانتوانی لە داهاتی نیشتمانی و خەرجیەکانی عێراق دڵنیابن، چونکە

بڵاوکردنەوەی ئاماری ئابووری پەیوەست بە بوارە ستراتیژیەکان بە تاوان لە قەڵەم دەدرا.

ئەوەش تا رادەیەك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە هەندێك لە پڕۆژەکان هەلێکی بۆ بەڵێندەرو ئەو کۆنتراکتچیانە رەخساند کە هەر لە بنەڕەتەوە پێگەی کۆمەڵایەتی دیاریان هەبوو رێگەی پێدەدان ئەو وەبەرهێنانە داراییە کە پێشتر لە ئابووری عێراق رووینەداوە تاکو دوا رادە بقۆستنەوە. لە راستیدا داهاتەکانی نەوت وای لە ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن و لایەنگرانیان کرد بازنەیەکی فراوانی سەرفکردنی رژێم بۆ پارەو پوڵی حکومەت لە بەرژەوەندی ئەو کەسانەی متمانەیان پێکراوە دروستبکەن. هەروەها بۆ دامەزراندنی تۆڕێك لە بەکرێگیراوان کە سەرتاپای وڵات بگرێتەوە. سەرەڕای ئەوەی زۆربەی تایبەتمەندییەکان کەسانێك بەدەستیان هێنا کە هەر لە بنەڕەتدا پەیوەندیان لەگەڵ کەسایەتیە سیاسیەکانی رژێم هەبوو، کەچی سەدام حوسێن بەشێوەیەکی تایبەت هەلی بۆ ئەو کەسانە رەخساند کە دەیویست بیانهێنێتە بازنەی هەژموونی خۆی. سەبارەت بە دەسەڵاتی رۆژبەرۆژ گەورەبووی سەدام حوسێن، دەبوایە زۆر وردبینی لە ئاڕاستەی بەکارهێنانی ئەو پارەو پولە نەکرێت. بەهەر ئاراستەیەك بووایە.

لە سایەی بەرزبوونەوەی داهاتی حکومەت و پلانەکانی بوژانەوە و هاندانی بەڵێندەرەکان و هێنانیان بۆ نێو تۆڕەکانی مەحسوبیەت لە عێراق. جێگەی سەرسوڕمان نەبوو پەیوەندییەکانی عێراق لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا باشتر بێت. عێراق بووە بازاڕێکی گرنگ و، بەنەمانی کێشەکانیشی لەگەڵ ئێران، عێراق نابێتە هاوپەیمانێکی ستراتیژی گرنگی یەکێتی سۆڤیەت. راستە رێکەوتنامەی دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵ روسیا هەرمایەوەو. سەرەڕای ئەوەی روسیا بە سەرەکیترین سەرچاوەی چەکی عێراق مایەوە سەرباری بەشداری کردنی لە پیشەسازیە نەوتیەکەی و پیشەسازیەکانی دیکەدا بەڵام ئەو داهاتەی نەوتی عێراق دابینی کرد . سەربەخۆیی هەڵبژاردنی دایە سەرکردەکانی عێراق کە لە کۆتاییدا پێگەی یەکێتی سۆڤیەتی سەراوگێرکرد. هیچ کامێك لەوانە لە بەرژەوەندی حزبی

شیوعی عێراقدا نەبوو. جارێکی دیکە سەرکوتکردنی شیوعیەکان بەلاوازی لە پایزی ١٩٧٦ سەریهەڵدایەوە سەرەڕای راگەیاندنە رەسمیە هاودژەکان، پشێوی پەیوەندییەکان لە نێوان حزبی شیوعی عێراقی و حکومەتی عێراق بە ئاشکرایی روو لە زیادبووندابوو. هەوڵەکانی سۆڤیەتیش بۆ چارەسەری کێشەکە پرسەکەی ئاڵۆزتر کرد، چونکە سەدام حوسێن بە جۆرێك لە دەستێوەردانی لە کاروباری عێراق لە قەڵەمدا. ئەوەش گومانەکانی سەبارەت بە حزبی شیوعی عێراقی زیاتر کرد .

لەو قۆناغدا حزبی شیوعی عێراقی وەك زۆرانی دیکە خۆی بینیەوە، لە نێو زنجیرەیەك پێشهاتدایە کە سەدامی گەیاندە پێگەیەکی سەرکردایەتی بێ رکەبەر لە سالآنی داهاتوودا، لەو ماوەیەدا روون بوو کە سەدام ئەو کەسێتیەیە کە کۆنترۆڵی رژێمی کردووە نەوەك ئەحمەد حەسەن بەکر. سەرەڕای نەبوونی هیچ نیشانەیەکی دیار بەبوونی ململانێ لە نێوان ئەو دوو پیاوە. یا بوونی جیاوازی لە سیاسەتدا، کەچی سەدام چەپۆکی خۆی بەسەر دامو دەزگاکانی ئەمنیی دەوڵەت و رێکخراوەکانی حزب توندکرد. ئەوەش وایلێکرد کۆنترۆڵێکی بێ رکابەر بکات بەسەر ئیدارەدا کەلە رێگەیەوە رێگەی خۆی کردەوە بۆ نێو ریزی ئەفسەران و تۆڕێکی تایبەتی لە بەکرێ گیراوان لە تکریتیەکان و ئەوانی دیکە دروستکرد. دەرگای دەوڵەمەندی و پلەپێدانی لەبەردەم کردنەوە ئەگەر بێتو ئەوان پاڵپشتی پرسی ئەو بکەن.

لە کانونی دووەمی ١٩٧٦دا ئارەزووی خۆی خستەڕوو بۆ ئەوەی ئەحمەد حەسەن بەکر پلەی ژەنەڕاڵی پێببەخشێت– لە هەمان کاتدا نیازی خۆی راگەیاند بەوەی دەیەوێت قەوارەی سوپای میللی لە ژێر سەرکردایەتی یەکێك لە پیاوەکانی کە بریتی بوو لە تەها یاسین رەمەزان دوو بەرابەر بکات، بۆ ئەوەی هەر هەوڵێکی گروپەکانی دیکەی حزب بەرپەرچ بداتەوە ئەگەر تەحەدای سەرکردایەتی سەدام بکەن. وای لێهات سەدام حوسێن زۆر لەو پروپاگەندانە دەردەکەوت کە بۆ رژێم دەکران و وای لێهات رەخنەگرتن لێی زۆر مەترسیدار بوو. هەروەها کۆنترۆڵکردنی

حزبی بەهێز کرد بەزیادکردنی ئەندامانی سەرکردایەتی قوتری بۆ ۲۱ ئەندام لە کانونی دووەمی ۱۹۷۷دا. هەروەها بەکرێگیراوانی خۆی پاداشت کردو دەسەڵاتی ئەو کەسانەی کەمکردەوە کە تا ئەو کاتە خۆیان دوورە پەرێز گرتبوو لەبارەی دەسەڵاتەکەی.

رەوشەکە وای ویست پاڵپشتیان بخرێتە ژێر تاقیکردنەوە. کاتێك لە مانگی شوباتدا کاری توندوتیژی لە هەردوو شاری نەجەف و کەربەلای شیعە نشین سەریهەڵدا. دووری ئاسایی شیعەکان لە حکومەتەکانی عێراق و بێزارییەکان بەهۆی جیاکاری لە تۆڕەکانی مەحسوبیەت. رەوشەکەی ئاڵۆزتر کرد. سەرەڕای نوێکردنەوەی رەخنەی ئیسلامی توند لە حکومەتی عەلمانی. ئەندامانی سەریە رێکخراوە نهێنیە ئیسلامیەکان (وەك حزبی دەعوە). بڕیاریاندا لە ساڵی ۱۹۷۷ یادی عاشورا بقۆستنەوە بۆ ئەوەی قەوارەی هەستی ئیسلامی شیعەکانی باشوور دژ بە حکومەت نیشانبدەن. ئەو رێپێوانە ئاساییەی نزیکەی ۳۰ هەزار کەس بەشداریان تێدا کردبوو لە نەجەفەوە بۆ کەربەلا بووە خۆپیشاندانێکی گەورە لە دژی رژێم کە دەزگاکانی ئەمنی شاگەشکە کرد. ئەوە وای کرد دەسەڵاتداران هێزی چەکداری بۆ روو بەڕوو بوونەوەی خۆپیشاندانەکە رەوانە بکەن. کاری توندو تیژی نەجەف و کەربەلای گرتەوە و بەدەستگیرکردنی ۲ هەزار کەس کۆتایی هات کە هەندێکیان زانای ئایینی بوون.

دادگایەکی تایبەت بۆ دادگاییکردنی خۆپیشاندەران دانرا بە سەرۆکایەتی عیزەت مەستەفا ئەندامی ئەنجومەنی باڵای شۆڕش. لەگەڵ دوو وەزیری شیعە کەلە سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس لە کانونی دووەم دامەزرێنرابوون. دادگا کە حوکمی مردنی بەسەر هەشت زانای ئایینی دا سەپاند لەگەڵ زیندانی کردنی ژمارەیەکی دیکە. لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆری ئەلقەکانی خوێندنی شیعە لە نەجەف و کەربەلا و چەند شارێکی دیکە داخرا، ژمارەیەك قوتابی ئایینی رایانکردە دەرەوەی وڵات. لەگەڵ ئەوەشدا سەدام حوسێن وای بینی ئەو سزایانە ئاسانکاری تێداکراوە بۆیە عیزەت مستەفا و وەزیرێکی شیعەی لە سەرکار لادا.

سەدام ویستی هەر گومانێك لە سەر تواناى خۆی لەسەر کۆنترۆڵکردنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و حکومەت لابدات. بە شێوەیەکی پراکتیکی دەریخست کە ڕێگە نادات ئۆپۆزسیۆنێکی سەربەخۆ هەبێت وەك ئەوەی لە شارە شیعە نشینەکان ڕوویدا. لەلایەکی دیکەوە. هەروەکو دۆزی کورد. ئەو ڕووداوانە ڕێگەی بۆ سەدام خۆشکرد شێوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ کۆمەڵگەی شیعە بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت دیاریبکات. بەو شێوەیە لە ساڵی ١٩٧٧، لە هاوینی ئەو ساڵە دەستی بە هاندانی تەبەنی کردنی فەرمی ڕاشکاوانەکرد بۆ هەڵوێستە ئیسلامیەکان و شانازی بە چاودێری کردنی هەندێك لە زانا ئاینییەکان دەکرد و هەندێکیانیشی بۆ تۆڕەکانی خۆی ڕاکێشا. پێداهەڵگوتنی بە بنەماکانی ئیسلام بەشێك بوو لەو ستراتیژیەتەی کە ئارەزولێکردن و تۆقاندنیشی لەخۆگرتبوو. لە پاییزی ١٩٧٧دا ئەندامانی سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس بوونە ئەندامی ئەنجومەنی باڵای سەرکردایەتی شۆڕش. بەوەش ژمارەیەك شیعەی عێراقی بۆ یەکمجار چوونە نێو ئەنجومەنەکە. ئەو ڕێوشوێنەش هۆکارێکی مەنتیقی هەبوو لەوکاتەدا بە لەبەر چاو گرتنی پێشویەکانی کۆمەڵگەی شیعە. لە هەمانکاتدا ئاماژە بوو کەسەدام حوسێن خۆی بۆ پێگەیەك ئامادە دەکرد کەخۆی بە تەنیا وەك گەورەیەك هەڵسوکەوت بکات مامەڵە لەگەڵ سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگەی عێراقیدا بکات. بەو شێوەیە ئەو کۆمەڵگەیە دەتوانێت نیعمەتەکان ڕەزامەندی سەرۆکەکەی بەدەست بێنێت. لەهەمانکاتدا دەزانێت سزایەکی توند چاوەڕێی دەکات ئەگەر بە هێڵێکی سەربەخۆ لابدات.

لە پاڵ ئەو هەنگاوە ڕەمزیانە، بەمەبەستی بە هێزکردنی شێوەیەکی دیارتری دەسەڵات چەند ڕێوشوێنێکی دیکە گیرایە بەر. لە ئەیلولی ١٩٧٧دا سەدام حوسێن دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو شێوەکانی سیاسەتی نەوتی عێراقدا گرت. بەوەش دەستی خستە سەر گرنگترین داهاتی دەوڵەتی عێراق. ڕێژەکانی بەرهەمهێنانی دیاریکرد و کۆنترۆڵی خەرجکردنی داهاتی نەوتی کرد. سەدام تاکە کەس بوو بەوردی ڕێژەکانی داهات و خەرجییەکانی دەزانی. هەر لەو ماوەیەدا وای لێهات بە

شێكی چەسپاوی داهاتی نەوتی عێراق لە بانكەكانی دەرەوەی وڵات دادەنرا. ئەوەش لە پێناو پێكهێنانی بنچینەیەك بوو بۆ ئەوەی بۆ (خەباتی بەعس) پشتی پێببەسترێت، لە حاڵەتێك ئەگەر رژێمەكەی رووخێنرا و ئەمەش لەساڵانی داهاتوو رژێمەكەی بەهێزكرد.

لە هەمان كاتدا. سەرۆك ئەحمەد حەسەن بەكر وازی لە وەزارەتی بەرگری هێناو دایە عەدنان خێروڵلا توڵفاح كە خزمی خۆی بوو ، عەدنان خێروڵلا توڵفاح هاوسەری كچی ئەحمەد حەسەن بەكر و برای هاوسەری سەدام حوسێن و كوڕی خاڵیشی بوو. گۆڕانكاریكردن لەو پۆستانە جەختی لەسەر پەیوەندییە عەشایەرییەكان كردەوە كە خودی رژێم لەسەری دامەزراوە . بەبەراورد لەگەڵ سەدام حوسێن، بەختی ئەحمەد حەسەن بەكر كەمتر دەبۆوەو پروپاگەندەی وا بلاوبۆوە كە گیرگرفتی تەندروستی نادیاری هەیە. بۆچوونەكان بەهێزتر بوون كە وەرگرتنی كورسی سەرۆكایەتی لەلایەن سەدام حوسێن تەنها مەسەلەی كاتە. لە راستیدا ئەوە ئەو رۆڵە بوو كە سەدام حوسێن لەو ماوەیەدا پێی هەڵسا بوو. هەرچەندە ئەگەر نەببووە سەرۆكی فەرمی كۆماری عێراقیش. دوا كەوتنی لەو هەنگاوە بۆ دوو ساڵی دیكە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە دەیویست لەو تۆڕانە دڵنیا بێتەوە كە بۆ لایەنگرانی دایمەزراندووە. بە تایبەتیش لە هێزە چەكدارەكان كە عەدنان خێروڵلا رۆڵێكی سەرەكی تێدا بینی. هەروەها ئەو ماوەیەی قۆستەوە بۆ ئەوەی لە سروشت و قەوارەی ئۆپۆزسیۆنی دژ بە حزب و رژێم دڵنیا بێت. پێویستی بەوە بوو بزانێت كێ پیاوی ئەوە (جێی متمانەیە) كاتێك بۆ دواجار دەست بەسەر دەوڵەتدا دەگرێت. لە ساڵی ١٩٧٧ زۆر كەس گومانیان لە نیازەكانی سەدام هەبوو.

لە ئاكامدا، سەدام پەنای بردە بەر ژمارەیەك فڕوفێڵ بۆ نەهێشتنی بەرهەڵستكاری لەنێو خاوەن پۆستە بالاكانی حزب كە لەهەمووان مەترسیدارتر بوون. لە سەرەتاكانی ١٩٧٨ هەڵمەتێكی رۆژنامەنووسی دژی حزبی شیوعی عێراقی دەستپێكرد لە وەڵامی رەخنەكانی حزب لەو سەركوتكارییانەی كە حكومەت لە

کوردستان پەیرەوی دەکرد و هەروەها هاندانیشی بۆ سەرمایەداری. چەند ئەندامێکی حزبەکە دەستگیرکران و هەندێکی دیکەیان لە سێدارەدران بە تۆمەتی ڕێکخستنی چالاکی حزبی شیوعی عێراقی لە نێو هێزە چەکدارەکان. لە ساڵی ١٩٧٦ هەرچالاکییەکی دیکەی سیاسی غەیرە بەعسی لە نێو ریزەکانی سوپا بە تاوانی گەورە لە قەڵەمدەدرا. ئەوەش بووە ئامرازێك بۆ سەرکوتکردنی چالاکی سیاسی بەرهەڵستکارانە لە وڵاتێکدا، کە ناونوسکردنی سەربازی بەزۆری تێدا سەپێنرا بە شێوەیەك زۆربەی کورانی تەمەن هەژدە ساڵ یا دەبوایە خزمەتی سەربازیی بکەن یاخود ببنە هێزی یەدەگ تیایدا. وەك هەموو جارێك پەنا بردنە بەر چەوساندنەوەی شیعە ئەندامانی حزبی بەعسیشی گرتەوە. سەدام حوسێن بەو هەنگاوە رادەی لایەنگرانی بۆ خودی خۆی و بەرەی نەتەوەیی و بنەماکانی سۆشیالستی کە تێیدا بەرجەستە ببوو تاقیدەکردەوە.

لە راستیدا ، حزبی شیوعی عێراقی نەیارێکی ترسناك نەبوو، لە بەهاری ١٩٧٩دا کە حزب بە تەواوی لە رژێم جیابووەوە. زۆربەی سەرکردەکانی بۆ دەرەوەی وڵات رایانکرد. سەرەڕای راوەدوونانی بێوەستانی دەزگاکانی ئەمن بۆ ئەندامانی. بەڵام خودی حزب ئامانج نەبوو، هێندەی کە تەڵەیەك بوو بۆ ئەو کەسانەی کە سەدام هەستی دەکرد جێی متمانە نین. دوای ئەوەی سەدام رادەی هێزی چەپرەوەکانی لە پۆستەکانی باڵای بەعس هەڵسەنگاند. دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی پەیوەستیی ئەندامانی حزب بە مۆدێلی نەتەوە خوازی و وەحدەی عەرەبی– ئەوەش توخمێکی دیکە بوو کە ناسنامەی بەعسی جیا دەکردەوە. لەگەڵ ڕێکەوتنامەکانی کام پدێڤد لە نێوان میسرو ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٨ کە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی تووشی شۆك کرد ڕێگە خۆشبوو بۆ ئەوەی ئەو پلانە جێبەجێبکرێت. و سەدام حوسێن ویستی بیقۆستێتەوە لەرێگەی هەوڵدانی بۆ ئەوەی عێراق سەرکردایەتی جیهانی عەرەبی بگرێتە دەست.

لە راستیدا هەوڵەکانی عێراق بۆ بینینی رۆڵێکی چالاك و دەستوەردان لە کاروباری جیهانی عەرەبی بە روونی دەرکەوت لەوەتەی ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ یەکلاکردنەوەی

ناکۆکیەکان لەگەڵ ئێران و کۆتایی هاتنی شەڕی کوردو پتەوکردنی دەسەلاتی دەوڵەت تا ڕادەیەکی زۆر هەرێمی و ناوخۆیی بەهۆی داهاتە نەوتیەکانەوە. ئەو هەنگاوانە هاوکار بوون لە زێدەکردنی توندیی هەستی دوژمنکارانە لە نێوان عێراق و سوریا. ئەوەش ئەو پەیوەندییە لە بنەرەتدا پشێوەی تێکدا کە بەهۆی یەکتر تۆمەتبارکردنەکانی دوای جەنگی ١٩٧٣ و بڕوای عێراق بەوەی سوریا یارمەتی کوردی داوە لە جەنگی ١٩٧٤-١٩٧٥دا. دواتر چوونی سوپای سوریای بۆ نێو خاکی لوبنان بەدواداهات لە ساڵی ١٩٧٦داو ، جموجۆڵە سەربازییەکانی دژی هێزە فەڵەستینیەکان لە وێدا، هۆکارێکی دیکەی دایە دەست سەدام کە گومان لە نیازە عروبیەکانی حافز ئەسەدی سەرۆکی سوریا بکات و خۆی بکاتە پاڵەوانی جموجۆڵەکانی بەرگری فەلەستینی و ئەوەش کردەی ڕاستەوخۆی لە دژی ڕژێمی سوریا بە دوادا هات. وای لێهات عێراق هێزە سەربازییەکانی لەسەر سنوری سوریا کۆبکاتەوە (دوای ئەوەی هێڵی نەوتی کەرکوک-فاو لەسەر کەنداو کرابووەوە و چیدیکە پشتی بە بۆڕی بانیاس نەدەبەست). هەروەها هەڵمەتێکی تیرۆرکردنی فراوانی لە دژی هەندێك فەرمانبەری سوریایی دەستپێکرد. کە زنجیرەیەك لە تەقاندنەوەی باڵەخانە حکومیەکانیشی لەگەڵدا بوو.

ساڵی ١٩٧٧. هەر زوو عێراق سەرەکۆنەی سەردانەکەی سەرۆك ساداتی بۆ قودس کرد و پەیوەندییە دیپلۆماتیەکانی لەگەڵ میسردا پچڕاند. لە هەمان کاتدا و ئەوەی پەیوەست بێت بە هەوڵەکانی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن بۆ سورانەوە لە سەرکردایەتی سوریاو دابڕاندنی. هەردوو سەرکردە هەلەکەیان قۆستەوە بە هاندانی هەڵسان بە جموجۆڵێکی پتر رادیکاڵیانە لە جیهانی عەرەبی زیاتر لەوەی کە ئەو وڵاتانەی ئامادەبووی کۆبوونەوەکەی ١٩٧٨ی لوتکەی تەڕابلوس چاوەڕوانیان دەکرد. ئەو کاتە وا دەردەکەوت عێراق پێی باشترە (چارەسەرێکی مامناوەندی) پەیڕەو بکات، بەو پێیەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کاریگەری دەبێت، ئەوەش هەوڵێك بوو لە هەوڵەکان بۆ سەرۆکایەتی کردنی جیهانی عەرەبی. ئەو پلانە سەریگرت کاتێك لوتکەی بەغدا لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٨ گرێدراو

سەرکردەکانی جیهانی عەرەبی هێنایە عێراق و سەدام حوسێنی خستە نێو شانۆی عەرەبی بەبێ ئەوەی میسریش بە تەواوەتی دووربخاتەوە. ئەوکاتە عێراق بە شێوەیەکی لاواز پەیوەندییەکانی لەگەڵ میسر دەستپێکردبووەوە.

جێی ئاماژەیە. لوتکەکە دوای بڵاوکردنەوەی بەڵگە نامەیەکی کاری نیشتمانی هاوبەش لەنێوان سوریاو عێراق لە تشرینی یەکەم هات. وەك بەڵگەیەك بۆ نزیکبوونەوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە نێوان هەر دوو سەرۆکی سوریا و عێراق. هاوینی ساڵی ١٩٧٨ پڕبوو لە تۆمەت و چەمکی خەتابارکردنی یەکتری. بەڵام لەگەڵ هاتنی پاییز دەرکەوت هەردوو ڕژێم نیازی ئاشتبوونەوەیان هەیە، تا ڕادەی بەکارهێنانی زمانی وەحدەی عێراقی ــ سوری کە لەمێژبوو فەرامۆشیان کردبوو. سەبارەت بە ئەسەد دوورکەوتنەوەی میسر لە هەر هاوپەیمانیەکی سەربازیی پێشبینی کراو لە دژی ئیسرائیل وا دەکات سوریا لاواز بێت. عێراقیش بە دەوڵەمەندیەکەی بووە مایەی گێڕانەوەی هەندێك لە شێوەکانی هاوسەنگی ستراتیژی بۆ ناوچەکە . بەکارهێنانی وتاری وەحدە. تەنها نرخێکی سادە بوو کە سوریا بۆ دامەزراندنی هاوپەیمانیەکی ستراتیژی دەیدا. بەڵام سەبارەت بە سەدام حوسێن. چاکتر بوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ دراوسێکەی ڕۆڵێکی سەرەکی دەداتە عێراق لە ناکۆکی عەرەبی ئیسرائیلیدا، هەروەها پێگەی سەدام حوسێن بەهێز دەکات و دان پیانانێکی پراکتیکی دەبێت بۆ پێویستی پارمەتی عێراق. جێی ئەگەریش بوو هاوپەیمانییەکی ستراتیژی لە نێوان دوو ڕژێمی بەعسی پرسی وەحدە لەنێوان هەردوو وڵات بخاتەروو. لەگەڵ ئەوەی ئەسەدو سەدام نیازیان نەبوو بەجدی هەوڵ بۆ وەحدە بدەن. بەڵام بەرژەوەندی هەردوو سەرکردە لە پایزی ساڵی ١٩٨٧ دەیخواست وا دەرکەون کە خۆیان بۆ ئەو کارە ئامادە دەکەن.

ئەو پەیوەندییە دروست بووەی نێوان دوو دوژمنی بەعسی سەرسەخت بووە پەرژینێك بۆ پرۆسەیەکی پاکتاوی دراندانە کە سەدام حوسێن دژی ئەندامانی حزبی بەعسی عێراق ئەنجامیدا. ڕێگەی بۆ خۆشبوو لە ماوەی زستانی ١٩٧٨ و

بەهاری ۱۹۷۹دا چاودێری هاوکارانی بکات. رەنگە لە رابردوو هەندێ خەیاڵاتی بەمێشکدا دەهات لە هەمبەر پابەند بوونیان بە وەحدە، بەڵام ویستی رادەی ئارەزوویان بۆ قۆستنەوەی ئەو پرسە بزانێت بۆ بەدەست هێنانی پاڵپشتی لە نێو ریزەکانی خوارەوەی حزب ئەویش لە رێگەی ژەنین لەسەر ژێی نەتەوە خوازی عەرەبی کەتاکو ئێستاکەش جۆشی ژمارەیەکی زۆر لە بەعسیەکان دەوروژێنێ. بەو شێوازە دەتوانێت پلەی لایەنگران بۆخودی کەسێتی سەدام و هەڵوێستیان لەهەمبەر هێڵی (یەکەمجار عێراق) ئاشکرا بکات. کە زیاتر لەو ساڵانەی حوکمکردنیدا روون ببووەوە. چالاکی لێژنەکانی ئامادەکاری هێور بوونەوەو ئەو کەسانەی سەرکەوتوو نەبوون لە بینینی ئەو ئاستەنگانەی کەحکومەت داینابوون، بەجودا خوازی پێشبینی کراو لە قەڵەمدران.

لەو کاتەدا، رۆژهەڵاتی ئێران رووداو و پێشهاتی وای بەخۆوە دەبینی کە وای لە سەدام کرد دەسەڵاتە رەهاکەی خۆی بەهێز بکات. رژێمی عێراق بە چاوی سۆزەوە تەماشای ئۆپۆزسیۆنی روو لە گەشەی دژ بە شای ئێرانی نەکرد، بە تایبەتیش لەو رووەی کە بە پیاوانی ئایینی شیعە جوداخوازەکانەوە گرێدرابوو. بەو هۆیەوە لە تشرینی یەکەمی ۱۹۷۸دا عێراق رەزامەندی لەسەر داوای ئێران بۆ دەرکردنی ئایەتوڵڵا خومەینی لە نەجەف دەربڕی. ئەو رێکارە وای کرد خومەینی ببێتە سەرکردەی شۆرشی ئێران کە شای لەسەر حوکم لاداو رژێمێکی تازەی لە شوباتی ۱۹۷۹ دامەزراند. سەرەرای مەترسیەکانی هەر زوو حکومەتی عێراق دانی بە حکومەتی تازەی ئێران نا. بەڵام کاریگەری ئەو شۆرشە گرنگتر بوو لە رێکخراوە نهێنیەکانی عێراق، وەك حزبی دەعوە، رووداوەکانی ئێران جۆشی ئەوانی ورووژاند و پاڵی پێوەنان هێرش بکەنە سەر چەند کەسایەتیەکی فەرمی رژێمی عێراق. سەرەرای ئەوەی چالاکیەکانیان سنوردار بوو، بەڵام حکومەتی عێراق وەك هەر حکومەتێکی دیکەی ناوچەکە، سەرکەوتنی شۆرشگێرانی ئێران و دامەزراندنی بزووتنەوەیەکی هاوشێوەی لە عێراق دووچاری توورەبوونی کرد. بۆیە

هەڵمەتێکی توندی سەرکوتکردن لە دژی ئەندامانی حزبی دەعوە و ڕێکخراوەکانی هاوشێوەی ئەو دەستی پێکرد.

ئەو سیاسەتە سەرکوتکارانە بووە مایەی نارەزایی سەرکردەکانی شیعە، دەیارترینیان ئایەتوڵڵا مەحەمەد باقر ئەلسەدر بوو کە خرابووە ژێر مانەوەی بەناچاری لەماڵ لە حوزەیرانی ١٩٧٩دا . رەنگ دانەوەی ئەوە ترسی لای رژێم دروست کرد لەوەی کە شیعە هەست بەزوڵم لێکردن و ناخۆشی بکەن بە کرداریش وایان کرد و خۆپیشاندانێکی بە کۆمەڵیان بۆ پاڵپشتی سەدر ئەنجامدا و نارەزاییان دژی حکومەت دەربڕی لە نەجەف، دواتریش لەکەربەلاو کوفە و شاری سەورە، کە گەرەکێکی میلیی بەغدایە و زۆربەی دانیشتوانەکەی شیعەن. لە راستیدا دەزگای چاودێری و سەرکوتکردنی بەعسی لە شاری سەورە بەهۆی نارەزاییەکان داڕووخا. ئەو ڕووداوانە مەترسییەکانی سەدامی دوو ئەوەندە کرد لە هەمبەر هێزە شاردراوەکانی شیعە و بێ توانایی لە پشت بەستن بە حزبی بەعس لەکاتی تەنگژەکان. لە جیاتی ئەوە پەنای بردە بەر دەزگاکانی ئەمن کە جێی متمانەی زیاتر بوون. لە ڕێگەی پەنابردنە بەر توندوتیژی کۆنترۆڵی شەقامی کرد و نزیکەی پێنج هەزار کەسی دەستگیرکرد لەنێوانیاندا ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی ئاینی شیعە و تەنانەت هەندێك زانای ئاینی سوننەش دەستگیرکران. لە سێدارەدان چارەنووسی زۆربەیان بوو. هەروەها زۆربەی پیاوانی ئاینی شیعە لە عێراق دەرکران، بەڵام سەدر هەر لەژێر دەستبەسەری بەناچاری مایەوە، بەڵام وتارەکانی لە دژی رژێم لەسەر کاسێت تۆمار دەکراو شیعە و سوننەکان لەنێوان خۆیاندا بڵاویاندەکردەوە، ئەوەش دەنگۆیەکی گەورەی لەسەرتاپای عێراق دروستکرد. ئەو پێشهاتانە بووە هۆی تەنگژەیەکی نیشتمانی لەوڵات. هەروەها تەنگژەیەکی زۆر مەترسیداری بۆ رژێم دروستکرد. سەدام بڕیاریدا هەنگاوی خۆی بهاوێت. بەشێوەیەکی کتوپڕ ئەحمەد حەسەن بەکر دەست لەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاند، دوای چەند کاتژمێرێك سەدام حوسێن وەك سەرۆك کۆمار سوێندی یاسایی خوارد. یەکێك لە پیاوەکانی خۆی کە جێگەی متمانەی بوو عیزەت

ئیبراهیم ئەلدوری کردە جێگری سەرۆك. هاتنە سەر کورسی سەرۆکایەتی لەلایەن سەدامەوە تاڕادەیەك شتێکی روالەتی بوو، بەلام زۆر مانای رەمزی دەدا، بەلام خێرایی کردارەکە دەریخست سەدام حوسێن خۆی دووچاری مەترسی ناکات و رێگە نادات هیچ بەرهەلستکاریەك دژی حوکمی کەسیی ئەو هەبێت. ئەوەش شتێکی پێویست بوو لە هەمبەر ئەو پڕو پاگەندانەی دەکرا کە، گوایە ئەحمەد حەسەن بەکر لەترسیی سەدام حوسێن خەریکی ئامادەکاری بوو بۆ ئەوەی حافز ئەسەدی سەرۆکی سوریا لەجێی خۆیدا بنێت و یارمەتیش لەو بەعسیانە بەدەست بێنێت کە رشتبوون لەسەر ئەوەی نابێت سەدام گەورەتر بکرێت و پلەی زیاتری پێبدرێت و بچێتە سەرووی دەسەلات. ئایا ئەحمەد حەسەن بەکرد ئەو نیازەی هەبوو یان نا، مانەوەی لەسەر ژیان ئەوەی رەتکردەوە کە سەدام بڕوای بە پڕوپاگەندەکە کردبێت. لەوەش گرنگتر ئەوەبوو دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤی سەدام لەناو حزبدا خرابووە بەر تاوتوێکردن.

سەدام حوسێن بەخێرایی و دلڕەقانە کاریکرد بۆ لادانی، هەموو ئەوانەی کە بڕوای وابوو کە گوێ رایەلی نابن. لە کۆتاییەکانی تەمموزی ١٩٧٩دا رایگەیاند، هێزەکانی ئەمن کودەتایەکیان ئاشکرا کردووە ـــ دواتر رایانگەیاند کە سوریا پلانی بۆ داناوەو مەبەستی رووخاندنی رژێمی عێراق بووە بە یارمەتی ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ـــ لەگەل ئەو راگەیاندنە دراماتیکیە داوای کۆبوونەوەیەکی تایبەتی حزبی بەعس کرا. یەك لەو دوو گوایە پیلانگێڕانە بەناوی ئەلمەشهەدی کە ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو دانی نا کە دەستی لە پیلانەکە هەبووەو وردەکاری لەبارەوە درکاند و ژمارەیەك لە هاوکارانیشی لەگەل خۆی تووشکرد. سەدام حوسێن لە لیستێکی دوور و درێژ ناوی بەشداربووەکانی پیلانەکەی خوێندەوە، هەر لەوێ دەستگیر کران و لەکەشوهەوایەکی پڕ لە ترس و دلەڕاوکێ راپێچی دەرەوەی هۆلی کۆبوونەوەکە کران، لە بەرامبەردا سەدام جگەرەیەکی گەورەی داگیرساند و خۆی دلتەنگ نیشاندا لەهەمبەر هەندێك لەو ئەندامانەی کە لەهەمووان زیاتر متمانەیان پێدەکرا.

دوای ئەو کۆبوونەوە زیاتر لە شەست کەس لە دیارترین ئەندامانی رژێم دەستگیرکران و لەبەردەم دادگایەکی تایبەت دادگایی کران کە یەکێك لە پیاوەکانی سەدام حوسێن سەرۆکایەتی دەکرد بەناوی نەعیم حەداد. زۆربەیان حوکمی مردنیان بەسەردا سەپێنرا لەوانە ئەلمەشهەدی و ئەندامەکانی دیکەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و عەبدولخالق سامەرائی کە لەوەتەی سالّی ۱۹۷۳ وە لە زیندان بوو. بەو شێوەیە لەو کاتە ژمارەیەك حیسابات یەکلاکرایەوە. رەنگە نزیکەی ۵۰۰ کەس لە گەورە ئەندامانی حزب لە سێدارە دران. کەچی ئەوانی دیکە پاکسازییان تێدا کراو پۆستەکانیان لێ سەنرایەوە یا لەبەر ئەوەی بەبالّی چەپرەو گرێدرابوون لە حزب یا لەبەر ئەوەی جۆشیان بۆ وەحدە لەگەلّ سوریا هەبوو یا لەبەر ئەوەی لایەنگری ئەو پیاوە گەورانەی ئەندامی رژێم بوون کە بە بەشداریکردن لە پیلانەکەی سوریا تۆمەتبار کرابوون. لە سادەترین حالّەتیشدا سەر پێچیان لەو بنەمایانە کردبوو کە تۆڕە فراوانەکانی بازنەی فەلەکی سەدام پابەندبوون پێوەی .

## سەرۆکایەتی سەدام حوسێن و جەنگ لەگەلّ ئێران لە سالّی ۱۹۸۰

دوای ئەو هەلّمەتە فراوانەی پاکسازی کە حزب و سەرکردایەتی بەخۆوەی بینی، ئەو کەسانەی لە پۆستەکانی حۆیان مابوونەوە هەستیانکرد زۆر بە سەختی توانیویانە پارێزگاری لێبکەن. گوێڕایەلّی کردن بۆ سەدام و خۆنزیك کردنەوە لێی بووەتە پێوەری بەرزبوونەوە و مانەوەی سیاسی. هەندێك جاریش جەستەیی. ئەو تەسلیمبوونەش دەستکەوتی خۆی هەبوو، بەلاّم ئەوەی بەدوادا دەهات دەبێت حوکمی سەرۆکت لەهەموو پۆستەکانی پەیوەست بە بەعس و چارەنووسی هەرکەسێك قەبوولّ بێت. سەدام حوسێن کە گەیشتبووە تەمەنی ٤٢ سالّی کاتێك کورسی سەرۆکایەتی وەرگرتبوو لە رێگەی بەکارهێنانی تێکەلّییەکی سەر سوڕهێنەر لە سیحر و توندوتیژی و رێز لێگرتن گەیشتە ئەوەی کە پێیگەیشت.

سودی زۆری لێبینیٚ بۆ پارێزگاریکردن لە پێگەی خۆی وەك حاکمی عێراق بۆ ماوەیەك کە هیچ کەس لەوانەی پیشە خۆی نەیان بینیبوو.

کاتێك گەیشتە دەسەڵات، لەسەرەتا سەدام حوسێن لەلایەن ئەحمەد حەسەن بەکری خزمیەوە گرنگی پێدەدرا. بەڵام هەرزوو هەستی بەوەکرد کە پێویستە هەژموونێکی تایبەت بەخۆی دابمەزرێنێت. نەیدەتوانی لەچوارچێوەی چینە کۆمەڵایەتییەکانی عێراق ئەو کارە بکات، چونکە باری کۆمەڵایەتی لە ئاستێکی زۆر نزمدابوو چونکە کوڕی جوتیارێکی بێ زەوی بوو، بەردەوام پشتی بەخزمەکانی دەبەست کە لەوان دەوڵەمەند تر و پایە بەرزتربوون. هەروەها لە تۆڕەکانی هێزە چەکدارەکان دوورخرایەوە چونکە هیچ باگراوندێکی سەربازیی نەبوو. لە ئاکامی ئەوەدا سەدام پشتی بە داهاتە تایبەتییەکانی و حەز و ئارەزووەکانی خۆی بەست، متمانەی بە خەڵکێکی کەم هەبوو ئەو کەسانەی هەڵبژارد کە سوودی پێدەگەیەنن، کەچی ئەوانی دیکەی ترساند و سەرجەم پیاوەکانی خۆی خستە نێو تۆڕی قەرزاری و چاودێری و کلیلەکەشی تەنیا لای خۆی بوو. بنەما ئایدۆلۆژییەکان نەیانتوانی لە ڕێگەیدا بوەستێت، بەڵکو توانی توانا گرنگەکانی خۆی لە حزبی بەعس تەواو بکات و دەزگاکانی هەواڵگری و ئەمن پەرەپێدات و کۆنترۆڵی ناڕاستەوخۆی بەسەر سەرجەم دەزگا گەورەکانی دەوڵەت پتەوبکات.

گەیشتنی سەدام حوسێن بۆ دەسەڵات، بە سروشت و ئەنجامەکانی ، ئەو دوو فاقیەی بەهێزکرد کە ماوەیەکی درێژبوو بالی بەسەر دەوڵەتی عێراق کێشابوو. لەلایەکەوە، ڕژێمێکی بیرۆکراتی فراوان و ئاڵۆز دامەزرابوو کە ڕەنگیدابووەوە سەر ژیانی عێراقییەکان لەهەموو بوارێك و ڕێوشوێنە فەرمیەکان زیادیکردبوو و پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر بەڵگەنامە و سوپایەك لە فەرمانبەران دەکرد بۆ خزمەتی ڕژێم و کە زۆر جەختی دەکردەوە سەر ملکەچی بۆ فەرمانەکان و بەرپرسیارییەتی توند و وردبینی لە وردەکارییە شێوەییەکان و هەلسوکەوتەکان . لەگەڵ ئەو ئاڵۆزیە گەورەیە لە دەوڵەت و بیرۆکراتیەکانی حزب ، زۆر ئەستەم

بوو فەرمانبەرێك بتوانێت بیرۆکەیەکی فراوانی هەبێت. چونکە ئەرکەکەی تەنها لەسەر رۆڵێکی بچووك لە دەزگایەکی گەورەی دەوڵەت چڕدەبووەوە. ئەگەرنا دەبوایە رووبەڕووی رێکاری تەمبێکردن ببێتەوە کە سیفەتێك بوو لە سیفەتەکانی رژێم. ئەو تۆڕە ئاڵۆزەی رێوشوێن تاکەکانی بە کارە وەزیفیە دیارکراوەکەیان بەستابووەوەو و وایلێکردبوون زۆر لاوازبن بەرامبەر ئەوانەی بە پراکتیکی دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست.

لێرەوە رووێکی دیکەی دەوڵەت بەدیارکەوت. وەك بزوێنەری دەسەلات داهاتەکانی کۆ دەکردەوەو پاداشتی دەداو پارێزگاری لە کۆنترۆڵکردنی هاوولاتیانی دەکرد. جەختی لەسەر بازنە تەسکەکانی لایەنگرانی سەدام حوسێن دەکردەوە. کە یا بەهۆی خزمایەتی یا بەهۆی باگراوندی ئاژاوەگەرێتی یا لە رێگەی مێژووی متمانەی کەسێتی بەسەدامەوە گرێدرابوون، ئەو جۆرە کەسانە ناوەرۆکی رژێمی عێراقیان پێکهێنا. کە لە زۆربۆنەدا لەو پێنج ساڵەی رابردوودا تاقیکرابوونەوە. ئەوکاتە دەیانتوانی لایەنگریی کەسانی دیکە بکەن لە عەشیرەتەکانی خۆیان یا بچنە پاڵ رەوتە ئایدیۆلۆژیەکانی دیکەی حزب یان ئەفسەرە سەربازیە ئینتیهازیەکانی دیکە، بەڵام لە جیاتی ئەوە هەر بە وەفاداری بۆ سەدام مانەوە. ئەوە وای لێکردن جێی متمانە بن. کە سەدام توانی متمانەیان بداتێ بۆیە پرسی ئەو بووە پرسی ئەوان و بە شێوەیەکی توند پێوەی بەسترانەوە تا ڕادەیەك چارەنووسیان بە چارەنووسی ئەو بەسترایەوە.

ئەوەش پرەنسیپێکی تایبەتی بە دەوڵەت بەخشی، کردیە بوارێك لە نێو بازنەیەکی تەسکی خزمەکانی لەوانەی تۆڕی هاوپەیمانیەتی و بەرژەوەندی کۆیان دەکاتەوە کە سەختە ئەوانی دیکە بتوانن بچنە ناوی تەنها بە فەرمانی خودی حاکم نەبێت. ئەو دەوڵەتی خاوەن سولالەیە بە ناوەڕۆکەکەی، کە زیاتر شێوازی باوکایەتی و کەسێتی تارادەیەکی زۆر پێوەدیاربوو. لە جیهانێکی کۆمەلایەتی کە تەواو ئاگای لە جیاکارییەکانی نێوان رەچەڵەکەکان و میلەتەکان و عەشایەرو رەگەزەکان هەبوو. ئەوەش وایکرد سەرجەم گروپەکانی دیکە وەکو ناوازە وابن. ئەگەری ئەوە

هەبوو هاوپەیمانی لە نێوان ئەو گروپانە دروست بێت. بەڵام دڵی ڕژێم شێوەیەک لە شێوەکانی متمانەی دەگرتەوە کە بەندبوو لەسەر ئەو یەکگرتوویەی کە دووبارەنابنەوە. ئەو متمانە مەرجێکی پێویست بوو بەڵام بەس نەبوو بۆ ڕێکخستنی ئەو بازنەیە و هەروەها ڕەهاش نەبوو. بەڵکو دەکرا بە چەند ڕێگەیەک تێکبشکێنرێت . ئەمە سەرباری ئەوەی کە ملکەچی بۆ حاکم دەبێتە جێگەی پرسیار ئەگەر بێتو ئەوەی دوایی بەتوانا نەبوو یا بەخشینی خۆی بەسەر بازنە نێوخۆییەکەی بڕی. دواتر لەوکاتەی حاکم بۆچوونەکانیان بەهەند وەردەگرێت. بەڵام ڕازی نابێت ئەوان بەسەریدا بسەپێنن و بەئاگادارییەوە لەگەڵ ئارەزووەکانیان هەڵسوکەوت دەکات.

لەبەر ئەم هۆیە. بەرژەوەندی سەدام وای دەخواست بوونی خۆی لەوە زیاتر بسەپێنێت کە تەنیا یەکێکە لە تکریتیەکان. پێویستی بە جەختکردنەوە لەسەر تاکڕەوی و توانا بێ وێنەکەی خۆی بوو لە سەرکردایەتیکردنی لایەنگرانی لە بنکەکانی باڵ بەسەردا کێشان و سوودمەندیەکان. کە هیچ سەرۆکێکی پێش خۆی پێی نەبەخشیبوون. دواتر سەدام هەوڵی دا یەکگرتوویەکی سیاسی بەسەر عێراق بسەپێنێت بەشێوەیەکی زیاتر لە هەموو ئەوانەی پێشە خۆی و بە شێوەیەکی سەرەکی لە کەسی خۆیدا بەدیدەکرا..هەوڵیدا گوێڕایەڵی کردن بۆ ئەو یەکگرتوویە ببێتە پرسێکی هاوبەشی گەلی عێراقی پێکهاتە ئاڵۆز. لە ژێر سەرکردایەتی ئەودا ئەفسانەی بێ وێنە لەسەر ناسنامەی عێراق ڕاگەیەنرا. باس لە سەرکردە کۆنەکانی دەسەڵات ڕەها دەکرا و جەخت لەسەر ئازایەتیانەی ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی هاوبەشیان دەکرایەوەو هێڵێکی بەردەوامی زنجیرەی سیاسی دروستکرا کە سەردارانی مەملەکەتە کۆنەکانی دۆڵی ڕافیدەینی خەلیفە عەباسیەکان و خودی سەدام حوسێنی بەیەکتر دەبەستایەوە.

لەگەڵ دانیشتی سەدام لە سەر کورسی سەرۆکایەتی کەوانەیەکی سەرنج ڕاکێشی لە ڕادەبەدەری بۆ کەسایەتی خۆی لە چوار دەوری خۆیدا خولقاند. وا هێنرایە بەرچاوان کە نوێنەرایەتی هەموو گەلانی عێراق دەکات. لە ناسنامەی تایبەتیان

وەك ئەندام لە كۆمەڵگە جۆراو جۆرەكانی و لە پێگەی هاوبەشیان وەك هاوڵاتیانی حكومەتی عێراق. دام و دەزگای نیشتیمانی بۆ پاڵپشتیكردنی ئەو ئەفسانە نیشتمانیانە دامەزرا. حزبی بەعس لەسەر ئاستی وڵات بوو بە رێكخراو و گەیشتە بچوكترین گوند و هەزارترین گەرەك، بە شێوەیەك پێشتر نمونەی نەبوو. هەروەها ناونووسكردنی گشتی ژمارەیەكی ئێجگار گەورەی عێراقیەكانی بۆ خۆی راكێشا. بەشێوەیەك فراوانبوونی بودجەی بەرگری رێگەیدا قەوارەی هێزە چەكدارەكانی زۆر بەفراوانی زیاد بكات. سەرەڕای ئەوە سوپای میللی و رێكخراوی لاوان بە شێوەیەكی زۆر بەربڵاو خرانە ناو ئەو پێكهاتانەی كە رژێم دروستی كردبوو. لە دواییدا، سەدام حوسێن ئەنجومەنی نیشتمانی لە ئاداری ١٩٨٠ دامەزراند، ئەوە یەكەم پەرلەمان بوو داوای رووخانی رژێمی پادشایەتی لە ساڵی ١٩٥٨دا . بەلأم ئەنجومەن وەك رواڵەتێكی رەمزی دامەزرابوو. لە راستیدا هیچ توانایەكی نەبوو و. ئەندامانی خرابوونە ژێر چاودێری دەزگاكانی ئەمن. بەلأم ئامانج لەو پەرلەمانە پێدانی وێنایەك بوو كە حكومەت لە ژێر چاودێری گەلدایە ، بۆ ئەوەی ببێتە رەمزێكی دیكە بۆ یەكگرتوویی نیشتیمان و سەكۆیەكی دیكە بۆ سەدام بۆ ئەوەی خۆی وەك سەركردەیەكی نیشتمانی بخاتەڕوو.

لە راستیدا دامەزراندنی ئەو جۆرە دامو دەزگایانەو بەردەوامبوونیان مەودای مرونەتی دەوڵەتی عێراقی دەرخست. سەدام زۆر بە توانا بوو لە قۆستنەوەی. ئەو دام و دەزگایانە خرانە ژێر فەرمانی خۆی و فەرمانی بازنە تەسكەكەی لایەنگرانی. ئەو دام و دەزگایانە (نیشتمانی) بوون بەو پێیەی خەڵكی لە سەرجەم كەرتەكاتی كۆمەڵگای عێراقی گرتبووەخۆ. هەروەها دەزگایەكی گەورەی دروستكەری ئەفسانەكانی بۆ تەرخانكرابوو تا جەخت لەسەر شێوازی نیشتمانی بكاتەوە. سەبارەت بە هەندێك كەس ئەوە بووە هۆی ئەزموونی هاوبەش . بەلأم لە راستیدا لە هەمان كات بووە ئامرازێك بۆ پێڕەویكركردنی سیاسەتی مەحسوبیەت. كە لە رێگەیەوە پاداشتی ژمارەیەكی گەورە لە سەرجەم كۆمەڵگا جۆراوجۆرەكان دەكرا بە گەیشتن بە سەنتەرەكانی هەژموون و گەیشتن بە سەرچاوە داراییەكان كە

بەسەرکردایەتیان دەبەستێتەوە. بەڵام سەبارەت بەوانەی ئەو سیاسەتەیان ڕەتکردەوە، دەرگاکان لە ڕوویان داخرا. تاکە ئەڵتەرناتیڤ لەبەردەم هەندێك ئەوە بوو عێراق بەجێ بێڵن. لەو ساڵانەدا کۆچکردنی پیشەییەکان و بیرمەندە عێراقیەکان ڕوو لە زیاد بووندا بوو تا گەیشتە نیو ملیۆن کەس لە ناوەڕاستی هەشتاکان و درێژەدان بە ژیانیان لە شوێنی دوور لەو چاودێریەی کە دەوڵەتی سەدام حوسێن پەیڕەوی دەکرد. دواتر ئەوانەی بە دەزگای نیشتمانی ناو دەبران، تەنها تۆڕێك بوو لە نێوان گەورەو شوێنکەوتوانی. ئەو توندو تیژیەی بەکارهێنرا لە دژی ئەوانەی بە ڕووی ڕژێم وەستا بوونەوە قووڵتری کردەوە. خێروبێری حاکمی بەسەر ئەو هێلانە دابەشکرد کە پاڵپشتی ئەو ئەفسانە درۆیە فەرمیەیان دەکرد کە دەڵێت ناسنامەی عێراق یەکگرتوو و تایبەتمەندە.

ئەو شاراوەییە باڵی بەسەر هەموو شێوەکانی ژیانی سەندیکایی کێشا، لە سەندیکا و ڕێکخراوەکانی جوتیاران و یەکێتی گشتیی ئافرەتانی عێراق. کە بە کاتێکی کەم دوای کودەتای ساڵی ١٩٦٨ دامەزرابوو وەك ڕێکخراوی رابیتەی ئافرەتان کە لە سەرەتای شەستەکان دامەزرابوو هەوڵیدا لە ڕووواڵەتەوە دەنگی ئافرەتە عێراقیەکان بگەیەنێت. هەوڵەکانی یەکێتی ئافرەتان سەرکەوتوو بوو کاتێك ئەرکەکانی بوژانەوەی حکومەت. لەگەڵ ئەوە یەکیگرتەوە کە ئافرەتانی عێراقی سەرقاڵ کردبوو. بە تایبەتیش لە بوارەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری و فێرکردن و هەلی بەشداربوونی هێزی کاری نا کشتوکاڵی (کە بەردەوام ئافرەت تێیدا پشکی سەرەکی هەبوو). ئەندامیەتیەکەی بەرز بووەوە کە حکومەت بە شێوەیەکی بەرچاو چاودێری دەکرد. هەروەها بە گوێرەی دەرامەت و ئاسانکاری تایبەت بە ئافرەتان لە بوارەکانی فێرکردن و تەندروستی. لە ساڵی ١٩٧٨ ئافرەتان هەنگاوێکی جۆریان بە دەستهێنا لە ڕێگای گۆڕینی یاسای باری کەسێتی، کە دادگاکانی سەر پشك کرد لە دەرکردنی حوکم لە دژی ئەدامە نێرینەکانی خانەوادەی ئافرەت. هەندێك هیوادار بوون ئەوە ڕێگە بۆ سەربەخۆیی ئافرەت لە عێراق خۆشبکات. کە بە درێژایی مێژوو دووچاری سەرکوتکردن ببووەوە لەلایەن

بیروبڕوای پیاو سالاری. کە بە شێوەیەکی توند بە پەرەسەندنی دەوڵەتەوە گرێدرا بوو. بەلام لە کاتی وردبینی لە پرسەکە. بینرا کە نەرمی نواندنەکە هێندە گرنگ نەبوو. هەروەها ئافرەتیش ئەو توانایانەی نەبوو ئەو مافانەی خۆی بە هێز بکات کە یاساکە پێیدابوو. کاروباری ئەویش وەکو سەرجەم عێراقیەکان. هەرکاتێك سەدام بیەوێت دەکرێت سەرکوت بکرێت. لە حالەتی ئافرەتانی عێراق ئەوە سالی ١٩٨٨ بەتەواوی لە رێگەی دەرچوونی یاساکەوە بە دیارکەوت کە هەر تەنیا دان بە کوشتنی ئافرەت نانێت بە هۆکاری تۆلە سەندنەوەی شەرەف لە کۆمەلگای عێراقی، بەلکو بە شێکی ئاسایشیشی لە قەلەمدەدات. ئەوەش رێگەی بۆ پیاوان کردەوە هاوسەرەکانیان یان خزمە ئافرەتەکانیان بکوژن بەو بەهانەی کە شەرمەزارییان بۆ خانەوادەکانیان هێناوە بەوەی کە زینایان کردووە.

کاتێك سەدام و لایەنگرانی دلی دەسەلاتەکەیان لە دەوڵەتی عێراقی بونیادنا، نەك تەنیا بنەماکانی کۆمەلگەو ئەندامانیان بەهەند وەرگرت، بەلکو تەماشای پشتی ئەو بناغە کۆمەلایەتییە تەسکەشیان کرد. سیاسەتی خۆلێنزیکردنەوە کە پەیرەوییان دەکرد هەر لەسەر هۆزە عەرەبیە سوننەکانی باکوری رۆژئاوا چڕنە بووەوە. هەرچەندە پێگەکانی سەرکردایەتی رژێم لە دامودەزگەکانی ئەمن بەبێ جیاوازی بە دەست ئەو کەسانە بوو کەسەر بەو باگڕاوەندەن. لە هەندێك بوارەوە وەك قەیلەقی ئەفسەران، کە بەدەستە بالای عەرەبی سوننە ناسراوە و دەرهاوێشتەی مێژووی دەوڵەتی عێراقیە. مایەی هەلەیە بەلکو مایەی مەترسیە لەلای گروپێکی دیکە ئەو سیاسەتەی خۆلێنزیکردنەوە پەیرەو بکرێت، لەگەل ئەوەش دا زۆر پۆستی گرنگی رەمزی و رێکخراوە ناوخۆیەکان نوێنەرایەتیەکی هاوکوفی پێکهاتەی تەواوی دانیشتوانی عێراقی بە جیاوازی ئینتیمایانەوە لە خۆگرتبوو .

لە راستیدا ئەوە بریتی بوو لە بەشێکی گرنگی ستراتیژییەتی سەدام حوسێن. بە سەپاندنی دەستە بالایی خۆی بەسەر گەلی عێراق. هەولیدەدا بناغەیەك بۆ پاشکۆیەتی عێراقی دابنێت کە رۆلێکی گرنگ دەبینێت لە مانەوەی رژێمەکەی. لە

پەنای ئەوەوە هیوادار بوو هەندێك سەرکردەی ناوەخۆ لێبخات لە کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگەکانی خۆیان کەتاکو ئەو کاتە بەدەستیانەوە بوو. هەندێکی دیکەش بخاتە ژێر کۆنترۆڵ کە تەسلیمی هۆزەکەی یا تایەفەکەی بە دواوە دەبوو. ئەوەش وایکرد پێگەیەکی بێ وێنەی هەبێت هەروەها کەسە نزیکەکانی دڵنیا دەکردەوە کە دەتوانێت بەردەوامی رژێمەکەی گرێنتی بکات کە دەتوانێت رێگەیان پێبدات پارێزگاری لە تایبەتمەندییەکانیان بکەن. ئەمەش گرنگترین پرس بوو بە پێی ئەو مەترسی و تەحەدییە ئیتنی و تایفیەکان لە ساڵی ١٩٧٩دا.

لەو کاتەدا کوردستان جارێکی دیکە شەڕی پارتیزانی تێدا بەرپا ببووەوە. کە هەر لە بنچینەدا پارتی دیموکراتی کوردستان رێکیخستبوو. کە تیایدا باڵا دەستی ئیدریس و مەسعود بارزانی بەسەر ئەو کۆنگرەیەی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩دا گرێدرا تەئکید کردەوە (مەلا مستەفا لە سەرەتاکانی ئەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردبوو). سەرەڕای ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بە شێك لە تواناکانی خۆی ئاراستەی رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان کردبوو، بەڵام زێدەبوونی هێرشەکانی بۆسەر دامودەزگاکانی حکومەت ، نیشانەیەك بوو بۆ ئەوەی کە ئاگری کوردستان جارێکی دیکە دەگەشێتەوە. لەگەڵ ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکان لە نێوان بەغداو تاران. پارتی دیموکراتی کوردستان روویکردە ئێران و داوای دەستی یارمەتی لێکرد. چونکە هەر دوو برا ئارەزوویان بوو یارمەتی حکومەت بدەن لە بەرەنگاری ململانێکەی لەگەڵ بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی ئێران ـــ پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان قاسملۆ– پەیوەندییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ تاران بەردەوام بەرەو پتەوبوون دەچوو. لە بەرامبەرداو بەهۆی پەیوەندییە باشەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ قاسملۆ، جەلال تاڵەبانی نەیتوانی بەشداری لەوەدا بکات، بەڵکو پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەغدا دەستپێکردەوەو. سەدام حوسێنیش بۆ ئەوە هانیدا و لێکترازانی ریزەکانی کوردی قۆستەوە بۆ ئەوەی تۆڕەکانی مەحسوبیەتی فراوان بکات و بیگەیەنێتە سەرکردەی هۆزەکان و چینە شارستانە

رۆشنبیرەکان کەبەرەو رژێمی بیرۆکراتی تازە دروستبوو لە عێراق هاتە پێشەوە. یا راستەوخۆ یا لە رێگەی ماکینەی "ناوچەی ئۆتۆنۆمی ."

ئەوەی پشێوی رژێمی زێدەترکردبوو بەردەوامی چالاکی رێکخستنەکانی ئۆپۆزسیۆن بوو لە نێوان شیعەکانی نێو شارەکانی عێراق و ئەو پاڵپشتیەی کە پێدەچوو لەحکومەتی ئێرانەوە لێیاندەکرێت. روو بەڕوو بوونەوە لە نێوان هێزەکانی ئەمن و کەسایەتییەکانی نێو تایەفەی شیعە لە هاوینی ١٩٧٩ بەردەوامبوو. رێکخراوە ئیسلامیە خەباتگێڕەکانیش کە بەنهێنی کاریان دەکرد. ناوە ناوە هانیان دەدان و هەندێك جاریش ئەو روو بەڕوو بوونەوانە بە دەستپێشخەری ئەوان بوو. حزبی دەعوەو جوندی ئیمام و رێکخراوی ریسالەی ئیسلامی هەموو رێکەوتبوون کە پێویستە زەبری هێزو توند و تیژی لە بەرامبەر رژێم بەکاربێت. لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٩دا ، ئەو هەڵوێستە پشتگیری کۆمەڵەی زانایانی ئایینی بەدەستهێنا، کە ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم لەساڵی ١٩٥٨ دایمەزراندبوو، بەرپەرچدانەوەی حکومەت لە رێگەی دەستگیرکردن و لە سێدارەدانی بە کۆمەڵ دەستپێیکرد، جۆرە شەرعیەتێکی خرایە سەر لە رێگەی دەرکردنی مەرسومێك لە ئاداری ١٩٨٥دا کە بە ئەندامبوون لە حزبی دەعوەی بەتاوانێك لە قەڵەمدەدا کە سزاکەی مردنە. لەگەڵ ئەوەشدا، یەکێك لە ئەندامانی رێکخراوی ریسالەی ئیسلامی ویستی تارق عەزیز جێگری سەر وەزیران بکوژێت لەبەغدا لە نیساندا. ئەو هەوڵە بە ئاشکرایە بۆ کوشتنی یەکێك لە دیارترین دەست و پێوەندەکانی سەدام توڕەیی حکومەتی لێکەوتەوە .

لەماوەی چەند رۆژێکدا، ئایەتوڵڵا باقر ئەلسەدر و بنتلهودای خوشکی دەستگیرکران، کە یەکێك بوو لە زانا ئایینیە ئافرەتە بە تواناو سەربەخۆکان و لەنەجەفەوە بەرەو بەغدا راپێچ کران و هەر زوو لە سێدارە دران. ئەوە یەکەمجاربوو لە مێژووی عێراق کە یەکێك لە پیاوە ئایینییەکانی تێدا لە سێدارە بدرێت، ئەوەش نیشانەیەك بوو کە رژێم رشتە لەسەر ئەوەی دەبێ سەرکردەکانی شیعە گوێڕایەڵی رژێم بن. لە هەمان کاتدا، موجتەهیدی گەورە ئایەتوڵڵا ئەلخوئی

لـە نەجـەف دەستبەسـەر کـرا. جـارێکی دیکـە رژێـم دەرکردنـی بـەناو شـیعە ئێرانییەکانی دەستپێکردەوە، ئـەوجارە نزیکـەی ٤٠ هـەزار کەسـی تـەنیا لەسـاڵی ١٩٨٠ دەرکـرد. هـەروەها مـاڵ و موڵکیـان دەسـتی بەسـەردا گـیراو لـە زۆربـەی حاڵەتەکان زیادکردنی بە ئاشکرا فرۆشرا، خەڵکی دیکە بەشداریان لـە لێسـەندنی ماڵ و موڵکی ئەوانە کرد. ئەوە بۆ سەدام گرنگ بـوو، چـونکە دەیویسـت زیـاترین ژمـارەی خـەڵك بـۆ تۆڕەکـانی مەحسـوبیاتی خـۆی رابکێشـێت. کـە لـە سـەرجەم کۆمەڵگەکانی عێراق هۆنرابووەوە. ئەوەش وایکرد هاوپەیمانییەتی لەسـەر بنـەمای بەرژەوەندییـە تایەفیـەکان شـتێکی زۆر سـەخت بێـت. ئـەو رێوشـوێنە تازانـە کـە لەسەر بنەمای دەسەڵات و سەروەت و سامان لەنێو ئەو شیعانەی کـە پشـتیان بـە رژێـم بەسـتبوو ، وایکـرد سـەرکردەی دیکـە لـە شـوێنی زانـا ئاینییـەکان و کەسـە نەیارەکان ئەوانەی سەدام نەیدەتوانی بـە ئاسـانی ئاراسـتەیان بکـات، دەریکـەون زۆربەی ئەوانەش یا لە سێدارە دران یا زیندانیکران یا رایانکردوو چوونە ئێـران کـە لەو کاتەدا ببووە جێی تێڕوانینی حکومەتی عێراق.

پەیوەندی نێوان هەردوو رژێم بەردەوام لە خراپـی بـوو لەوەتـەی سـاڵی ١٩٧٩وە. حکومـەتی عێـراق لەسـەرتادا دەرگـای دۆسـتایەتی لەگـەڵ حکومـەتی بازرگـان کردبـووەوە. بـەڵام دوژمنـداری نێـوان رژێمـی ئیسـلامی تـازەی ئێرانـی شـیعە و حکومەتی عێـراق، تونـدبوو لەهەمبـەر رەفتـارکردن لەگـەڵ ئیسلامییە شیعەکانی عێراق و هیچ بوارێکی بـۆ ئاشـتەوایی نەهێشـتبووەوە لـە ئێـران وێنـای حکومـەتی عێراق واکێشرابوو کە هەموو خراپەیەکی تێدا بەدیدەکرێت کە بۆ گۆڕینی ناوچـەکە پێویسـتە لـەناوببرێت. ئـەوەش سروشـتی دوژمنـداریی و تایـەفی بـۆ سـەدام دووپـاتکردەوە کـە بـاڵی بەسـەر رژێمـی ئێـران کێشـابوو. هـەروەها وەلای گومانلێکراوی زۆربەی رۆڵەکانی گەلی عێراقی دەرخست و جەختی کردەوە سـەر نەبوونی دڵنیایی کە باڵی بەسەر نێوەنـدە تەسـکەکانی رژێمـی عێراقـی کێشـابوو، نەدەکرا پرسی ئێران بە ئاسانی فەرامۆش بکرێـت و لەبایەخەکـەی کەمبکرێتـەوە، سـەرەڕای کاریگەرییەکـەی بەسـەر شـیعە دەبوایـە سـەدام دوو هۆکـاری دیکـە

لەبەرچاو بگرێت. یەکەمیان بریتیبوو لە دەسەڵاتەکەی وەك سەرکردەیەکی عەرەبی، کەچی ئەوەی دووەمیان دەرەنجامی سروشتی دەسەڵاتەکەی بوو وەك سەرۆکی دەوڵەتی عێراقی هەرێمی. هەر لە ساڵی ١٩٧٨ بەلانی کەم سەدام مانۆری ئەوەی دەکرد کە عێراق بخاتە ژێر سەرکردایەتی خۆی، بۆ ئەوەی ببێتە وڵاتێکی تەوەرەیی عەرەبی، دوای هەردوو لوتکەی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ بڵاوکردنەوەی پەیماننامەی عەرەبی لە بەغدا لە شوباتی ١٩٨٠دا ، کە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی بەشداربوو لە لوتکەی بەغدا بەشداریان تێداکرد. پەیماننامەکە ئەمانجە عەرەبییە هاوبەشەکانی سەر لەنوێ دیاریکردەوە، بەڵام کرۆکەکەی بایەخی کەمتر بوو لەچاودێریکردنی سەدام بۆی، روون و ئاشکرابوو وێنایەك سەبارەت بە عێراق دەخاتە روو کە هێزێکی سەرکردایەتییە بەڵکو (هێزێکی سەرکردایەتی کارە) لە جیهانی عەرەبیدا: وڵاتێکی دەوڵەمەند، لەرووی سەربازییەوە بەهێزە، لەرووی سیاسییەوە سەقامگیرە، تارادەیەك پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوا باشە. بەرگری لە پرسە عەرەبییەکان دەکات و لەدەریای ناوەڕاستەوە تاکو کەنداو دانی پیانراوە.

سەدام بەتایبەتی جەختی لەسەر ناوچەی کەنداو کردەوە، چونکە پێی وابوو ناوچەی کەنداو گەورەترین مەترسییە کە رژێمی رادیکالی ئێران لەسەر رژێمی عێراق دروستی دەکات. جەختکردنەوە لەسەر سەرکردایەتیکردنی عێراق بۆ جیهانی عەرەبی زۆر گرنگ بوو بۆ وێنەی سەدام حوسێن وەك سەرکردەیەکی مێژوویی عەرەبی، بەڵام بووە هاوکارییەکیش بۆ گەرەنتی کردنی پشتگیری زۆربەی عەرەبی سوننە کە پاڵپشتیان گرنگ بوو بۆ تۆرە فراوانەکانی بازنەی هەژموونی ناوخۆیی. سەدام سەلماندی کە بڕوای بە تێڕوانینی عەرەبی بەتەنیا نییە، لە جیاتی ئەوە وای دەبینی جیهانی عەرەبی شانۆیەکە دەوڵەتی عێراق رۆڵی تێدا دەبینێ. کە بەپێی ئیرادەی ئەو بونیادنراوە، رۆڵێکی سەرکردایەتی لەبەرژەوەندی خۆی و ئەوانەی پاڵپشتی حوکمی ئەو لە عێراق دەکەن، دەبینێت . جەختکردنەوە لەسەر مەترسی ئێران رێگەی بۆ خۆشکرد تەئکید بکاتەوە سەر

ئەوەی کە خۆی بۆ پرسێکی عەرەبی تەرخان دەکات بەبێ ئەوەی لەگەڵ سوریا رووبەڕوو ببێتەوە. هەروەها ئەوە رێگەی پێدا کە خۆی وەك پارێزگاریکەر لەولاتانی کەنداو بسەپێنێت. کە لە ئایندەدا سودی باشیان دەبێت و متمانە لەنێوان عێراق و کوێت زێدەتر دەبێت، بەتایبەتیش رەنگە ببێتە هۆی بەرژەوەندی هەرێمیی عێراق کە دەستی بە پەرەپێدانی بەندەری ئوم قەسر کردبوو، دواتر هەر لەو چوارچێوەیەدا سەدام جارێکی دیکە پرسی (دورگە عەرەبییەکانی) هێناوە گۆڕێ کە دەکەونە نێو کەنداو و ئێران ساڵی ١٩٧١ خستنیە سەر خاکی خۆی. لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر وێنای عەرەبی بۆ ویلایەتی خۆزستانی ئێران و، ئاماژەدان بەوەی کە کاتی ئەوە هاتووە ئازاد بکرێن. لەگەڵ پشێوبوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێران، جارێکی دیکە جێبەجێکردنی مەرجەکانی پەیماننامەی ١٩٧٥ سەریهەڵدایەوە. ئەو پەیماننامەیە کێشەیەکی گەورەبوو بۆ سەدام حوسێن. ژمارەیان کەمبوو ئەوانەی لە عێراق گرنگیان بەنەخشاندنەوەی سنووری هەردوو دەوڵەت لە شەتولعەرەب دەدا یان پێیاندەزانی ، بەڵام سەدام حوسێن چاك درکی بەوە دەکرد کە ئێران نەرمی نواندنی زۆری بەسەر عێراق سەپاندووەو درکی بە ئەگەری بەکارهێنانی ئەو نەرمی نواندنە وەك بەڵگەیەك بۆ ئامادەبوونی بۆ قوربانیدان بە بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی عێراق دەکرد. لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵات لەساڵی ١٩٧٩ ئەو خاڵە زیاتر دەرکەوت. وایلیێهات خۆی بە پاڵەوانی عێراق دەهێنا بەرچاوان و بەردەوام جەختی لەسەر شێوەی تایبەتی دانیشتوانی عێراق و یەکگرتوویان لە کۆمەڵگەیەکی سیاسی دەکردەوە، کە سەدام بەسەرەری زاڵەو بەتەنیا پارێزگاری لێدەکات. هەروەها لەگەڵ جەخت کردنەوەشی لەسەر ناسنامەی نیشتمانی عێراق ،

دەبوایە گرنگی زیاتر بەخاکی عێراق بدات. لە ئاکامدا وایلیێهات ناکۆکی لەگەڵ ئێران رێرەوێکی هەرێمی دەگرتە بەر و جەختی لەسەر شەتولعەرەب دەکردەوە. دوای ئەوەی عێراق هاتەوە سەر باسکردنی داواکەی بۆ سەپاندنی سەروەریی خۆی بەسەر تەواوی رێرەوە ئاویەکە .

لەبەشی یەکەمی ساڵی ١٩٨٠، هەندێك شەڕە تەقە لەسەر سنوور روویدا کە نیشانەبوو بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا گرژە، لەهەمان کاتدا، خەریك بوو نیشانەی هەلێك دەردەکەوت لەبەردەم سەدام حوسێن و سەرکردایەتییەکەی عێراق کە دووبارە نابێتەوە . سروشتی شۆڕشگێڕانەی رژێمی ئێران وای لێکردبوو دوژمنکاریانە بێت و توانای تەقینەوەی هەبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وا دەردەکەوت کە لاوازە، ئەو رژێمەی کە پشێوی و ململانێکان و لێکترازانی لەسەنتەرەوە بۆی دانوسابوو واپێدەچوو کە ناسەقامگیربێت ، سەرباری نەبوونی متمانە لەنێوان رژێمی شۆڕشگێڕانەو هێزە چەکدارەکانی ئێران بووە هۆی ئەنجامدانی چەند پرۆسەیەکی پاکسازیی فراوان کە هەزاران ئەفسەری گرتەوەو بووە هۆی پشێوی ئیداری لەکیانی سەربازیدا. هەروەها پچڕانی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەمەریکا وایکرد ئێران پاڵپشتیکاری سەرەکی چەك لەدەستبدات ئەوەش وایکرد رژێمی تازە لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دابڕێت. بەو شێوەیە لەدیدی بەغداوە رژێمی تازە زۆر لاواز دەردەکەوت هەروەها دابڕاوو نارێکە، تاڕادەیەك لە رەوشی رژێمی عێراق دەچوو لە کۆتایی شەستەکاندا کەشای هاندا فشاری بخاتە سەر و ساڵی ١٩٧٥ چەند تەنازولێك بەدەست بێنێت.

لە بەرامبەردا، سەدام حوسێن تا رادەیەك دڵنیابوو لە هێزی خۆی و هێزی دەوڵەتەکەی. نزیکترین نەیارەکانی خۆی لەناوبرد بۆ ئەوەی بەبێ رکابەر کۆنترۆڵی دەوڵەتی عێراق بکات. کە لەو کاتەدا لە ململانێ حزبیە نێوخۆییەکان دوور بوو کە سەرکردەکانی پێشووی عێراقی لاواز کردبوو ، هەروەها هێزە چەکدارەکان بەهێز کرابوون بە چەروپڕی و لە ناوەڕاستی حەفتاکان بەهۆی بوژانەوەی بودجەی سەربازیی پڕ چەك ببوو ، هاوکات دوای وەستانی شەڕ لە کوردستان هیچ شتێك نەبوو سەرقاڵی بکات.

سەرەڕای ئەوە پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکانی عێراق باشتر ببوو لەوەی کە پێشتر هەبوو، بوونی لەسەر گۆڕەپانی عەرەبی و کەنداو بەشێوەیەکی روو لە زێدەبوون دانی پیانرابوو. هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ هێزە گەورەکان زۆر

باشبوو و ڕوو لە گەشبوونەوەبوو، ئەگەر نەڵێین زۆر دۆستانەبوو، لە کاتێکیشدا کە پەیماننامـەی دۆسـتایەتی لەگـەڵ ڕوسـیا هـەر کـارپێکراوبوو ، عێـراق پەیوەنـدی بازرگانی زۆر فراوانی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاواش دروستکرد.

لەژێر ڕۆشنایی ئەو بارودۆخە سەدام وای دەبینی دەستپێکردنی شەڕ لەگەڵ ئێـران ڕێگەیەکی گونجاوە بۆ ناچارکردنی ڕژێمی ئێران بۆ دان پێنـان بـەوەی هاوسـەنگی هێـز بـەلای عێراقـدا لاربووەتـەوە. باشـترین بەڵگـەش لەسـەر دان پێنانەکـە ڕەتکردنـەوەی پەیماننامـەی ۱۹۷۵ و گەڕاندنـەوەی سـەروەری عێراقـە بەسـەر تەواوی شەتولعەرەب. سەرەڕای کەمی بایەخی ئەو دسکەوتە لەڕووی هەرێمیـەوە. بەڵام ئامانجەکـەی تـەنها بـۆ ئـەوە نـەبوو یـادەوەری ئـەو لاوازییـە لاببـات کـە لـە ناوەڕاسـتی حـەفتاکان بـاڵی بەسـەر عێـراق و سـەدام حوسـێن کێشـابوو. بـەڵکو مەبەست نیشاندانی هێزی عێـراق بـوو لـە ڕێگـەی هەوڵـدان بـۆ تـەنازول پێکردنـی ڕژێمی تازەی ئێران. سەرەرای نرخە ڕەمزیەکەی و دەسـەڵات و هێـزی عێـراق ئـەو دەسکەوتە زۆر شتی دیکەشی لە خۆدەگرت کە سـەدام پێیوابـوو شـایەنی ئەوەیـە شەری لە پێناودا بکات .

لەهـەنگاوێکی کتـوپڕدا، سـەدام حوسـێن بـە ئاشـکرا سەرپێچـی ڕێکەوتننامـەی ۱۹۷۵ی کرد و دووپاتی سەروەریی عێراقی بەسەر تەواوی شەتولعەرەب کـردەوە، ئەوەش پێش کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی نیشتمانی لە ئـەیلولی ۱۹۸۰. دواتـر لـە ۲۲ ئەیلول، زنجیرەیەك هێرشی بەدواداهات، کە هێزە ئاسمانییـەکانی عێـراق بـۆ سـەر فرۆکەخانە سەربازییەکانی ئێران ئەنجامیاندا. هاوکات هێـزە عێراقییـەکان چـوونە نێـو چـەند پێگەیـەکی خـاکی ئێـران ، هەنـدێك لەیەکـە عێراقیـەکان ئامـانجی دیاریکراویان هەبوو، وەك شارەکانی عەبادان و خورەمشەهر لەسەر شەتولعەرەب، کەچی هەندێك یەکەی سەربازیی دیکە فەرمانیان پێـدرا گـەورەترین ڕووبـەر لـەنێو خاکی ئێران داگیر بکەن. ئەو هەڵمەتـە بـووە دەرخسـتنی شـان و بـاڵی عێـراق بـۆ ترساندنی حکومەتی ئێران و ناچارکردنی بۆ دانوستان و دانانی سنوورێکی بەپەلـە بۆ سەرپێچییەکان و بەپێی چـەند مـەرجێك کـە لەگـەڵ بەرژەوەندییـەکانی عێـراق

بگونجێت، ئەوەش لەڕێگەی نەرمی نواندنی هەرێمی و دانپێنانی ئاشکرا بەزاڵبوونی عێراق .

سەدام وای بۆ دەچوو رژێمی ئێرانی هێشتا خۆنەگرتوو هەر زوو تەسلیم دەبێت بۆ ئەوەی پارێزگاری لەمانەوەی خۆی بکات. بەلام ئەو تێڕوانینەی هەڵەیەکی زۆر گەورەبوو. لەوەگرنگتر ئەوەبوو حکومەتی ئێران وای دەبینی ئەو دەستدرێژییەی عێراق تاقیکردنەوەیەکە بۆ خودی شۆڕش و وایلێهات بەرگریکردن لەولات و شۆڕش بووە جێی سەنتەری ئامادەباشی میللی لە ئێران ، کە رژێم بەکاریهێنا بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی و پتەوکردنی دەسەلاتەکەی . دوای تێپەڕبوونی چەند هەفتەیەك بەڕوونی دەرکەوت ئەو جەنگە کورت و یەکلاکەرەوەیەی کە سەدام پلانی بۆ دانابوو بووە جەنگێکی دیکە کە تەواو جیایە، ئەوەش راستییەك بوو کە سەدام لەساتێکی دەگمەندا بە ئاشکرا دانی پێنا.

لەگەڵ ئەوەشدا، سەدام هەوڵیدا رەوشەکە لەبەرژەوەندی خۆی سەراوبن بکاتەوە، پڕوپاگەندەی ئەوەیکرد سەروەری عێراقی بەسەر شەتولعەرەب مەسەلەیەکی شەرەفی نیشتمانی و ئەرکێکی پیرۆزی گەل و سەرکردەکانیەتی. لەهەمان کاتدا، عێراق داوای گلدانەوەی خۆزستانی کرد. داواکارییەکان پاڵپشتییەکی بەجۆشیان لەنێو زۆربەی رۆڵەکانی گەلی عێراق بەدەست نەهێنا ــ چجای گەلی خۆزستان ــ. بەلام ژمارەیەکی کەم تەنها خەڵکی بەسرە نەبێت، زانیاریان لەبارەی کاریگەری ئەو جەنگەوە هەبوو. رژێم رشتبوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت لەسەر تاپای ولات ژیان ئاسایی و بەردەوام بێت. لەگەڵ ئەوەی توانای عێراق لەبەرهەمهێنانی نەوت کەمبووەوە، بەهۆی ئەوەی ئێران دەزگانەوتییەکانی عێراقی وێرانکرد. بەلام ئەم کەمبوونەوە کاتیی بوو، یەدەگەکانی دراو توانی تێپەڕی بکات. سەرەڕای ئەو بێ ئومێدییەی کە بەهۆی کاردانەوەکەی ئێران هاتە ئاراوە. سەرکردایەتی عێراق بەردەوام بوو لەو بۆ چوونەی کە رژێمی ئێران ناچار دەبێت بۆ دانوستان و رشتبوو لەسەر ئەوەی عێراق لە دەرەنجامەکانی جەنگ دووربخاتەوە.

ئەو بارودۆخە باڵی بەسەر ساڵەکانی یەکەمی جەنگدا کێشا. دوای هێرشی یەکەم کە عێراق ئەنجامیدا، بەرەی سەربازیی هیچ رووداوێکی گرنگی بەخۆوە نەدیت. لەناوخۆشدا هێزەکانی ئەمن بەردەوامبوون لەسەرکوتکردنی هەر نیشانەیەکی بەرهەڵستاریەکی رێکوپێکی شیعەکان و، کاتێک گرووپەکانی وەک کۆمەڵەی موجاهیدین لە ئێران بەسەرکردایەتی مەحەمەد باقر ئەلحەکیم سەریهەڵدا بە توندی و دڕندەیی وەڵامی دایەوە کە داوای دامەزراندنی رژێمێکی ئیسلامی لە عێراق دەکرد. توندی هێرشەکانی حکومەت بۆ سەر شیعەو رێکخراوەکانیان لەنێو هەندێك حزبی خەباتکار لایەنگرانی ئەو حزبانەی هاندا بەرەو ئێران کۆچبکەن و بچنە ریزی ئەو هەزاران شیعانەی کە بەناو ئێرانین و عێراق دریکردبوون. حکومەتی عێراق دوورتر لەوە رۆیشت کاتێك ساڵی ١٩٨٨ پاداشتی ماددی دەدایە ئەو پیاوە عێراقیانەی کە ژنە ئێرانییەکانیان تەڵاق دەدەن کە سەریەو خانەوادانەن کە پێشتر لە عێراق دەریکردبوون یا بەنیازبوو دەریانبکات. ئەو هەنگاوانە بەمەبەستی لێکترازاندنی ریزەکانی شیعە بوو، هەروەها بەشێك بوو لە هەڵمەتێکی حکومەت بۆ دووپاتکردنەوە لەسەر سروشتی عەرەبیی کۆمەڵگەی شیعە لە عێراق ، حکومەت لەرێگەی ئەوەدا هیواداربوو لەسەر ژێی ناسنامەی عەرەبی و باڵا دەستی عەرەبی بژەنێت، و عێراقییە شیعەکان کە زۆرینەی سوپای عێراقیان پێکدەهێنا بوون لە ئێرانییە شیعەکان جیابکاتەوە کە فەرمانیان پێدرابوو لەگەڵیاندا بجەنگن، لەهەمان کاتدا حکومەت چاودێری توندی خستبووە سەرهەندێك پیاوی ئایینی شیعە، و سەرپەرشتی ناوەرۆکی وتارەکانی دەکرد، کۆنترۆڵی سەرجەم پێگە و مزگەوتەکانی شیعە کرابوو. خەڵکانێك لەسەر بنچینەی مەحسوبییەت لە پێگەی بەرپرسیارییەتی دامەزرابوون بۆ ئەوکارە. هەروەها سەرجەم پیاوانی ئایینی شیعە کرابوون بە فەرمانبەر و مووچەیان لەدەوڵەت وەردەگرت. هەروەك چۆن پیاوە ئاینییە سوننەکان بۆ ماوەیەك وابوون.

لە ناوچە کوردیەکاندا پارتی دیموکراتی کوردستان لەبەرپابوونی جەنگ هەلی بۆ رەخسا، بەڵام بەکردەیی شتێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا تەنها چەند هێرشێکی

پارتیزانی دیاریکراو نەبێت کە لە دوو ساڵی رابردوودا لەسەری راهاتبوون. تواناو هێزی خۆی و نەیارەکانی لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆشەڕکردن لەگەڵ یەکتر و گروپە کوردیەکانی دیکە تەرخانکرابوو، ئەو رەوەشە دڵنیایی دەدایە بەغدا کە بەشێوەیەکی دەستکراوە پاڵپشتی جاشەکانی دەکرد. لەهەمانکاتدا پەیوەندییەکانیشی لەگەڵ سەرجەم سەرکردە کوردەکان بەردەوامبوو و، ئاماژەی بەوەشدەدا کە رەنگە تەنازولی گەورتر پەیوەست بە ئۆتۆنۆمی بنوێنێت.

ئەوەی پەیوەست بوو بەبازنەی نێوخۆیی سەدام حوسێن متمانەی بەو کەسانە کەم نەبووەوە کە وەك بەکرێگیراوی سەرەکی خۆی دەستنیشانی کردبوون و لە زۆربەی کاتەکان تێڕوانینیان وەك تێڕوانینی ئەو بوو، کارەکانی پاکتاوی کە لە ساڵی ١٩٧٩دا ئەنجامدرا هەموو ئەو دەنگانەی سەرکوتکرد کە گومانیان لەرژێم بوو. بەلام لەو قۆناغەدا. سەرەڕای ئەوەی کە سەدام و دەست و پێوەندەکانیشی هەستیان بە توورەیی دەکرد لەهەمبەر کاردانەوەکەی ئێران کە پێچەوانەی بۆ چوونەکانیان بوو. بەلام هیچ گومانێکیان لە مەترسیەکانی دوژمنداریی یا وابەستەیی ئێران بە هەندێك هێز کە حەزیان نەدەکرد بوونیان لە کۆمەڵگەی عێراقدا هەبێت نەبوو، وەك پیاوانی ئایینی شیعە و رێکخراوە ئیسلامییەکان و پێشمەرگە. ئەو مەزەندانە لەرووداوەکانی ١٩٨٢ دووپاتکرایەوە، لەهەمان کاتدا متمانەی هەندێك کەسی بەسەدام حوسێن هەژاند و هەندێك پرسیاری لەهەمبەر تواناکانی بۆ سەپاندنی ملکەچی و رێزگرتن لێی بەسەر گەلەکەیدا کە کۆڵەگەی دەسەلاتەکەی پێکدەهێنا، سەبارەت بە سەدام پرسێکی زۆر ترسناك بوو.

## بەرگریکردن لە رژێم و عێراق دوای ساڵی ١٩٨٢

ساڵی ١٩٨٢، ئێران دژە هێرشێکی ئەنجامداو سەرکەوتنەکەشی لەسەر رووی هەموو بۆچوونەکانبوو. هێزەکانی عێراق لە زۆربەی شوێنەکانی نێو خاکی ئێران دەرکرا کە ساڵی ١٩٨٠ داگیریکردبوو. بریندارێ زۆری لێکەوتەوەو نزیکەی ٤٠

هەزار سەربازی عێراقی بەدیل گیران. لەگەڵ ئەوەی سوپای عێراق توانی لەسەر سنوور خۆڕابگرێت و نەهێڵێت سوپای ئێران بەردەوام بێت لە پێشڤەچوون و هاتنە ناو عێراق. بەڵام شکستەکانی ساڵی ١٩٨٢ گورزێك بوو بەر سەدام کەوت. بەپلەی یەکەم گومان کردن بوو لە حوکمی ستراتیژی ئەو سەبارەت بە دەستپێکردنی جەنگ هەروەها زۆربوونی ژمارەی قوربانیان و دیلەکان ئاماژەبوون بەوەی ناتوانێت قەوارەی تێچووی مرۆیی لەجەنگ لەوەزیاتر لەگەلی عێراق بشارێتەوە. نرخی ئابووریش روون و ئاشکرابوو. زۆربوونی تێچووە سەربازییەکان و هەوڵەکان بۆ پارێزگاریکردن لەسەر تێکڕای وەبەرهێنانی گشتی لەژێرخانی مەدەنی و لەدەوڵەتی خێرو خۆشی یەدەگی عێراقی کەمکردەوە لە دراوی بیانی لە ٣٠ ملیار دۆلاری ئەمەریکی ساڵی ١٩٨٠ بۆ ٣ ملیار دۆلاری ئەمەریکی لەساڵی ١٩٨٣دا نەدەکرا قەرەبووی ئەوە بکرێتەوە. بەهۆی داهاتەکانی نەوت، چونکە بودجەی نەوت نزمبوەوە بۆ ٢٦ ملیار دۆلار لەساڵی ١٩٨٠ بۆ نزیکەی ٩ ملیار دۆلار لەساڵی ١٩٨٢دا، لەژێر کاریگەری وێرانبوونی دامودەزگای نەوتی خاو و داخستنی سوریا بۆ هێڵی بانیاس لە نیسانی ١٩٨٢دا. لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٩٨٣ قەرزە دەرەکییەکانی عێراق گەیشتە ٢٥ ملیار دۆلار.

بەهۆی بەهێزی دەزگاکانی ئەمن، ئاسان بوو بۆ رژێم هەر رادەربڕینێك لەناڕەزایی میللی سەبارەت بە رەوشەکە پشتگوێ بخات. بەڵام سەخت بوو بۆ سەدام بتوانێت کاریگەری ئەوە لەسەربازنە نێوخۆییەکەی فەرامۆش بکات. راستە بەشێوەیەك لەشێوەکان پێوەی پەسترابوونەوە، بەڵام توندی تەنگژەکە و ئەگەری لاچوونی هەر هەموویان ئەگەر بێتوو هەوڵ بۆ ئاشتی نەدەن وایلێکردن بیر لە چاکترین رێگە چارەی دەربازبوون بکەنەوە. لەژێر سایەی ئەو بارودۆخە، کۆبوونەوەیەکی نائاسایی هاوبەش لەنێوان سەرکردایەتی سەربازیی عێراق و هەردوو سەرکردایەتی قوتری و قەومی حزبی بەعس و ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە حوزەیرانی ١٩٨٢ گرێدرا بە ئامادەنەبوونی سەدام حوسێن. تیایدا رێککەوتن پێشنیازێك بۆ ئاگربەست پێشکەش بکەن، بەرامبەر گەڕانەوە بۆ بارودۆخی پێشوو و دەست

هەڵگرتن لە سەرجەم ئەو داوا کارییانەی ساڵی ١٩٨٠ سەدام بەرزی کردبووەوە ، ئەگەر ئێران ئەو پێشنیازەی قەبووڵ بکردایە سەدام نەیدەتوانی پارێزگاری لەدەسەڵاتی خۆی بکات بەبێ دەستکاری یاخود مانەوەی خودی سەدامیش چونکە دەستپێشخەرییەکە ڕەزامەندی سەرجەم ئەندامانی سەرکردایەتی بەدواوەبوو لەوانەش نزیکترین پیاوەکانی سەدام بەڵام خومەینی و حکومەتی ئێران پێشنیازەکەیان ڕەتکردەوە، چونکە دڵنیا بوون کە ئێران ئێستا دەتوانێت جەنگ لەدژی عێراق بەرپا بکات و ئامانجەکانی بەدەست بێنێت کە لەراستیدا رووخاندن و لەسەرکار لادانی تەواوی سەرکردایەتی عێراقە.

رازی نەبوونی ئێران بەئاشتی سەدام حوسێنی بەهێزکرد ، سەرەڕای بەرپرسیارییەتی لە هەڵسەنگاندنە هەڵەکەی بۆ جەنگی ١٩٨٠، دوای ڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی عێراق لە لایەن ئێرانەوە وایلێهات مەحاڵ بوو، لایەنگرانی بتوانن خۆیان لە بریاردان لەسەر جەنگ جیابکەنەوە. لە ئاکامدا. هیچ کامێکیان نەیانتوانی سەرکردەیەکی دیکەی ئەلتەرناتیف بۆ دانوستان سەبارەت بە ئاگر بەست بخەنەروو، ئەوەش خاڵێکە سەدام زۆرجار جەختی لەسەر دەکردەوە لە وەڵامدانەوەی بۆ پێشنیازی ئێران بۆ ئاگر بەست کە بریتییە لە وازهێنانی سەدام لە دەسەڵات ، بەڵکو رایگەیاند کەخۆی تەقەی لەوەزیری تەندروستی کردووە چونکە پێشنیازێکی لەو جۆرەی خستبووە روو، سەرەڕای ئەوەی زانیارییە فەرمیەکان ئاشکرایانکرد کە وەزیری تەندروستی بەهۆی گەندەڵی لە سێدارە دراوە . راستی مردنی وەزیر هەرچییەك بێت سەدام بەتووندی وەڵامی پەیرەویکردنی شێوازێکی دیاریکراو و ئیمکانیەتی دوورکەوتنەوەی لەسەرۆکایەتی دەدایەوە بەشێوەیەکی کاتیی بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر بۆ ئەوەی بەدەنگ داواکارییەکانی ئێرانەوە بچن و واز لە دەسەڵات بهێنێت. بەڵام مردنی کتوپڕی ئەحمەد حەسەن بەکر لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٢دا لەو کاتەی ئەو پرسە ترسناکانە هێشتا تاوتۆ دەکران بەتەئکید پێگەی سەدامی بەهێزتر کرد. ئەوە ئەگەری سەرهەڵدانی هەر ناڕەزاییەکی لەبازنە نێوخۆییەکەی بەلاوەنا لەدژی

سەرکردایەتی کەسێتی ئەو و ناوودەنگە ترسناکەکەی وەك کەسێکی بێ بەزەیی زێدەتر کرد کە لە کوشتنی خزمە نزیکەکەی خۆی و سەرۆکی پێشووی سێ و دوو ناکات.

سەدام پەنای بردە بەر چەند ستراتیژییەتێك بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆی بەهێز بکات، لە هاوینی ١٩٨٢دا چەند گۆڕانکارییەکی نوێی لە ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی شۆڕش و سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس و وەزارەت ئەنجامدا. وایکرد ئەو دامودەزگایانە زیاتر لەگەڵ کەسێتی خۆی بگونجێت. وای لێهات تەنها لە خزمە نزیکەکانی و پیاوە نزیکەکانی پێکدەهات. دواتر داوای گرێدانی کۆنگرەی نۆیەمی قیادەی قوتری حزبی بەعسی کرد. راپۆرتێکی کۆتایی لێ هێنایە کایەوە کە سەرجەم گرنگییەکانی کلاسیکی بەعسی وەك قەومییەی عەرەبی و سۆسیالیستی تێدابوو، تیایدا جەختی لەسەر ئەولەویەتی عێراق و مانای دین و گرنگی پێکهێنانی سەروەت و پرۆژە تایبەتیەکان دەکردەوە، لەهەموو ئەوانە گرنگتر ئەو رۆڵە بوو کە درابووە پاڵ سەدام حسێن (بە لەبەرچاوگرتنی نازناوی سەرکردەی زۆر پێویست "القائد الضرورة"ی ناوازە کە درایە پاڵی) بە سیفەتی ئەوەی کە زۆر زۆر زیرەکەو بریاردەری کۆتاییە لە ئایدیۆلۆژییەتی حزب. وەك ئەوەی سەدام دوای چەند ساڵێك ئاماژەی پێدا، ئەو بوو دیاریدە کرد چ شتێك بچێت یا نەچێتە نێو ئایدیۆلۆژیای حزبی بەعسەوە.

سەرەڕای ئەو هەنگاوانە، جەختی لەسەر ئاگاداربوون لەهێزە چەکدارەکان کردەوە، بۆ ئەوەی رووبەڕووی ئەو رەخنانە ببێتەوە کە لەنێو دەزگای سەربازیی ئاراستەی دەکرێن سەبارەت بە تێڕوانینە ستراتیژیەکەی و بۆ پارێزگاریکردن لە بنکە سیاسییەکەی لەنێو ئەو دەزگایەدا لەهەر مەترسییێك کە هەڕشەی لێبکات. چەند ئەفسەرێك پلەیان پێدرا، تێکرا ریزی ئەفسەران پاداشت و یارمەتی مادیان بەدەستکراوەیی پێبەخشرا. بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەو پەیوەندییانە ئاسانتر بوون بەهۆی ئەو تەنگژەی کە عێراق تێیکەوتووە، بەو پێیەی کە لە جەنگێکدایە بێ هیچ گومانێك ئێستا جەنگێکی بەرگریکردنە . مەترسی ئێران راستەقینەبوو،

ئەفسەرە عێراقییەکان، وەك پیشەکار پێگەیەکی بەرچاویان هەبوو لە دەوڵەتی عێراقدا. بەبێ گوێدانە باگراوندەکانیان بەشێوەیەکی گشتی سووربوون لەسەر رێگەپێنەدانی ئێران لە بەدەستهێنانی هەر سەرکەوتنێکی سەربازیی. داواکاری سەرەکیان ئەوەبوو کە هۆکاری پێویستیان بۆ دابین بکرێت بۆ ئەوەی ئەرکێك جێبەجێ بکەن کە تەنها ژمارەیەکی کەمیان نارەزایی خۆیان لە بەرامبەریدا دەربری.

لە سالانی سەرەتای جەنگدا، هەندێك نارەزایی گشتی هەبوون لەسەر بوونی کادیرەکانی حزب لە هەموو شوێنێك بۆ ئەوەی بەردەوام چاودێری رادەی وەفاداری ئەفسەران بکەن و رێگەنەدەن هیچ هەنگاوێك بێ وەرگرتنی رای سەرکردایەتی بهاوێن. لە راستیدا، حەواڵەکردنی سەرجەم بریارە سەربازییەکان بۆ سەرکردایەتی سیاسی بەو شێوەیە لە نەزانین و رێز لێنەگرتنە زۆر بەگران لەسەر سوپای عێراق وەستا ، لە سالانی بەرایی جەنگدا ئەرکی سوپا سەختتر ببوو بەهۆی نەبوونی پسپۆری کە سالانی ململانێی سیاسی و ناکۆکی و لێکترازان هۆکارەکەی بوو، ئەوەش وایکرد چەند کەسێك پلەیان بەرز بکرێتەوە کە شایستە نەبوون و هیچ لێهاتووییەکیان نەبوو، ئەوەش بەتەنها لەبەر وەفاداری سیاسیان بوو. کەچی لە سالی ١٩٨٢ وای لێهات ئەرکی سەربازیی زۆر ئاسانتر بێت و سەرکردایەتی سیاسی جارێکی دیکە بەپەلە ئامانجەکانی جەنگی دیاریکردەوە بەشێوەیەك رێگەی بەبەردەوامی دەوڵەتی عێراق دەدا ورشتبوو لەسەر ئەوەی ئەو ئامانجە هاوبەش بێت لەنێوان سەرکردایەتی سیاسی و هێزە چەکدارەکاندا . لەهەمان کاتدا گەشەکردنی بەپەلەی سوپاو کرینی برێکی زۆری چەك و کەلوپەلی سەربازیی پێگەی ئەفسەرانی بەهێزکرد. سەرەرای کەمنەبوونەوەی چاودێری و بەردەوامی هاتنی راپۆرت لەسەر پیلانەکانی تیرۆرکردن و پرۆسەکانی پاکتاوی، بەلام پاداشتە مادی و پیشەییەکان بۆ ئامانجی باش بەکاردەهات. ریزی ئەفسەران لەو کاتەدا جەختیان لەسەر جێبەجێکردنی پیشەکەیان دەکردەوە و لەگەڵ

تێڕوانینی ڕژێم بۆ بەرپرسیارییەتی سوپا دەگونجا. هەرچەندە دواتر گەشەکردنی گیانی پیشەگەری بەرووني گیروگرفتی بۆ سەدام حوسێن دروستکرد.

کەچی لەوکاتانەدا سەرکردە عێراقییەکان، سیاسەتمەدارو سەربازییەکان وەکو یەك. بەدوای پلانێکەوەبوون حکومەتی ئێران ناچار بکەن رازی بێت بە ئاگر بەست . پارەیەکی ئێجگار زۆریان بۆ ئەو کارە تەرخان کرد کە عێراق لەکوێت و سعودیە و ولاتانی کەنداوی قەرزکردبوو، ئەوە سەرەڕای پرۆتۆکۆڵەکانی کڕینی چەك لە روسیا و فەرەنسا. لەماوەی هەشت ساڵی شەڕدا خەرجییەکانی جەنگ لە هەر ساڵێك گەیشتە ١٥ ملیار دۆلاری ئەمەریکی. هەروەها حکومەت پرۆگرامەکانی بەدەستهێنانی چەکی کۆکوژی خێراتر کرد. لە حوزەیرانی ١٩٨١دا ئیسرائیل هێرشێکی ئاسمانی کردە سەر کارخانەی ئۆزەریکی ئەتۆمی، ئەوەش سەرنجی رای گشتی راکێشا بۆ توانای سەربازیی پرۆگرامە ئەتۆمییەکانی عێراق. کە لەسەرەتای حەفتاکان بەچاودێری سەدام دەستی پێکرابوو. هەروەها دەست بە پرۆگرامی بەدەستهێنانی چەکی کیمیاوی و بایۆلۆجی کرابوو لە کۆتایی هەشتاکان حکومەت پاڵپشتی مادی ئێجگار گەورەی ئەو پرۆگرامانەی دەکرد. سودی زۆری لەو تۆڕە گەورانە بینی کە لە ئەوروپا هەیبوو بۆ ئەوەی شارەزایی و کەل و پێویستەکان بەدەست بێنێ. لەساڵی ١٩٨٤ دەستکرا بەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بەشێوەی پچڕپچڕ لە بەرەکانی جەنگدا، هەر کاتێك بارودۆخەکە گونجاو با، بەلام کاریگەری لەسەر وورەی سەربازە ئێرانییەکان زۆر لەکاریگەرییە سەربازییەکەی گەورەتر بوو. چونکە تەنیا زانینی ئێرانییەکان کە عێراق ئامادەیە ئەو جۆرە چەکە بەکار بێنێت بۆ یەکلاکردنەوەی دەرەنجامی هەندێك لە شەرەکان بەسبوو .

لەو قۆناغەدا سروشتی چەکەکان بەرگری بوون، پلانی جەنگ کە عێراق بەکاریدەهێنا جەختی لەسەر پاراستنی بەرەکانی پێشەوەی جەنگ و رێگەگرتن بوو لە هێزەکانی ئێران لە دزەکردنیان بۆ نێو شارە گەورەکانی عێراق. سەرکەوتنی روو لە زێدەبوونی عێراق لە چەکە کلاسیکییەکان و بەکارهێنانی

ناوەناوەی چەكی كیمیاوی وایكرد عێراق بە هێزتر بێت بەرامبەر هێرشە یەك لەدوای یەكەكانی ئێران. سەركردایەتی ئێران لە ستراتیژییەتی خۆی بەردەوام بوو كە بریتی بوو لە فشار خستنە سەر بەرەی جەنگ ،سەركردایەتی عێراق ناچاربوو ستراتیژییەتی جۆراوجۆر بەكار بێنێت. پارەیەكی زۆر خەرجكرا بۆ پەرەپێدانی موشەكی زەمین بە زەمین لە عێراق. بەشێوەیەك موشەكی سكۆدی سۆڤیەتی پەرەی پێدرا بۆ ئەوەی ئاراستەی شارەكانی نێو قولایی ئێرانی بكات. ساڵی ١٩٨٥ شەڕی شارەكان دەستپێكرد و نەوەستا تا ئەو كاتەی كە ئێرانیش سەلماندی لەتوانایدایە زیان بەشارەكانی عێراق بگەیەنێت. لەهەمان كاتدا عێراق پەرەی بەهێزە ئاسمانییەكانی دەدا و یارمەتی لە فەرەنسا وەردەگرت بۆ ئەوەی هێرش بكاتە سەر پێگە ئابورییەكانی ئێران، بەتایبەتیش پیشەسازی نەوت ، كە خوازیار بوو ئابووری ئێران پەكبخات.

## جەنگی ئیستینزاف ١٩٨٤–١٩٨٥

بەهاتنی ساڵی ١٩٨٤–١٩٨٥، هێزە ئاسمانییەكانی عێراق زیانی گەورەیان بەدامودەزگا نەوتییەكانی ئێران گەیاند لە دورگەی خەرەج؛ هەموو كەشتییەكانی گواستنەوەی نێودەوڵەتی ترساند كە ئێران بۆ هەناردەكەنی نەوت پشتی پێ دەبەست. سەركەوتنی ئەو تەكتیكانە وایكرد دەستدرێژی زیاتر بكاتە سەر وێستگەنەوتییەكانی ئێران لە كەنداو، لەهەردوو دورگەی (سەری و لوان). هیچ بواری تێدانەبوو كە ئێران وەڵامی ئەو دەستدرێژیانەی عێراق دەداتەوە ئەوەبوو وەك تۆڵەسەندنەوە ئێران هێرشی كردە سەر ئەو كەشتیانەی كە لەگەڵ عێراق و هاوپەیمانەكانی لەكەنداو كاریان دەكرد و پاڵپشتیان لەهەوڵەكانی عێراق بۆ جەنگ دەكرد. ئەو مەترسییە بۆ سەر هەناردەكردنی نەوت. بووە هۆی زۆر بوونی ژمارەی هێزە دەریاییەكانی ڕۆژئاوا لە ناوی كەنداو لە ئاكامدا وڵاتانی ڕۆژئاوا لەسەروویانەوە ئەمەریكا و بەریتانیا و فەرەنسا و كەشتیگەلی بچوكیان ڕەوانەی

ناوچەكە كرد بۆ مەبەستێكی دیاركراو ئەویش بۆ ئەوەی رێگە لـە ئێـران بگـرن كـە هێرش نەكاتە سەر كەشتییە بارهەڵگرە نێو دەوڵەتییەكان.

بەهاتنی ساڵی ١٩٨٧ مەترسی جەنگی (كەشـتییە نـەوت هەڵگـەركان) زیـاتر بـوو، پاڵی بە كوێت نا كەشتیی نەوت هەڵگری ئەمـەریكی و سـۆڤییەتی بـەكرێ بگرێت. ئەوەش وایكرد بوونی هێزی دەریایی نێو دەوڵەتی بەتایبەتیش ئەمـەریكایی زیـاتر بێت لەناوچەكە، بەتایبەتیش لەژێر رۆشنایی ئەو بارودۆخە چەند جارێك هێزەكانی ئەمەریكا و هێزی دەریـایی ئێـران رووبـەڕووی یـەك ببوونـەوە و سـاڵی ١٩٨٨ ئـەو رووبەڕوو بوونەوانە گەیشتە ئەو پەڕی ، كاتێك زۆربـەی هێـزە دەریایـەكانی ئێـران تێكشكێندرا ، و ئەو رەوشەی هێنایە ئارا كە تیایدا هێـزە دەریاییـەكانی ئەمـەریكا بە ئەنقەسـت تەقـە لـە فرۆكەیـەكی مـەدەنی ئێـران بكـەن. ئێـران بـەهۆی هێرشـە بەردەوامەكانی عێراق بـۆ سـەر دەزگـە نەوتییـەكانی زیـانی زۆری لێكـەوت، بـەڵام پابەندبوونی كراوەی هێـزە دەریاییـەكانی ئەمـەریكا بەجـەنگ لەكەنـداو و لاگـیری كردنـی عێـراق بـە پراكتیكـی بـووە هۆكـارێكی یـەكلاكرەوە بـۆ ئـەوەی ئێـران بەمەرجەكانی ئاگر بەست رازیبێـت لـەژێر چـاودێری UN بـەدەقی بڕیـاری ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایش لە ساڵی ١٩٨٧دا. چونكە بۆ ئێران دەركەوت كە كەوتووەتە نێو جەنگێك نەك بەتەنیا لەگەڵ عێراق بەڵكو لەگەڵ هێزەكانی رۆژئاواش كە عێراق لە ساڵانی جەنگدا پەیوەندی پتەوی لەگەڵیان بونیادنابوو.

لە راستیدا تێڕاوانینی سەدام حوسێن بۆ وڵاتانی زلهێز هەر لەسەرەتاوە لە راستیدا بەشـێكی سـەرەكی بـوو لـە پلانـە جەنگییەكـەی. هـەروەك لـە حـەفتاكانیش سـەلماندی، بەباشـی دركـی بـەتوانای وڵاتـە زلهێزەكـان دەكـرد لـە سـەركەوتن یاشكسـت هێنـانی دەستپێشـخەرییە هەرێمییـەكانی. بـەڵام ئـەویش وەك سـەركردەكانی جیهـانی سـێیەم لـەكاتی جـەنگی سـارد سـێ و دوری نـەكرد لـە قۆستنەوەی وڵاتێك لەسەر حسێبی وڵاتێكی دیكە یا كاركردن لەگـەڵ هـەردووكیان پێكـەوە. پچـڕانی پەیوەندییـەكان لـەنێوان ئێـران و ئەمـەریكا سـاڵی ١٩٨٠و تارادەیەكیش دابڕانی لە UN توخمێكی گرنگ بوو لە حیسـاباتی سـەدام بـۆ ئـەو

مەترسیانەی کە هێرش کردنە سەر خاکی ئێران لە خۆی دەگرێت. دوورە پەرێزی گشتیش لەسەر کۆنەکردنی هێرشەکانی عێراق ئەو راستییەی سەلماند تەنها کاردانەوەی یەکێتی سۆڤییەت نەبێت کە دەستبەجێ ناردنی چەکی بۆ عێراق راگرت بەهۆی باشبوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران.ئەوەش سەدامی تووشی شۆك کرد. بەڵام ئەو هەنگاوە رێگەی بۆ عێراق خۆشکرد پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا بەهێز بکات کە لە توانایاندایە پاڵپشتی هەوڵەکانی جەنگیی عێراق بەشێوازی جۆراوجۆر بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك کە شەڕی ساڵی ١٩٨٢دەستی پێکرد یەکێتی سۆڤییەت دەستیکردەوە بە پێدانی چەك بە عێراق بەشێوەیەکی چڕ، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی ئەو گریمانە گشتییە دووپاتبکاتەوە لە ناوچەکە و دەرەوەی ناوچەکە کە سەرکەوتنی سەربازیی ئێران رەنگە زیانێکی ریشەیی بەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بگەیەنێت ئەو پرسەش نە لەبەرژەوەندی رۆژهەڵات و نە لەبەرژەوەندی رۆژئاوا بوو، (ئەوەش ئەو دروشمەی ئێران بوو کە لەو کاتدا بڵاوببووەوە). بەڵام دواتر بۆ ئێران دەرکەوت ئەو دروشمە زۆر بەگران لەسەری کەوتووە لەبەر ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٨ بۆی ئاشکرابوو رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەشێوەیەکی چالاکانە پاڵپشتی هەوڵە جەنگیەکانی عێراقیان دەکرد.

لە ناوەڕاستی هەشتاکان هێشتا عێراق بەتەواوەتی پەیوەندییە دیپلۆماتیەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەدەست نەهێنابووەوە، بەڵکو سودیشی لەو پاڵپشتییە مادیە وەردەگرت کە ژمارەیەك وڵاتانی رۆژئاوایی پێیان دەگەیاند، دیارترینیان ئەمەریکا و فەرەنسا و بەریتانیا بوون. بەشێك لەو یارمەتییە لەشێوەی قەرز پێدان بوو بەشێکی دیکە تەرخانکرابوو بۆ کەلوپەلی جەنگی کەدەکرێ راستەوخۆ بۆ پاڵپشتی جەنگیی عێراق بەکاربێت. بەوشێوەیە عێراق خۆی بینیەوە کە کورە بەنازەکەیەو هێزە رۆژئاواییەکان و هاوپەیمانەکانی خۆشیان دەوێت و دەستی بەسەردا دەهێنن و یارمەتیەکانیان دەخەنە ژێر رکێفی هەوڵە جەنگییەکانی لە ئاوی کەنداو و بەرەکانی جەنگ. لەگەڵ بوژانەوەی

پەیوەنـدی ئەمـەریکا بـە عێـراق. زانیـاری ورد و راسـتەوخۆ لـە رێگـەی مانگـە دەستکردەکانەوە دەگەیشتە دەست عێراق لە هەمبەر پێگەو جموجۆڵی سەربازیی ئێران، ئەوەش رۆڵێکی زیندووی هەبوو لەبـەر پەرچدانەوەی هێرشـەکانی ئێـران و سەرکەوتنەکانی سوپای عێراق کاتێك لە ساڵی ١٩٨٨ دەستپێشخەری هێرشکردنی کرد.

لەو ساڵەدا ئێران لە ئاکامی ئـەو گۆڕانکارییانـەی بەسـەر بـەرەی جـەنگ دەهـاتن، رەزامەندی لەسەر ئاگر بەست دەربڕی. هەروەها هەوڵە یەك لەدوای یەکەکانیان بۆ کەلێن دروستکردن لە ریزەکانی پێشەوەی سوپای عێراق لە بەرەکانی جەنگ هـیچ سەرکەوتنێکی نەبوو، بەڵکو کوژرانی سەدان هـەزار سـەربازی ئێرانـی لێکەوتـەوە. لەساڵی ١٩٨٨ دەرکەوت باڵا دەستی هێزەکانی عێراق رەوشەکان یەکلا دەکاتـەوە ، لـە راسـتیدا سـەرکەوتنی سـوپای عێـراق و دەستپێشـخەری بەهێرشـکردن هـەر بەتـەنها بـۆ زانیاریـە هەواڵگریـەکان و پێشـکەوتووی جـۆری چـەك نەدەگەڕایـەوە، بەڵکو بۆ ئەو گۆڕانکارییـە سـەرەکییەش دەگەڕایەوە کـە لـە جـۆری بـەکارهێنانی هێـزە چـەکدارەکان ئەنجامـدرا. ئـەو هێزانـە لـە ئاکـامی تەنگـژەی نێـوان سـەدام حوسـێن و سـەرکردە سـەربازییەکانی لـە سـاڵی ١٩٨٨ ئاراسـتەی خۆیـان گـۆڕی. سەرەڕای باڵا دەسـتی سیاسـی، بـەلام گۆڕانکـاری گـرنگ لەشـێوەکانی دەسـەلات روویـدا کـە بنچـینەی رژێمەکـەی پێکهێنـابوو. راسـتە بەسـەختی تـوانی رێگـە بـە روودانی ئەو گۆڕانکارییانەبدات. بەلام ناچار بوو بەهۆی رەوشی کارەسات ئـامێزی جەنگ لەو کاتەدا.

لەماوەی ساڵەکانی دوای ١٩٨٢ ئێـران زۆرجـار هێرشـی لـە دژی هێزەکـانی عێـراق ئەنجامداو کە زۆر گران لەسـەری وەسـتا و لـە ئاکامیشـدا بـێ هـودە بـوو. جـەنگ لەبەرەکاندا و ژمارەی زۆری بریندارو کوژراوان هیوایەکی دروستکرد کـە ئێـران بـیر لـە ئامانجـەکانی جـەنگ بەکاتـەوە. بـەلام ئـەو کپبوونـە لـە شـوباتی ١٩٨٦دا گۆڕانکاری بەسەرداهات کاتێك هێزەکانی ئێران نیمچە دورگەی فاویان داگیرکرد کە دەکەوێتە دەروازەی شەتولعەرەب. ئەو گرنگیەی کە سەدام بە ئـازادکردنی فاویـدا

ڕوون و ئاشـکرا بـوو کاتێـك فەرمانیـدا بـژاردەی یەکـەکانی پاسـەوانی کۆمـاری بەشداری لە جەنگ بکەن. ئەو یەکانە لـەو کەسانە پێکهـاتبوو سـەربە عەشـیرەتی سەدام حوسێن و عەشیرەتە هاوپەیمانەکانی ناوچـەی تکریت بـوون تـا ئـەو کاتـە وەك هێزێکـی یـەدەگ دانرابـوون. ئـەرکی سـەرەکیان وەکـو هـی سـەردەمی عەبدولسەلام و عەبدەلرەحمان عارف بوو، کە بریتی بوو لە پاراستنی ڕژێم لەهـەر دەستدرێژییەکی نێوخۆیی کـە یەکەیـەکی سـەربازیی دیکـە بـە مەبەسـتی کودەتـا ئـەنجامی بـدات. بەوهۆیـەوە پاسـەوانی کۆمـاری لـەو کەسـانە پێکهێنرابـوو کـە باگراوندی هاوبەشیان لەگەڵ سەدام حوسێن هـەبوو لـە زۆرشـتدا هاوشـێوەی ئـەو بـوون. لەگـەڵ ئەوەشـدا پاسـەوانی کۆمـاری لـە فـاو زیـانی زۆری لێکـەوت و ئەفسەرەکانی والێکرد بچنە ریزی ئەوانی دیکە و داوای کشانەوە لەشەر بکەن.

ئەوە بووە هۆی ڕووبەڕوو بوونەوە لە نێوان سەدام و هەندێك لە پیاوانی پاسەوانی کۆماری و کەسانی دیکە لە سوپای عێراق لە خزمـەکانی سـەدام و هۆزەکـەی کـە چـووبوونە پـاڵ هـاوڕێ ئەفسـەرەکانیان. لـە ڕووی پیشـەیی سـەربازییەوە ئەفسەرەکان ڕوونیان کردەوە کە ناتوانن هێزەکانی ژێر فەرمانی خۆیان بخەنە نێو شەڕێکی بێ ئاکام کە تەنها سودەکەی ئەوەیـە فـەرمانی سـەرکردایەتی سیاسـیان جێبەجێکردووە. ئەوەش بووە تەحەدایەك بۆ ئەو پڕوپاگەندەی سەدام حوسێن کە هەموو شتێکی گەورەو بچوکی دەوڵەتەکەی دەزانێت و دەسەڵاتی بەسەر سەرجەم دەزگاکانیدا هەیە. ئەوەش دواتر بووە تەحەدایەکی سیاسی گـەورە. بـەڵام کاتێـك سەدام خۆی بینیەوە کە لەهەمبەر هاوکارییەکی پیشەیی لەو جۆرەدایە کە، چۆتە نێـو تۆڕەکـانی دەسـەڵات و بـاڵا دەسـتی خـۆی و مەحسـوبیەتی عەشـایەری و خانەوادەیی کـە خـۆی زۆر بـەوردی هۆنیبوویـەوە. ناچـار بـوو گوێڕایـەڵی گـەورە سەرکردەکان بێت و دڵی خۆی بەوە دایەوە کە پلان بۆ ڕێگە چارەیەك دابنێـت بـۆ بەدەستهێنانەوەی دەستپێشخەرییە سەربازییەکانی.

ئەو هەنگاوە بووە هۆی دەستدرێژیە شومەکەی سـەرمەهران لـە ئایـاری ١٩٨٦دا. وێنەکانی داگیرکردنی ئەو شارە لەلایەن میـدکانی عێراقـەوە پێشـوازیی لێکـراو بـە

نمونەیەکی زیرەکی سەربازیی سەدامیان لە قەڵەمدا وەك تۆڵە سەندنەوەیەك لە داگیرکردنی فاو . لە راستیدا ئەوە هێزەکانی عێراقی دووچاری مەترسیەکی گەورە کردو لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە لەمانگی تەممووزدا دژەهێرشیان کرایە سەر. ئەو رووداوە بووە هۆی ئەوەی جارێکی دیکە سەدام روو بەڕووی سەرکردە باڵاکانی ببێتەوە، داگیرکردنی مەهران مەترسی ئەوەی هێنا ئاراوە کە سەرکردایەتی سیاسی پلانی جەنگی دابنێت. لە راستیدا ساڵانی جەنگ و ئەو پێشکەوتنە گەورانەی کە بەسەر هێزە عێراقیەکاندا هات و مەترسیە سەربازییەکانی ئێران جۆرە هەماهەنگیەکی پیشەیی دروستکردبوو کە زاڵ بوو بەسەر هەماهەنگی پاشکۆیەتی و خانەوادەیی کە سەدام پشتی پێدەبەست بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی دەزگای سەربازیی بۆ دیکتاتۆریەتی خۆی مسۆگەر بکات. لە راستیدا. ئەو تۆڕانە وون نەبوون بەڵکو گەشەیان کرد. وەك ئەوەی لە ناسنامەی یەکە سەرەکیەکان و ئەندامانی سەرکردایەتی باڵا دیار بوو. بەڵام رووداوەکانی فاو بە پلەی یەکەم و دواتریش مەهران دەریخست کە هاوکارییەکی پیشەیی هاوبەش هەیە.

ئەگەر شێوەی ئەو روو بەڕووبوونەوانە هەر جۆرێك بوو بێت. بەڵام ئەنجامەکانی زۆر گرنگ بوون، سەربەخۆیی پلانی سەربازی لە سەرکردایەتی سیاسی سەدام و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ئازادیەکی زیاتری دایە سەرکردە سەربازییەکانی عێراق لە وەڵامدانەوەی هێرشەکانی ئێران بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ پرسکردن بە بەغدا. جارێکی دیکە هێزە ئاسمانیەکانی عێراق دوای ئەوەی لە سەرەتای جەنگ بە هۆی باڵا دەستی هێزە ئاسمانیەکانی ئێران لەبەرەکاندا هاتنە دەرەوە ، وەك چەکێکی کردەیی جارێکی دیکە هاتنەوە نێو شەڕەکە. سەدام لەوە دەترسا ئەو بەشەی سوپا ماندوو بکات چونکە هێزە ئاسمانیەکانی بە(دوا پەناگە) دادەنا. بەکارنەهێنانی هێزە ئاسمانیەکانی رەنگە بۆ ئەوە گەرابێتەوە کە سەدام متمانەی بە لایەنگریی سیاسیان نەبوو. چونکە ئەفسەرەکانی بە ئاسانی نەدەچوونە ژێر باڵی تۆڕەکانی پاشکۆیە عەشایەرییەکانی.

بە لەبەر چاو گرتنی بارودۆخی بەرەی جەنگ. سەدام دانی بەوەنا لە رەوشێکی ئەوتۆدایە ناتوانێت شتێك بکات لە هەمبەر ئەو هەستە هاوبەشەی کە لەو کاتەدا سەریهەڵدا. بەڵام توانی ببینێت. کە ئەگەر سوپای عێراق ناسنامەیەکی دامودەزگەیی و پیشەیی بەدەست بێنێت رەنگە سەرکردایەتی سیاسی ئەو لاواز بکات و هۆکارەکانی سەپاندنی کۆنترۆڵی لە ناوبیات و گومان لەو پلانانە دروستبکات کە دایدەنێت . لە ئاکامدا، لەو کاتەی ملکەچی دەزگای سەربازیی بوو، کۆنتڕۆڵی خۆی بەسەر دەوڵەت پتەوتر کردبوو. ژمارەیەك فەرمانبەری لەسەر کارلاداو هەندێکی دیکەی لە پۆستەکانیان گواستەوە. لە هەموو کاتێك زیاتر پشتی بە بازنە تەسکەکانی بەست لە خزم و لایەنگرانی کە بنچینەی پێکهاتنی رژێمەکەی بوون.هەروەها رشتبوو لەسەر ئەوەی کە پرۆسەکانی (لێپرسینەوەی دامودەزگەیی) نەگاتە نێو سەرکردایەتیە سیاسیەکەی و تۆرە فراوانەکانی هەژمونی. راستە بەردەوام بوو لە دامەزراندنی خزمەکانی و ئەندامانی عەشیرەتەکەی کە متمانەی پێیان هەبوون بۆ پۆستی سەرکردایەتی لە هێزە چەکدارەکان بەڵام، راستیە سەربازییەکان لە عێراق لە دوو ساڵی داهاتوو سەلماندیان ئەو کەسانە زۆر نەیاندەتوانی دەست لە لێهاتوویی پیشەیی لە دەزگای سەربازییدا وەربدەن.

## بەرگری کورد و شیعە

هەموو ئەو کۆمەڵە هۆکارانە یارمەتیدەربوون بۆ ئەوەی سەدام حوسێن جارێکی دیکە سەرنجی خۆی ئاراستەی رەوشی کوردستان بکاتەوە. کەلەو چەند ساڵەی رابردوو فەرامۆشی کردبوو، بەو پێیەی گرنگی کەمتر بوو لەو شەڕەی کە لەبەرەی باشوور لە ئارادابوو. بەڵام لەساڵی ١٩٨٧و لەگەڵ وەستانی دەست تێوەردانەکانی ئێران لە باشوور پلاندانەرە سەربازییەکانی عێراق سەرنجی خۆیان خستە سەر کوردستان کە تیایدا هاوپەیمانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی

کوردستان لە ساڵی ١٩٨٥ پرۆسەی سەربازی چڕو کاریگەریان لە دژی پێگەکانی حکومەت ئەنجامدەدا. بەڵام سەدام کە مەترسی لە دەستدانی دەسەڵاتەکەی دەکرد بەهۆی شکستە بەردەوامەکانی سوپای عێراق لە بەدەستهێنانەوەی فاو و بەهۆی پەیوەندییە تازەکانی لەگەڵ سەرکردایەتی سەربازیی. لەلایەن خۆیەوە وای بینی کوردستان هەلێکە بۆ چەسپاندی هێز و درەندەیی خۆی. هەموو ئەو هۆکارانە بەیەکەوە هانیدا لە ئاداری ١٩٨٧دا عەلی حەسەن مەجیدی خزمی بە نوێنەری خۆی لەباکوور دابمەزرێنێت (کە تا ئەو کاتە سەرۆکی دەزگای هەواڵگری دەوڵەت و ئەندامی سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعسیش بوو). دەسەڵاتێکی تەواوی بەسەر سەرجەم دامودەزگاکانی دەوڵەت و حزب پێدرا، لەوانە سەرجەم هێزە سەربازییەکان و دەزگە هەواڵگرییەکان. تەنها لە بەرامبەر سەدامیش بەرپرس بوو.

ئەو ڕەوشەی کە مەجید ڕوو بەڕووی بووەوە و پێویست بوو بە دەستێکی ئاسنین کۆنترۆڵی بکات لە تەمموزی ١٩٨٣دا دەستی بە پەرەسەندن کرد، کاتێک سەرکردایەتی باڵا لە ئێران هێرشێکی گەورەی لە سنوری کوردستان ئەنجامدا و دەستی بەسەر شاری حاجی ئۆمەران داگرت و ناوچەکانی نزیک پێنجوێنی (penjwin) داگیرکرد کە دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای کوردستان. پارتی دیموکراتی کوردستان یارمەتی هێزەکانی ئێرانیدا و پاڵپشتیەکی ناوەخۆیی بۆ دابین کرد و زانیاری بەنرخیان پێدان، لەبەرامبەر ئەوە هێزە ئەمنیەکانی عێراق ٨هەزار پیاو و منداڵی عەشیرەتی بارزانیان دەستگیرکرد و مردن چارەنووسیان بوو. بەوەش تۆڵەی لێکردنەوە بۆ ئەوەی بیانکاتە پەندێك بۆ ئەوانەی بیر لە یارمەتیدانی ئێران دەکەنەوە. ئەنجامێکی دیکەی سەرکەوتنەکانی ئێران لە ساڵی ١٩٨٣ نزیکبوونەوەی زیاتری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو لە حکومەتی بەغدا لەبەر ئەوەی سەرکردایەتیەکەی هەستی دەکرد لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە مەترسی لە سەرەو نەیارەکەشی پارتی دیموکراتی کوردستان دەسکەوتی باشتری دەبێت. سەدام دەستی بە دانوستان کرد لەگەڵ جەلال تاڵەبانی سەرۆکی یەکێتی

نیشتمانی کوردستان و. ئەگەری دانوستانکردنەوەی سەبارەت بە بەندەکانی سەربەخۆیی زاتی لە بەرژەوەندی خۆیدا خستەڕوو. پێدەچوو بەدەستهێنانی ئەوە ستەم بێت ، بەڵام ناکۆکی بۆشایی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان فراوان و ئاڵۆزتر بوو و ماوەی ئەو ١٨ مانگەی کە دانوستانی تێدا ئەنجامدرا یارمەتی بەغدای دا کە ڕێگە نەدات ئێران و هاوپەیمانەکانی لە ناوچە کوردیەکاندا دەسکەوتی زیاتر بەدەست بێنن.

لە کانونی دووەمی ١٩٨٥دا، بەڕوونی دیار بوو کە سەدام نایەوێت بچێتە ژێربالی داواکارییەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی پەیوەست بە سەربەخۆیی زاتی و دارایی و کۆنترۆڵکردنی کێڵگە نەوتیەکانی کەرکوك و یاخود کۆنترۆڵکردنی نێو خۆیی هێزە ئەمنیەکان لەناوچە کوردیەکاندا. ئەو خاڵانە لە بنچینەدا بریتی بوو لە کرۆکی دانوستانەکانی پێشوو لە نێوان بەغداو کورد داو. وەکو هەموو جارێك، دانوستانەکان شکستی هێنا، یەکێتی نیشتمانی کوردستان چووە ریزی ئۆپۆزسیۆن دەستی بەشەڕی پارتیزانی کرد و پەیوەندی لەگەڵ تاران دروست کرد. لەئاکامدا، بەغدا لە ناوەڕاستەکانی ١٩٨٥دا خۆی لە نێو رەوشێکی ئەمنیی پشێودا دیتەوە. ناوبژیوانی ئێران بۆ هەردوو حزبە کوردیە نەیارەکە هەندێك سەرکەوتنی بەخۆیەوە دیت و تیمێکی سەربازیی نافەرمی لێکەوتەوە. بە شێوەیەك پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە هەندێك بەشی کوردستان. ناوچەی حوکمی زاتیان دروستکردبوو لە ژێر ئەمرێ واقیع و گەورەترین پاڵپشتی کۆمەڵایەتیان هەبوو. بەم شێوەیەو بەهاتنی کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٦ هێزە حوکومیەکانی عێراق تەنها کۆنترۆڵی شاروشارۆچکە گەورەکانیان بەدەستەوە بوو. سەرەڕای بۆڕییەکانی نەوت و ڕێگە سەرەکیەکان کە ناوچەکانی دانیشتوانیان بەیەکەوە گرێدەدا. بەڵام لە ناوچەکانی دیکە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و چەند حزبێکی دیکەی بچوکی کوردی و ڕێکخراوەکانی بەرگری نێو خۆیی جێ پێی خۆیان قایم کردبوو و لە زۆربەی کاتەکانیشدا چالاکی جاشەکانیان پەکخستبوو کە لەوکاتەدا

سەركردەكانیان وەكو پێویست پارمەتیان پێشكەش بە هێزەكانی حكومەت نەدەكرد وەكو لە رابردوودا .

لە ژێر رۆشنایی ئەو بارودۆخە و لەگەڵ درككردنی بەوەی كە سەدام رشتە لەسەر كۆنترۆڵكردنەوەی كوردستان لەلایەن حكومەتەوە بەهەر نرخێك بێت. عەلی حەسەن مەجید پۆستە تازەكەی وەرگرت و هەڵمەتێكی زۆر توندی دەستپێكرد بەناوی ئەنفال. تیادا چەكی كیمیاوی بەكارهێنا (لە نیسانی ١٩٨٧دا یەكەم بەكارهێنانی لەلایەن هێزەكانی عێراق لە كوردستان تۆماركرا). بۆ بڵاوكردنەوەی ترس و بەدیهێنانی ئامانجە سەربازییەكان. هەروەها ئەو كەسانە دەسگیركران و لە سێدارەدران كە گومانیان لێدەكرا سەربە رێكخستنەكانی شەڕی پارتیزانی بن، یا ئەوانەی رایانكردبوو لە سوپای عێراق. سەرباری ئەوەش گوندەكانی ئەو ناوچانەی كرابوونە ئامانج وێران كران و بەرووبومە كشتوكاڵیەكان لە ناوبردران و وێران كران و سوتێنران و دانیشتوانی ئەو ناوچانەش كە لە ژیان مابوون راپێچی كۆمەڵگاكانی نیشتەجێ بوون كران كە لە ژێر چاودێری حكومەتدا بوون. ئەو هەڵمەتە بە شێوەیەكی پچڕپچڕ ئەنجامدرا لە ماوەی ساڵی ١٩٨٧دا. سەرەڕای ئەوەی نیشانەیەك بوو بۆ تواناكانی رژێم و نیازەكانی. بەڵام نەیتوانی بارودۆخی سەربازیی لە كوردستان لە بەرژەوەندی رژێم بگۆڕێت.

ئەو پرسە بۆ دڵنیانەبوون لە نیازەكانی ئێران لە بەرەی باشووری جەنگ و گرنگیدانی دەسەڵاتدارانی عێراق بە پاراستنی دەرامەتەكان دەگەڕایەوە. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ روون و ئاشكرا بوو كە ئێران هیچ دەستپێشخەرییەك بۆ هێرش كردن ناكات بەڵكو توانای سەربازیی ئێران لە پاشەكشە دابوو. لە ئاكامدا حكومەت بە تەواوەتی رووی كردە ناوچە كوردیەكان و بەهەموو شێوەیەك پشتگیری عەلی حەسەن مەجیدی كرد بۆ خاپووركردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی كورد. لە شوباتی ١٩٨٨ هەڵمەتی ئەنفال بەمانا راستەقینەكەی خۆی دەستپێكرد. هێزەكانی عێراق سیاسەتی خاكی سوتاویان لە هەموو ئەو ناوچانە دەست پێكرد كە شەڕی پارتیزانی تێدا كرابوو ، سەرجەم دانیشتوانەكانی دەكوشتن و گوندەكانیشی وێران

دەکرد. لەو کاتەدا چەکی کیمیاوی بە شێوەیەکی رۆتینی بەکاردەهێنراو زۆربەی قوربانیەکانی ژن و منداڵ بوون، سەرەڕای ئەو پیاوانەی کە ناوی سەربازییان هاتبوو بەردەوام کرابوونە ئامانج. تەنها ژمارەیەکی کەم نەبێت بەختی ئەوەیان هەبوو کە گواسترانەوە کۆمەڵگە زۆرەملێکان، لەبەردەم ئەو کۆمەڵکوژی و قەسابخانەیە. گروپەکانی شەڕی پارتیزانی بێتوانا مانەوەو هەوڵیان دا سەلامەتی گەلەکەیان بپارێزن ، هاوکاریەکانی ئێرانیش لەو کاتەدا زۆر کەمبوو. کاتێکیش کە هێزەکانی ئێران هاتنە ناو کێشەکە هەروەکو ئەوەی کە روویدا لەو کاتەی کە دەستی بەسەر شاری هەڵەبجەدا گرت لە ئاداری ١٩٨٨دا. کاردانەوەی حکومەتی عێراق گەیشتە رادەیەك لە درندەیی لە دژی دانیشتوانی سڤیل کەمایەی بەرگەگرتن نەبوو. لە حاڵەتی هەڵەبجە. چەکی کیمیاوی وادەخەمڵێنرێت ٤ هەزار کەسی کوشت و ئەوانەی لە ژیانیشدا مان ناچارکرد بەرەو سنوری ئێران رابکەن .

لە کۆتایی مانگی ئاداری ١٩٨٨ دەست بە سەر بارەگای سەرەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا گیرا و، وای لێهات زۆرستەمبوو حزب هیچ جۆرە بەرگریەك رێکبخات لە گوندەکان و ناوچە وێرانکراوەکان. بەرگری پارتی دیموکراتی کوردستان بەردەوامبوو بەڵام دوای ئاگر بەستی نێوان ئێران و عێراق لە تەمموزی ١٩٨٨دا. حکومەتی عێراق هێزەکانی خۆی بە هەموو توانایەکەوە ناردە سەر پێگەکانی ئەو حزبە. لە بەرامبەر ئەو هێرشە حزب داوای لە پێشمەرگەکانی کرد بەرگری زۆرنەکەن و ئاگایان لە رزگارکردنی خانەوادەکانیان بێت لە رێگەی سنوری تورکیاوە. لە کۆتایی مانگی ئابدا. بەرگری رێکخراو وەستاو هێزەکانی عێراق دەستیان بەسەر تەواوی ناوچە کوردیەکاندا گرت. لە هەرسێ پارێزگاکەی ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا نزیکەی ٨٠ لە سەدای گوندەکان وێرانکران و راگەیەنرا کە سەرجەم زەویە کشتوکاڵیەکان (خاکی قەدەغەکراون) و نزیکەی ٦٠,٠٠٠ کەس کوژران. لە سێدارەدانی ئەو کەسانەی لە هەڵمەتەکانی ئەنفال دەستگیرکرابوون بەردەوام بوو. بەڵام لەسەرەتاکانی ئەیلولی ١٩٨٨دا حکومەتی عێراق لێبوردنی گشتی راگەیاند و

ڕێگەی دا بەوانەی کە پێشتر پێشمەرگەش بوون بگەڕێنەوە عێراق. سەرەڕای ئەوەی کە گوندەکانیان بە شێوەیەکی گشتی وێران ببوو.

ئەنفال کۆتاییەکی مەنتیقی بوو ئەگەر نەڵێین دڕندانەیی بۆ سیاسەتی ڕژێم لە هەمبەر کورد. بەغدا لەو کەسانە خۆشدەبوو کە ئامادەییان نیشاندەدا بێنە ڕیزەکانی بەڵکو متمانەی تەواوی پێدەکردن. بەڵام ئەو کەسانە بەکاردەهێنران و پاداشت دەکران لە ململانێ دژی ئەو کەسانەی دەسەڵاتی سەدام و حکومەتی بەغدایان ڕەتدەکردەوە. کاتێك پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەرکەوتووبوون لە تەحەداکردنی ڕژێم و حکومەتی مەرکەزی، ئەوە دەستپێشخەرییەکی ترسناکیان ئەنجامدا، سەدام ڕشتبوو لەسەر ئەوەی هەردوو حزب و ئەوانەی پشتیوانیان لێدەکەن بکاتە پەند. لەگەڵ ئەوەش کە بە عێراقیەکان گوترابوو بەهۆی ئەوەی هاوکاری ئێرانیان کردووەو خیانەتیان کردووە سزادراون، بەڵام تاوانی ڕاستەقینەیان ئەوە بوو تەحەدای ئیرادەی سەدام حوسێنیان کردبوو. ئەو وێرانکارییەی ئەنفال لەدوای خۆی بەجێیهێشت بۆ کورد و هەموو عێراقیەکانی ناوەوەو دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی دەرخست کە ئەوە چارەنووسی هەرکەسێکە لە "ریزی نیشتمانی" دەربچێت، وەك ئەوەی کە خودی سەدام پێناسەی کردبوو.

لە هەندێك لایەنەوە، ئەو سیاسەتەی ڕژێم لە هەمبەر شیعە پەیڕەوی دەکرد لەو ساڵانەدا هێندە جیاواز نەبوو، بەو پێیەی شیعە زۆرینەی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن ، ملکەچکردنیان پێویستی بە تەکتیکێکی دیکە بوو. ئەوەش زۆر گرنگ بوو چونکە سەدام دەیویست لە دژی ئێران ئامادەیان بکات. بە تایبەتیش لەو ڕووەی ڕژێمی ئێران ڕشتبوو لەسەر جەختکردنەوە لەسەر ناسنامە شیعیەکەی خۆی، دواتریش ڕەنگە لەسەر پرسی هاوبەشی نێوان شیعەی ئێران و عێراق. حکومەتی عێراق چەند ستراتیژییەتێکی پەیڕەوکرد کە لە ڕێگەیانەوە نەك تەنها هەر هەوڵی ئەوەی دەدا بەڕوونی ئێرانی و عێراقیەکان لێك دووربخاتەوە. بەڵکو پرسی فرەناسنامەیی شیعەکانی عێراقیشی ووروژاند. ئەو ناسنامانە عێراق دروستی

نەکردبوو. هەرچەندە سەدام هانی ئەو کارەی دەدا ، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێگا جۆراوجۆرانەی کە بەدرێژایی مێژوو گروپە شیعە عێراقیە جۆراوجۆرەکان پابەندی بوون لەگەڵ دەوڵەتی عێراق. شیعەی گوندەکان، کەتاکو ئێستا کۆمەڵگەیان کاریگەرن بە بنەماکانی خزمایەتی و عەشیرەتگەریی پرسی شەرەف و خوڕەوشت بەسەریدا زاڵە. ئەوانە تەواو جیاوازن لەگەڵ ئەو شیعانەی دانیشتوانی شارەکانن. جا ئەگەر پیاوی ئایینی بن یا پیشەکاری سادە یان ئەو هەژارانەی دانیشتووی پرۆژەی نیشتەجێکردنی گەورەی سەدام حوسێن بوون لە بەغدا. (کە بە شاری سەورە ناسرابوو، دواتر لە ساڵی ١٩٨٨ ناوی کرا بە شاری سەدام). تەنانەت لە نێو ئەو گروپەشدا جیاکاری لەسەر ئاستی دەوڵەمەندی و پۆست و ئایین و ئایدیۆلۆژیا هەبوو.

پێش بەرپاکردنی جەنگ. حکومەتی عێراق هەوڵی زۆریدا ریزەکانی شیعە لێك بترازێنێت. مەحسوبیەتی خۆی لە نێو پیاوانی ئایینی بەکارهێناو ئەو شیعانەی کە بە فارس ناوی دەبردن لە عێراق دەریکردن. بەلانی کەم ئەگەر بە وتاریش بێت جەختی لەسەر هەردوو ناسنامەی عێراقی و عەرەبی دەکردەوە بۆ ئەوەی شیعەی عێراق لە شیعەی ئێران جیا بکاتەوە. هاوکات لەگەڵ ئەوەش هەڵمەتی سەرکوتکردنی دژی ڕێکخراوە سیاسیەکانی شیعە وەکو حزبی دەعوە پەیرەو دەکرد کە کاری بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لە عێراق دەکرد. ئەوە وایکرد زۆربەی ئەندامەکانی بەرەو ئێران رابکەن. لەوێ بەچاودێری حکومەتی ئێران ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق لە ساڵی ١٩٨٢دامەزرا ئەو دەزگایە مەحەمەد باقر ئەلحەکیم سەرۆکایەتی دەکرد و دواتر بوو بە حزبێکی سیاسی لە ژێر سەرۆکایەتی ئەلحەکیم. ئەلحەکیم کە حکومەتی ئێران بە توندی پاڵپشتی دەکرد ئارەزوویەکی توندی هەبوو بۆ پشتگیرکردنی بیروباوەڕی فەرمی کۆماری ئیسلامی ئێران کە دەیگوت ویلایەتی فەقیە شێوازێکە بۆ حوکمی ئایندە لە عێراق. ئەوەش وایکرد ڕێکخراوەکانی دیکەی شیعە لێی دووربکەونەوە. وەك حزبی دەعوە کە ترسی لەو بیروباوەڕەو پەیوەندیە پتەوەی نێوان ئەنجومەنی

باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق و حکومەتی ئێران هەبوو . بەڵام ئەو پاڵپشتیەی کە حکومەتی ئێران لە حەکیمی دەکرد وای لێکرد هێزێکی سەربازیی بچوك پێکبهێنێت و ناوی لێنا لیوای بەدر. کە لەسەرەتادا لەو زیندانییە عێراقیانەی جەنگ پێکهاتبوو و دواتر رۆڵێکی بچوکیان لە هەندێك رووبەڕووبوونەوە بینی بەتایبەتی لە کوردستان.

لە راستیدا. زۆربەی شیعەکانی عێراق پەیوەندییان بەو رێکخراوە سیاسیە نەبوو بەڵکو وەکو هەموو عێراقیەکانی دیکە باری جەنگ ئەستۆی قورس کردبوون. لە کاتێکدا ریزی ئەفسەران لە هێزە چەکدارەکان عەرەبێکی سوننەی زۆری تێدا بوو ، هەر وەکو کە هەردەم وابوو. ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرانی شیعە پلەکانیان بۆ پۆستی زۆر گەورە بەرزکرایەوە کەتیایدا توانا و لێهاتوویی خۆیان لەجەنگ لە دژی ئێران نیشاندا. لەگەڵ ئەوەی رێژەی راکردن لە سوپا ئێجگار زۆربوو لە هەندێك قۆناغەکانی تەنگژەکەدا. بەڵام زۆر کەمتر بوو لەوەی کە ریزەکانی یەکە سەربازییە کوردیەکان بەخۆوەی دەدیت و رەنگە زۆر کەمیش جودا بێت لە رێژەی راکردن لە نێو عەرەبی سوننە. لە ترسی ئەوەش کە نەبادا هێزەکانی شیعەی پیادە کە زۆربەی سوپای عێراقیان پێکدەهێنا وەلایان نەبێت. حکومەتی عێراق هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی گەورەی لە ماوەی ساڵانی جەنگ دەستپێکرد بوو، جەختی لەسەر یەکگرتوویی نێوان سەرجەم عێراقیەکان و ناسنامەی عێراقی و عەرەبی شیعە عێراقیەکان و ئایینی ئیسلامی رژێم دەکردەوە (گەیشتە ئەو رادەیەی کە ئیدیعای ئەوە بکرێت سەدام حوسێن بەرەچەڵەك دەگەڕێتەوە سەر ئیمامی عەلی). لە راستیدا، نەزانراوە کە ئایا زۆرینەی عێراقیەکان بڕوایان بەوە هاتووە کە ئێران دوژمنێکی پێویست و بەردەوامی سەرجەم عێراقیەکانە. ئەستەمە بتوانین دیاریبکەین کە تا چ رادەیەك بەشداری چالاکانەی شیعەکانی عێراق لە هەڵمەتەکانی جەنگ دەگەڕێتەوە بۆ هەستکردنیان بە ناسنامەی عەرەبی و عێراقیانەیان. رەنگە زیاتر ئیعتیباراتە براگماتیەکان هانیدابن خۆیان یەکلابکەنەوە وەك پێویستی بەرگریکردن لە خۆیان و خانەوادەکەیان لە دژی

هێزەکانی ئێران و دەرەنجامە خراپەکان کە بەسەر خۆیان و خانەوادەکانیان دێت ئەگەر بێتو بەشداری شەڕنەکەن.

لە نیسانی ١٩٨٨دا ، ئەو ستراتیژیەتەی کە سەرکردایەتی بالا پەیڕەویدەکرد ڕێگەی بە دەستکەوتنەوەی نیمچە دوورگەی فاودا لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ، لە مانگەکانی داهاتوو هێزە عێراقیەکان دەستیانکرد بە هێرشکردن لە کەرتەکانی دیکەی بەرەی جەنگ، ئەوەش ورەی سەربازەکانی ئێرانی دابەزاند و، بەروون و ئاشکرایی بۆ ئێرانیەکانی سەلماند کە ئێران هیوای نەماوە لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانی جەنگ. کاتێك ئێران ئاگر بەستی قەبوڵکرد لە تەمموزی ١٩٨٨دا، سەدام هەواڵی سەرکەوتنی راگەیاند. لە دیاریکردنەوەی عێراق بۆ ئامانجە جەنگیەکانی وڵات دەکرێ بڵێین عێراق سەرکەوتوو بووە. چونکە هەوڵەکانی ئێرانی بۆ ڕووخاندنی ڕژێمەکەی پوچەڵکردەوە. فشارەکانی جەنگی تێپەڕاند بەبێ ئەوەی گۆڕانکارییەك لە دەموچاوە سەرەکیەکانی وڵات ئەنجامبدات. سەرەڕای چەند هەوڵێکی کوشتنی سەدام حوسێن و بوونی چەند راپۆرتێك لە بارەی کودەتاکان لە نێو هێزە چەکدارەکاندا. بەڵام ئەو هەوڵانە بەبەراورد لەگەڵ ڕووداوەکانی پێشووی مێژووی عێراق، بەشێوەیەکی رێژەیی ڕووداوی دابڕاون. بە شێوەیەکی گشتی گروپەکانی نێو بازنە نزیکەکانی بنکەی کۆمەڵایەتی ڕژێم ڕێکیان نەخستبوو، بەڵکو هەندێك کەسی بێزار بە تایبەتیش لە شیعەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا. سەرکەوتنە بەناوەکەی عێراق، بۆش بوو، بەو پێیەی ئامانجەکانی ئەیلولی ١٩٨٠. بەدی نەهات تەنها بەشێکی کەمی نەبێت. ئێران دانی بە سنوری تواناکانی خۆی نا لەبەرەو پێشبردنی شۆڕشی ئیسلامی و دووچاری شەڕ بووەوە لەسەر گۆڕەپانی جەنگ کە بەتەواوی وەستاندی. بەڵام شەتولعەرەب هەر بە داخراوی مایەوەو. هیچ نیشانەیەك نەبوو کە حکومەتی ئێران ئارەزووی پێشکەشکردنی ئەو تەنازولاتە هەرێمیانەی هەبێت، کە سەدام داوایکرد بوو. سەرەڕای ئەوەی ٨ ساڵی جەنگ بارێکی قورسی لەسەر شانی گەلانی عێراق دروستکردبوو هەروەها چارەگە ملیۆنێك کوژراوی لێکەوتەوە، هەرچەندە رەنگە

چواریەکی ئەوانە ببوونە قوربانی هەڵمەتەکانی حکومەتی عێراق لە دژی کوردەکانی عێراق. هەروەها ٦٠ هەزار دیلی عێراقی لە ئێران مانەوەو نزیکەی یەك ملیۆن عێراقیش خزمەتی سەربازییان ئەنجامدا.

بۆ ئەوەی عێراق جارێکی دیکە لە جەنگ بەردەوام بێت دوای تەواو بوونی یەدەگی لە دراوی بیانی. ناچار بوو بڕی ٨٠ ملیاری دۆلاری ئەمەریکی قەرز بکات. لە هەمان کاتدا و سەرەڕای کەمێك باشتربوونی قەوارەی هەناردەکردنی نەوت و بونیادنانی هێڵێکی بۆری نەوت لەرێگای تورکیاو شانشینی عەرەبی سعودی لەکاتی جەنگدا بەڵام دارمانی جیهانیی نرخ بووە هۆی دابەزینی داهاتی نەوت بۆ ١١ ملیار دۆلار لە ساڵی ١٩٨٨دا . واتە نیوەی ساڵی ١٩٨٠. لەگەڵ لاچوونی مەترسی جەنگ ئەو وڵاتانەی قەرزیان دابووە عێراق لێبوردەییان کەمتر بووەوە. لەگەڵ نەمانی هەڕەشەی دەرەکی پێگەی سەدام حوسێن پاشەکشەی کرد و لە توانایدا نەبوو خۆی وەك پارێزەری بەرژەوەندی بژاردە نیشانبدات لە مەترسی دامەزراندنی رژێمێکی سیاسی ئیسلامی لە عێراق بەچاودێری ئێران .

## دوای جەنگ و داگیرکردنی کوێت ١٩٨٨-١٩٩٠

سەدام حوسێن باش هەستی بەوە کردبوو کە تەواو بوونی جەنگ لەگەڵ ئێران و سەرکوت کردنی شۆڕشی کورد و بەردەوام سەرکوتکردنی رێکخراوە ئیسلامیە شیعەکان، تەحەدا سیاسیەکانی بنبڕنەکردووە کە هەڕەشە لە پۆستەکەی دەکەن. بە پێچەوانەوە، وای لێهاتووە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو تەحەدیە لە نێو بازنەی کەسە نزیکەکانیەوە بێت بۆ رووخانی رژێمەکەی. دەبوو بە زووترین کات دوو پرس چارەسەر بکات کە لەپاشماوەکانی جەنگ بوون، ئەگەر نەیەوێت پێگەی وەکو سەرکردەی باڵای وڵات لاواز بکەن. یەکەمیان خۆی لە هەماهەنگی هاوبەشی روون و ئاشکرای ریزی ئەفسەرانی عێراقی دەدۆزیەوە. دووەمیشیان تەنگەژەی ئابووری بوو کە وڵات تێیکەوتبوو ، کە هەردووکیان تەحدایەکی تایبەت بوون بۆ ئەو رژێمە

بۆماوەییە تازەیە کە هەژموونی سەدام حوسێنی لە عێراق بەهێز کردبوو. لەو قۆناغەدا هیچ هەوڵێك بۆلادانی لە پۆستەکەی نەدرا. بەلام بەپێی زانینی بۆ تێچووی راستەقینەی جەنگ. ئەوە رەنگە تەنها مەسەلەی کات بێت، خۆی بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەو هەڕەشەیە تەرخانکرد.

ئامانجی یەکەمی ریزی ئەفسەران بوو بۆ ئەوەش قەوارەی تارادەیەك گەورەی سوپای عێراق یارمەتیدا، وای کردبوو ریزی ئەفسەران لە پێکهاتەیەکی جۆراوجۆر بێت رێگەی پێنەدات جموجۆڵ بکات، تەنانەت ئەگەر هەندێك لە ئەندامەکانی هەڕەشەشیان لێبکرێت. سەدام پەنای بردە بەر هۆکارەکانی هەڕەشەو خۆلێنزیکردنەوەو جیوازیکردن کە پێشتر تاقی کردبووەوەو بە ئەنقەست هەندێ لە ئەفسەرەکانی پلە بەرز کردەوەو، هەندێکی دیکەی پلە نزم کردەوە یا خانەنشینی کردن، لە هەندێك حاڵەتی دیکەدا هەندێك ئەفسەری بە (رووداو) کوشتن و هەندێکی دیکەی لەوانەی لە کاتی جەنگدا ناویان دەرکردبوو خستە ژێر دەستبەسەری بەناچاری. بەو رێگەیە سەدام هەوڵیدا زۆر لە رێگەکانی پەیوەندییان ببڕێت کەلەکاتی جەنگدا دروستیان کردبوو هەروەها هەموو ئەو یادەوەریە دامەزراوەییانەش کە کەوایکردبوو ئەفسەرانی سوپا ببنە تەحەدایەکی گەورەی سەرکردایەتیەکەی.

ئەوەی لەسەر ئەو ئەفسەرانەش جێبەجێکرد کە هەمان باگراوندی دێهاتیی سەدامیان هەبوو و پەیوەندی خزمایەتیشیان لەگەڵی هەبوو. وەك لە حاڵەتی ژەنەراڵ ماهر عەبدوڵلا ئەلرەشید . کە کوشتنی براکەی (کە ئەویش ژەنەراڵ بوو لە سوپا). هەروەها بەزۆر خانەنشین کردنی عەبدوڵلا رەشید و دواتر دیارنەمانی لە ژیانی گشتی نەك تەنها پەیوەندییەکانی لەگەڵ زۆربەی گەورە ئەفسەران پچڕاند لەوانەی کە وەلایان بۆی هەبوو ، بەڵکو کردیە پەند بۆ ئەوانەی دیکە. وا پێدەچوو هەوڵەکانی سەدام بۆ شکست پێهێنانی کودەتایەکی پێشبینی کراو وایکرد ئەو پلانانەی کە بۆ رووخاندنی دانراوە خێراتر بکرێت. بەلام حکومەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ و سەرەتاکانی ساڵی١٩٨٩ ئەو کودەتایانەیان ئاشکرا کرد. پرۆسەکانی

پاکتاوکردنی دوای ئەوە وایکرد سەدام جارێکی دیکە کۆنترۆڵی هێزە چەکدارەکان بکاتەوە. بەڵام تەنها بوونی ئەو جۆرە پلانانە ترسناکترین شت بوون سەبارەت بە رژێم ، بەتایبەتیش کە ئاماژەدان بە گۆرینی سەدام بە کەسێکی دیکە لە خزمەکانی لەگەڵدابوو ، لە جیاتی ئەوەی رژێمەکەی بەتەواوی بروخێنرێت. ئەوەش وایکرد گومانی زیاتر لە عەدنان خێروڵڵا بکات، کە خزمایەتیەکی نزیکی لەگەڵ سەدام هەبوو. ئەوەش وایکرد شەڕە قسەیەکی کۆنی خانەوادەییان لە نێوان سەرهەڵبداتەوەو بووە هۆی لێکترازانی بازنە بچوکەکانی خزمەکانی سەدام. دواتر مردنی لە ناکاوی لە ئایاری ساڵی ١٩٨٩ــــ لە ئاکامی تێکشکانی کۆپتەرەکەی وەك بڵاوکرایەوە ــ بەڕێکەوت نەبوو.

سەدام دەیزانی پشت بەستن بە ئەندامانی خانەوادەکەی و خزمەکانی هەرچەندە کە نهێنی بەردەوامیی سیاسیە. بەڵام خراپەی خۆشی هەیە. لە هەشتاکان لە ترسی دروستبوونی هەماهەنگیەك لە نێوان کۆمەڵەی هۆزەکانی ئەلبوناسر (کە ئەحمەد حەسەن بەکرو عەدنان خێروڵڵا تلفاح و سێ لە زرِبراکانی سەدامی دەگرتەوە). براکانی لە پۆستەکانیان لادا لە تۆڕەکانی هەواڵگری و ئەمن، لە شوێنی ئەوان کەسانی نێو خانەوادەی ئەلمەجیدی دامەزراند، بەو پێیە بەکارهێنانی پەیوەندی خانەوادەیی لە حوکم پێویستی بەلێهاتوویی هەیە لە پاراستنی هاوسەنگی. راستە دەکرێ متمانە بە ئەندامانی خانەوادە بکرێت نەوەك بە عێراقیەکان. بەڵام ئێرەییان بە یەکتر دەبرد و هەوڵیاندەدا ئارەزووەکانیان بە دەست بێنن و هەست بەوە بکەن کەلە سزادان دوورن و پارێزراون. ئەوەش عودەی کوڕە گەورەی سەدام پەیڕەوی کرد. کاتێك بە ئاشکرا لە ساڵی ١٩٨٩ یەکێك لە پیاوە نزیکەکانی سەدامی کوشت ئەو سنورە نەخشێنراوەی بەزاندو زیندانی کرا. بەڵام دوای چەند رۆژێك ئازاد کراو بۆ سویسرا دوورخرایەوە. رەنگە مردنی تولفاحیش هۆشداریەك بوو بێت بۆ خزمەکانی سەدام و هەموو عێراق بە گشتی.

لە ژێر سایەی ئەو رەوشە پشێوەدا لە کودەتای سەربازیی و رق و کینەی خانەوادەیی و پێشبینی گشتی بۆ گۆرانکاری. سەدام بەڵێنی بە بواردان بە جۆراوجۆری سیاسی زیاتردا. ئەوەش لەسەرەتادا خۆی لە ململانێی زیاتر لەسەر کورسیەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی بینیەوە. لەگەڵ هاندانی رەخنەگرتن لە وەزیرانی حکومەت و بیرۆکراتیەتی دەوڵەت. بەڵام زۆربەی بەڵێنەکان جێبەجێ نەکران. ئەو کرانەوەی باسی لێوە دەکرد تارادەیەکی زۆر لە ژێر چاودێری مایەوە، راستە هەندێك کەسی غەیرە بەعسی توانیان بە شێوەیەکی (سەربەخۆ) بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەندا لە نیسانی ١٩٨٩دا بکەن و هەندێکیان تونیان سەربکەون بەلام هەر لە ژێر چاودێری دەزگا ئەمنیەکاندا بوون. رێگەی رەخنەگرتن نەدرا تەنها لە چەند وەزیرێکی دیاریکراو نەبێت، بە تایبەتیش تەکنۆکراتەکان ئەوانەی بەکارهێنرابوون بۆ هەوڵەکانی چارەسەری پشێوی ئابووری لە عێراق. ئەوەش هەر بۆ ئەوە بوو کە رەخنەکان سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی هەڵەی ستراتیژی لە سەرکردایەتی سیاسی نەگیرێت. بەڵام سەرۆك و خزمەکانی و ئەوانی دیکە لە بازنەی ناوخۆیی رژێم لە رەخنەگرتن پارێزراو بوون.

سیاسەتی ئابووری گەورەترین تەحەدابوو بۆ سەدام حوسێن. کورتهێنانی پارەی پێویست بۆ پارێزگاری کردن لە سوڕانی بازنەی مەحسوبیات و ئابووری عێراقی بەکاربەر کە پشتی بە هاوردەکردن و یارمەتیە مادیەکان بەستبوو. لەوانە بوو شەپۆلێکی بێزاری دژی سەرکردە کە ئێستا بێ توانا دەرکەوتووە نەوەك پاڵەوان بێنێتە ئارا. سەرباری ئەوە تەنها بوونی عێراق بە قەرزاری ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتان وڵاتی خستبووە هەڵوێستێکی لاوازو ئەو وێنایەی کە سەدام بۆخۆی دروستیکردبوو وەك سەرکردەیەکی بەهێز زۆر لاواز ببوو. دەستکرا بە فراوانکردن و بەهێزکردنی ئازادکردنی ئابووری کە لەکاتی جەنگ دەستپێکرابوو. بەلایەنی کەم لە تۆماری یاساکان. هەروەها چاودێری لەسەر نرخەکان هەڵگیرا. کارکردن لە بواری کۆنتراکت هاندرا و چەند کارگەیەکی حکومی فرۆشرایە خەڵك. لەگەڵ چەند موڵکێکی بچوکی حکومەت. ئەوە نیشانەیەك بوو بۆ کۆتایی هاتنی سەردەمی

کۆنترۆڵی کەرتی گشتی بەسەر دامودەزگاکان. رێگە و مۆڵەتدرا بە پرۆژە پیشەسازیە تایبەتەکان و کەرتی تایبەت چواریەکی سەرجەم داهاتەکانی دەستدەکەوت. هەروەها هیوای ئەوە هەبوو پارەوپولی ولاتانی دیکە لە کەنداو بهێنرێتە نێو عێراق و کاری پێبکرێت. ئەو چالاکیانە هەلی قازانجی بێ وێنەی بۆ هەندێك کەس و خانەوادە رەخساند، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی پتەویان لەگەڵ نێوەندەکانی حوکم هەبوو، سودیان لە مۆڵەتە تایبەتییەکان وەرگرتبوو، بەتایبەتی فرۆشتنی ئەو کێڵگانەی کە مولکی دەوڵەت بوون. بەلام لە بەرامبەردا بوونە هۆی هەلاّیسانێکی ترسناك و سەرلەنوێ سەپاندنەوەی یاساو رێساکان لە ژمارەیەك لە بوارەکاندا.

سەرەڕای ئەو سوودانەی لەو هەنگاوانە کەوتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لە پێگەی دەسەلات بوون، بەلام نەیانتوانی ولات لەو تەنگژە ئابوریە دەربێنن کە تێیکەوتووە. ئەو قەرزەی کە پێویست بوو عێراق بیداتەوە (کەیشتبووە ٥٠٪ی داهاتی نەوتی عێراق لە سالّی ١٩٩٠) تێچووی گەورەی ئاوەدانکردنەوەو بەردەوامیی دابەزینی نرخی نەوت و لیستی هاوردەکردنی کەلوپەلی سەربازیی و مەدەنی– بەتایبەتی خۆراك لەداهاتی چاوەڕوانکراوی نەوتی عێراقی تێپەڕاند. هەموو ئەوانە وایکرد ولات پێویستی بە چارەسەرێکی ریشەیی بێت و کاریگەری زیاتر بێت ، هەولّەکانی سەدام بۆ پێکهێنانی تیمێکی ئابووری لەسالّی ١٩٨٩ سەرینەگرت. هەروەها رێو شوێنەکانی تەقەشوف، وەك کەمکردنەوەی ژمارەی فەرمانبەرانی حکومەت و کۆتایی پێهێنانی خزمەتی سەربازیی هەزاران سەرباز هیچ سودێکی نەبوو، بەڵکو کێشەی بێکاری ئالۆزترکرد. بۆیە ئەو رێو شوێنانەی رەتکردەوە.

لەژێر سایەی ئەو بارودۆخەدا، عێراق هەولّیدا داهاتەکانی نەوت زێدە بکات لە رێگەی رازیکردنی ئۆپیك بە بەرزکردنەوەی نرخی نەوت ، سەدام بەشێوەیەکی تایبەت روویکردە هەردوو دراوسێی عەرەبیی عێراق، سعودیە و کوێت بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن لەو تەنگژە داراییە بێتە دەرەوە بەهەر رێگەیەك بێت. دەبوایە

هاوكاری یەكتر بكەن بۆ ئەوەی پارێزگاری لە نرخی نەوت بكەن لە ڕێگەی پابەندبوون بە بەرهەمهێنانیان و فشار خستنە سەر وڵاتانی دیكە. چەند جارێك سەدام داوای لێكردن بەڵام بێ هودەبوو، دەیویست رابیگەیەنن ئەو پارمەتیە داراییەی كە برەكەی ٤٠ ملیار دۆلاربوو لەكاتی جەنگ دابوویانە عێراق بە قەرز لێی خۆشبن و بەبەخشینی دابنێن نەوەك بە قەرز. هەروەها پێشنیازی كردبوو پارمەتی زۆر و گرنگی بدەن لە بونیادنانەوەی ئابووری عێراق . بەڵام وەڵامە بێ ئومێدەكان سەدام و لایەنگرانی هاندا پەنا ببەنە بەر زمانی هەڕەشە لە شەش مانگی یەكەمی ساڵی ۱۹۹۰دا ، كە تیایدا ئاشكرابوو تاچ رادەیەك گۆشەگیر و بێ ئومێد بوونە ، ئامازەی ئەوەیاندا كە عێراق پەنا دەباتە بەر ڕێگە چارەی دیكە بۆ بەدەستهێنانی ئەو دەرامەتانە ئەگەر بێتوو بەخۆشی پێی نەبەخشن.

لەو ماوەیەدا، بیرۆكەی بەكارهێنانی هێز لای لایەنگرانی سەدام گەڵاڵە دەبوو. كوێت ئامانجی راستەوخۆ بوو، بەڵام ئامانجی دوورتر بریتی بوو لە بەدەستهێنانی داهات و تەنازول لە وڵاتانی كەنداو بەگشتی و شانشینی عەرەبی سعودیە بەتایبەتی. بە پشت بەستن بەو پلانە كوێت دەبێتە كەلوپەلێك عێراق بۆخۆی پارێزگاری لێدەكات یا لەرێگەی حكومەتێكی كارتۆنی یا گلدانەوەی بۆنێو خاكی عێراق یاخود دەتوانێت دەستبەرداری بێت بەرامبەر تەنازولی گرنگ. ئەو ڕێگە چارانەش دەتوانێت توندی تەنگژەی ماددی كەمبكاتەوە و دەسەڵاتی سەدام حوسێن پتەوبكات و عێراق بكانە ئەو هێزەی كە باڵ بەسەر كەنداودا دەكێشێت و دەبێتە سەر قافڵەش لە بازارو نەوتدا.

ئەو پلانە زۆر خاڵی هاوبەشی تێدابوو لەگەڵ ئەو بڕیارەی كە عێراق پێش دە ساڵ دای بۆ بەكارهێنانی هێز لەدژی ئێران. پشتی بەو بۆ چوونە بەستبوو كە، وڵاتانی كەنداو ئەو جموجۆڵەی عێراق بە مانۆرێكی سەرەتایی دادەنێن و دەگەنە لێككەیشتنێك لەسەر ئەو بنچینەیە. هەروەها پشتیشی بەو گریمانە دەبەست كە وڵاتە زلهێزەكان، بەتایبەتیش ئەمەریكا بەسەر وڵاتانی كەنداو زاڵ دەبێت و بە ئەنجامی دانوستانەكان رازی دەبێت بۆ چارەسەری تەنگژەكە كە هێزی چەكی

عێراق هێنابوویە ئاراوە. سەرباری ئەوەش ئەو حیساباتانە وەکو ئەوەی سالّی ١٩٨٠ دەرەنجامی هێزێك بوو هەرچەندە هەستپێکراویش نەبوو، بەوەی کە سەدام حوسێن سەرکردەی پێویستە (ألقائد ألضرورة) بۆ دەولّەتی ئومەی عێراقی و پێویستی بە جموجۆلّێکی بەهێز هەیە (بۆ گەراندنەوەی مافەکانی گەلی عێراق). لەکاتێکدا ئامانجی ئەوەی لە سالّی ١٩٨٠ گەراندنەوەی سەروەری عێراق بوو بەسەر شەتولعەرەب و زەلیل کردنی حکومەتی ئێران. عێراق لەسالّی ١٩٩٠ ویستی هەژموونی عێراق زیاتر بکات تا دەگاتە کاروباری کوێت و زەلیلکردنی سەرۆکە عەرەبییەکانی ولاّتانی کەنداوی دەولّەمەند بەنەوت.

دوای ئەوەی سەدام سەرەرای زمانی هەرەشە نەیتوانی هیچ تەنازولێکی گرنگ لەولاّتانی کەنداو بەدەست بێنێ،و دوای ئەوەی رەزامەندی موحتەمەلی ئەمەریکا و ولاّتانی عەرەبی گرەنتیکرد، لە ئابی ١٩٩٠فەرمانی بەهێزەکانی کرد کوێت داگیر بکەن. لەماوەی ٢٤ کاتژمێر داگیرکردنەکە جێبەجێکرا. شێخ جابر ئەلسوباح و زۆربەی ئەندامانی خانەوادەی دەسەلاّتدار توانیان رابکەنە سعودیە و هەر زوو ٣٠٠ کوێتی دیکەش توانیان بگەنە ئەوان. لەو کاتەدا عێراق حکومەتێکی کاتیی کوێتی پێکهێنا بۆ ئەوەی وێنایەکی خەیالّی نیشانبدات گوایە هێزەکانی عێراق بانگهێشت کراون بۆ ئەوەی پالّپشتی شۆرشێك لەدژی خانەوادەی سوباحی دەسەلاّتدار بکەن. بەلاّم دوای چەند رۆژێك عێراق رایگەیاند. کوێت گلدەداتەوە نێو خاکی عێراق ئەوەش بەفەرمی لە کۆتایی ئاب راگەیەنراو کوێت کرا بە نۆزدەمین پارێزگای عێراق.

واپیشاندرا پرۆسەی گلدانەوەی کوێت گەورەترین دەسکەوتی سەدام حوسێنە لە ئامانجە نیشتیمانیە عێراقیەکانی و ئەو زولّمەشی هەلّگرتوە کە کۆلۆنیالستی بەریتانی ئەنجامیدابوو کاتێك کوێتی لە عێراق جیاکردەوە کاتێك نەخشەی سنووری دەولّەتی عێراقی کێشا. بەلاّم بەکارهێنانی چروپری رەمز و پروپاگەندەی نەتەوەی عێراقی بۆ پاکانە هێنانەوە بۆ ئەو جموجۆلّە کە دوای ئەو رووداوانە هەندێك وتاری یەکگرتوویی نەتەوەیی عەرەبیشی وەگەردرا. سەرکەوتوو نەبوو لە

گـۆڕینی ئـەو هەڵسـەنگاندنە هەڵەیـەی کـە سـەدام حوسـێن ئەنجامیـدابوو لـە داگیرکردنـی کوێـت. لـە جیـاتی بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی وڵاتـانی عـەرەبی و پاڵپشتی کۆمەڵگـەی نێـو دەوڵـەتی. عێـراق لەلایـەن کۆمکـاری وڵاتـانی عـەرەب و نەتەوە یەکگرتووەکان سەرەکۆنە کـرا، پـارەو پـولی عێـراق و کوێـت بلـۆك کـرا و ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نێودەوڵـەتی گـەمارۆی ئـابووری تـەواوی بەسـەر عێـراق سەپاند و تاکە بۆڕی نەوتی عێراق کە لـە ڕێگـەی تورکیـا و سعودیەوە دەڕۆیشـت دەستبەجێ داخرا. سەرەڕای ئەوە مەترسی سـعودیە لـە بـوونی هێـزی سـەربازیی عێراق لەسەر سنورەکانی وای لە قەڵەمدا کە ئامانجی ڕاستەوخۆ یـا ناراسـتەوخۆی داگیرکردنی عێراقە و داوای یارمەتی سـەربازیی ئەمـەریکای کـرد. ئەمـەریکا داوای کشانەوەی بەبێ مەرجی عێراقی کرد لە کوێت و گەڕاندنەوەی ڕەوشەکە بۆ دۆخـی جارانی، پردێکی ئاسمانی دروستکرد و بەهۆیەوە نیو ملیۆن سەربازیی ئەمەریکایی لەماوەی شەش مانگدا هاتنە نێو خاکی سعودیە.

## جەنگی کوێت و شۆڕشەکانی ١٩٩١

لەو کاتەدا سەدام حوسێن هەوڵیدا ستراتیژیەتێك دابنێت کە ڕێگەی پێبدات بەشێك لـە بڕیـارە شـومەکەی داگیرکردنـی کوێـت قـەرەبوو بکاتـەوە، گلدانـەوەی کوێـت شێوازێك بوو بۆ دەرخسـتنی ڕشـتبوونی بـۆ هاوپەیمانییـەتی نێودەوڵـەتی و وڵاتـە عەرەبییەکان و غەیرە عەرەبییەکان کە دژی وەستانەوە بۆ ئەوەی بەناچاری بـیر لـە ڕێگەیـەك بکەنـەوە بـۆ ئـەوەی عێـراق ڕازی بکـەن بکشـێتەوە. هەنـدێك لـەو فرۆفێڵانـە بـریتی بـوو لـەوەی سـەدام حوسـێن داگیرکردنـی کـوێتی بـەداگیرکردنی فەڵەستین گرێدەدا. بەڵام هیچ کامێك لەو پلان و هەوڵانە نـەیانتوانی هاوپەیمانییـە نێودەوڵەتییەکەی بەرامبەری هەڵبوەشێنێتەوە. لە تشرینی دووەمـدا ئەنجوومـەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ٦٧٨ دەرکرد و تیایدا داوای لە عێراق کرد بەبێ هیچ مەرجێك تاکو ١٥ەی کانوونی دووەمی١٩٩١ لە کوێت بکشـێتەوەو ئەگـەر وانـەکات

ڕێگە دەدات بەبەکارهێنانی هێز. لەگەڵ سەپاندنی ئەو مۆڵەتە و بەهێزکردنی هێزەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لەکەنداو. وای لێهات بۆ سەدام ئەستەم بوو کە بۆچوونەکەی سەبارەت بە پلانە سەرەکییەکەی بۆ دوای داگیرکردنی کوێت کەوای بۆ دەچوو بە سوودمەندی بکشێتەوە شتێکی مەحاڵە. وای لێهات جەنگ بووە دەرەنجامێکی حەتمی و کشانەوەو پاراستنی هێزەکانی عێراق بۆ سەدام بوونە ئەولەویەت.

وەك ڕووداوەکانی سەرەتای ١٩٩١ سەلماندی. خۆی و ڕژێمەکەی ئامادەبوون بۆ جێبەجێکردنی ئەو ستراتیژیەتە بە تەواوی وەك ئەوەی لەجەنگەکەی لەگەڵ ئێران ڕوویدا.دڵی دەسەڵاتەکەی بریتی بوو لە بازنەیەکی دیکتاتۆری لە خزم و کەسەکانی ،کە خودی سەدام سەرۆکایەتی دەکات. پێکهاتبوو لە کوڕە مامی و مێردی کچەکەی حسێن کامل ئەلمەجیدْ (وەزیری پێشووی پیشەسازی سەربازی و نەوت)، کوڕە مامەکەی دیکەی لەهەمان خانەوادە عەلی حەسەن ئەلمەجید (بۆ ماوەیەکی کەم حوکمی کوێتی کرد). زڕ براکانی بەرزان و وەتبان و سەبعاوی ئیبراهیم (هەرسێکیان جێگەی سەرەکیان هەبوو لە دەزگاکانی هەواڵگری). خزمەکەی دیکەی ژەنەڕاڵ حوسێن ڕەشید تکریتی (فەرماندەی گاردی کۆماری)، سێ لە کۆنە پیاوەکانی، تەها یاسین ڕەمەزان جەرزاوی (فەرماندەی سوپای میللی) ، تارق عەزیز (وەزیری کاروباری دەرەوە) و عیزەت ئیبراهیم ئەلدوری.

ئەو گرووپە کە پەیوەندییەکی زۆر بەهێزیان لەگەڵ سەدام حوسێن هەبوو لەگەڵ نزیکبوونەوەی مۆتەکەی جەنگ ڕیزەکانیان ڕێکخست، لە تشرینی دووەمدا عەلی حەسەن مەجید کە پێشتر کرابووە حاکمی کوێت گەڕایەوە بەغدا، لەهەمان کاتدا حوسێن ڕەشید تکریتی پلەی بەرزکرایەوەو لە فەرماندەی گاردی کۆمارییەوە کرا بە سەرۆکی ئەرکانی گشتی و یەکەکانی گاردی کۆماری بەشێوەیەك بڵاوکرانەوە کە سەلامەتی کرۆکی ڕژێم لە ناوەڕاست و باکووری عێراق گەرەنتی بکەن و ڕێگە لەهەر هەوڵێك بگرن بۆ هاتنە ناو وڵات لە باشوورەوە. لەگەڵ بوونی ئەو هێزانە لە شوێنەکانیان. سەدام حوسێن بڕوای بەخۆی هەبوو کە بەرپەرچی هەر هێرشێك

دەداتـــەوەو ، لـــەكاتی پێویســـت هێزەكـــانی لـــە كوێـــت دەكاتـــە قوربـــانی بـــۆ گەرەنتیكردنی سەلامەتی خاكی عێراق .

كاتێك هێزی هاوپەیمانان لە ١٦ی كانوونی دووەمدا هێرشیان دەستپێكرد، عێـراق كەوتە بەر بۆردومانێكی وێرانكارانەی هێزە ئاسمانییەكان بە نوێترین چەك ماوەی چـەند هەفتەیـەك ئـەو هێرشـانە بـەردەوام بـوون پـێش ئـەوەی هێـزە پیادەكـان بەشداری بكەن ، عێراق هیچ بەرگرییەكی كاریگەری بەرامبەر ئەو هێرشە نەبوو، لە جیـاتی ئـەوە كاردانـەوەی سیاسـی هـەبوو، لەتەحەدایـەكی رەمزیـدا چـەند موشەكێكی ئاراستەی ئیسرائیل كرد، هیواداربوو ناكۆكی لەبارەی ئیسرائیل ببێتـە هۆی ئەوەی هاوپەیمانیەتییەكە هەڵبوەشێنێتەوە، بەتایبەتیش سوریا و میسـر بـۆ ئەوەی بكشێنەوە. بەڵام پلانەكە هـیچ ئاكـامێكی نـەبوو، بۆردومـانی هاوپـەیمانان بـەردەوام بـوو. بەتـەنها بۆردومـانی دەزگـای سـەربازیی نـەكرد بـەڵكو بەشـێكی گەورەی ژێرخانی مەدەنی عێراقی وێرانكرد. بە هۆی خێرایـی و قـەوارەی هێرشـی زەمینی هاوپەیمانان كە دواتر لە كوێت و عێراق ئەنجامدرا. سەختە بتوانرێ رادەی جیدیەتی سەدام حسێن لەبەرگریكردن لە كوێت دیاری بكرێت. وادەركەوت بڕیـاری دەستهەڵگرتن لە كوێت پێشتر درابوو، تەنانەت سـوپای عێـراقیش ئاگـادار نـەبوو. لەوكاتـــەدا سیاســـەتی خـــاكی ســـوتاو جێبـــەجێكرا. دوای ئـــەو تاڵانـــە بەرنامەبۆدارێژراوەی هێزەكانی عێراق لەكوێت ئەنجامیانـدا، سـەدام بـە ئەنقەسـت بـیرە نەوتـەكانی كـوێتی بۆردومـان كـردو دامودەزگـا و باڵەخانـەكانی وێرانكـرد. بەوشـێوەیە سـەدام رشـتبوو لەسـەر ئـەوەی دوا گـورز بـۆ زەلیلكردنـی سـوباح بوەشێنێت كە لەگەڵ تێڕوانینی خۆی و داروودەستەكەی بۆ مەرجـەكانی تەنگژەكـە بگونجێت.

قـــەوارەو ئاراســـتەی هێرشـــی زەمـــینی كـــە لـــە ٢٤ی شـــوباتدا دەســـتی پێكـــرد عێراقییەكانی سەرسام كـرد، لەباشـووری وڵات دەسـتیپێكرد و تیمـەكانی گـاردی كۆماری پەكخسـت كـە دەبوایـە وەك یـەدەگ بمێننـەوە، هێـزە عێراقییـەكانی نـاو كوێت و دەوروبەری دۆڕان و بە كۆمەڵ تەسلیم دەبوونـەوەو بـە پشـێویەوە بـەرەو

بەسرە رایاندەکرد هەروەها یەکە سەربازییەکانی عێراق کە هیچ چەترێکی ئاسمانیان نەبوو و لەناکاو هێرشیان کرایە سەر لە رێگەی روباری فوراتەوە رایانکرد. لەماوەی چەند رۆژێکدا، هێزی هاوپەیمانان کوێتی ئازاد کرد و عێراق داوای ئاگر بەستی کرد بۆ ئەوەی چیدیکە هێزەکانی وێران نەبێت. بەو شێوەیە هاوپەیمانان ئامانجی خۆیان بەدەستهێناو بەلام رێگەیان پێنەدرابوو و ئارەزووشیان نەبوو زیاتر بچنە نێو خاکی عێراق. بەو پێیە لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩١دا ئاگر بەست لە سەفوان ئیمزا کرا.

لەبەرامبەر خێرایی و قەوارەی شکستەکە. پرسی سەرەکی کە سەرکردایەتی عێراق رووبەڕووی بۆوە بریتیبوو لە چۆنییەتی تێپەڕاندنی رەنگدانەوەکانی شکستەکە. مەترسییەکە هەر لە دۆڕانی کوێتدا نەبوو، بەڵکو لەو زیانانەی کە بەدوای دۆڕانەکە دادێ. لێرەوە رۆڵی نیمچەیی ستراتیژیەتی سەدام دێت. ئاسانی گواستنەوە لە دۆڕانی سەربازیی دەرەکی بۆ سەرکوتکردنی سەربازیی ناوەخۆیی ئاماژەدانێك بوو بەوەی لە کۆتایی شوباتدا کوێت و هێزە عێراقییەکان کە هەوڵیاندەدا بەرگریی لێبکەن بە کردەیی کەوتنە دەرەوەی حیساباتە ستراتیژیەکانی رژێم. ئەو ستراتیژیەتە لەوکاتەدا بەرەو گەرەنتی کردنی سنووری سیاسی لە دوژمنانی ناوخۆ ئاڕاستە کرا. ئەوەش لە سەرکوتکردنی یاخیبوونی کراوە بەزەبری هێز و راگەیاندنی دامەزراندنی ، تۆڕەکانی تیرۆر و چاودێری کەماوەیەکی کەم بەهۆی دۆڕانی عێراق لە کوێت نەمابوون خۆی بینیەوە. ئەوەش مەترسی بۆ سەدام حوسێن دروستکرد.

لە سەرەتاکانی ئاداری ١٩٩١دا چەند شۆڕشێك لە باشووری عێراق بەرپابوو و بەشێوەیەکی سەرەکی لە شارەکانی بەسرەو عیمارەو ناسریە و نەجەف و کەربەلا کە زۆرینەی دانیشتوانیان شیعەبوو چڕ ببووەوە. زۆربەی ئەو شۆڕشانە هەر لەخۆوە سەریان هەڵدا دژی رژێمێکی زۆردار کە پێدەچوو هەژموونی لاواز بوو بێت. لە زۆربەی شارەکان سەرکردایەتی ناوخۆ دەرکەوت، هەندێکیان نەك هەموویان بە رێکخراوە ئیسلامیە نهێنیەکانی وەك حزبی دەعوە گرێدرابوون. لەو کاتە باقر

حەکیم سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێرانەوە چەند هەزار ئەندامێکی ڕێکخراوەکەی (ڕێکخراوی بەدر) لە ڕێگەی سنورەوە رەوانە کرد بۆ ئەوەی یارمەتی شۆڕشگێڕان بدەن کە ژمارەیان زۆرببوو لەگەڵ هاتنی سەربازە راکردووەکانی سوپا دوای دۆڕانی سەربازیی لە باشوور بۆ ریزەکانیان. شۆڕشگێڕان لەوشارانەی دەستیان بەسەردا گرتبوو تۆڵەی زۆر ترسناکیان لەو کەسانە کردەوە کە بەبەکرێگیراو و هاوکارانی سەدامیان لە قەڵەمدەدان. بەڵام سەرەڕای سەرکەوتنیان لە رازیکردنی ئایەتوڵلا ئەبولقاسم ئەلخوئی بەرێگەدان بۆ پێکهێنانی لێژنەیەك بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش لە عێراق. روون و ئاشکرابوو کە شۆڕش سەرکردایەتییەکی گشتی و ئاراستەیەکی دیاریکراوی نەبوو، لەکاتێکدا دانیشتوانی زۆربەی ناوچە دێهاتیەکان چاوەڕوانیاندەکرد بزانن چی روو دەدا. سەرۆك هۆزە دیارەکانی هۆزە گەورەکان لە هەندێك ناوچەدا یارمەتی هێزەکانی حکومەتیاندا بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی رەوشەکە بکەنەوە.

لەبەرامبەر ئەو رەوشەدا، وادەرکەوت هێزە یاخیبووەکان ناتوانن شان لەشانی ئەو هێزانە بدەن کە عێراق بڵاویکردبووەوە، لەماوەی دوو هەفتەدا یەکەکانی گاردی کۆماری، کە وەکو یەدەگ بۆ ئەو مەبەستە هەڵگیرابوون توانیان زیانی گیانی و مادی زۆر بەباشووری شیعە نشین بگەیەنن. لە ۲۱ی ئاداردا دەسەڵاتداران ئایەتوڵلا ئەلخوئیان ناچار کرد پاڵپشتی خۆی بۆ سەدام حوسێن رابگەیەنێت و داوای راگرتنی شۆڕش بکات. کەچی زیاتر لە ٥٠ هەزار پەنابەر روویانکردە سنووری سعودیە، بەهەزارانی دیکە پەنایان بردە بەر ئێران، ژمارەیەکی زۆری دیکە بەرەو زۆنگاوەکان رایانکرد ترسیان لەتۆڵەسەندنەوەی هێزەکانی عێراق هەبوو. لە راستیدا هێزەکانی عێراق تۆڵەیەکی ترسناکیان لەو کەسانە کردەوە کە گومانیان لێدەکردن سەر بە شۆڕش بن. بە هەزاران کوژراویان لەدوای خۆیان بەجێهێشت، بە هەزارانی دیکە دەستگیر کران، لەساڵانی دواتر زۆربەیان هەر لە زیندان مردن.

دوای وەشاندنی گورزێکی کوشندە لە شۆڕشی شیعە لە باشوور، سەدام رووی کردە ئەو شۆڕشەی کە هاوکات لە کوردستان بەرپابیوو. دوای دۆڕانی هێزەکانی عێراق لە کوێت و هەواڵەکانی بەرپابوونی شۆڕش لە باشوور، جۆشی کورد ووژاو ئەوانیش شۆڕشیان بەرپاکرد. لێرەش وەك باشوور، سەرەتاکانی شۆڕش بەهۆی بێزاری ناوەخۆیی گردبووەوەی دژ بەرژێم کە دڵڕەقانە حوکمی کوردستانی دەکرد بەرپابوو. هەرزوو حزبە سەرەکییەکان کە ئەندامبوون لەبەرەی کوردستانی و پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەلەکەیان قۆستەوە بۆ ئەوەی جارێکی دیکە سەرکردایەتی خۆیان قایم بکەنەوە. بەڵام ئەوەی روون و ئاشکرابوو لەو یاخیبوونەدا ئەوە بوو کەسەرۆك جاشە نێوخۆییەکان. کەتاکو ئەوکاتە بەکرێگیراوی حکومەت بوون، ئەوانیش ڕاپەڕین و بەشداری شۆڕشیان کرد . بەهێزی شۆڕشگێڕان و ئەو پشێوییەی باڵی بەسەر سەربازانی سوپای عێراق کێشابوو بووە هۆی زنجیرە سەرکەوتنێك و، لە ئاکامدا شار لەدوای شار دەکەوتە دەست هێزەکانی کوردیەکان. سەرکەوتنەکان گەیشتنە ئەو پەڕی کاتێك دەست بەسەر شاری کەرکوکدا گیرا لە ١٩ی ئاداردا. بەڵام شۆڕش نەیتوانی لەوە زیاتر بڕوات، لەماوەی دە رۆژدا هێزەکانی حکومەتی عێراق بەرابەرایەتی چەند یەکەیەکی گاردی کۆماری دژە هێرشێکیان ئەنجامداو دەستیان بەسەر کەرکوکدا گرتەوە، دواتر بەرەو ئەو شوێنانە بەرێککەوتن کە شۆڕشگێڕان دەستیان بەسەرداگرتبوو، زیانی زۆر گەورەیان بە کورد گەیاند. یادگارییەکانی ئەنفال و هێرشە کیمیاوییەکان سەربارى پروپاگەندەکان سەبارەت بە کوشتنی مەدەنییەکان وایکرد، سەدان هەزار کورد کۆڕەوێك بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا ئەنجامبدەن کە تاڕادەیەك ئارام بوون. لەماوەی چەند رۆژێکدا، نزیکەی دوو ملیۆن کەس ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشت، ئەوەش بووە هۆی لێکترازانی هێزە یاخیبووەکان.

ئەو کۆڕەوە لە نیسانی ١٩٩١ بووە هۆی ئەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ژمارە ٦٨٨ دەربکات کە تیایدا داوای لە عێراق کرد سنورێك

بۆ ئەو سەرکوتکردنە دابنێت کە دژی گەلەکەی خۆی ئەنجامیدەدات. ئەوەش ڕێگەی بۆ هاوپەیمانان خۆشکرد، ناوچەیەکی ئارام لەسەرووی هێڵی پانی ٣٦ لە عێراق (کەبەباشووری هەولێر تێپەڕ دەبوو) دروستبکەن . ڕێگە نەدرا فڕۆکەکانی عێراق بە ئاسمانی ئەو ناوچەیە بفڕن. حکومەتی عێراق داوای کرد مۆڵەتێکی پێبدرێت بۆ بەرەو پێشچوونی هێزەکانی ، لەترسی ئەوەی نەبادا هاوپەیمانان کارێکی سەربازیی فراوانتر ئەنجامبدەن. تاکو ئێستا بەروونی دیاریبوو کە دەسەڵاتدارانی عێراق بە سەربەخۆییەکی تەواو شۆڕشەکان بەپێی ویستی خۆیان سەرکوت دەکەن. سەرەڕای بانگەوازەکەی سەرۆکی ئەمەریکا بۆ گەلانی عێراق لە شوباتدا بۆ شۆڕش و ڕوخانی سەدام حوسێن. بەڵام ئەمەریکاو هاوپەیمانان هیچ یارمەتییەکی ئەو دوو شۆڕشەیان نەدا کە لە باکوور باشوور بەرپابوو. هەروەها روون بوو کە ئەمەریکا و وڵاتانی ناوچەکە و دەرەوە لەوە دەترسان وەکو زۆرانی دیکە لە ناو خودی عێراق کە عێراق لێکبترازێت، لەگەڵ ئەوەی ڕەقیان لەسەدام بوو، بەڵام بیرۆکەی بوونی سەرۆکێکی بەهێز کە لەلایەن سوپاوە لە عێراق پاڵپشتی لێبکرێت پێ باشتربوو لە ئەگەری ڕووخانی ڕژێم و هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و دەست تێوەردانی هێزە هەرێمییەکان ، بەتایبەتیش ئێران.

ئەو هەڵوێستەی هێزە بیانییەکان دەنگۆیەکی باشی لەنێو زۆربەی عێراقیەکاندا دەنگی دایەوە، هاوکات یارمەتی سەدامیدا تاڕادەیەکی زۆر قەرەبووی دۆڕانە سەربازییەکەی بکاتەوەو جارێکی دیکە دەست بەسەر وڵاتدا بگرێتەوە. لەبەرامبەر ئەو دوو شۆڕشەی کە لەباکوور و باشوور ڕووبەڕووی بووەوە، نەیتوانی بەتەنها پشت بە بازنە نێوخۆییەکەی ببەستێت کە لە کوڕانی هۆزەکەی پێکهاتبوو بەڵکو پشتی بەهەموو ئەوانە بەست کە وەلایان هۆکار بوو بۆ ئەوەی ڕژێم بەردەوام بێت، جا ئەگەر ڕایان هەر چییەك بێت لەسەر سەرکردایەتی سیاسی، بێگومان مۆتەکەی هەڵگیرسانی شەڕی تایەفی و شەڕی ناوخۆ ترسێکی گەورەی لادروستکردبوون، بۆ نموونە لەحاڵەتی ئەو هەموو تایەفانەی گوندەکانی باشوور، کە لەترسی بەرژەوەندی خۆیان ئامادەنەبوون بچنە نێو شۆڕش تا ئەوکاتەی ئەنجامەکەی

بەتەواوی دەردەکەوێت. لەبەر ئەو هۆیە، هێزە سەربازییەکانی عێراق بە ئاسانی توانی بەنێو زۆربەی گوندەکانی باشوور هاتوچۆ بکات و ئەوگوندانەش کە بەشداری شۆڕشیان کردبوو یەك لەدوای یەك بخاتەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی.

لەگەڵ ئەوەشدا، سەدام دوانەکەوت لە هەنگاونانی بە ئاشکرا بۆ ئاشتبوونەوە. دوای چەند رۆژێك لەسەر کوتکردنی شۆڕشی شیعە لە باشوور، سەعدون حەمادی ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی، بەسەر وەزیران دامەزراند،وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە رابەری گۆڕانکاری ریشەییە، هەروەها لەکاتێکدا هێزەکانی شەڕیان لەگەڵ شۆڕشگێرە کوردەکان دەکرد، دەرگای دانوستانی لەگەڵ سەرکردەکانی بەرەی کورد کردەوەو ئاماژەیدا کە نیازی وایە پێشنیاز بۆ هەنگاوی تازە و فراوان لەسەر ئاستی ئۆتۆنۆمی بخاتە روو. تالەبانی سەردانی بەغدای کرد و لەسەردانەکەیدا بەئاشکرا ئامێزی لەسەدام حوسێن داو بڕواو پاڵپشتی خۆی بۆ بەڵێنی حکومەتی عێراق دەربڕی (کە زۆر دوور بوو جێبەجێ بکرێت) بە گۆڕینی عێراق بۆ فیدراڵیەتێکی دیموکراتی .

پێویست ناکات باس لەوە بکەین کە سەدام ئەو بەڵێنانەی جێبەجێ نەکرد. مەبەستی بەدەستهێنانی کات بوو لەگەڵ پەرتەوازەکردنی شۆڕشگێڕان و رازیکردنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەوەی کە پێویست ناکات لەوە زیاتر دەست بخەنە ناو کاروباری وڵاتەکەی . سەرەڕای سەرکەوتنی بەشێکی پلانەکەی، بەلام نەیتوانی UN رازی بکات کە ئاوەدانکردنەوەو ئامادەکردنەوەی عێراق لەژێر سەرکردایەتی ئەو بە ئاسانی و لەماوەیەکی کورت ئەنجامبدرێت. لەجیاتی ئەوە یاسای سزاکان هەرمایەوە کە ساڵی ١٩٩٠ بەسەریدا سەپابوو بۆ ئەوەی عێراق ناچار بکرێت لە کوێت بکشێتەوە، بەهیوای بەدەستهێنانی ئامانجی زیاتر. کە دیارترینیان هەوڵی لە ناوبردنی چەکە کۆکوژەکان و توانای موشەکیەکانی عێراق بوو کە وایکردبوو ببێتە مایەی هەڕەشە لەناوچەکە. بەلام بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش ئەگەر بەتێکڕا وەریان بگرین، دەڵێ سزاکان لەسەر عێراق هەڵناگیرێت، ئەگەر حکومەتی عێراق زنجیرە مەرجێك جێبەجێنەکات.

ئەو مەرجانە، بریتی بوون لە، دانپیانان بەسەروەری کوێت و خاك و سنورە هەرێمییەکەی . رازیبوون لەسەر قەرەبوو کردنەوەکانی جەنگ، ئامادەبوون بۆ لێپرسینەوە لە بەرامبەر شوێن بزربوونی ئەو کوێتیانەی کە لەکاتی داگیرکردنی کوێت دیارنەمان. وەستان لە هەڕەشەکردنی ئەمنی هەرێمیی. دانانی سنورێك بۆ سەرکوتکردنی هاوولاتیانی عێراق. لە راستیدا داواکردنی جێبەجێکردنی ئەو مەرجانە لە عێراق وەك بەهانەیەك بەکارهێنرا بۆ سەپاندنی سیستەمی سزاکان بەسەر عێراق بۆ پەکخستنی ئابووری عێراق و سەپاندنی شێوازی خۆتێهەڵقورتێنەر لە پرۆسەکانی پشکنین و دەستێوەردان کە هیچ باکیان بە سەروەری عێراق نەبوو. مایەی سەرسوڕمانیش نییە لەژێر سایەی ئەو بارودۆخەدا سەدام حوسێن بڕوا بەوە بهێنێت کە ئەو رێوشوێنانە تەنها هۆکارێکە لە رێگەیەوە ئەمەریکا دەیەوێت خۆی و رژێمەکەی لەناوببات. بەپشت بەستن بەوە خۆی و لایەنگرانی رشتبوون لەسەر دەربازبوون لەگەمارۆی ئابووری هەروەك چۆن خۆیان لەشەری هەشت ساڵەی ئێران دەرباز کرد .

## عێراق لەژێر گەمارۆ و رەنگدانەوەکانی جەنگی کەنداو

توانای سەدام حوسێن بۆ پاراستنی رژێمەکەی و زۆربەی ئەندامانی بازنەی دەسەڵاتدار لەماوەی ساڵانی دوای شکستی ۱۹۹۱ بەڵگەبوون لەسەر مرونەتی ئەو رژێمەی کە دایمەزراندبوو. هەروەها تارادەیەك لێهاتوویی سەدامی سەلماند لە خوێندنەوەی سەرجەم پێکهاتەکانی عێراق و تێگەیشتنی لەوەی کە خۆی لە کێ نزیك بکاتەوەو کامەی پێویستە دوور بخرێتەوەو لە چ کاتێکدا. دواتر ئەو سەردەمە سەرسوڕهێنەر و وێرانکارە لەمێژووی عێراق بەشێوەیەکی زۆر ورد شێوەو وێنەی دەوڵەتی عێراقی لەسەردەمی سەدام حوسێن دەرخست. لە راستیدا بەشێك لەو وێنایە لەداهێنانی سەدام حوسێن بوو، هەروەها دەگەڕایەوە بۆ ئەو قسەو باسانەی کە باڵیان بەسەر ئەو دەوڵەتە کێشابوو، سەرنجی ژمارەیەکی زۆری

دانیشتوانی بۆخۆی ڕاکێشا لەماوەی سەدەی بیستدا. سەرەڕای ئەو دڵە ڕاوکێیەی کە لە دوژمنایەتی هێزە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکان لەگەڵ سەدام کەوتەوەو سەرەڕای کەمبوونەوەی داهاتی نەوت و دابڕانی کوردستان جچای بەشبەشبوون و ناکۆکی نێوخانەوادەی سەدام و عەشیرەتەکەی، بەلام هەروەکو پێشتر هەڵسوکەوتی کرد. هۆکاری ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ماوەیەکی درێژبوو چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو مەترسیانەی دەکرد. ئەو ڕژێمەش کە دابنابوو توانای گونجانی لەگەڵدا هەبوو.

ڕاستەوخۆ دوای شکستی عێراق کۆدەنگییەکی ڕوون لە ئەنجوومەنی ئاسایش و UNهەبوو لەسەر ئەوەی کە پێویستە عێراق لە ئەنجامدانی دەستدرێژیەکی هاوشێوە لە ئاییندە قەدەغە بکرێت. لە پێناو ئەوەدا دەبوایە بەفەرمی دان بە سەربەخۆیی کوێت بنێت و پابەند بێت بە قەرەبوو کردنەوەی زیانەکانی جەنگ و سەرجەم پێگە عێراقییەکان لەبەردەم تیمەکانی پشکنین بکاتەوە کە لە UN ڕەوانە کرابوون تا بەدوای بەڵگەیەکدا بگەڕێن سەبارەت بەوەی کە عێراق پرۆگرامی پەرە پێدانی چەکی ئەتۆمی و کیمیاوی و بایۆلۆژی هەیە. لەکاتی دۆزینەوەشیان ئەوچەکانە خاپوور دەکرێن و هەموو ئەو موشەکانە کە ماویەتی لەجۆری سکۆد تێکدەشکێنرێت. سزاکانیش لەسەر عێراق هەڵناگیرێت تا ئەو کاتەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دڵنیا دەبێت کە عێراق ئەو توانایەی نەماوەو، هەروەها ڕێگەیداوە سیستەمی چاودێری دابمەزرێت و سەرجەم بەندەکانی دیکەی بڕیارەکانی UN جێبەجێ بکات. لە ئایاری١٩٩١دا تیمی تایبەتی نەهێشتنی چەك سەربە UN لە عێراق دەستبەکاربوو.

سەبارەت بە ڕژێمی داخراو و نهێنی عێراق ئەو لێکۆڵینەوە هەرەمەکی و خۆتێهەڵقورتاندنەی پشکێنەرە بیانییەکان لە بوارە زۆر هەستیارەکانی دەزگا سەربازی و پیشەسازییەکانی عێراق پرسێك بوو قەبوڵکردنی ئەستەم بوو. بەلام ئەمەریکاو وڵاتە دیارەکانی ئەندام لە ئەنجوومەنی ئاسایش هیچ بوارێکی گومانیان بۆ عێراق نەهێشتەوە کە هەر ڕێگرییەك لەو ڕێوشوێنانە عێراق دووچاری کاری

سەربازیی دەکاتـەوە . بەوشـێوەیە عێـراق ناچاربوو بـە هێواشـی ڕێگـە بـە تیمـی لێژنەی تایبەت بدات سەردانی چەند پێگەیەکی عێراق بکـەن، وێنایـەکی دڵـەراوکێ ئامێز سەبارەت بـە پرۆگرامـە کیمیـاوی و بایۆلۆژییـەکانی عێـراق سـەریهەڵدا. ئـەو پرۆسـەیە چـەند سـاڵێکی خایاند و لێژنـەی تایبـەتی دامـاڵینی چـەکەکانی عێـراق هەوڵێکی زۆریدا و لە بەرامبەردا عێراق فروفێڵ و کۆسپ و تەگەرەی بـەکاردەهێنا. ناوە ناوە تەنگژە دەکەوتە نێوانیان و هەڕەشە لە عێراق دەکرا بـەوەی ئەمـەریکاو هاوپەیمانان پەنا دەبنە بەر کرداری سەربازیی بەناوی ئەنجوومەنی ئاسایشی سـەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان.

لێکۆڵینـەوەکان قـەوارەو ئـاڵۆزی پرۆگرامـەکانی چـەکی عێراقیـان دەرخسـت و سـەلمێنرا کـە عێـراق کۆگەیـەکی ئێجگـار گـەورەی چـەکی کیمیـاوی هەیـە و سەرکەوتوو بووە لـە گونجانـدنی بوونـەوەری بـایۆلۆژی وەك (الجمـرة الخبيثـة) بـۆ ئەوەی وەکو چەك بەکاری بێنێت نەك هەر ئەوەنـدە، بـەڵکو لەسـەر لێـواری پـەرە پێدانی چەکی ئەتۆمی تایبەت بەخۆی بوو. تاکو دوای هەشت ساڵ لـە لێکۆڵینـەوە هێشـتا تیمـەکانی پشـکنین لـەوە دەترسـان عێـراق توانـای دروسـتکردنی چـەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی هەبێت. ئەوەش جێگەی سەرسوڕمان نـەبوو، چـونکە سـەدام تێڕوانینێکی دوژمنانەی بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییـەکان هـەبوو بەتایبـەتیش لـەو ناوچەیەی کـە عێراقـی تێدایـە روون و ئاشـکرابوو نەیدەویسـت عێـراق بـەلاوازی و دابڕوای لە پرۆسەکانی پشکنین کەمایەی شەرمەزاری بوو بـۆ ئـەو، بێتـە دەرەوە. بەو هۆیەوە. پێویستی بەشتێك بوو تـا ڕێگـە لـە وڵاتـانی ناوچـەکە بگرێـت لـەوەی نەتوانن لاوازی عێراق بقۆستنەوەو . گومانیشیان لادروست بکات کە هێشتا عێـراق چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی ماوە، ئەوەش لەگـەڵ دڕەنـدەیی ڕژێـم و بـەکارهێنانی پێشووتری بۆ ئەو جۆرە چەکانە. دەبێتە بەرپەرچێکی تەواو و پرسێکە عێـراق بـە ئاسانی دەستبەرداری نابێت.

دەتوانرێ رادەی رشتبوونی عێراق لەسەر پارێزگـار یکـردن لەوچـەکانە بـەو نرخـە گرێبـدەین کەلـەو پێنـاوە دای. لـەماوەی شـەش هەفتـەدا لـە جـەنگی لەگـەڵ

هاوپەیمانان زیانی زۆر گەورەی بەرکەوت. بۆردومانی ئاسمانی ژێرخانی ئابووریی عێراقی وێرانکرد پتر لەوەی لە ماوەی هەشت ساڵی جەنگ لەگەڵ ئێران بەریکەوت لەهەمان کاتدا، عێراق هێشتا لەژێر کاریگەری قەرزەکانی سەردەمی ئەو شەرە دەی ناڵاند کە بەهۆی ئەو جەنگانەو قورسایيە مادییە سەربازییەکان دووچاریان ببووەوە، وەك ئەو قەرەبووکردنەوەیەی کە بەسەریدا سەپابوو بەهۆی دەستدرێژییەکانی بۆ سەر کوێت . کەچی بەردەوامیی سیستەمی ئەو سزایانەی کە UN بەسەر عێراقی سەپاندبوو وای لە عێراق کردبوو نەتوانێت نەوت بنێرێتە دەرەوە و دراوی بیانی بەدەست بێنێت بەوەش داهاتەکانی زۆر سنووردار ببوو . لەرووی تیۆرییەوە دەرمان و خۆراك لەو سزایانە جیاکرابووەوە، کەچی پەیین و کەلوپەلی کشتوکاڵی و مادەکانی قەلاچۆکردنی مێشو مەگەز و ئەو ماددە کیمیاویانەی کە بەکارهێنانیان دووسەرەیە ، سەرباری کەل و پەلی پێویست بۆ چاکردنەوەی تۆرەکانی کارەبا و پاکردنەوەی ئاو قەدەغەکرابوو. لەماوەیەکی کەمدا، کاریگەری ئەو گەمارۆیەی بەسەر وڵات سەپێنرابوو بەسەر گەلی عێراق دەرکەوت لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بەدخۆراکی و نەخۆشی دیکە، ئەوەش بووە هۆی زێدەبوونی رێژەی مردن لەنێو منداڵان بەشێوەیەك کە عێراق لەماوەی پتر لە ٤٠ ساڵدا بەخۆوەی نەبینیبو. کەچی ئەو پرسە لە ئەولەویاتی رژێمدا نەبوو .

UN . هەوڵیدا ئێش و ئازارەکانی گەلی عێراق سوك بکات، ئەوە بوو رێگەی بە حکومەتی عێراقدا بایی ١٠٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی لە ساڵی ١٩٩٢ نەوت بفرۆشێت و پێویستیەکانی خۆراك و دەرامەتی پێ دابین بکات. بەلام سەدام ئەو پێشنیازەی رەتکردەوە. چونکە UN رشتبوو لەسەر چاودێریکردنی پارەکە کە عێراق دەستی دەکەوێت و بڕی ٣٠ لە سەدای بۆ قەرەبووکردنەوەی جەنگی کوێت تەرخان بکات. سەدام بەردەوام بوو لە رەتکردنەوەی ئەم پێشنیازە بەو پێیەی پێشێلکردنێکی ترسناکی ئازادییەکەیەتی لە خەرج کردن و شەرمەزارییەکی گەورەشە بۆ دەسەلاتەکەی. رەنگە هیوادار بوو لەماوەیەکی کەم سزاکانی لەسەر هەڵبگیرێت. ئەو کاتە پێویستی بەو پێشنیازە نابێت. لە ساڵی ١٩٩٦ حکومەتی عێراق

ڕەزامەندی لەسەر بەندەکانی بڕیارەی ٩٨٦ی ئەنجومەنی ئاسایش دەربڕی، کە ڕێگەی بە عێراق دەدا بایی ٢ ملیار دۆلار نەوت بفرۆشێت لە هەر شەش مانگێك بۆ ئەوەی پێویستیەکانی گەلی عێراقی پێ دابین بکات (ئەو بڕە بەرزبۆوە بۆ ٥,٥٢ ملیار دۆلار لە نەوت بۆ هەر شەش مانگێك بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش ژمارە١١٥٣ی ساڵی ١٩٩٨ ، هەروەها لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٩بەرز بۆوە بۆ ٨,٣ ملیار دۆلار بۆ ئەو ماوەیەی نێوان ئایار- تشرینی دووەمی ١٩٩٩). بەرازیبوون بەو بڕیارە. عێراق ڕازیبوو لەسەر ئەوەی UN ئیدارەی ئەو پارە بکات. باقی پارەکە دوای ئەوە دەدرێتە عێراق کە ڕێژەیەکی سەدی چەسپاو بۆ قەرەبووەکانی جەنگ و کاری لێژنەی تایبەتی نەهێشتنی چەك تەرخان بکات، سەرەڕای بڕێکی دیاریکراوی پارە کە ڕاستەوخۆ حەواڵەی کوردستان دەکرا. لەگەڵ ئەوانەشدا. UN داوای دەکرد ئەو کەلوپەلانەی دەکڕدرێت لە ژێر چاودێری پشکنەرانی UN بێت، هیوادار بوو بە گەورەترین ڕادەی یەکسانی بەسەر فراوانترین چینەکانی گەلی عێراق دابەشبکرێت.

سەبارەت بە سەدام. سودی بنەڕەتی ئەو ڕێکەوتنە نەك تەنها خۆی لەوەدا دەدیتەوە کە دەست بەسەر داهاتی زیاتر دابگرێت. بەڵکو سەبارەت بەو، ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ کۆتایی هاتنی سزاکان، چونکە عێراقی گەڕاندەوە بازاڕی جیهانی وەك بەرهەمهێنەرێکی نەوت و بەکاربەرێکی سەرەکی کەلوپەلی پیشەسازی. ڕوون و ئاشکرا بوو، سەدام خوازیار بوو ئەوە تەوژمێك لە UN دروست بکات و پاڵی پێوە بنێت سزاکان هەڵبوەشێنێتەوە. لە ڕاستیدا حکومەتی عێراق هەوڵیدەدا هانی ئەو تەوژمە بدات بەلانی کەم لە ساڵی ١٩٩٢ وەوە. بە دیاریکراوی عێراق مەبەستی (ڕوسیا و فەڕەنسا بوو بەو پێیەی ئەندام بوون لە ئەنجومەنی ئاسایش و عێراق نزیکەی ٧٩١٠ ملیار دۆلاریان قەرزار بوو لەبڕی چەك کە لە ساڵانی هەشتەکان لێیانی کڕیبوو). ئەوانەش لە بەرژەوەندیان دابوو عێراق وەك هێزێکی گەورەی بەرهەمهێنەری نەوت بگەڕێتەوە پێگەی خۆی. حکومەتی عێراقیش ئەو بەرژەوەندییانەی لە ڕێگەی ئیمزاکردنی چەند ڕێکەوتنێك لەگەڵ

ڕوسیا و کۆمپانیا فەرەنساییەکانی بواری پیشەسازییەکانی نەوت ئیمزا کرد بۆ دوای هەڵگرتنی سزاکان .

ئەو هەنگاوانە دەست پێشخەری دیبلۆماتی دیکەی لەلایەن عێراقەوە لەگەڵ دا بوو. وڵاتە دوورەکانی کەنداو (عومان و قەتەر و ئیمارات) هاندران تا بچنە ڕیزی ئەو وڵاتانەی کە داوای هەڵگرتنی سزاکان لە سەر عێراق دەکەن. لە تشرینی دووەمی ١٩٩٤دا عێراق دانی بەسەربەخۆیی کوێت و سەروەریەکەی نا. بەو شێوەیە بە تەواوی وازی لە پڕوپاگەندەکانی پێشووی هێنا سەبارەت بە سەروەری عێراق بەسەریدا و دانی بە سنوری کوێت–عێراق نا کە UN لە بەرژەوەندی کوێت بەیەکجاری لە ئایاری ١٩٩٣دا نەخشاندی. سەرەڕای ئەوانە عێراق هەوڵیدا چین هان بدات بەو پێیەی ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشە دەنگی بخاتە پاڵ هەڵگرتنی سزاکانی سەر عێراق. ئەوەی دەقۆستەوە چین بەردەوام ڕەتی دەکردەوە پرسەکانی مافی مرۆڤ لە پێناو سزادانی وڵاتان بەکار بێت.

ئەو پرسە بۆ عێراق زۆر گرنگ بوو ، چونکە لە ساڵی ١٩٩١ UN بڕیاردەرێکی تایبەتی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ دامەزراند کە بەشێوەیەکی رێك وپێك راپۆرتی ئامادە دەکردو تیایدا سەرەکۆنەی حکومەتی عێراقی دەکرد لەوەی بەردەوام سەرپێچی مافی مرۆڤ دەکات بەرامبەر ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیان. هەر یەك لە ئەمەریکاو بەریتانیا و وڵاتانی دیکە بەو راپۆرتانە کاریگەر دەبوون بۆ ئەوەی سزاکان لەسەر عێراق بهێڵنەوەو ئیحتیوای بکەن. کەچی ئەو راپۆرتانە ئەوەشیان دەرخست سزاکان کە ٩ ساڵی خایاند هیچ کاریگەریەکی بەسەر رژێمی سەدام حوسێندا نەبوو بەڵکو گەلی عێراق ببووە قوربانی و سزاکان ئێش و ئازارەکانی گەلی عێراقی زێدەتر کردبوو .

لە راستیدا هێزە باڵا دەستەکانی ناو UN لەرێگەی پرۆتۆکۆڵەکانی "نەوت بەرامبەر خۆراك" هەوڵیاندا ئەو گرێکوێرە بکەنەوە. مەبەستیان بوو سزاکان بهێڵنەوە لە هەمان کاتیشدا رەوشی سەختی ژیان و گیروگرفتە تەندروستیەکانی

عێراق کەمبکەنەوە، کە ببووە مایەی نیگەرانیـەکی راستـەقینەی UN و دەرەوەی لە هەمبەر ئەخلاقیـەتی سـزا ئابوورییـەکان و بەلەبـەر چـاوگرتنی کاریگەرییەکـەی لەسەر لاوازترین چینەکانی کۆمەڵگەی عێراق. ئـەو رەوشـە پـاڵی بـە سـەدام وەنـا هەوڵەکانی دووبەرابەر بکات و چەند جار داوای هەڵگرتنی سزاکان بکات. عێراق لـە ماوەی ١٩٩٧–١٩٩٨ زنجیرە تەنگژەیەکی خولقاند کە هەرەشـەی رێگـە گـرتن لـە لێژنـەی تایبـەتی دامـاڵینی چـەك کـرد ئـەرکی خۆیـان جێبـەجێ نەکـەن UN ی ناچارکرد جەخت لەسەر بەرنامەی پشکنین بکات بەو پێیەی هۆکاری سەرەکیە بـۆ هێشتنەوەی سزاکان. بەڵام ئەو سـتراتیژیەتە مەترسی هـەبوو بـۆ عێـراق، چـونکە ئەگەری ئەوەی نزیـك کـردەوە جـارێکی دیکـە ئەمـەریکا پـەنا بباتـەوە بـەر کـاری سەربازیی بۆ ئەوەی ناچاری بکات گوێڕایەڵ بێت. لە کاتێکدا کە حکومەتی عێـراق رشتبوو لەسەر شاردنەوەی بەرنامەکانی پەرەپێدانی چەك.

دوای ئەوەی چەند جارێك هێندەی نەمابوو ئەمەریکا لـەماوەی سـاڵەکانی ١٩٩٧–١٩٩٨ کاری سەربازی ئەنجامبدات، بەیارمـەتی هێزەکـانی بـەریتانیا بۆردومـانێکی ئاسمانی کردە سەر عێراق بـەناوی (رێـوی بیابـان) لـە کـانونی یەکـەمی ١٩٩٨دا . لەسەرتا ئامانجەکان سەربازیی بوون ، دواتر چەند پێگەیەکی گرتەوە کەئەمـەریکا گومانی لێدەکرد رۆڵیـان هـەبووە لـە شـاردنەوەی پرۆگرامـی پەرەپێـدانی چـەکی عێراق. هەریەك لە حکومەتەکانی بەریتانیا و ئەمـەریکا بەهانـەی ئـەوەیان بـۆ رای گشتی دەهێنایەوە کە مەترسی سەربازیی عێراق لەسەر ناوچەکە هـەر بەردەوامـە. هێرشەکە بۆ ناچارکردنی عێراقە تاکو گوێڕایەڵی داواکارییـەکانی لێژنـەی دامـاڵینی چـەك بێـت و رژێمـی سـەدام حوسـێن لاواز بکـەن بەوهیوایـەی زوو بڕوخێـت. ئـەو کۆمەڵە هاندەرانە سەرباری هۆکارە بەکارهاتووەکان وایکـرد ئامانجـەکانی بکەونـە بەر گومانی ترسناك. چەند پرسـێك لـە هەمبـەر ئاینـدەی لێژنـەی تایبـەت هاتنـە ئاراوە کاتێك عێراق ویستی ئەو رارابیـە بقۆستەوە کـە بـاڵی بەسـەر UN کێشـاوە لەهەمبەر ئـەوەی ئەمـەریکا پـەنای بردووەتـە بـەر هێـزی تێکشـکێنەر. سـەرەڕای ئـەوەی ئـەو کـارە سـاربازیە هـیچ کاریگەرییـەکی لەسـەر لاواز کردنـی هـەژموونی

سەدام حوسێن نەبوو، بەڵکو ئەو لایەنانەی نیازی گۆڕینی رژێمی بەغدایان هەبوو هەستیان بەبێ ئومێدی کرد و هەروەها زۆر جارانیش بەسەر سورمان، بەو پێیەی سیستەمی سزاکان کاریگەری کەمتر هەبوو بەسەر دەسەلاتدارێتی لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا ، چجای ئەو وێرانکارییانەی کە بەسەر ئابووری عێراقدا هاتبوو لەگەڵ ئەو هەژاریەی کە بەسەر زۆرینەی گەلی عێراقدا زاڵبوو.

## مرونەتی رژێمی سەدام حوسێن

رەنگە ئەو مرونەتە تا رادەیەکی زۆر بۆ ژێرخانی دەسەلاتی سەدام حوسێن لە عێراق بگەڕێتەوە. کرۆکی رژێم لە چەند گروپێکی بچوکی ئەو پیاوانە پێکهاتبوو کە بەباگراوندی ناوچەگەری هاوبەش و خانەوادەیی و عەشایەری یا ئەوانەی خۆیان تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی، کەسی سەدام پێکهاتبوون، دوای ئەوان تۆڕەکانی مەحسوبیەت دەهات کە لە نێو کۆمەڵگەی عێراق قورساییەکی پێدا بوون، لەلایەن خودی سەدامیش بەنرخ ببوون، لە بەرامبەر دا ئەوانیش چاویان لە سۆزی سەدام بوو. سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە سەرتاپای عێراق تێوە گلابوون لە خزمەتکردنی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی سەرۆك. بەلام ئەوانە رێژەیەکی کەم بوون بە گوێرەی ژمارەی دانیشتوانی دەوڵەت کە ئەو کاتە نزیکەی ٢٠ ملیۆن بوو. ئەو کەسانە کە ژمارەیان نزیکەی ٥٠٠ هەزار کەس دەبوو بەلایەنگرانیشەوە. سەدام پێویستی بەوە بوو رازییان بکات کە سەرکردایەتی ئەو باشترینە بۆ بەرژەوەندییەکانیان لە هەر ئەڵتەرناتیڤێکی دیکە کە ئەوان بەخەیاڵیاندا بێت، ئەگەر رژێم بروخێت ئەوانیش هەموو شتێك دەدۆڕێنن.

زۆربەی نەك هەموو ئەو کەسانە کە زۆر جار بەوانەی سەدام متمانەیان پێدەکات ناوزەد دەکران سەر بەتایەفەی عەرەبی سوننەی عێراق بوون. بەتایبەتیش ئەوانەی سەر بەناوچەکانی باکوری رۆژئاوای بەغدابوون کە سەدام لەوێوە هاتبوو. لە نێوان خۆیاندا لە ململانێدا بوون بۆ ئەوەی لە سەدام نزیکببنەوەو سەرنجی

رابکێشن و بەر سۆزی ئەو بکەون و هیچ گومانێکیشیان لە بنەماکانی رژێم نەبوو. توانای ئەو کەسانە بۆ گەیشتن بە دەرامەتە زۆرەکانی دەوڵەتی عێراقی و هەموو جۆرە کۆمپانیاکانی فرۆشتنی نەوت بە قاچاغ و کڕین و فرۆشتنی کەلو پەل بە قاچاغ کە سەدام دایمەزراندبوو بۆ ئەوەی خۆی لە سزاکان بدزێتەوە وای لێکردبوون لە کاریگەری گەمارۆی ئابووری دابڕاوبن و چارەنووسیان جیاواز بوو لە زۆرینەی زۆری گەلی عێراق. رادەی ئەو خۆشگوزەرانیەیان بەڕادەی نزیکیان لە سەدامەوە گرێدرابوو کە ئەو خاوەنی دوا بڕیار بوو سەبارەت بەوەی کێ دەبێ سوودمەند بێ و کێ سزابدرێت، هەروەها تا چ رادەیەك پێویستە هانی ململانێی نێوانیان بدرێت. ئەوەش شێوازێك بوو بۆ پەرتوبڵاوکردنەوەیان و گاڵتە پێکردن بە ئارەزووەکانیان لە پێناو پرسی خۆیدا.

لە ماوەی ساڵەکانی دوای ١٩٩١. سەدام سەلماندی کە دەتوانێت زۆر بە لێهاتوویی کۆنترۆڵی دوژمنایەتی و ئارەزووەکانی ئەو کەسانە بکات. زۆر جاریش ئەوە بێزارییەکی زۆری لای ئەو کەسانە دروستدەکرد. هەندێکجار دەگەیشتە رادەیەك پلانیان بۆ کودەتا لە دژی سەدام دادەنا. لەبەر ئەم هۆیە جێی سەرنجە ئەو کودەتایانەی کە ئاشکرا دەبوون لە نێو ریزەکانی سوپا کە وەك بنچینەیەك بۆ لە سێدارەدان و زیندانیکردنی ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەران بەکاردەهات لەوەتەی شکستی کوێتەوە (سەرەڕای پێویستی هەڵسوکەوت کردن بە ئاگەدارییەوە لەگەڵ هەندێك راپۆرت لە بارەی ئەو کودەتایانە) وا پێدەچێت لە چواردەوری چەند ئەفسەرێك گەلاڵە ببوو کە زۆر جێگەی متمانە بوون و خەڵکی رومادی و دۆرو سامەڕاو تکریت بوون. ئەوانە ئەو ناوچانە بوون کە بەردەوام سەدام گەورە ئەفسەرانی خۆی لە هێزەکانی سەرەکی ئەمن لێ دەستنیشاندەکرد. بەلام بە پوچەڵکردنەوەی ئەو کودەتایانە سەدام نەك هەر توانی تۆڕە هەواڵگریەکانی بەکاربهێنێت کە ئەندامانی خێزانەکەی سەرۆکایەتیان دەکرد، بەڵکو عەشایەرو گروپەکانی دیکەی ریزی ئەفسەرانیشی بەکاردەهێنا بۆ پوچەڵکردنەوەی هەوڵەکانی کودەتا.

لەسەر ئاستێکی فراوانتر لە عێراق سەدام حوسێن ئەو سەرۆك هۆزانەی کە توانا و ئارەزووی هاوکارییان هەبوو بەباشتر دەزانی بەو پێیەی کوڕانی ئەو هۆزانە گوێڕایەڵی سەرۆکی دەوڵەت دەبوون. ئەوە بە فەرمی خرایە قاڵبی ڕێوشوێن و لە ساڵانی نەوەتەکان سەپێنرا و دان بە دەسەڵاتی سەرۆك هۆزەکان نرا لە چارەسەری ناکۆکیەکان و ڕێکخستنی کاروباری ڕۆڵەکانی هۆزەکانیان لە نێوان خۆیان و هۆزەکانی دیکە، بەوەش سیستەمێکی یاسادانانی جودای گەڕاندەوە ناوچە هۆزگەریەکان (کە ئێستا لە زۆر حاڵەتدا دەکەونە نێو شارەکان) یادی سەردەمی پادشایەتی هێنایەوە بیر. لە ئاستێکی نافەرمیشدا سۆزی زیاتری بۆ ئەو سەرۆك هۆزانە  هەبوو کە هاوکاری زیاتر دەکەن. لە ڕێگەی پێدانی خانوبەرەو بەرزکردنەوەی پلەی ئەندامانی هۆزەکانیان لەسەرجەم بوارەکانی دەوڵەت و ڕێگە پێدان بە چەك هەڵگرتنی لایەنگرانیان. لە راستیدا ئەو هۆکارانەی هەژموونی کۆمەڵایەتی سەرجەم حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق گرتبوویانە بەر سەرەڕای ئەوەی تەنگەژەو–عەبقەریەتی–ڕژێمی سەدام حوسێن کردبوویە بەشێکی جیانەکراوە لە ڕێگەکانی دەوڵەت بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی.

هاوکات لە دە ساڵی رابردووشدا حکومەت هانی کلتوری "عەرەبی"و هۆزگەری دەدا. میدیا فەرمیەکانی دەوڵەتیش ئەو ڕێگەیەی گرتە بەرو پەرەی پێدا وەك سەربوردەکانی پێشووتر. لەگەڵ ئەوەی وای خستە روو کە "تایبەتمەندی سروشتیە" لەلایەن زۆربەی گەلانی عێراق. لەگەڵ ئەوەشدا وا دەردەکەوێ لەگەڵ سیستەمی هێز تێك ئالاوان کە دەوڵەتی عێراقی لێپێکهاتووە لە سەردەمی سەدام حوسێندا. ئەوەش مانایەکی دابە چەمکی هۆزگەری کە بەهۆیەوە وای لێهاتبوو کوڕانی شار کە چەند نەوەیەك بوو لە گوندەوە هاتبوونە شار رەسەنایەتی عەشایەری خۆیان و ناسنامەیان دەدۆزیەوە و هەوڵیاندەدا روخسەت لە یەکێك لە سەرۆك هۆزەکان وەربگرن بۆ ئەوەی ببنە ئەندامی ئەو هۆزە دوای ئەوەی کە نەسەبەکەیان وونکردبوو. گومانی تێدا نیە ئەو هەوڵدانە بۆ دیاریکردنی ناسنامە ئامانجی تایبەتی و مانای خۆی هەبوو لە جیهانی سیاسی عێراق کە تیایدا

تۆڕەکانی پاراستن و خۆلێنزیکردنەوە تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر هەلی ژیان هەبوو.

لە راستیدا، تۆڕەکانی مەحسوبیەت و خۆلێنزیکردنەوەو ئەو رەهندانەی پێوەی گرێدرابوو لە سەرتاپای عێراق زۆر خزمەتی سەدامی کرد. هەندێك جار رژێم ئەوەی بە شێوەیەکی کارەسات ئامێز بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی راستەوخۆ کۆنترۆڵی ئەندامانی خێزانەکەی بکات. تێگەیشتنی سەدام بۆ دەوڵەت بەرەچەڵەك و پشتاو پشت بوو تا رادەیەکی زۆر بەند بوو لەسەر رەسەنایەتی و حەسەب و نەسب. کە ببوونە نیشانەی زۆر گرنگ بۆ ناسنامەو پێگە لە نێو کۆمەڵگە دێهاتیەکان کە سەدام و کەسە نزیکەکانی لێوەی هاتبوون. لەسەر ئاستی دەوڵەتیش. ئەوە لە بەرژەوەندی کەسە نزیکەکانی دەسەلاتدار دابوون. کە خرابوونە نێو جەرگەی دەسەلات و تایبەتمەندی و توانای بێ وێنەیان پێدرابوو بۆ گەیشتن بە دەرامەتەکانی دەوڵەت، هەر هەمووشیان لە خزمەتی دابوون. سەرەڕای هەستی خۆشەویستی و رقلێبوونەوە کە بالی بەسەر هەر گروپێك لەوانە کێشابوو کەبەیەکەوە کاردەکەن. هەندێك گروپ لەو کەسانە دروست دەبوو کە لە نێو خانەوادەی گەورەدا زۆر لەیەکتر نزیك بوون. لەوەتەی مردنی عەدنان خەیروڵلای خزمی سەدام لە ساڵی ١٩٨٩دا. خانەوادە بەسەر سێ بەشدا دابەش ببوو: بەشی یەکەم لە سەدام و زڕبراکانی لە دایکی، بەرزان، سەبعاوی، وەتبان. بەشی دووەم پێکهاتبوو لە هۆزی ئەلمەجید کوڕە مامەکانی سەدام، بەشی سێیەم بریتی بوو لە هەردوو کوڕەکەی عودەی و قوسەی. کە هەر چەندە ئارەزووەکانیان وای لێکردبوون تۆڕی لایەنگری تایبەت بەخۆیان پێکبهێنن.

سەدام ئەو پیاوانەی بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتەکەی بەکاردەهێناو تا ڕادەیەکی زۆر پشتی پێدەبەستن بەو پێیەی لە گرنگترین پۆستەکانی ئەمنیی دەوڵەتدابوون. بەلام سەدام رشتبوو لەسەر ئەوەی رێگە نەدات هیچ کامێك یا گروپێك لەوانە بگاتە ئەو رادەیەی تەحەدای بکەن. بە پێچەوانەوە بەردەوام لە رێگەی دامەزراندنیان و تایبەتمەندی و زەوی و زار پێدان و لێسەندنەوەی لێیان بە بیری دەهێنانەوە ،

بەوەی کە هەر هەموویان لە دروستکراوی دەسەلاتدارەکەن. سەدام خۆی بڕیار دەدات چۆن باشتر خزمەتی دەکەن و شایەنی چ پاداشتێکن، ناوە ناوە گروپێکی لە دژی گروپێکی دیکە هاندەدا، جار جار سۆز و بەخشندەیی بۆ گروپێك دەردەبڕی جارێکی دیکە بە پێچەوانەوە، بەلام دەرگەی لە بەردەم هەر هەموویان دەکردەوە بۆ ئەوەی تایبەتمەندی بە دەست بێنن لە ڕێگەی رازیکردنی سەرۆك.

لە سالی ١٩٩٥، زنجیرە ڕووداوێك هاتە پێشەوە. ئەو مەنتیقە تایبەت و بێ بەزەییەی دەرخست کە ئەو پرۆسەیە بەڕێوەدەبات. پاشەکشەی بەختی هەندێك لە رۆڵەکانی هۆزی ئەلمەجید (عەلی حەسەن مەجید لە پۆستی وەزیری بەرگری لادراو حوسێن کامل ئەلمەجیدی کوڕە برای و زاوای سەدام حوسێن کۆنترۆلی بەسەر زۆربەی کارەکانی بە قاچاخ بردنی نەوت لە بەرژەوەندی عودەی کوڕە گەورەی سەدام لە دەستدا) بووە هۆی ئەوەی، حوسێن کامل لەگەل هەریەك لە براکەی سەدام کامل و ژنەکانیان کە هەردووکیان کچی سەدامبوون رابکاتە ئوردن. حوسێن کامل وردەکاری چەکی کۆکوژی عێراقی ئاشکرا کرد (بەو پێیەی وەزیری پیشەسازی و بەرهەمهێنانی سەربازیی بوو لە هەشتاکان، رۆلی هەبوو لە بونیادنانی ئەو پرۆگرامە). بەلام بەهۆی پەیوەندی پتەوی لەگەل رژێم وای لێکردبوو لە ولاتانی دەرەوە جێگەی نەبێتەوە.

هەردوو برا هیوابڕاو بوون بەهۆی ئەو مامەلەیەی لەگەلیاندا کراو دلنیابوون لەو لێبوردنەی سەرۆکایەتی و ئەو گرەنتیانەی سەدام بە باوکیانی دابوو. لە شوباتی ١٩٩٦دا گەڕانەوە عێراق. لەگەل گەیشتنیان بۆ عێراق هەردوو برا و باوکیان و چەند ئەندامێکی دیکەی خانەوادەکەیان کوژران. پڕوپاگەندەی ئەوە کرا گوایە کرداری کوشتنەکە بە دەستی هەندێك کەس بوو لە هۆزەکەیان کە تووڕەیی خۆیان دەربڕیوە و ڕشتبوونە لەسەر ئەوەی مۆری شەرمەزاری بسڕنەوە کە لەسەر خانەوادەکە دروست ببوو. بەم شێوەیە سەدام حوسێن جارێکی دیکە نرخی تەحەدا کردنی دا. نەك هەر ئەوەندە بەلکو لە راستیدا سێ و دوو ناکات لە کوشتنی هەر کەسێك مەگەر نزیکترین کەسی بێت ئەگەر زیادەڕۆیی لەسەر بکات.

ڕەنگە هەر خۆشی بەرپرسیار بێت لەو پڕوپاگەندەیەی کە دەڵێت منداڵەکانی هەر دوو براکە واتە—نەوەی خۆی—ئەوانیش کوژراون. بۆ ئەوەی بسەلمێنێت هەر یەکێك بەو شێوەیە لە بەرامبەر خانەوادەکەی هەڵسو کەوت بکات پێویستە چاوەڕوانی سۆزو بەزەیی نەکات. لە جیهانێکی لەو شێوەیەدا، هەر پەیوەندیەکانی خانەوادەیی حوکمی ناکات بەڵکو تۆڵە سەندنەوەش. ڕەنگە هەوڵی کوشتنی عودەی کوڕە گەورەی لە کانونی یەکەمی ١٩٩٦دا و هەوڵی کوشتنی قوسەی کوڕە بچوکی لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٧ هەر ڕەنگدانەوەی کوشتنی خانەوادەی کامل بووبێت.

هەندێکی دیکە هەوڵەکانی کوشتنی کوڕەکانی سەدامیان بۆ هێزە ڕێکخراوەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی کۆمەڵگەی شیعە گەڕاندنەوە. ئەو هێزانە لەوەتای شکاندنی شۆڕشەکانی باشوور لەساڵی ١٩٩١دا بە شێوەی پچرپچڕ چالاکانە مانەوە. هەر چەندە زیانی زۆریشیان بەدەست هێزە ئەمنیەکانی عێراق لێکەوتبوو. بەڵام پارێزگاریان لە تۆڕەکانی مقاوەمەت لەناو شارەکان کردبوو، وەك شاری سەدام لە بەغدا کە زۆرینەی دانیشتوانی شیعە بوون، سەرەڕای چەند شارێکی دیکەی باشوور، بەڵام نە حزبی دەعوە و نە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق نەیانتوانی دەستکەوتی گەورەیان بەرامبەر هێزەکانی ڕژێم هەبێت کە پرچەك بوون، لە ساڵانی هەشتا هەوڵیان دا خودی سەدام بکوژن. ئەو پلانە مەنتقی بوو لە ڕژێمێکی مەرکەزی وەك ڕژێمی عێراق. بەڵام هێزە ئەمنیەکانی سەدام حوسێن ڕشتبوون لەسەر ئەوەی کەس جێگەی پێنەزانێت تەنها کەسە زۆر نزیکەکان نەبن. لەو حاڵەتە گروپەکانی ئۆپۆزسیۆن لە جیاتی ئەوە هێرشیان دەکردە سەر بنکەو پێگەکانی ئەمن ئەوەش تەنها بۆ ورە بەرزکردنەوەیان بوو بێ ئەوەی بتوانن گۆڕانکارییەك لە تەرازووی دەسەڵات دروست بکەن.

بەو پێیەی ئەو ڕژێمە عەشایەری و کەسێتیەی کە سەدام لەسەر بنچینەی خۆلێنزیکردنەوە لەچەند کەس و گروپێکی هەڵبژاردە لە کۆمەڵگا ناسراوەکان بنیاتی نابوو. ببووە هۆی دوورخستنەوەی کەسانی تر لە کۆمەڵگەکانی دیکە کە

ناکرێت متمانەیان پێبکرێت و بە ئاسانی بخرێنە ژێر سیاسەتی خۆلێنزیکردنەوە کە سەدام دەستنیشانی کردبوو– یا وای دادەنا کە گرنگیان کەمە بۆ بەرژەوەندییەکان و مانەوەی. لە ئاکامدا لە دوای سالّی ١٩٩٠ سەرجەم کۆمەلّگاکانی عێراق لە ژێر دوو جۆر سزا دەیان نالآند. یەکەمیان ئەمەریکا سەپاندبووی. دووەمیشیان بنچینەیەکی کۆنی هەبوو لەو سۆزو پاداشتەی کە سەدام دایناببوو. لەو سەردەمی تا ڕێژەیەك خێروبێرەدا کە حیرمانی کۆمەلآیەتی تێدا زۆر کەم بوو لە ماوەی چەند ڕۆژێکێدا بووە مایەی بێ ئومێدی و گۆشەگیری خانەوادەکەیان کە هەولّیان دەدا خۆیان لەگەلّ ئەو هەژارییە رابێنن کە تێیدا دەژیان.

لە توانای نەتەوە یەکگرتووەکان دانەبوو چارەسەری ڕەوشەکە بکات تەنانەت دوای ئەوەش کە پرۆتۆکۆلّەکانی "نەوت بەرامبەر خۆراکیش" کە لە سالآنی ١٩٩٦–١٩٩٩ ئەنجامدرا ڕێگەی بە عێراقدا پارەو پولەکەی بە چرووپری لە خۆراك و پێداویستیەکانی دیکە خەرجبکات. سیستەمی پشکنین کە UN داینابوو بۆ گەرەنتیکردنی گەیشتنی ئەو کەل و پەلانە بۆ چینە هەژارەکانی گەلانی عێراق. بەو شێوەیە گونجاو نەبوو کە رووماڵی پێداویستیەکانی سەرتاپای ولآت بکات یا بتوانێت تۆڕەکانی مەحسوبیەت و خۆلێنزیکردنەوە ببڕێت کە دابەشکردنی دەرامەت بەو پێیە بەڕێوە دەچوو. ڕژێم بەردەوام بوو لە بەکارهێنانی مەینەتیەکانی گەلەکەی لە هەلّمەتی هەلّگرتنی سزاکان و لە هەمان کاتدا کەمی کەل و پەلەکانی بۆ فروفێلّی هێزە دەرەکیەکان دەگەڕاندەوە. لە سەروویان ئەمەریکا. کە پلاندانەری "هێرشەکانی ٣٠ دەولّەتەکە بوو". لەو کاتەدا ڕژێم بەردەوامبوو لە پەیرەوکردنی سیستەمی پاداشت و سزا کە لە رابردوو سوودی زۆری لێبینی بوو و هۆکارێك بوو بۆ ئەو هەژاریەی کە بالّی بەسەر زۆرینەی گەلی عێراقدا کێشابوو.

هەندێك کەس لەوانەی لەلایەن ڕژێمەوە سزا دەدران و مامەلّەیەکی تایبەتیان لەگەلّ دەکرا مەینەتەکانیان دوو هێندەبوو. بەو شێوەیە ڕۆلّەی هۆزە شیعەکانی

ناوچەی فراوانی زۆنگاوەکان لە باشوری عێراقدا لە ماوەی نەوەدەکان دووچاری سەرکوتکردنێکی زۆر بوونەوە. لەلایەك سوپای عێراق تۆپبارانی دەکردن لەلایەکی دیکەش گەمارۆیان لەسەر بوو. سەرەڕای تەواو کردنی پرۆژەی "رووباری سێیەم" کە ئاراستەی دوو رووبارە گەورەکەی گۆڕی و رووبەرێکی فراوانی زۆنگاوەکانی وێرانکرد. دانیشتوانەکەی لە رێگەی سنورەوە بەرەو ئێران رایانکرد، یاخود گواسترانەوە بۆ گوندی دیکەی نوێ لە هۆکارەکانی پەیداکردنی بژێوی ژیانیان قەدەغەکران و خرانە ژێر چاودێری هێزەکانی ئەمن. ئەوەش ئێش و ئازاری زۆری پێگەیاندن. چونکە زۆنگاوەکان بۆ ماوەیەکی زۆر ببووە شوێنی دالدەدانی ئەوانەی لە دەست بەکرێگیراوانی رژێم رایاندەکرد. لە کاتی جەنگی عێراق و ئێرانیشدا بە هەزاران راکردووی سەربازیی پەنایان بردبووە بەر ئەو زۆنگاوانەو خۆیان لەوێ حەشاردابوو. هەروەها دوای شکستی شۆڕشی ۱۹۹۱ بە هەزاران کەس خۆیان لەناو زۆنگاوەکاندا شاردبووەوە کە لە دەست گاردی کۆماری رایانکردبوو. رژێم ئەو هەڵسوکەوتە توندەی لەگەڵ دانیشتوانی زۆنگاوەکان کە یەکێکن لە کۆنترین کۆمەڵگەی عێراق بۆ هۆکاری ئەمنی و نوێکردنەوە دەگەڕاندەوە . هاوکات ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە بووەتە هەڕەشە لەسەر ناسنامەی عێراق و پێشکەوتنی. لە هەمان کاتدا رژێم سێ و دووی نەکرد لە زڕاندنی ناوی دانیشتوانی زۆنگاوەکان بۆ ئەوەی عێراقیەکان قەناعەت پێبهێنێت بەوەی ئەو کەسانە هیچ نرخێکیان نیەو دەبێ سەرکوت بکرێن و کۆمەڵگەکەیان وێران بکرێت.

هەروەها رژێم ئەو شیعانەی کردە ئامانج کە لایەنگری زانا ئایینە سەربەخۆکان بوون. زۆربەی جار سەدام رشتبوو لەسەر چاودێریکردن و پاڵپشتی کردن لە سەرۆك هۆزەکان لە گوندەکانی شیعەی باشوور. سەرباری هەندێك پیاوی ئایینی دیکە وەك عەلی کاشیفو لغیتاء ، ئەوانەی ئارەزووی گێرانی رۆڵی ئامرازیان هەیە بۆ رژێم. هەر ئاماژەیەکیش بۆ سەربەخۆیی لە دەسەلاتی رژێم توندوتیژی تەئدیبی بەدوادا دەهات. بەو شێوەیە ئایەتوللای ئەکبەر ئەبو لقاسم خوئی دوای شۆڕشی

١٩٩١ دستبە سەرکرا و ، هەروەها چەند ئەندامێکی خانەوادەکەی و راوێژکارەکانی زیندانی کران و کوژران. کاتێك لە ئابی ١٩٩٢دا کۆچی دوایی کرد. چاودێرییەکی توند خرایە سەر کوڕەکانی و پیاوە ئایینیەکانی دیکە کە بێزاری خۆیان لە حکومەت دەربڕیبوو. هەر سەرکردەیەك دەرکەوتبا یان بە شێوەیەکی سەربەخۆ چالاك بوایە سەرکوت دەکرا یان دەکوژرا. بەو شێوەیە محەمەد تەقی کوڕی خوئی لە ساڵی ١٩٩٤ لە رێگەی نێوان نەجەف و کەربەلا کوژرا. هەروەها تەقە لە هەر یەك لە ئایەتوڵڵا مورتەزا ئەلبرۆجەردی و ئایەتوڵڵا عەلی ئەلغەرەوی کرا لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٩٨دا. لە شوباتی ١٩٩٩دا هەمان چارەنووس چاوەڕوانی ئایەتوڵڵا محمد سادق ئەلسەدر و دوو لە کوڕەکانی کرد. هەر چەندە ئەلسەدر بە ئاشکرا رەخنەی لە رژێم نەدەگرت، بەڵام ببووە خاوەنی لایەنگریەکی بەکۆمەڵ لە نێو شیعەکان. ئەو لایەنگیریەش لە ناڕەزایی دەربڕینێك بەرامبەر حکومەت لە شارە شیعەکان بە روونی دەرکەوت کاتێك کە هەواڵی کوژرانی بڵاوبووەوە. لەو کاتەدا موجتەهیدی گەورەی شیعە ئایەتوڵڵای ئەکبەر عەلی سیستانی لە ساڵی ١٩٩٤ دەستەبەسەر کرا بۆ دانانی سنورێك بۆ پەیوەندیەکانی لەگەڵ تایەفەکەی. بەم شێوەیە رژێم هیواخواز بوو هەر جورێك لە جۆرەکانی رابەرایەتی سەربەخۆی شیعەکان بترسێنێت و لەناو ببات.

## حوکمی زاتی کوردی و سیاسەتی کورد

هاندەرەکان لە یەکدەچوون، بەڵام تەکنیکی بەکارهاتوو دژی کۆمەڵگەی کوردی دوای شکست هێنانی راپەڕینی ١٩٩١ جیاواز بوو . بە پێچەوانەی باشوری شیعەنیشین، ئەو کێشەی کە بەهۆی کۆڕەوی بە هەزاران کورد بەرەو سنورەکانی تورکیا وایکرد هێزە هاوپەیمانەکان راستەوخۆ بێنە ناو پرسەکە، "ناوچەیەکی ئارام" دامەزرا لە کوردستان بە روون و ئاشکرایی قەدەغە کرا سوپای عێراق بێتە ناوچەکە هەروەها رێگە نەدرا فرۆکەکانی عێراق بە ئاسمانی باکوری هێڵی پانی ٣٩

بفڕن کە دەکەوێتە باشووری موسڵ و هەولێر. ئەوە بووە هۆی کشانەوەی سوپای عێراق لەوناوچەیەکی فراوانی باکوور بەوەش هێڵێك بۆ ئاگربەست لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١ دانرا کە تارادەیەك لەگەڵ ئەو سنورەی ناوچە کوردیەکان دەگونجا کە ساڵی ١٩٧٤ دانرابوو.

دەستتێوەردانی هاوپەیمانان لە بەرژەوەندی پەنابەران بووە هۆی دروستبوونی کیانێکی کوردی سەربەخۆ لە ژێر باری واقیعدا لە باکووری عێراق. هەر زوو پارتی دیموکراتی کوردستان سەر لە نوێ جێ پێی خۆی لەو ناوچەیە قایم کردەوە بەو پێیەی گەورەترین هێزی ناوخۆییە لە باکوور، لە کاتێکدا کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بنکەی خۆی لە سلێمانی لە باشوور بەهێزکرد.

لە ژێر چاودێری نێودەوڵەتی هەڵبژاردنێکی تاڕادەیەك سەربەخۆ لە ئایاری ١٩٩٢ ئەنجامدرا. لە ئاکامدا نوێنەرایەتیەکی تاڕادەیەك یەکسان لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان هاتە ئاراوە (هەر یەکەیان نزیکەی ٥٠٪ی دەنگەکانیان بەدەستهێنا) لەگەڵ چەند حزبێکی بچوکی دیکە ، لە حوزەیرانی ١٩٩٢دا ئەنجومەنی نوێنەرانی کوردستان لە هەولێر دەستی بەدانیشتنەکانی کرد.

بەڵام هەر لەسەرەتاوە ناوچە کوردیەکان خۆی لە رەوشێکی پڕ لە ئاستەنگ و سەخت دۆزیەوە، لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٢ دانوستانەکان لەگەڵ بەغدا پچران و حکومەتی عێراق گەمارۆی بە تەواوی خستە سەر ناوچەکە و مووچەی بڕی و رێگەی نەدا کەلوپەل هاوردەبکەن. لەگەڵ زیادبوونی حاڵەتی کورتهێنان لەناوچەکە ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکان زیادیکرد تاکو هەردوو حزبە سەرەکیەکە تواناکانیان لەسەر هاوکاری تاقیبکەنەوە. لە جیاتی ئەوەی بچنە نێو حکومەتی نێوخۆیی کوردی کە لە تەمموزی ١٩٩٢ پێکهێنرا هەردوو سەرکردە مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و جەلال تاڵەبانی سەرۆکی نیشتمانی کورستان لە دوور وەستان و خەڵکی دیکەیان دامەزراند کە

نوێنەرایەتیان دەکەن. ئەمەش هەلێ بۆ ڕەخساندن بۆ ئەوەی پارێزگاری لە تۆڕەکانی حزبەکانیان بکەن و فراوانی بکەن. هەروەها هاندەر بوو بۆ پەرەپێدانی دوو ئیدارەی هاوسەنگ لە خودی ناوچە کوردیەکان. شتێکی ئاسایی بوو ناکۆکی لە نێوان دوو حزبەکە بەرپا بێت کە نەبوونی متمانەی مێژوویی لە نێوانیاندا هاریکار بوو بۆ ئەوە. ئەو پرسانە لە دەوری زەوی و دابەشکردنی یارمەتیە ئابوورییە نێو دەوڵەتیەکان و داهاتی پرۆسەکانی ئاودیوکردنی نەوت و کەل و پەل لە سنورەکانی ئێران و تورکیا تەوەریان گرتبوو. لە کانونی یەکەمی ١٩٩٣دا یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوەی چەکداری لە نێوان هەر دوو حزبە کوردیە ڕکابەرەکە ڕوویدا .

هەوڵی زۆر بۆ ڕاگرتنی شەڕدرا. بەڵام زۆری نەدەخایاند، لە کانونی یەکەمی ١٩٩٤دا هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەستیان بەسەر هەولێرداگرت و کاری ئیدارەی ناوچەکە وەستا. وا دەرکەوت هەوڵی لایەنە دەرەکیەکان بە تایبەتیش ئەمەریکا بۆ چارەسەری کێشەکانی نێوان هەردوولا سەرکەوتوو نەبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٥ ژمارەی کوژراوان لە شەڕی پچڕپچڕی نێوان هەردوولا گەیشتە هەزاران کەس. سەرەڕای تێچووی گیانی و ئابووری وا دەرکەوت هەر دوو حزبەکە توانای چارەسەرکردنی کێشەکانیان نیە، بەڵکو بەردەوامبوون لە وروژاندنی خاڵەکانی ناکۆکی نێوانیان و چارەسەرکردنی بەزەبری چەك. لە ژێر سایەی ئەو بارودۆخە گومانی تێدانەبوو کە هەردوو حزبەکە بە دوای هاوپەیمان لەدەرەوەی ناوچەی کوردیەکەدا دەگەڕێن، لە سەرەتادا پارتی دیموکراتی کوردستان ڕوویکردەوە تورکیا و یارمەتی بۆچەند شەڕێکی چڕو درێژخایەن دابینکرد کە تیایدا سوپای تورکیا لەو ساڵانەدا هەوڵیدا پێگەکانی بزوتنەوەیەکی جوداخوازی ڕادیکاڵی لە تورکیا لەناو ببات. کەچی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕووی کردە ئێران، سەرەڕای گومانەکانی پێشوو، بەو سیفەتەی هێزێکی خاوەن پێگەی باشترەو بۆ ئەوەی یارمەتی ڕاستەوخۆی بدات.

بەڵام هەردوو حزبەکە بێئاگانەبوون لە هێشتنەوەی کەناڵێکی کراوە لەگەڵ بەغدا. ئـەوەش زۆرجـار سـودی زۆری بـە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان گەیانـد کاتێـك هێزەکانی ئێران لە هاوینی ١٩٩٦ هاتنە نێو خاکی یـەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان بـۆ راوەدوونـانی یەکـەکانی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران وەردەگرێـت (بزوتنەوەیەکە داوای حوکمێکی زاتی کوردی لە ئێران دەکات). پـارتی دیمـوکراتی کوردستان یەکێتی نیشتمانی کوردستانی تۆمەتبار کرد بەوەی یارمەتی سـەربازیی ئێران وەردەگرێت، بۆیە روویکردە بەغدا و داوای یارمەتی سەربازیی لە حکومـەتی عێراق کرد. لە ماوەیەکی کورتدا ٣٠ هـەزار سـەربازیی عێراقـی چـوونە نێـو خـاکی کوردستان و یارمەتی پارتی دیموکراتی کوردستانیاندا لە وەرگرتنەوەی هەولێر لـە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هاوکات رژێم هەلەکەی قۆستـەوە و هەڵمـەتێکی بـۆ دەسـتگیرکردنی نـەیارەکانی دەسـتپێکرد کـە رایـانکردبووە ئـەوێ. سـەرەڕای کشانەوەی زۆربەی هێزەکـانی سـوپای عێـراق دوای دوومـانگ. بـەڵام سـەدام بـەو هەنگاوە ویستی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستان دووپات بکاتـەوە. لـە راسـتیدا جموجۆڵەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان نەك تـەنها سـەختی جیابوونـەوەی لـە چاودێری دەسەڵاتی مەرکەزی دەوڵـەتی عێـراق دەرخسـت- هەرچـەندە قـەوارەی ئـەو دەسـەڵاتە بچـوکیش بێـت- ئـەو هەڕەشـانەی لـەکاتی پرۆسـە سـەربازییەکە ئەمەریکا ئاراستەی کرد نەیگەڕاندەوە، بەڵکو لە جیاتی ئەوە توانی رێکخراوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی ببینێت کە لە کوردستان کۆببوونەوە، کەچۆن پـەرت و بـڵاو دەبن. سەرەڕای ئەوەی ئەمـەریکا ٥ هـەزار عێراقـی کـورد و غـەیرە کـوردی بـردە ئەمەریکا بەو پێیەی مەترسی هێزەکانی عێراقیان لەسەر بوو.

ئەمەریکا نیگـەران بـوو لـەوەی سـەدام جـارێکی دیکـە جێـی دەسەڵاتی خـۆی لـە کوردستان کردەوە، هەوڵیدا هەردوو حزبەکە ئاشت بکاتەوە لە ئاکامدا لە تشـرینی یەکـەمی ١٩٩٦دا رێکـەوتنێکی لێکەوتـەوە کـە چـەند دەسـتەواژەیەکی نیازپـاکی لەخۆ دەگرت، بـەڵام رەوشـەکە لـە کوردسـتان وەکـو خـۆی مایـەوە. ناکۆکیـەکان لەسـەر داهـات و خـاك و هاوپەیمانیەتیـەکان کەلەگـەڵ بەغـداو ئەنقـەرە و تـاران

گرێدرابوون ناکۆکیەکانی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی خستە ڕوو و شەڕێکی وێرانکاری لێکەوتەوە کە ناوەناوە ئاگربەستیش رادەگەیەنرا. ژمارەی قوربانیەکان زیادیکرد و ئیدارەی پەکخست وا پێدەچوو هەموو هیوایەك بۆ دامەزراندنی ناوچەیەکی کوردیی یەکگرتووی نمونەیی لە دەستدەرچوو. بەلام بەو پێیەی ئەمەریکا بەردەوام بە درێژایی ئەو سالانە پابەند بوو بە دامەزراندنی ناوچەیەکی حوکمی زاتی کە لەتوانایدا بێت بەردەوام بێت لە کوردستانی عێراق. هەروەها بەو پێیەی بەردەوام هەولیدەدا حکومەتی عێراق رابگرێت و ئیحتیوای بکات. وازی لە دۆزی کورد نەهێنا، هەروەك چۆن رووداوەکانی سالی ١٩٩٦ سەلماندی بەردەوامی شەڕی ناوەخۆی کورد نەك هەر هەرەشەی گەرانەوەی هێزەکانی بەغدای بە زەبری هێز بۆ کوردستان دەکرد بەلکو دەرکەوت هانی دەستێوەردانی ئێرانیش دەدات . دوای ئەو تەنگژانەی لەگەل عێراق هاتنە ئاراوە سەبارەت بەپشکنینی چەك لە کۆتاییەکانی سالی ١٩٩٧ و سەرەتای ١٩٩٨. ئیدارەی ئەمەریکا بینی زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە زۆر پێویستە سەر لەنوێ حکومەتێکی یەکگرتوو لە کوردستانی عێراق دابمەزرێتەوە. میانگیری و فشاری ئەمەریکای چڕوپڕ بۆ دواجار لە ئەیلولی ١٩٩٨دا رێکەوتنی واشنتۆنی لێکەوتەوە. کە بەپێی رێکەوتنەکە بارزانی و تالەبانی بە دابەشکردنی دەسەلات لە ناوچەکە رازیبوون. هەردوولا رێکەوتن پەرلەمان دەست بە دانیشتنەکانی خۆی بکاتەوە و هەلبژاردنێکی نوێ بەپێی چەند مەرجێك ئەنجامبدرێتەوە لەوانە داهاتەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان حەوالەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بکرێت، هێزێکی ئەمنی یەکگرتوو پێکبهێنرێت. بەلێندان بە چارەسەرکردنی سەرجەم کێشە هەلپەسێردراوەکانی تایبەت بە زەوی و زار مولکەکان.

لە رووی ژێرخانەوە، هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر ناوچە کوردیەکاندا نەهات . پەیوەندی هەردوو سەرکردە مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی و حزبەکانیان وەکو خۆی مایەوە. هەروەها پشتبەستنی هەردوو حزب بە ژێرخانە کۆمەلایەتیە

جۆراوجۆرەکان لە بەشەکانی باکوور و باشووری ناوچە کوردیەکان بەردەوامبوو. بە شێوەیەکی گشتی رەوشەکە لەناوچەکە بە شێوەیەکی لەرزۆك پشتی بە هێزە دەرەکیەکان دەبەست. لەگەڵ کەمی دەرامەتەکان، دەبوایە ئەوەندەیان بەس بێت کە هێزەکان و ئاژانسە دەرەکیەکان یارمەتیان بدەن. یا پشت بەو باجانە ببەستن کە حزبە کوردیەکان دەتوانن بەسەر بازرگانیە رێگە پێدراو ورێگە پێنەدراوەکان کە بەنێو خاکەکیاندا تێپەڕ دەبێت بسەپێنن. هەموو پرسەکە بەند بوو بە بارزانی و تاڵەبانی و پابەندبوونیان بە رێکەوتنامەی واشنتۆن، ئەوەش مانای وەستانە بەرووی دوو شتی وروژێنەر ، یا تۆڵە سەندنەوە یاخود هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی نوێی راستەوخۆ و کورتخایەن. ئەوەش بە تەحەدایەك لەقەڵەمدەدرێت بۆ تۆماری هەردووکیان .

پرسی کورد هاوشانە، بەڵکو تێکئالاوە بە مەسەلەیەکی گەورەتر ، کە خۆی لە ناسنامە عێراقیەکان و سستەمێکی سیاسی دەبینێتەوە کە دەکرێ لەسەر بنەماکەی بنیاد بنرێت. رێکەوتنی واشنتۆنیش لە دوو خاڵدا ئامارەی پەوەداوە . لەپێگەی یەکەمدا ، رێکەوتنەکە بەئاشکرا دان بە پێکهاتەی فرە ئیتنی ناوچە کوردییەکان و، دواتریش لە هەموو عێراق بەگشتی ناوە، خەون و ئارەزووی گروپەکانی وەك تورکمان و ئاشوری و کلدانەکانیشی وەکو هی کورد ئەژمار کردووە. لە هەمان کاتدا. دەبێ هەموو حزبەکان پابەند بن بەیەکپارچەیی و یەکگرتوویی خاکی عێراق، بەڵام لەسەر بنەمایەکی سیاسی فرەیی و دیموکراتی فیدراڵی. ئەوەی پەیوەست بێت بەلایەنی فیدراڵی. ئەوە ئارەزوویەکی کۆنی سەرکردە یەك لەدوای یەکەکانی کورد بوو ، کە هەر هەموویان هەوڵیان بۆ جۆرێك لە سەربەخۆیی زاتی دەدا لە چەپۆکی توندی بەغدا بەڵام ئەو ئەوەی پێنەبەخشین. سەربەخۆییەکەی ئەمری واقیعیش کە لە دەرەنجامی رووداوەکانی ١٩٩١ هاتە ئاراوە رێگەی بە دەرکەوتنی شێوازی جودا لە رادەربڕینی سیاسی دا. هانی دروست بوونی حزبی وایدا کە پشت بە هێزی ناسنامەی ئیتنی و مەزهەبی دەبەستێت، وەك سێ حزبە تورکمانیەکە سەرباری حزبە ئاشوریەکان. هەروەها

هانی پێکهێنانی هاوپەیمانیەکی فراوانتریدا کە هەندێك لە حزبە عێراقیەکانی دژ بە سەدام حوسێنیشی لە خۆگرت .

## کەم وکورتیەکانی ئۆپۆزسیۆن

شکستی شۆرشەکانی ١٩٩١ و خۆ قایمکردنی رژێم لە بەغدا نەیارانی سەدام حوسێنی لە دەرەوەی ولات هاندا بیر لە هەمەهانگی هەولەکانیان بکەنەوە. حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن کە بە پارچە پارچەیی و دوژمنایەتیکردنی یەکدی ناسراوبوون، دەربری زۆر لە مێژووی عێراقی سیاسی پر لە پشێوی و گیروگرفت بوو. لە راستیدا ژێرخانی ئایدۆلۆژی کە لە رووالەتدا بواری ئاشتبوونەوەی تێدانیەو ئەو کەسایەتیە خاوەن دەسەلات و مێژووی پر لە دوژمنداری و خیانەت سەرباری زۆر لە گروپە ئیتنی و مەزهەبیەکان شایەدێکی زیندووبوون لەسەر ئەو خوێندنەوانەی سیاسەتی عێراقی کە رکابەری یەکتر دەکەن و کە خوێندنەوەکەی سەدام حوسێن و رژێمەکەی هەمووی لاداو هاتە جێگایان . کەمتوانایی ئەو گروپانە لە دانانی ستراتیژیەتێکی یەکگرتوو لە میانەی قەیرانەکەی ١٩٩٠-١٩٩١. دواتریش لە پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو وەك دیالۆگکار لەگەل ئەمەریکا و ولاتانی دیکەی دژ بە عێراق بێ گومان هاوکار بوون لە شکستهێنانی رێکەوتنەکان، لەبەر هیچ نا تەنیا رارایی هاوپەیمانانی لە دەست تێوەردان لە بەرژەوەندی شۆرشگێران زیاتر کرد . لەبەرامبەر ئەو رابوونەی کە لەو ئەزموونە کەوتەوە لەگەل ئەو جۆشەی کە لە دەرەنجامی بوونی ناوچەیەکی کوردیی سەربەخۆ بە (ئەمری واقیع). حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن رازی بوون ناکۆکیەکانیان هەلپەسێرن و لە ڤیەننا لە حوزەیرانی ١٩٩٢ کۆببنەوەو کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی گرێبدەن و ببێتە چەترێك بۆ هاوکاری. لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٢ ئەندامانی کۆنگرەی ناوبراو لە شارۆچکەی پیرمام لە هەولێر کۆبوونەوە. ئەنجومەنێك دامەزرا، نوێنەری سەرجەم گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی لەخۆ گرت تەنها چەند گروپێکی بەعسی

جیابووەوەو نەتەوە خوازی عەرەبیە سوننە نەبن. لێژنەیەکی جێبەجێکردنیش هەڵبژێردرا و دووپات لەسەر سەرکردایەتی ئەحمەد چەلەبی کرایەوە. کە کەسێکی ئەکادیمی و شارەزای بواری بانکە و لە خانەوادەیەکی عێراقی شیعەی بەناوبانگە. هەرچەندە کە لەواشنتۆن رێزی خۆی هەبوو بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر حکومەت لە دەرەوەو ناوەوەی وڵات نەبوو.

هەر چەندە یەکەمجار بوو ئۆپۆزسیۆنی عێراق یەکبگرێت لەسەر خاکی عێراق لەوەتەی کودەتای بەعس لە ساڵی ١٩٦٨دا، بەڵام کۆنگرەی نیشتمانی عێراق هەر زوو خۆی بینیەوە لە سیاسەتی ئاڵۆز و پشێوی ناوچەی کوردی تێوەگلاوە. زۆربەی ئەندامەکانی پێکهاتبوون لە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان. بە گوتەی خۆشیان نوێنەری ژمارەیەکی زۆری گەلانی عێراقن و دەستیان بەسەر داهاتی دارایی و سەربازیدا گرتبوو. لەگەڵ پشێوبوونی پەیوەندی نێوانیان و لاگیری حزبە چەپڕۆکان و بزوتنەوەی ئیسلامی شیعە، وای لێهات زۆر ئەستەم بێت پروپاگەندەی ئەوە بکرێت کۆنگرەی نیشتمانی عێراق بەیەك دەنگ قسە دەکات. چەلەبی و ئەندامە چالاکەکان لە لێژنەی جێبەجێکردنی کۆنگرەی نیشتمانی هەوڵیاندا میانگیری بکەن بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان. ئەوەی مایەی پێکەنین بوو، خۆیان بینیەوە ئەو چەند یەکە سەربازییە بچوکانە بەکاردێنن کە لە ژێر فەرمانیان دانرا بوون بۆ لێکجوداکردنەوەی میلیشیا چەکدارەکانی سەربە حزبە کوردییە شەرکەرەکان. بە هاتنی ساڵی ١٩٩٥ لەگەڵ هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شەڕیان بەرامبەر هەندێك لە یەکەکانی سوپای عێراق دەکرد. بەڵام سەرکەوتنەکانیان زۆری نەخایاند. پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی دیکەش کۆنگرەی نیشتمانی عێراقیان بە ناڤبەرێکی بێ لایەن لەقەڵەم نەدەدا. کاتێك پارتی دیموکراتی کوردستان داوای لە هێزەکانی عێراق کرد بگەڕێنەوە ناوچەی کوردی لە ساڵی ١٩٩٦. نووسینگەکانی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی لە هەولێر و پیرمام و ناوچەکانی دیکەی سەربە پارتی دیموکراتی کوردستان کەوتنە ژێر پشکنینێکی

ورد، هێزە ئەمنیەکانی عێراقیش هەموو ئەندامەکانی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقیان کوشت کە نەیانتوانی بوو رابکەن.

لەگەڵ روو لە کزبوونەوەی توانای کۆنگرەی نیشتمانی عێراق لە قسەکردن بەناوی سەرجەم هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن، کۆنگرەش بووە گروپێك وەك هەر گروپێکی دیکە دووچاری سەرجەم کێشەو بێئومێدیە گرێدراوەکان بەرێکخستنی ئۆپۆزسیۆنێکی چالاك لە دوورخراوەیی دژی رژێمی عێراق بۆوە . گۆرانکارییەکانیشی ئەوە دەردەخەن کە رێکخستنی سیاسی لە سایەی رژێمی سەدام حوسێندا کارێکی زۆر ئەستەمە. یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی سەدام لە ماوەی ساڵانی حوکمکردنیدا ئەوەبوو کە تاکو بکرێت لەوانەی راستەوخۆ پشتی پێوە دەبەستن کەس نەتوانێت هەلێك بۆ بوارێکی سیاسی و میللی کاریگەر بدۆزێتەوە و رێکخستنی تێدا بکات. ئەمەش بەزۆر شێوە دەربری تێروانینی سەدامە بۆ سستەمی گونجاو بۆ کۆمەڵگای سیاسی ، ئەو سستەمە هیچ بوارێکی بۆ ئەو کەسانە نەهێشتەوە کە خەون بە حوکمی فرەیی و لامەرکەزیەت و کرانەوەی زیاتر لە عێراق دەبینن . رەنگە ئەوانەی خاوەن ئەو رایە بوون لە کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی لەسەرەتادا هیوایان وتبوو ئەو بوارە لە ناوچە کوردیەکەدا بدۆزنەوەو رەنگە رێکەوتننامەی واشنتنیش کە لەساڵی ١٩٩٨ ئەنجامدرا ئەو خەونانەی زیندوو کردبێتەوە بەلام ئەزموونەکانی ساڵانی رابردوو ئەو جۆرە خەونانەی لەناوبردن .

ئەو خەونانە لەبیری گردبوونەوەیەکی گەورەی دیکەی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆندا نەبوو ، ئەویش ویفاقی نیشتیمانیە . ئەو رێکخراوە کە ساڵی ١٩٩٠ دەرکەوت و لەژمارەیەك لەو کەسانە پێکهاتبوو کە خۆیان لە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بە دوورگرتبوو، تێروانینان بۆ عێراق تا رادەیەك لە تێروانینی سەدام حوسێن نزیك بوو. لە ئاکامدا وا مەزەندەکرا هەلی زیاتری لە پێشە بۆ گۆرینی رژێمی بەغدا. ویفاقی نیشتمانی کە ئەیاد عەلاوی سەرۆکایەتی دەکرد توانی ئەو کەسایەتیانە بۆخۆی رابکێشێت کە لە حزبی بەعس جودا ببوونەوە، هەروەها ژمارەیەك لەو کەسانە بۆخۆی رابکێشێت کە لە بازنە کۆمەڵایەتیەکانی رژێم هەڵگەرابوونەوە. بە

تایبەتیش عەرەبی سوننەی باکوری رۆژئاوا کەلە دەزگاکانی ئەمن و ریزەکانی ئەفسەران زۆرینەیان پێکدەهێنا. ستراتیژیەتی سەرەکی ویفاقی نیشتمانی کە بارەگاکەی لە دیمەشق بوو دواتر لە عەمان بریتیبوو لە هەوڵدان بۆ رێکخستنی کودەتا لە نێو دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقی کە سەدام پشتیان پێدەبەستێت. ئێستگا بەکارهێنرا بۆ بلاوکردنەوەی پەیامی لیبرالی بەگشتی و نەتەوەیی لەناو عێراق. بەلام چاکترین هۆکار بریتیبوو لە قۆستنەوەی پەیوەندییەکانی خزمایەتی و پەیوەندیە نافەرمیەکان لە نێو ریزەکانی سوپای عێراق بۆ جێبەجێکردنی کودەتا لە دژی سەدام حوسێن. بەلام هەوڵەکانی شکستی هێناو دەبوایە لە هاوینی ساڵی ١٩٩٦رووبەرووی بێ ئومێدی و دەستگیرکردنی لایەنگرانی و لە سێدارەدانیان ببێتەوە . هەروەك چۆن کۆنگرەی نیشتمانی عێراقیش نەیتوانی بوارێکی سیاسی گرنگ بۆ رێکخستن بەدەست بێنێت. هەروەها ویفاقی نیشتمانیش ناچار بوو دان بەوە بنێت کە تۆرەکانی ئەمنیی سەدام حوسێن وادەکات هەموو هەوڵێکی کاریگەری پیلان گێران لەنێو رێزەکانی سوپا ببێتە سەرکێشیەکی ترسناك و دەرەنجامەکەشی مردن بێت. نەك هەر ئەوە بەڵکو بۆی دەرکەوت کە کۆچکردن و دووره ولاتی رەنگە ئەو پەیوەندیانەش ببرێت کە کودەتایەکی سەرکەوتوو پشتی پێ دەبەستێت .

ئەوە ئەو کێشە بوو کە رووبەرووی ئەو کەسانە دەبوووەوە کە دەیانویست رێکخستنێك دژی سەدام حوسێن دابمەزرێنن. لە راستیدا ئەو رژێمە پتەو نەبوو. بەلام بە شێوەیەك بونیاد نرابوو ئەو کەسانەی دێنە ناوی لە دەزگا سەرەکیەکانی دەسەلاتی دەولەت دوور دادەنرێن. بۆ ئەوەی بە تەنیا بەدەستی سەدام و ئەو ژمارە کەمەی کە متمانەی پێیانە بمێنێتەوە. کەچی ئەوانەی دەیانویست دژی سەدام جموجۆڵ بکەن هیچیان دەست نەکەوت تەنها چەند هەلێکی لاواز بۆ سەرکەوتن نەبێت. لەوانەش ئەمەریکاو ئەوانەی دیکە کە ئارەزووی خۆیان نەدەشاردەوە بۆ رووخانی رژێمەکەی سەدام . ئەم رووخاندنەش سەری نەگرت کە پێشبینیە سەرەتاییەکان لەسالانی یەکەمی سەپاندنی سزا ئابوریەکان موژدەیان

پێدا. هەروەها هێرشە ئاسمانیەکان و موشەکە ئاڕاستە کراوەکان کە ناوە ناوە هێزەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا دەیان وەشاند لە لاوازکردنی چەپۆکی ڕژێم سەرکەوت و نەبوو. دەرچوونی بڕیاری ئازاد کردنی عێراقیش لە کۆنگرێسی ئەمەریکا لە پایزی ساڵی ١٩٩٨ کە سەد ملیۆن دۆلار تەرخان دەکات بۆ یارمەتیدانی گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی و عێراقی ، زیاتر لە دەستپێشخەرییەکی ڕەمزی دەچوو نەك لە ستراتیژیەتێکی دیراسەتکراو بۆ گۆڕینی ڕێچکەی مێژووی عێراق.

## لە نێوان دووبارە ئامادە کردنەوەو دەستێوەردانی بیانی

لە ساڵانی دوای دەرچوونی یاسای ١٩٩٨. پرسی ئەوەی کە کێ دەتوانێت ڕێچکەی مێژووی عێراق بگۆڕێت زیاتر جەختی لەسەر دەکرایەوە. ئەوەش تا ڕادەیەك بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کەدرك بەوە دەکرا کە بڕیارەکانی UN کە کۆنترۆڵی پەیوەندییەکانی عێراقی لەگەڵ جیهانی دەرەوە کردبوو لەگەڵ ئەو ڕەوشە ناگونجێت کەلەو کاتەدا عێراق تێیدابوو. سەرسەختی ڕژێمی عێراق و مرونەتەکەی و گەڕانەوەی عێراق وەك بەرهەمهێنەرێکی سەرەکی نەوت و هێزێکی ئابووری گرنگی هەرێمی، لەگەڵ سزا سەپێنراوەکانی سەری لەساڵی ١٩٩١ەوە دژ بەیەك بوون بەڵام خستنە ڕووی پرسی ئایندەی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕینی هەڵوێستەکان لە هەمبەریدا. نەك هەر لەسەر ئاستی ناوچەکە بەڵکو لە سەر ئاستی جیهانیش، بە تایبەتیش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

لەکۆتایی نەوەدەکان، هاودژیەك لە نێوان کۆت و بەندە سەپێنراوەکانی سەر سەروەری و بازرگانی کە لە ڕێگەی سیستەمی سزاکانەوە سەپێنرابوون و ڕەوشی ئابووری ئەو کاتی عێراق هەبوو. بەپێی بەندە خاوو پێ بە پێکانی بڕیاری "نەوت بە خۆراك" عێراق جارێکی دیکە بووە بەرهەمهێنەرێکی گرنگی نەوت. لە ساڵی ٢٠٠١–٢٠٠٢ ڕۆژانە ٢.٨ملیۆن بەرمیل نەوتی بەرهەم دەهێناو بڕی ١.٧ ملیۆن

بەرمیلی هەناردەی دەرەوە دەکرد. دوای یەکلاکلادنەوەی رێژەی چەسپاو بۆ رووماڵکردنی قەرەبووی جەنگ و خەرجییەکانی UN و حەواڵە کردنی ١٣ لە سەدای داهاتەکان بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان. حکومەت رێژەی ٥٠ لەسەدای بە دەست دەمایەوە بۆ خەرجکردنی لە هاوردەکردن. هەروەها ئەو باجەش دەخرایە سەر داهاتەکان کە حکومەت بەسەر کڕیارانی نەوتی سەپاندبوو، سەرەڕای هەناردەکردنی نەوت بە شێوەیەکی نیمچە نهێنی لە دەرەوەی چاودێری UNلە رێگەی تورکیا و ئێران و ئوردن و سوریاوە، دوای جارێکی دیکە کردنەوەی بۆڕییە نەوتی سوریا لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٠. ئەو پرۆسانە نزیکەی ٢ ملیار دۆلاری لە ساڵێك داهاتبوو.

چالاکی ئابووری کە لەو داهاتە کەوتبووە و جۆراوجۆریی تواناکانی هەناردەکردن وایانکرد عێراق جارێکی دیکە بیێتەوە تەوەری بازرگانی هەرێمی. سەرەڕای ژمارە گرنگەکانی پەیوەست بە کەل و پەلی هاوردە کە لێژنەی سزاکانی UN وەستاندبووی لە ساڵانی دوای جێبەجێکردنی بڕیاری ٩٨٦ ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی (کە بڕەکەی دەگەیشتە نزیکەی ٤ ملیار دۆلار لە کانونی دووەمی ٢٠٠٢)، لە هەمان کاتدا رەزامەندی لەسەر چەند بۆندێك درا بەبڕی ٣٠ ملیار دۆلار. کۆمپانیاکان و وڵاتەکان کەتا ئەو کاتە بە ئاگادارییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ چوونە نێو بازاڕی عێراقی دەکرد. جارێکی دیکە گەڕانەوە نێو ئەو بازاڕە، نەیانتوانی بەرگەی ئەو هەموو هەل و هاندانە بگرن کە حکومەتی عێراق پێشکەشی دەکرد بۆ ئەوەی تێکەڵ بە سیستەمی جیهانی بیێتەوە. بۆنە ساڵانەییەکانی وەك پێشانگای بازرگانی بەغدا سەرنجی ژمارەیەکی زۆری بەشداربووانی رادەکێشا کە ژمارەیان گەیشتە نزیکەی ١.٦٠٠ کۆمپانیاو ٤٧ وڵات لە تشرینی دووەمی ٢٠٠١دا. بە گوێرەی هاوڵاتیانی ئاسایی عێراق بەلانی کەم ئەوانەی لە شارە گەورەکان دەژیان، وای لێهات کەلوپەلێکی ئێجگار زۆر لە بازاڕەکان بە نرخێکی گونجاو دەستیان دەکەوت. بەڵام سەبارەت بە حکومەتی عێراق ئەوە بووە دەسکەوتێکی سیاسی و زیاتر لە چەند مانایەکی بەخشی.

لەگەڵ زیادبوونی داهاتەکانی، هاندرا بۆ ئەوەی پرۆتۆکۆڵی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و سێ وڵاتی ئەندامی هەمیشەیی لە ئەنجومەنی ئاسایش روسیا، فەرەنسا، چین گرێبدات، تاکو پشکێکیان لەبازارەکانی عێراق پێببەخشێت .

لاوازی سیستەمی سزاکان و ئەنجامە سیاسیەکانی کە بەروونی لە ناوچەکەو UN دیاربوون، جیاوازیەکی دیکەی خستەڕوو. ئەو جیاوازییە لە دەرەنجامی ئامانجێکی سیاسی دروستبوو کەلەپەنای سزا ئابوریەکانەوە بوو ناوە ناوەش گوتەبێژانی بەریتانیا و ئەمەریکا بەراشکاوی دەریان دەبڕی. ئەوەش ئەو رۆڵە بوو کە هیوادار بوون لە رێگەی جێبەجێکردنیەوە سەدامی پێ بروخێنین و رژێمەکەی نەهێڵێن. بەلام وا دەرکەوت سزاکان کاریگەریەکی پێچەوانەی دروست کردووە. تۆڕە سەرکوتکارییەکانی بۆ ماوەیی لە دەوڵەت لە سەر ئاستی مادی و پڕکردنی هەستی هاریکاری لە ژێر گەمارۆدا جێی پێی خۆی قایم کرد. ئەو هەستانەش دەرەنجامی جەنگی ئێران بوون لە ساڵانی هەشتاکان. هەروەها سزاکان رێگەیان لە حکومەتی عێراق نەگرت کە دامودەزگایەکی سەربازیی زۆر گەورە بهێڵێتەوە . سەرەڕای بچوك بوونەوەی لە رووی قەوارە و چەك لەناوەخۆدا، بەلام هەر بە مەترسیداری مانەوە. هاوکات مەترسی گەورە لەوە دابوو کە رەنگە سەدام بەرنامەی پەرەپێدانی چەکی کۆکوژی دوای رۆیشتنی پشکێنەرە نێودەوڵەتیەکان لە ساڵی ١٩٩٨ پەرەپێبداتەوە. سەرەرای ئەو سزایانەش کە بەسەریدا سەپێنرابوو.

وای لێهات ئەو ئاستەنگانەی لەو شتە هاودژانە کەوتبوونەوە زۆر روون بوون لەو رێوشوێنانەی کە UN و ئەمەریکا (کە نیگەران بوو لە گەرانەوەی عێراق وەکو هێزێکی هەرێمی جارێکی دیکە سەرهەڵبداتەوە)پەیرەویان دەکرد. لە ١٧ کانونی یەکەمی ١٩٩٩دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بریاری ١٢٨٤ی پەسندکرد، بەلام چوار دەوڵەت رەزامەندییان لەسەرنەدا، لەوانەش سێ دەوڵەتیان روسیا و فەرەنسا و چین ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بوون. بریارەکە هەوڵێك بوو بۆ ئەوەی سەر لەنوێ سیستەمێکی کاریگەر بەسەر چەکی عێراقدا بسەپێنێت. بریارەکە هەوڵیدا هاوکاری حکومەتی عێراق لە رێگەی

پێنیشـاندانی مەسـەلەی هـەڵگرتنی سـزاكانی سـەری ئەگـەر بێتـوو ڕێگـە بـدات سیسـتەمی چـاودێری بخرێتـە واری جێبـەجێكردنێكی تـەواو بەدەسـت بێنێـت. سەرەڕای بەڵێندان بـەخێرایی گەیشـتنی كەلوپـەل بـەپێی بڕیـاری ٩٨٦ كـە لـە ئەنجوومەنی ئاسایشـەوە دەرچـوو بـوو و ڕێگـەدان بـە نوێكردنـەوەی پیشەسـازی نەوتی عێراق. دواتر ئاژانسێكی تازە دامـەزرا بـۆ ئـەوەی شـوێنی لێژنـەی تایبـەتی داماڵینی چەك بگرێتەوە. ئەویش لێژنەی چاودێری و لێكۆڵینـەوەو پشـكنینی سـەر بە UN بوو.

ئەوەندە بەس نـەبوو بـۆ ڕازیكردنـی حكومـەتی عێـراق بـۆ ئـەوەی جـارێكی دیكـە ڕەزامەندی لەسەر گەڕانـەوەی پشـكنەران بـدات. عێـراق بڕیارەكـەی ڕەتكـردەوەو پڕوپاگەندەی ئەوەی كرد بڕیارەكە عێـراق دەكاتـە ناوچـەیەك بەدەسـت UN ەوە ،هـەروەها نـاڕەزایی دەربـڕی لەبـەر ئـەوەی بڕیارەكـە لـە جیـاتی ئـەوەی بـەڵێنی ڕاستەوخۆ و بەبێ مەرجی هەڵگرتنی سـزاكان بـدات وەك ئـەوەی عێـراق چـاوەڕێی دەكرد، عێراقی خسـتە ژێـر تاقیكردنـەوەو ڕێگەیـدا بـە گەڕانـەوەی سـزاكان دوای هەڵگرتنی ئەگەر بێتوو ئەنجومەنی ئاسایش گومان لە هەڵسوكەوتی عێراق بكـات . هەروەها حكومەتی عێراق ڕازی نەبوو چیدیكە بەبەردەوامی UN كۆنترۆڵی داهـاتی نەوتی عێراق و سزای سەپێنراوی سەر كەلوپەلی سەربازیی بكات. ئەوەی عێراقـی بۆ ئەو هەنگاوە هاندا، دەنگنەدانی هەرسێ ئەندامە هەمیشـەییەكەی ئەنجوومـەنی ئاسایش بوو لەسەر بڕیارەكە. ناڕەزاییـان دەربـڕی و ڕێگـەیان بـۆ عێـراق كـردەوە تاكو تەحەدای بڕیارەكە بكات. گوتەبێژی حكومەتی عێـراق ڕایگەیانـد، عێـراق بـیر لەوە ناكاتەوە جارێكی دیكە ڕێگە بدات پشكنەرانی سەر بە UN بێنەوە عێـراق تـا ئەوكاتەی سزا نێودەوڵەتییەكان بەبێ مەرج لەسەریدا هەڵدەگیرێن. سـەبارەت بـە هەنـدێك كـەس. ئـەوە ئامـاژەدان بـوو بـەوەی كـە، بڕیارەكـە دوای بیركردنـەوەی پێویست دەرنەچووە و پێویستی بەدیراسەی زیاتر و بیركردنەوەی دیپلۆماتی یـە ، هەندێكی دیكـە پێیـانوابوو ئاماژەدانـە بەرشتبوونی عێـراق لەسـەر پـارێزگریكردن

لەوەی کە سەرکەوتوبووە لە شاردنەوەی لەچەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی لەماوەی نۆ ساڵی رابردووداو خەریکی پەرەپێدانی پرۆگرامی چەکی تازەیە.

عێراق رێگەی دیکەی بۆ تاقیکردنەوەی ئەنجوومەنی ئاسایش دۆزیەوە. لەماوەی ئەو ساڵەی کە بەدوای ئەوە داهات جەختی لەسەر کردنەوەی ئاسمانی عێراق کردەوە لەبەردەم فرۆکەوانیی مەدەنی. لە ئاداردا سەفەری ٢ هەزار حاجی عێراقی لە رێگەی ئاسمانەوە بۆ عەرەبستانی سعودیە رێکخست، بەوەش تەحەدای UN ی کرد کە رێگە لەو جۆرە گەشتانە بگرێت کە سیفەتی رەمزیان هەیە. کاتێك UN هیچ کاردانەوەی بۆ ئەو هەنگاوە نەبوو عێراق کردنەوەی فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی بەغدای راگەیاند. خۆی هاندا بۆ ئەوەی چەند گەشتێکی دیکە ئەنجامبدات لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٠، ئەو گەشتە یەك لایەنانە کە لە روسیا و فەرەنسا و چەند وڵاتێکی هەرێمی وەك سوریا و یەمەنەوە دەهاتن، لەرواڵەتەوە ئامانجی مرۆییان هەبوو. فرۆکەکانیان دکتۆر و کەلوپەلی پزیشکیان بارکردبوو. بەڵام لەهەمان کاتدا ئێش و ئازاری گەلانی عێراقی لەژێر کاریگەری گەمارۆدا خستە بەرچاوی رای گشتی. سەرەڕای ئەوەی ئەو گەشتانە سەرپێچی نەبوون لە سیستەمی سزا سەپێنراوەکانی سەر عێراق هاوکات چەند هێڵێکی ئاسمانیی هاندا کە گەشتی ئاسمانی رێکوپێك لە عێراق بۆ سوریا و میسر و ئوردن لە ساڵی دواتر ئەنجامبدەن. هەروەها نەبوونی قەدەغەی ئاسمانی رێگەی خۆشکرد حکومەتی عێراق گەشتە ناوخۆییەکانی لەناو عێراق دەستپێبکاتەوە.

ئەوەش سەرپێچی نەبوو لە بریارەکانی UN بەڵام سەرنج راکێش بوو و ئەرکی فرۆکە جەنگییەکانی ئەمەریکاو بەریتانیاشی کە چاودێری ناوچەی قەدەغەکردنی فرینی باکور و باشووری عێراقیان دەکرد تارادەیەك ئاڵۆزکرد. ئەو فرۆکانە ئەرکی خۆیان بە تەواوی جێبەجێدەکرد و تەحەداکردنی عێراق بۆیان و لە قەڵەمدانی بەوەی زێدەرۆییکردنە لەسەر سەروەریی عێراق ، لەماوەی ساڵانی ٢٠٠٠ و ٢٠٠١ چەند رووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازیی لێکەوتەوە. هێزە دژە ئاسمانییەکانی عێراق فەرمانیان پێدرا تەقە لە فرۆکە جەنگیەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بکەن،

لەو هەنگاوەشدا عێراق زیانی زۆری لێکەوت چونکە هێزەکانی هاوپەیمانان تۆڵەیان لە هێزەکانی عێراق دەکردەوە.

لەژێر سایەی ئەو رووبەڕووبوونەوە بەردەوامانە کە، هەر چەندە کاریگەرییان سنوردار بوو. هەوڵەکانی تێکەڵکردنەوەی ئابووری عێراق بەردەوام بوو و، سستەمی سزاکان نەماو عێراقیش رەتیکردەوە چیدیکە رێگە بە گەران بەدوای چەکدا بدات . ئەو رەوشە بەتایبەتی بۆ ئەمەریکاو هاوپەیمانە نزیکەکانی بووە هۆکاری ئەوەی دووچاری سەرئێشەیەکی گەورە ببنەوە. ئیدارەی سەرۆك کلینتۆن دانی بەوە نا هەرچەندە ئامادەکردنەوەی ئابووری عێراق فراوانتربێت ئەنجامدانی هەرکارێك بۆ ناچارکردنی بۆ بەجێبەجێکردنی بریارەکانی UN سەختتر دەبێت، لەراستیشدا بەهانەکانی دەستێوەردان بەشێوەی پێویست نەبوو . چونکە ئەزموونی ساڵی ١٩٩٦ کە تیایدا هەوڵەکانی هاندان بۆ ئەنجامدانی کودەتایەکی نێو خۆیی دژی سەدام شکستێکی گەورەی هێناو ، بیرۆکەی هەوڵدان بۆ گۆرینی رژێمی پەکخست.

لەو کاتەوە، ئەمەریکا دەستیکرد بە پاڵپشتیکردنی دارایی بۆ رێکخراوی INDICTی بەریتانی کە بەڵگەنامەی لەدژی فەرمانبەرانی عێراقی پایە بەرز کۆ دەکردەوە کە تۆمەتباربوون بە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ. لەپەنای ئەوەدا ئەمەریکا خوازیاربوو داوایەك لەدژی ئەو فەرمانبەرانە بەرز بکاتەوە. ئەگەر سەرپێچیان لە یاسای دەوڵەتی عێراقدا کردووە. یاخود هاندان بۆ دامەزراندنی دادگایەکی تاوانی سەر بە UN بۆ دادگاییکردنیان. هەرچەندە کە ئەنجامدانی ئەو کارەش گران بوو و . ئەگەرێکی دووربوو ، لەجیاتی ئەوە ئەمەریکا پشتی بەو هۆکارانە بەست کەرەوشەکە دابینیان دەکات، لە سزاکان و فرین لە ئاسمانی عێراق و پاڵپشتیکردنی بە ئاشکرای هێزە ئەمنییەکانی کوێت و سعودیە بۆ پتەوکردنی سیاسەتی ئیحیتواو گەمارۆدان. سەرەرای ئەوەی ئەمانە بەس نەبوون بەڵام کاریگەرتربوو و تێچووشی کەمتر بوو، لە هۆکارەکانی دیکەی کە لەئارادابوون بۆ رێگە گرتن لە عێراق کە نەبێتە هەرەشە بۆ سەر سستەمی

هەرێمی. دواتر بە پراکتیکی تارادەیەك دانی بە پێگەی سەدام حوسێن و تواناکانی و تێکەڵبوونەوەی بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی نا.

هەندێکی دیکە لە ئەمەریکا بەتایبەتیش لەحزبی کۆماری و کۆنگرێسدا، پێیانوابوو ئەو خاویە مایەی شەرمەزارییە و هیچ دووربینیەکی پێوە دیارنییە. سەبارەت بەوانە، " کێشەی عێراق" لە راستیدا بریتییە لە "کێشەی سەدام حوسێن". بۆیە رووخاندنی و دامەزراندنی رژێمێکی زیاتر نزیك لە ئەمەریکاو گونجانی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست تاکە رێگەی گونجاوە بۆ تێکەڵکردنەوەی عێراق بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و وەستان لە چیدیکە دانانی بە سەرچاوەی هەرەشەی سەربازیی. ئەوانە ئەو هێزە سیاسیە ئەمەریکیانە بوون کە کاریانکرد بۆ دەرکردنی بریاری ئازادکردنی عێراق سالی ۱۹۹۸ دژی ئارەزوەکانی سەرۆك کلینتۆن. ئەوەش دواتر بوە هۆکاری هەستکردن بەنائومێدی کە دەبینرا دابەشکردنی بەهوشیاری پارەو پول بەسەر سەرجەم گرووپەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی نەیتوانی ستراتیژییەتێکی هەڕەشەی راستەقینە بۆسەر رژێم پێکبهێنێت. لەگەڵ ئەو کاریگەریەش کەکۆنگرەی نیشتمانی عێراقی توانی لەوانەی بکات دوای ئەوەی شانۆی کارەکانی گواستەوە واشنتۆن، خودی ئەو کەسایەتیانە چوونە پاڵ هەڵمەتە سەرۆکایەتیەکەی بوش لە سالی ۲۰۰۰.

لەگەڵ سەرکەوتنی بوش لە هەڵبژاردنەکان و پێکهێنانی ئیدارەیەکی ئەمەریکی تازە لە سالی ۲۰۰۱، هەلێك بۆ ئەمەریکا رەخسا بۆ ئەوەی جارێکی دیکە نەخشەی سیاسەتی لەهەمبەر عێراق لە نوێوە دابرێژێتەوە. لە شوباتی ۲۰۰۱دا ئیدارەی تازە رشتبوونی خۆی نیشاندا، ئەگەر نەڵێین سیاسەتی خۆی گۆری لە رێگەی دەرکردنی فەرمان بەلێدانی پێگەکانی رادار و چەکی دژە ئاسمانی لە چوار دەوری بەغدا.

لە پرۆسەکەدا کە فرۆکەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا ئەنجامیاندا دامودەزگاکانی بەرگری ئاسمانی عێراق بۆردومان کران کە تازە بونیادنرابونەوەو ئەمەریکا و

بەریتانیا پاکانەی ئەوەیان هێنایەوە، کە رێکارێکی پێویستە بۆ پاراستنی فرۆکەکانی هاوپەیمانان کە چاودێری ئاسمانی عێراق دەکەن، بەڵام هێرشەکە مەبەستێکی سیاسیشی بەدەست هێنا، هێرشەکە سەرنجی بۆ ئەوە راکێشا کە عێراق سەرکەوتوو بووە لە نوێکردنەوەی توانا سەربازییەکانی لەژێر سیستەمی سزاکان و بووە هوشداریەکیش بوو بۆ ئەو وڵاتانەی بەنهێنی تەکنۆلۆژیای نوێ دەدەنە عێراق– لەوانەش وڵاتی چین. لەلایەکی دیکەوە. دەریخست ئەمەریکا سێ و دوو ناکات لەبەرکارهێنانی هێزی سەربازیی دژی عێراق ئەگەر هەست بکات دەبێتە هەرەشە بۆ سەر ئاسایشی ئەمەریکا. ئەوەش پەیامێکی گرنگ بوو چونکە سەرۆك بوش ویستی خۆی لە "لادان" ئیدارەی پێشوو دوور بخاتەوە.

لەژێر سایەی ئەو رووداوانەدا ئەمەریکا هەولیدا، بەهاوکاری بەریتانیای مەزن لەبەهار و هاوینی ساڵی ۲۰۰۱ چاکسازی لە سیستەمی سزاکان بکات کە UN بەسەر عێراقی سەپاندبوو، دواتریش سەر لەنوێ گەڕاندنەوەی پشکنەرانی UN بۆ عێراق. ئەو پلانەی (سزا زیرەکەکان) هەولیدا سیستەمی سزاکان باشتر بکات بە تەنیا قەدەغەکردنی هاوردە سەربازییەکانی پەیوەست بە ئامانجە سەربازییەکان و رێگەدان بە بازرگانی مەدەنی نارێکخراو لەگەڵ عێراقدا . و جەختکردنەوە لەسەر توانا سەربازییەکانی عێراق و سەر لەنوێ خۆ پڕچەك کردنەوە. ئەمەریکا و بەریتانیا هیواخواز بوون کۆدەنگییەك لەنێو ئەنجوومەنی ئاسایش دروستبکەن بۆ رووبەروو بوونەوەی عێراق لەبەرەیەکی یەکگرتوو بۆ داواکردنی رێگەدان بە گەرانەوەی لێژنەی چاودێری و پشکنینی سەربە UN و دەستپێکردنەوەی کارەکانیان. بەڵام رووبەرووی دوو گیروگرفتی سەرەکی بوونەوە کاتێك ویستیان پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ ئەو ئامانجە کۆ بکەنەوە. چونکە وڵاتە هەرێمییەکانی وەك سوریا و ئوردن و تورکیا لەو نرخە ترسان کە پێشبینی دەکرا بیدەن. بەهۆی ئەوەی بەشێك لە پێشنیازەکەی بەریتانیا و ئەمەریکا توندکردنی چاودێریکردنی ئەو کەلوپەلانەی لەخۆگرتبوو کە لەرێگەی خاکی ئەوانەوە دەچووە عێراق و

ئەوەش سنوردانانێك بوو بۆ ئەو بازرگانییە ناشەرعیە پـر قازانجـەی کـە لـەماوەی ساڵانی رابردوو لەگەڵ عێراقدا پەرەی سەندبوو.

بەڵام ئاستەنگی دووەم بریتبوو لەوەی روسیا بە بەندەکانی بڕیارەکە رازی نـەبوو، لەوانە ئەو لیستە درێژەی کەلوپەلەکان کە دەکرێت لەبواری سەربازیی بـەکار بێـت و پێش هێنانیان پێویستە عێراق رەزامەندی UN ی لەسەر وەربگرێـت. سـەبارەت بـەعێراق ئـەو کۆسـپانەی پێشـنیازەکە خستبوویەسـەر بازرگـانی، سـەرەرای هەرەشەی بەدانانی سـنورێك بـۆ پرۆسـەکانی قاچاغچێتی کـە رژێم بەبـەردەوامی ئەنجامیدەدا لەگەڵ بەردەوامیی کـۆنترۆڵکردنی UN بـۆ داهاتـە نەوتییـەکانی، وای لێکرد بوو بەتـەواوی رەتکراوەبێـت. بـەڵام نـارەزایی هـەرێمی و هەرەشـەکردن بـە ڤیتۆی روسی لە ئەنجوومەنی ئاسایش بوونـە هـۆی ئـەوەی لەناوەراسـتی هـاوینی ۲۰۰۱ واز لەگەیشتن بەکۆدەنگی بهێنن . بۆیە جارێکی دیکە رێو شـوێنەکانی نـەوت بەرامبەر خۆراك نوێ بووەوە، دواتر لەمانگی ئابدا هێرشێکی ئەمەریکا و بـەریتانیا بۆ سەر سیستەمی بەرگری ئاسمانی لە باشووری عێراق بەدواداهات.

بەو شێوەیە دەرکەوت سیستەمی گەمارۆ و بۆردومانکردنی پچرپچر جارێکی دیکـە بـاڵی بەسـەر عێـراق دەکێشـێتەوە. لەگـەڵ ئـەوەش ، شکسـتهێنان لـە UN هـانی هەندێك لایەنی لەنێو ئیدارەی ئەمەریکا دا کە هەست بە پێویستی بەهۆکاری بەهێز تر و چەند لایەنە بکەن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی عێراق ئەگەر پێویست بکـات . ئەو گرووپـە کـە زۆریـەیان لـە پنتاگۆنـدابوون هـەر لـە مێـژەوە داوای روخانـدنی سـەدام حوسـێنیان دەکـرد بـەو پێیـەی کـە تاکـە هۆکـارە بـۆ لـەناوبردنی ئـەو هەرەشـەیەی کـەوا بـروا دەکرێـت عێـراق دروسـتی دەکـات . بـەڵام چـەند رایـەکی جیاواز لەبارەی باشترین رێگە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە لـە ئـارادابوو، لەوانـە هاندانی کودەتاکان لەنێو ریزەکانی سوپای عێراق تا داگیرکردنی سـەربازیی وڵـات بەسەرکردایەتی ئەمەریکا. لەراستیدا ئەو نێوەندانە بیرۆکەیەکیان هەبوو لەهەمبـەر بوونی حیساباتێکی هەڵپەسێردراو لەوەتەی جەنگی کەنداوی ساڵی ۱۹۹۱و دەکـرێ یەکلاییکردنەوەی دەست پێبکرێتەوە دوای تێپەربوونی نزیکەی دە ساڵ و بەهەمان

ئامرازەکانی پێشووش ، ئەوەش پەیوەندی نێوان زۆر لەلایەنگرانی ئەو نێوەندەی دەرخست بە ئیدارەی پێشووی سەرۆك بوشی باوك ، لەگەڵ ئەوەشدا وا دەرکەوت ئەو گیروگرفتە کردەییانەی کە کارێکی وا لەخۆیدەگرێت زۆر لەدەستکەوت و سودەکان گەورەرترە. جا ئارەزوی ئەوانە هەرچەند گەورەبێت بۆ رووخانی رژێمی سەدام حوسێن .

دوای هێرشە کارەسات ئامێزەکانی قاعیدە بۆسەر نیۆیۆرك لە ئەیلوولی ٢٠٠١دا ئەو تێڕوانینە گۆڕا. هەندێك کەس ئامادەبوون بۆ ئەوەی ببینن دەستی عێراق لەو رووداوەدا نامۆنییە و لەمەش پشتیان بە دوژمنایەتی بەناوبانگی عێراق بۆ ئەمەریکا و گومانیان لەوەی رەنگە دەزگا ئەمنییەکانی عێراق لەرابردوودا رێکخراوی ئیسلامیان بۆ هێرشکردنە سەر چەند پێگەیەك لە ئەمەریکا بەکارهێنا بێت بەست، زیاتر لە پشت بەستنیان بە بەڵگەیەك کە دەسەلاتدارێتی عێراق بەوکارانە ببەستێتەوە. لەژێر سایەی ئەو رەوشە پشێوە کە بەدوای ئەوەدا هات کاتێك بوش جەنگی لەدژی تیرۆر راگەیاند دەبوایە سەرکردایەتی عێراق بخرێتە ناو لیستی هەموو ئەوانەی هەستی رق و کینەیان دژی ئەمەریکا دەردەبڕی و سێ و دوویان نەدەکرد لەبەکارهێنانی هێز بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان . لە راستیدا سەدام حوسێن هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ ئەوەی گومانەکان لەسەر خۆی لابدات. ئەو نەك تاکە سەرکردەی عەرەبی بوو کە سەرەکۆنەی هێرشەکانی سێپتەمبەری نەکرد. بەڵکو ئامارەشی بەوەدا کە ئەمەریکا بەهۆی سیاسەتەکانی لەچەند ساڵی رابردوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خۆی ئەو کارەساتەی بەسەر خۆیدا هێناوە.

لەگەڵ بەردەوامیی نەبوونی بەڵگە سەبارەت بە بەستنەوەی عێراق بەو هێرشانە و جەختکردنەوەی ئەمەریکا لەسەر هەڵمەتە سەربازییەکانی لە ئەفغانستان، عێراق ئەو بایەخەی نەما. بەڵام زۆران لە ئیدارە، لەوانەش سەرۆك بوش پێیانوابوو (جەنگ لە دژی تیرۆر) ناوەڕۆکی زۆر دوور و قووڵی هەیە، هەر تەنها بە ریشەکێشکردنی قاعیدە کۆتایی نایەت. یاخود تەنها بە رووخانی بزوتنەوەی تالیبان لە کابوڵ کۆتایی نایەت. بەڵکو ئامانجەکەی ئەوەبوو دەربڕی تێڕوانینێکی

پڕ ئارەزووتربێت بۆ هێزی ئەمەریکا لە ڕێگەی قۆستنەوەی پێگەی ئەمەریکای باڵا دەست بەسەر سیستەمی جیهان بۆ گەرەنتیکردنی بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بەشێوەیەکی گشتی . لەو روانگەوە ئەو مەترسییەی کە هەڕەشە لەو بەرژەوەندییانە دەکات لەهەندێك لایەن سەرچاوەی گرتووە، کەنیاز و توانای هەیە هێرشی تیرۆریستی ترسناك وەك هێرشەکانی ۱۱ی سێپتەمبەر ئەنجامبدات. ئەو وێرانکارییە گەورە و ئەو هەموو قوربانییەی لەریزی هاووڵاتیانی سڤیل کەوت بەهۆی هێرشەکان بۆ سەر بنکەی بازرگانی جیهان، هاوکات بوو لەگەڵ مردنی چەند کەسێك بەهۆی ڤایرۆسی (الجمرة الخبیثة) کە لەرێی پۆستەی ئەمەریکاوە بۆیان رەوانە کرابوو بەکاتێکی کەم دوای ئەو هێرشانە. ئەوەش سەر لەنوێ ترسی ئەوەی هەڵگیرساندەوە رەنگە گرووپی تیرۆریستی چەکی بایۆلۆژی و کیمیاوی و تەنانەت ئەتۆمیش لە هێرشەکانی ئایندەدا بەکار بێنن.

لەژێر سایەی ئەو رەوشەدا دەبوایە جارێکی دیکە سەرنجەکان بکەوێتەوە سەر رێگەنەدان بەو وڵاتانەی کە دژی ئەمەریکان ئەو چەکانە پەرەپێبدەن.بەم شێوەیە بنەمای تاوانبارکردنی عێراق گۆرا بۆ مەسەلەی پەرەپێدانی چەکی کۆکوژە ئەمەش بری ئەمبارکراوی چەکە کیمیاوی و بایۆلۆژیەکان دەگرێتەوە کە رەنگە عێراق لەوەتەی ساڵی ۱۹۹۱لە پشکنەرانی UN ی شاردبێتەوەو ئەگەری ئەوەی کە لەوانەیە دەستی بە پەرەپێدانی بەرنامەکانی چەکی کردبێتەوە دوای رۆیشتنی پشکێنەرانی سەریە UN لەساڵی ۱۹۹۸دا. لە راستیدا زنجیرەیەك کەموکوڕی گومانەکانی لیژنەی تایبەتی داماڵینی چەکی عێراقی پشت راستدەکردەوە سەبارەت بەوەی کە عێراق توانایەکی گرنگی لە بواری چەکە کیمیاوی و بایۆلۆژیەکان و توانای مرۆیی و نیازی سیاسی هەبێت بۆ دەستپێکردنەوەی بەرنامە ئەتۆمییەکەی. لە راستیشدا بەهیچ شێوەیەك ناکرێت راستی ئەو پڕوپاگەندانە دەربخرێن تەنها بەگەڕانەوەی پشکنەرانی چەکی سەر بە UN نەبێت بۆ عێراق. کەچی لە تشرینی دووەمی ۲۰۰۱دا عێراق رشتبوونی خۆی لە نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی ژمارە ۱۲۸٤ دەربڕی و دووپاتی

کردەوە کە ڕێگە نادات تیمی لێژنەی چاودێری و لێکۆڵینەوەو پشکنینی سەر بە UNدەست بەکارەکانیان بکەنەوە.
ئەمەریکا کە بەهەڵمەتەکەی بۆسەر ئەفغانستان و ئەو هاوپەیمانییەتییەی کە پێویستی بوو بۆ پاڵپشتی وەدەستهێنان بۆ هەڵمەتەکەی سەرقاڵبوو توانی کۆدەنگییەك لە ئەنجوومەنی ئاسایش بەدەست بێنێت بۆ دەرکردنی بڕیاری ١٣٨٢ تایبەت بە عێراق لە تشرینی دووەمی ٢٠٠١دا . دەقی بڕیارەکە جەختی لەسەر ئەرکێکی ڕێکو پێك کردەوە کە ناکۆکی لەسەر نەبوو ئەویش بریتییە لە نوێکردنەوەی بەرنامەی نەوت بەرامبەر خۆراك بۆ شەش مانگی دیکە. بەڵام بواریشی لەبەردەم ئەگەری ئەنجامدانی چاکسازی لە سیستەمی سزاکان و گەیشتن بە کۆدەنگییەکی دیکە کردەوەو بەڵێنی بە ئازادی ئاڵوگۆڕی کەلوپەل و خزمەتگوزاری مەدەنیدا، بەڵام جەختی لەسەر دەستپێکردنەوەی ئەرکی لێژنەی پشکنینی سەر بە UN کردەوە و لە ئایاری ٢٠٠٢ هەموو لایەنەکانی ناچار کرد ڕەزامەندی لەسەر ئەو لیستە بدەن کە گفتوگۆی دەوروژاند لەسەر ئەو کەلوپەلانەی کە دوولایەنە بەکاردێن . حکومەتی عێراق پێشوازی لەو پێشڤەچوونە نەکرد، چونکە هوشداریەك بوو بۆی کە بەو زووانە ڕووبەڕووی ئەنجوومەنێکی ئاسایشی یەکگرتوو دەبێتەوەو لەگەڵ نوێبوونەوەی جەختکردنەوەش لەسەر چەکی کۆکوژە ڕوسیاش دەچێتە پێگەیەکی نزیکتر لە ئەمەریکا.
ئەو هەنگاوانەش کە بە ئامانجی زیندووکردنەوەی پرۆسەی پشکنین هاوێژاربوون بەسەرپەرشتی UN هاوکات بوو لەگەڵ هەڕەشەی سەربازیی گەورە لەلایەن ئەمەریکاوە. سەرکەوتنی ئەوهەڵمەتە سەربازیەی کە سەرۆکایەتی کرد بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی تاڵیبان لە ئەفغانستان و ڕاوە دوونانی هێزەکانی ئەلقاعیدە و دامەزراندنی سیستەمێکی گونجاو تر لە کابوڵ ئەو لایەنانەی هاندا کە پاڵپشتی ئەو جموجۆڵەیان کرد بەو پێیەی مۆدێلێکی سەرکەوتووە بۆ دەستوەردان لەناوچەکانی دیکە بەتایبەتیش عێراق . لە ڕاستیدا ئاماژەدانی سەرۆك بوش بە (تەوەری شەڕ) کە پێکهاتبوو لە عێراق و ئێران و کۆریای باکور لەوتارێکدا لەکانوونی دووەمی ٢٠٠٢دا پێدەچوو کە نەخشەی دەستێوەردانێکی تازە دادەنێت کە ئیدارەکەی پێیناسرابوو لەوەتای ١١ سێپتەمبەرەوە لەحاڵەتی عێراقیش

وادەرکەوت نەك تەنها رژێم بەڵکو خودی سەدام حوسێن ئامانجی ئەودەست تێوەردانەیە .

سەدام و حکومەتەکەی پابەندبوون بەهەڵوێستی تەحەداکردنیان و بە گاڵتەجارییەوە وەڵامی هەڕەشەکانیان دایەوەو گاڵتەیان بە ئەگەری بەکارهێنانی هێزی سەربازیی هات . بەڵام هەندێك نیشانەی لاواز لە رەوشەکەدا سەریان هەڵداو لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٢دا دەستی بە دەرکەوتن کرد کاتێك کە چەندین راپۆرت ئاماژەیان بەوەدەدا کەسەدام دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە بووەو توانای لێبریوە . لەوانەشە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو پروپاگەندانە سەدام حوسێن لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠دا بەشداری لە نمایشێکی گەورەی سەربازیی کردو بۆ چەند سەعاتێك لەسەر پێ وەستاو بەیەك دەست تەقەی دەکرد بۆ سڵاوکردن لەو یەکە سەربازیانەی کە بەپێشیدا تێدەپەرین ، ئەمەش پروپاگەندەیەکی دیکەی نایەوە گوایە ئەم کارە ماندووی کردووەو توشی سەکتەی مێشك بووە بەڵام ئەم پروپاگەندەش بە درۆ خرایەوە . واپێدەچوو کە سەدام حوسێن بە جدی بیری لە مەسەلەی جێگرتنەوەیی و رۆڵی هەردوو کورەکەی عودەی و قوسەی کردبێتەوە لە ساڵی ٢٠٠١ قوسەی کورە گچکەی لە زنجیرەیەك پۆستدا دامەزرێندرا کە بەشێوەیەکی کردەیی بووە جێگری باوکی لە هەردوو دەزگای هەواڵگری و ئەمن و مەکتەبی عەسکەری و حزبی بەعس .

لە ئایاری ٢٠٠١داو لە کۆنگرەی قوتری دوازدەمینی حزبی بەعسدا بەرزبوونەوەی پلەی قوسەی بووە شتێکی ئاشکرا کاتێك کە بەئەندامی سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس هەڵبژێردرا . و سەلماندی کە زۆر لە بەهرەمەندیەکانی باوکی تێدایە لە ئارامگرتن و دڵرەقیدا ئەمەش هانی سەدامی دا هەوڵی پتەوکردنی پەیوەندی لەنیوان قوسەی و ریزی ئەفسەران لە سوپای عێراقدا بدات . لە راستیدا ژمارەی ئەو هەوڵە سەرنەکەوتوانەی تیرۆکردن کە گوایە قوسەی کردۆتە ئامانج بەڵگەیەك بوو بۆ بەرز بوونەوەی پێگەی لە بونیادی دەسەڵاتدارێتی عێراق .

لەو بوارەدا قوسەی لەسەر حسابی عودەی برا گەورەی بەدیار دەکەوت. عودەی ئەرکی کەمتر بوو نیازەکانی خۆی کەمتر دەردەخست و سەرنووسەرایەتی رۆژنامەی بابلی بۆ وێنەی گشتی خۆی زیاد کردبوو ، دواتر لە ئایاری ٢٠٠٠دا بووە

ئەندامی ئەنجومەنی نیشتیمانی عێراق بەلام بایەخدانی بە ئەنجومەنەکە کەم بۆوە کاتێك کە باوکی رێگەی پێنەدا ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنەکە . لەگەڵ سەرکەوتنی قوسەی کە زۆر بە روونی دیاربوو بووەتە مایەی گرنگی پێدانی تایبەتی باوکی، پروپاگەندەی زۆر بلاوبووەوە کە گوایە هەردوو برا دوژمنایەتییەکی تاڵیان لەنێوانداییەو لەبەرامبەر ئەو ململانێیە لەسەر پۆست و پێگە ، باس لە هاوپەیمانییەکی بەهێز لەنێوان قوسەی و عەلی حەسەن مەجید دەکرا، کە خەریك بوو سەر لەنوێ ئەستێرەکەی سەریهەڵدەدایەوە، بەو پێیەی هەماهەنگیکار و چاودێری دامودەزگاکانی هەوالگری و رێکخراوی حزبی بەعس بوو لە ناوەڕاست و باشووری عێراق . ئەو لێکترازانە خەریك بوو ئالۆزتر دەبوو بەهۆی چەند کێشەیەکی دیکە لەنێوەندی ناوخۆی رژێم لەنێوان زڕ براکانی سەدام و کوڕەکانی سەدام و عەشیرەتەکانی دیکەی نێو کۆمەڵەی هۆزگەری ئەلبو ناسڕ .

هەروەك ئەو راپۆرتانەی باسیان لە تەندروستی سەدام حوسێن کردبوو، زۆرجار کاریگەرییەکانی ئەو ململانێیەو ئێرەیی بردن زیادەرۆیی تێدا دەکراو ببووە ماددەیەکی سیاسی نێو رژێم و بەشێکی دانەبراو لە پرۆسەی دابەشکردنی دەسەلاتدا کە سەدام حوسێن کۆنترۆڵی کردبوو . سەبارەت بە لایەنەکانی نێو عێراق دەرەوەی کە ئامانجیان رووخاندنی سەدام بوو ئەو تەحەدییەی کە رووبەڕیان دەبۆوە نەك تەنها چۆنیەتی چوونە ناوو قۆستنەوەی ئەو ململانێ و دوژمنایەتییە بوو کە لە نێو بازنەی ناوخۆیی رژێمدا هەبوو بەڵکو چۆنیەتی دۆزینەوەی سەنتەرێکی ئەلتەرناتیف و پشتپێبەستراوی وەلاو هەژموون بوو کە ببێتە هۆی لێکهەڵوەشانەوەی ئەو تۆرانەو چیرۆکانەی کە پاڵپشتی لە رژێمەکە دەکەن . لەگەڵ زێدەبوونی رشتیی ئیدارەی بوش لەسەر هاندان بۆ گۆڕینی رژێمی عێراق هەندێك کێشە لە دەرەنجامی ئەو تەحەدایە دەرکەوت . کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی بەردەوام بوو لە ئیدیعا کردن لە نوێنەرایەتی پێکهاتەیەکی فراوانی ئەو عێراقیانە دەکات کە دژی رژێمی سەدامن و واپێدەچوو کە لە هەمووان کاراترە بۆ رووخاندنی و شایەنی یارمەتیدانی ئەمەریکایە ، هەندێك لە ئەندامانی ئیدارەی ئەمەریکا بەتەواوی پاڵپشتی ئەو بۆ چوونەیان کرد هەندێکی دیکەش ناڕەزاییان لەبەرامبەر دەربڕی و ئاماژەیان بەو گیروگرفتانەدا کە کۆنگرەی

نیشتمانی عێراق دووچاریان دەبێتەوە لەنێو عێراق ئەگەر لەسەر ئاستی مەدەنی بێت یا سەربازیی سەرەڕای کورتهێنانی لەهەماهەنگیکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی نوێنەرایەتیان دەکات و ئەو گیروگرفتانەی کە سەرکردایەتییەکەی رووبەڕوویان دەبێتەوە.

بەڵام کاری دیاریکردنی لایەنە زیاتر کاریگەرەکان بۆ رووخاندنی رژێم لە بەغدا زیاتر ئاڵۆزبوو بەهۆی نوێبوونەوەی بایەخدانی ئەمەریکا بە پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ ئەو لایەنانە . ئەوەش بووە هۆی زێدەبوونی گرووپەکان کە هەر یەکێکیان دەیگوت لە رکابەرەکەی زیاتر جێگەی متمانەیە . سەرەرای ئەوانەی کە ئیدیعای ئەوەیان دەکرد کە نوێنەرایەتی پێکهاتەیەکی گەورەی گەلی عێراق دەکەن ، زنجیرەیەك لەو ئەفسەرانە دەرکەوتن کە عێراقیان بەجێهێشتبوو لە ساڵانی نەوەدەکان و پێشنیازیان کرد کە توانای زیاتریان لە هاوپەیمانێتیە مەدەنییە لاوازەکان هەیە بۆ گۆڕینی رژێم لەنێو دەزگەکانی ئەمن کە لە هەموان زیاتر لە دڵی دەسەڵاتەوە نزیکن. بەوشێوەیە ساڵی ٢٠٠١ ژەنەڕاڵ نەجیب ساڵحی بەدەرکەوت کە پێشتر یەکێك بوو لەسەرکردەکانی پاسەوانی کۆماری و سەرکردەی بزوتنەوەی ئەفسەرانی سەربەخۆ بوو، سەرەڕای ئەوەی چەند تۆڕێکی لەنێوریزەکانی سوپای عێراق هەبوو و وەك کەسێك دەکرێت ئەمەریکاو کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی پاڵپشتی بکەن، لەهەمان کاتدا ژەنەڕاڵ نەزار خەزرەجی، سەرۆکی پێشووی ئەرکانی سوپای عێراق ببووە مایەی بایەخی هەندێکی دیکە لەوانەی وایاندەبینی کە کەسێکە هێشتا دەتوانێت سەرکردایەتی لایەنگرانی لە سوپای عێراق بکات، سەرەڕای ئەوەی هەندێك بەهۆی تۆماری پێشوی متمانەیان پێنەبوو. ئەوانە بە هۆکاری سەرەکی هەر گۆڕانێك لە رژێمدا دەناسرا سەرەڕای گومانی هەندێکی دیکە کەئەوە تەنها دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی خولی حوکمی سەرکوتکار و عەشایەری کە مێژووی عێراقی پێدەناسرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا گرووپەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی مەدەنی و سەربازیی بڕوایان بەوە هەبوو دەبێ هاندەرێکی دەرەکی هەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریە ئەگەرچی رای جیاوازیشیان هەبێت لەهەمبەر رادەی دەستێوەردانی دەرەکی پێویست. لەلایەن خۆیەوە ئیدارەی ئەمەریکا بەو پێیەی لایەنگری دەرەکی

سەرەکی بوو بۆ گۆڕینی ڕژێم کاری هەڵسەنگاندنی ئەو گرووپانەی گرتە ئەستۆ کەتا چ ڕادەیەك قسەو کرداریان یەکەو ئەگەر بکرێت بەیەکەوە کۆبکرێنەوە بۆ زێدەکردنی کاریگەریان. ئەو ڕاوێژکاریانەی کە لەنێوان وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا و تۆڕی نارەسمی (گروپی چوارەکە) سالّی ٢٠٠١--٢٠٠٢ ئەنجامدران دەریخست بیرۆکەکانی پەیوەست بە ئاییندەی عێراق تاکو ئێستا لەچوار دەوری سێ ڕەگەزی گرنگی پێکهاتەی عێراق دەخولێتەوە کەپێکهاتووە لە گرووپە نارەسمییەکانی ویفاقی نیشتمانی عێراقی و ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق و هەریەك لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. کە دەتوانین وایدابنێین یەك لەدوایی یەك نوێنەرایەتی کەرتەکانی کۆمەڵگەی عەرەبی سوننە دەکەن کە بەرژێمی سەدام و ئەوانەی پێشەخۆی گرێدراون و بەشێك لە دامەزراوەی سیاسی– ئایینی شیعەو هەردوو حزبە کوردییە سەرەکیەکە. سەبارەت بە هەندێك کەس ئەو گروپە ڕاستگۆی زیاتریان لە کۆنگرەی نیشتمانی هەیە سەرەڕای ئەوەی هەردوو حزبە کوردیەکە بەناو لەژێر باڵی ئەودابوون.

بەلاّم لەحاڵەتی دوو حزبە کوردییەکە دەرکەوت زۆر ئەستەمە هاوکارییان لە نێواندا هەبێت تەنانەت لەو کاتانەش کە ئەرکێکی دیاریکراوی وەك ئیدارەی حکومەتی کوردی ناوخۆیان پێ بسپێردرێت. ڕاستە شەڕو کوشتار لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەستابوو لەوەتەی ڕێککەوتننامەی واشنتۆن لەساڵی ١٩٩٨ کە ئەمەریکا تێیدا میانگیر بوو بەلاّم پێشکەوتن لەبوارەکانی دیکە زۆر هێواش بوو، هەڵبژاردنە چاوەڕوانکراوەکە بۆ دامەزراندنی پەرلەمانێکی نێو خۆیی تازە ئەنجام نەدراو هەردوو سەرکردە مسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی تاکو کانوونی دووەمی ٢٠٠١ ڕووبەڕوو دیداریان لەگەڵ یەکدا نەکرد، دوای سێ ساڵ بۆ یەکەمجار لەو مێژووەی سەرەوە لەگەڵ یەك دانیشتن و کێشەکانی نێوانیان تاوتوکرد، لەگەڵ هاندانی چالاکانەی ئەمەریکا پێشڤەچوونێك لە پرۆسەی ئاشتبوونەوە ، لەساڵی داهاتوو ڕوویدا، بووە هۆی ڕێکەوتنێك لەسەر کشانەوەی هێزەکان و چارەسەرکردنی پرسی ئاوارەکانی ناوخۆ، لەساڵی ٢٠٠٢ هەندێك پێشڤەچوون بەدەستهات بەلاّم بیرۆکەی پێکهێنانی ئیدارەیەکی

راستەقینەی یەکگرتوو لەسەرتاپای ناوچەی کوردەکان هێشتا ئەگەرێکی دوور بوو، بەو شێوەیە پارتی دیموکراتی کوردستان لە حوکمکردنی ناوچە کلاسیکییەکانی خۆی لەباکووری کوردستان بەردەوامبوو، لەو کاتەدا یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش لە حوکم کردنی ناوچەی کلاسیکی خۆی لە باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان بەردەوامبوو سەرەرای ئەو تەگەرانەی لەچەند بەرەیەکدا بەهۆی حزبە ئیسلامییە کوردیە کۆن و نوێکان رووبەرووی بۆوە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە هەردوو حزبە کوردییەکە پەیوەندییەکی پتەویان بە کۆمەڵگەی کوردی عێراق هەبوو کەکۆنترۆڵیان کردبوو و لە توانایاندابوو ژمارەیەکی زۆر لەهێزە چەکدارەکان بڵاوبکەنەوەو ناوە ناوە شەری پارتیزانیش ئەنجامبدەن. بەڵام بەهۆی سەرقاڵیان بەکارەکانیان پێدەچوو ناتوانن گۆرانکاریەك لەرژێمی بەغدا ئەنجامبدەن، بەڵکو هەردوو رێکخراو پارێزگاریان لە پەیوەندیەکی بە هوشیاریەوە لەگەڵ حکومەتی ناوەندی عێراق کرد. ئەو تاڵیەی کە لەمامەڵەی سەدام لەگەڵ کورد کەوتبووەوە و بەرهەڵستکاری بەردەوامیان بۆ زۆربەی هەڵسوکەوتەکانی حکومەتی ناوەندی بەغدا سەرباری تێپەربوونی نەوت بە نێوخاکی کوردستان و ئاڵوگۆری بازرگانی بەسەر سنوور و درك کردنیان بەرادەی هێزی رژێم، هەموو ئەو هۆکارانە هەردوو حزبەکەی هاندا لەرووبەرووی بوونەوەیان لەگەڵ بەغدا هوشیاربن.

سەدام حوسێن باش درکی بە خاڵە لاوازەکانی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن دەکرد بەڵام بە ئاگاوە مامەڵەی لەگەڵ هەر ئاماژەیەك بۆ کودەتایەکی نێو خۆیی دەکردو ژمارەیەك ستراتیژیەتی بۆ پاراستنی رژێمەکەی لە هەرجۆرە دەست تێوەردانێك کە ئەمەریکا ساڵانی ٢٠٠١ـ٢٠٠٢ هەرەشەی پێدەکرد . فەرمانی دەستگیرکردنی چەند کەس و گروپێکی نێو ریزی ئەفسەران و دەزگاکانی ئەمن دەرچوو ، ئەوەش هەوڵێك بوو بۆ پوچەڵکردنەوەی سەرەتاکانی هەر کودەتایەك. هەروەها هۆشدارییەکی ترسناك بوو بۆ ئەوانەی بیر لە کودەتا بەسەر رژێم دەکەنەوە. داهاتە زۆرەکانی بەردەستی حکومەتیش بۆ سەرلەنوێ زیندوکردنەوەی تۆرەکانی مەحسوبیەت و قەرزباری لەدەرەوەی کەسانی نزیك لە رژێم بەتایبەتیش لە بەغداو لە ناوەراستی باشووری عێراق بەکارهات .

لەسـەر ئاسـتی ناوچـەکەش حکومــەتی عێـراق بـەردەوامبوو لـە بـەهێزکردنی پەیوەندییـە ئابووریـەکانی بـە ژمارەیـەك دەوڵـەت و ، ڕێکەوتنامــەی بازرگـانی گرنگیشـی لەگـەڵ میسـر و سـوریا و ئـوردن ئیمزاکـرد، هـەروەها هـانی ئـاڵوگۆڕی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی کەنداودا لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٠ـ٢٠٠١دا.

لەگـەڵ زێـدەبوونی هەڕەشـەکانی ئەمـەریکا بـۆ ئەنجامـدانی کـارێکی سـەربازیی ڕاسـتەوخۆ لـە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ٢٠٠١ — ٢٠٠٢ حکومـەتی عێـراق گرنگـی و توانایـەکی زۆری بـۆ چـاکترکردنی پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ وڵاتـانی دراوسـێ تـەرخانکرد. دوای ئـەو هـەموو تۆمەتانـەی ئاراسـتەی کوێت و سـعودیەی کردبـوو لەماوەی دەساڵدا بەهۆی بوونی سەربازیی ئەمەریکی و بـەریتانی لـەو دوو وڵاتـەدا لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ تـاکتیکی خـۆی گـۆڕی و هەوڵیـدا لەگـەڵ ئـەو دوو دەوڵەتـە دیارەی کەنداو ئاشتبێتەوە. ئەو ستراتیژیەتە بەرووبوومی خۆی هەبوو، هەرنـەبێت بەشێوەیەکی ڕەمزیی لە لوتکەی عەرەبیدا کەلە ئاداری ٢٠٠٠ لە بەیروت گرێدرا، لە ڕێگای یەکتر لـەباوەش گرتنـی ئاشـکرای نێـوان مـیر عەبـدوڵلای جێگـری پادشـای سعودیەو عیزەت ئیبراهیم ئەلدوری جێگـری سـەرۆکی عێـراق . لـە هـەمان کاتـدا، پێشوازی لە دووپاتکردنەوەکانی عێراق بۆ کوێت کرا لەوەی حکومەتی عێـراق ڕێـز لـە سـەروەری کوێـت دەگرێـت و جـارێکی دیکـە پـەنا ناباتـە بـەر هێـز لـە دژیـدا. گرنگترین ئەوشتانەش کە شاندی عێراقی بە دەستی هێنا سەبارەت بە ئاییندە ئـەو بڕیارەبوو کە لە لوتکەکە دەرچوو و، تیایدا هاتبوو هەر دەستدرێژیەك بۆ سەر هەر وڵاتێکی عەرەبی بە دەستدرێژی بۆ سەر هەموو وڵاتانی عەرەبی لەقەڵەمـدەدرێت. هەمان ستراتیژیەتیش بەرامبەر ئێران پەیڕەوکرا. ژمارەیەك سەردان و بەیاننامـەی فەرمی لە سەرەتاکانی ٢٠٠٢ ئاڵوگۆڕکران کە بەڕێکەوتنێکی کـاتیی لـە پەیوەنییـە پشێوەکانی نێوانیان لەقەڵەمدرا کە نـەبوونی متمانـە لـە نێـوان هـەردوو دراوسـێدا باڵی بەسەر کێشابوو.

ڕژێمـی عێـراق لـە بەرهەڵسـتکاری نـاوخۆیی نەدەترسـا هێنـدەی لـە ئەگـەری ئەنجامدانی کـارێکی سـەربازیی دەرەکـی ڕاسـتەوخۆ و فـراوان دەترسـا. لـەماوەی نێوان ساڵانی٢٠٠١ـ٢٠٠٢ پلانێکی بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی ئەمـەریکاو هاوپـەیمانانی دانا. لە لایەکەوە سیاسەتی تۆقاندن و وێرانکردن دژی هەرتۆڕێك ئەگەر لایـەنگیری

دوژمنانی دەرەکی بکات لەنێو وڵات و کۆمەڵگەی عێراقدا وایکرد ئەولایەنانەی هەوڵی گۆڕینی رژێم بدەن بیر لەدەستێوەردانی دەرەکی راستەوخۆ بکەنەوە، لەلایەکی دیکەوە قەوارەی ئەو دەستێوەردانە دەرەکییە پێویستی بەبنکەی هەرێمیی و توانای گرنگیدان بەبریندااران و بەدەستهێنانی پاڵپشتی نێودەوڵەتی دەبێت بۆ ئەوەی سەر بکەوێت. لەبەر ئەم هۆیە حکومەتی عێراق هەوڵیدا ئەو خاڵانە بقۆستەوە لە رێگەی ئەوەی وڵاتانی دراوسێ والێبکات لە ریزی ئەو بوەستن و هەڕەشەی جەنگێکی پڕ تێچوو بێنێتە ئاراوە ئەگەر بێتوو هێزی پیادە لەدژی عێراق بڵاوبکرێتەوە، سەرباری هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتیUN بۆ هەڵوێستەکەی.

ئەگەری کارێکی سەربازیی هەمەلایەن دڵەڕاوکێی نەك تەنها لەسەر ئاستی ناوچەکە بەڵکو لەسەر ئاستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش بەگشتی لێکەوتەوە. لەمبارەوە حکومەتی عێراق لەهەوڵێکدا بۆ روونەدانی هێرشی دەرەکی ئەو پاڵپشتیە فراوانەی قۆستەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕواندەکرا عێراق جارێکی دیکە هەندێك نەرمی بنوێنێت لەبارەی رازیبوونی لەسەر گەڕانەوەی پشکنەرانی چەکی سەربە UN .
لەبەهاری ساڵی ٢٠٠٢ دەرکەوت کە حکومەتی عێراق درکی بە پێویستی دانوستان بەلانی کەم لەگەڵ UN هەیە چونکە زۆر شت هەبوو کەدەکرا دانوستانی لەبارەوە بکرێت.

بەو شێوەیە ئەگەری هەڵگرتنی سزاکان لە ئاسۆدا دەرکەوت. ئەو مەرجانەش کەلەسەر ئەو بنچینەیە دادەنرێت گرنگیەکی زۆریان بۆ دەسەڵاتی سەدام حوسێن و مانەوەی دەبێت. دوای ئەوەی سەدام پێگەی عێراقی وەك وڵاتێکی گەورەی بەرهەمهێنی نەوت دووپاتکردەوەو دوای ئەوەی توانای دەستە باڵایی خۆی بەسەر شانۆی سیاسی عێراق سەلماند دەبێ ئێستا توانای لە گەڕاندنەوەی عێراق بۆ نێو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بسەلمێنی بەبێ ئەوەی بچێتە ژێر باری چەند مەرجێك کە رەنگە دەسەڵاتەکەی لاواز بکات و ئەمەریکا هانبدات هێرش بکاتە سەری بۆ رووخاندنی. نهێنی سەرکەوتنی لەو پرۆسەیدا لەوەدا بوو کە بەردەوامبوو لە کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئەو پرۆسەیەو هەروەها بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی کە پێشتر لە رابردوودا سەرکەوتنیان بۆ گەرەنتی کردبوو. لە راستیدا سەرکەوتنی

سەدام حوسێن لەو چەند ساڵەدا تاڕادەیەك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە توانای هەبوو وتووێژەکان لەنێو ئەو پیاوانەدا سنووردار بکات کە بەشێوەیەکی گشتی هاوبەشی تێڕوانینەکانی ئەویان دەکرد و دەشیانزانی لە چارەنووسیشدا لەگەڵی بەشدارن. ئەو لەیەکچوونە لە تێڕوانین یارمەتیدەربوو بۆ دوو دەستپێشخەری شووم کە پاڵیان بە عێراق وەنا لە بیست ساڵی رابردوودا بکەوێتە نێو دوو جەنگەوە لەسەدەی بیستەمدا کەچی ئەو لەیەکچوونە لەسەر ئاستی بەرەی ناوخۆ رێگەی بۆ سەدام خۆشکرد شانۆی سیاسی بەوە رەنگپۆش بکات کە لەگەڵ ئارەزووەکانی و دەرخستنی تێگەیشتنی خۆی لە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی بگونجێت. روون و ئاشکرایە کە وایبۆدەچوو بەمە ئەلتەرناتیڤەکانی دەست عێراقی سنوردارکردووە بۆ ئەو ئایندەیەی کەوێنەی بۆ کێشاوە بەپشت بەستن بەو پێکهاتەیەی کە ئێستا دایمەزراندووە.

بەڵام کەموکوڕی ئەو چەمکە پەیوەستە بە بەردەوام نەبوونی جەستەیی هەر وەکو کە خۆی دانی پێدەنێت لە لێدوانێکی زۆر راشکاوانەدا لەگەڵ ژمارەیەك سەرمایەداری عێراقی گوتبووی پێویستە بەو مەرجە لاوازانە رازیبن کە ئەوکات پێشکەشی دەکرد" چونکە هیچ شتێکیان دەسناکەوێت کە کاتێك کۆتایی دادێت و تەرمە لەخوێن وەردراوەکەی لە کۆشك رادەکێشرێت. بەو پێیەی بەردەوام توندوتیژی بەکاردەهێناو زۆر چاکیش شارەزای ئەو شێوازە توندو تیژو لەناکاوانە بوو کە رژێمەکانی حوکم لە مێژووی عێراقی نوێدا کۆتاییان پێهاتبوو، رەنگە ئەوە هەڵسەنگاندێکی واقعیانە بوو بۆ ئەوەی کە قەدەر بۆی شاردۆتەوە. لە راستیدا بڕوای بەوەی کە لە ئایندەدا چی روودەدات زۆر لە کەسایەتییەکەی ئاشکرا دەکات. رەنگە پێشخستنی بەو دواییانەی قوسەی کوڕی کەلە توندوتیژی و دووربینی هیچی لەو کەمتر نەبوو هەوڵێك بوو بۆ گەرەنتیکردنی لەناونەچوونی جێ پەنجەی سەدام حوسێن بەسەر عێراق لەدوای نەمانی خۆیدا بەڵام بەدڵنیاییەوە هیچ شتێك ناتوانێت گەرەنتی ئەوە بکات کە ئەو کەسەی دێتە شوێنی ئەو و لە رووی هزریەوە لەو دەچێت و هیچ شتێکیش رێگری نابێت لە ئیدارەکردنی بۆ ئەو رژێمە بەهەمان لێهاتوویی و سەرکوتکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا مایەی پێکەنینە کە سەدام هاوکار بوو بێت لە هێنانە ئارای ئەو بارودۆخەی کەکەسێکی تێدا هانبدرێت هەمان تێڕوانینی ئەوی هەبێت و وەکو کەسێکی باڵا دەست لەسیاسەتی عێراق دەربکەوێت. بنچینەو بنەماکانی سیاسەتی خۆلێنزیکردنەوە لە سیستەمێکی سیاسی رەگی داکوتابوو کە رەگەزی گرنگ لە رەگەزەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگەکانی عێراق دێنێتە ناو پەیوەندیەك کە جۆرەها شێواز لە پشت بەستن بەیەکتری لێدێتە ئاراوە. شتە سەیرەکەش لەوەدایە کە ئەو بەش بەش بوونەی هاوشانی ئەو پرۆسەیە بوو هاوکار بوو لە پتەوکردنیشی. لەوکاتانەدا پەنابردنە بەر توندوتیژی بژاردەیی و هوشداریانە سەرباری خستنەرووی دەستکەوتەکان بەکاردێن بۆ دەرخستنی پاداشتی ملکەچی و نرخی سەرپێچی کردن بۆ عێراقیەکان. لەبەشی دوایی سەدەی بیستەمیشدا ئەوە بووە هۆی هەژارکردنی عێراق لەزیاتر لە بوارێکداو سەرەرای ئەو وێرانکاریەی کە لەو بەشەی مێژووی سیاسی عێراق کەوتەوە بەڵام بووە نموونەیەك بۆ رادەی باڵا دەستی ئەو سەربوردەیەی کە لە دەرەنجامی مەنتیقێکی سەرسەختی پێشتر چاوەروانکراو نەهاتۆتە ئاراوە بەڵکو لەو هەلانەی کە بریارە ستراتیژیەکان و خەیاڵی پلاندارێژەر بۆ چەند نەوەیەك لە یاریکەرانی سیاسی ، عێراقی غەیرە عێراقیەکان رەخساندویانە. سەرەرای خراپی لەرادەبەدەری ئەنجامەکانیش سەبارەت بە دانیشتوانی وڵات ، ئەو سەربوردەیە وای لێهات لەهەموو کاتێك زیاتر بروا پێهێنەربوو، لەگەڵ بە دەستهێنانی سەدام حوسێن و ئەوانەی وەکو ئەون هەلێك بۆ رێکخستنەوەی بەشە پەرتو بڵاوەکان.

❑

# کۆتایی

مێژووی سیاسی عێراق مێژوویییەکی بەردەوامە، دەستەبالآیی ئەو رژێمەی ئێستا گەیشتبێتە هەر رادەیەك لە ٣٠ ساڵی رابردوودا، و ئەگەر هەوڵەکان بۆ لادانی ئەڵتەرناتیڤە مومکینەکانیش هەرچییەك بێت کات دەبێتە باشترین ئامراز بۆهەڵوەشاندنەوەو تێکشکاندنی ئەو رژێمە. لەگەڵ بەسەرچوونیشی هەل و بواری تازە دێنە پێشەوە لەبەردەم سەربوردەی دیکە بۆ ئەوەی رۆڵێك بەدەست بێنێ لەدارشتنەوەی مێژووی عێراق. ئەوە مانای ئەوەنییە هەموو شێوەکانی رژێمی ئێستا بەیەکجاری لەناو دەچێت، بەڵکو هەر دەمێنێتەوە لەو پرۆسەو پێکهاتانەی کە پەرەی پێدابوون و لەو هەڵوێست و بارودۆخانەی کە رێگەی بەدەرکەوتنی دابوو. لەگەڵ ئەوەش کە گەلی عێراق مەحکوم نابێت بەوەی ئەو مێژووە دووبارە ببێتەوە، بە هۆی ئەو گۆڕانکاریە گەورەیەی کە بەسەر یاریزان و هۆکارە سەرەکییەکان دێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێویستە لەسەر ئەو لایەنانەی کە هەوڵی پەرەپێدانی سەربوردەیەکی نوێ بۆ مێژووی عێراق دەدەن درك بەو بۆماوە بەهێزانە بکەن کە هێشتا لە وڵاتدا چالآکن لە وڵاتدا هەتا ئەگەر نەشیانەوێت ملکەچی مەنتیقەکەی بن.

لە راستیدا دەکرێت دەوڵەتی عێراق وەك هەر دەوڵەتێکی دیکە لە قەڵەمبدرێت کە رێکخراوێکە جۆرە یەك لەدوای یەکیەك بەرجەستە دەکات کە تیایدا توێژەکانی هەژموون و پۆستەکانی تێدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت و سزای وا دەسەپێنێت کە هەندێك جار توندو تیژە، بۆ پاراستنی ئەو رژێمەی کە لەگەڵ بەها مەعنەویەکان و بەرژەوەندیە مادیەکانی ئەوانەی لەسەر حوکمن دەگونجێت. بەپێی ئەوە غەمی

یەکەمی ئەوانە خۆی لە پاراستنی سنورە هەرێمی و کۆمەڵایەتیەکانی نێو خودی دەوڵەت دەدیتەوە. بەهۆی بنەماکانی دەوڵەتی عێراق، سەرباری ئەو پرۆسانەی کە هاوشانی پێکهاتنی بوون، هەردەم هەندێك ناوەندی کۆمەڵایەتی بەسەر لایەنی دیکە پێشدەخران. ئەوانەش ئەو هەژموونەی کە بەدەستیان دەهێنا بۆ پاراستنی دەسکەوتەکان و پێگەی گەورەتر لەسەر ئاستی موڵکیەت و پایەی کۆمەڵایەتی و پۆستەکان بەکاریان دەهێنا. سەرەرای ئەوەی کە ئەندامانی ئەو توێژە دەسکەوتەکانیان لەسەر بنەمای ئەوە بوو کە عەرەبی سوننەن ئەوانەی دەرەنجامی ئەو سستەمە چینایەتیە بوون کە دەوڵەتی عوسمانی لەناوچوو جێیهێشتبوو، بەڵام ئەم پۆلێنکردنە بەرتەسك و ناتەواوە بۆ ئاگادار بوون لە هەستی دوژمنایەتی و ئەو ململانێیانەی کە باڵی بەسەر دەوڵەتی عێراقدا کێشابوو لەسەرەتای دروستبوونیدا. چونکە پێناسە کردنی سیاسەت تەنیا خۆی لە هەستی دوژمنایەتی نێوان ئەو نێوەندانە نابینێتەوە بەڵکو لەوەش تێپەری کرد بۆ هەوڵی دورخستنەوەی ئەوانی دیکە لەسەر بنەمای پلەوپایە یان تایەفە یان ئینتیمای ئیتنی یان باری ئابووری.

هەروەها هەندێك لە بەشەکانی دەوڵەت بەسەر بەشەکانی دیکە پێشخران نەك بەهۆی رەچەڵەکی فەرمانبەرەکانی بەڵکو بەهۆی ئەو هەژموونەی کە دەکرێت بەدەستی بێنن لە هەر ململانێیکدا کە بچنە ناوی. لەم بوارەشدا بەردەوام هێزە چەکدارەکان سەرکەوتوو بوون، ئەو رەوشەشی هێنا ئاراوە کە هاوکاربوو لە بەردەوامی ئەو سەرکەوتنەو ئەو کەسانەشی ناچارکرد کەرەنگە لەروویدا بووەستنەوە بۆ بیرکردنەوە لەکارکردن لە هێڵی وا کە زۆر لە هێڵەکەیان دەچێت. لەگەڵ ئەوەش کە ئەوە مانای ئەوە نادات کەخودی ئەو سەرکردە سەربازیانە لە بەرکارهێنانی هەژموونی سیاسیدا زیرەك بوونە، بەڵام ئەوەی دەرخست کە ئەو کەسانەی حوکمیان گرتە دەست یان چاویان تێبری پێویست بوو لەسەریان

هەڵوێستی ئەفسەرەکان بەهەند وەربگرن ــ ئەگەر تەنیا بۆ ترساندنیشیان بێت یان بۆ بنیاتنانی هێزەکان ئاسایشی ئەلتەرناتیف کە بتوانرێت ڕێگەیان لێبگرێت تا دەست بەسەر دەستپێشخەری سیاسیدا نەگرن.

لە ڕاستیدا ئەو دوو هێزە تێکهەڵکێش و تەریبە ــ نێوەندە تەسکەکانی سەرکردەکان و سەرکەوتویی هێزە سەربازییەکان ــ هاوشان بوون لەگەڵ هەژموونی زەبەلاحی دارایی کە حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەدەستیانەوە بوو بەهۆی داهاتەکانی نەوت لە پێناو ڕێکخستنی سەربوردەی بالادەست کە دەسکەوتی سەرکوتکارانە باڵی بەسەر کێشا بوو. بیرۆکەی وا هاتە ئاراوە وای لە سیاسەت کرد خۆی لە سەپاندنی ڕێکخستن و بەشداری لە گوێڕایەڵی ببینێتەوەو. عێراقیەکان خۆیان لەبەردەم دوو ڕێگە چارە بینیەوە. یا ملکەچ کردن یان ڕاکردن. لە سەرەتای بیستەکانیشدا، کاتێك کە بواری چالاکی سەربەخۆ پێ بەپێ پتر تەنگ بووەوە، یاخود نرخی ملکەچی زۆر لەوە گەورەتر بوو کە لەتوانادا بێت، خەڵکانێك زۆر لە عێراقیەکان ئارەزووی ڕاکردنیان هەبوو و پاڵینان بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕوو لەدوور خراوەیی بکەن سەبارەت بە دانیشتوانی گوندەکانیش لە باشوور، وادەرکەوت گەڕەکە هەژارنیشینەکانی بەغدا باشترە لە ڕەوشی ژیان لە خاکە بەرفراوانەکەی عیمارە. سەبارەت بە ئاشوری و کورد و ئێزیدییەکانیش، لە کاتێك لەکاتەکاندا دەرکەوت کە کۆچ و ڕاکردن بەرەو دوورە وڵاتی تاکە ڕێگەیە بۆ دوورکەوتنەوە لە فشاری دەوڵەت و تاوانی ئەو کەسانەی دەسەڵاتیان بەدەست بوو. بەڵام بیرمەندە داهێنەرەکان کە خاوەنی بیرۆکەی سەربەخۆ بوون و گرێدرابوون بەو بوژانەوە سەرنج ڕاکێشەی کە هونەر لە عێراق بەخۆیەوە بینی. زۆرجار دەیانبینی کۆچکردن تاکە ڕێگەیە بۆ ڕێگەنەدان بە سەرکردایەتی بۆ کپ کردنی دەنگیان. لەو کاتەدا. زۆر لە موجتەهیدە شیعەکان کۆچی نێوخۆییان ئەنجامدا بوو کۆچی نێو خۆیی و ڕوحیان بەباشترین نمونە

پەسند كردبوو. پشتی خۆیان لەو جیهانە سیاسیە كرد كە شوێنی خۆیان تێدا نەدەدەدۆزیەوە. ئەگەر هەوڵیشیاندا بیگۆڕن وەكو هەندێك كەس، كاردانەوەكە ئەوەندە توند دەبوو بە ڕادەیەك ڕاكردن و دوورە وڵاتی دەبووە تاكە پەناگە.

ئەو دیاردانە وەك ئەوەی لە بیست ساڵی ڕابردوودا هەبوو، لەهەموو ڕۆژێك لە ڕۆژان دەركەوتنیان زیاتر بووە. بە شێوەیەك جەنگ و حاڵەتەكانی هەژاری كە باڵی بەسەر مێژووی عێراقی نوێ كێشا بوو بەهەزاران كەسی پاڵ نا لەبێ ئومێدیان وڵات بەجێبهێڵن لە هەوڵێكدا بۆ ئەوەی ژیانیان مسۆگەر بكەن. بەڵام ئەو ڕێگە چارەیە بۆ زۆرینەی دانیشتوانی وڵات نەدەچووە سەر كە ژمارەیان نزیكەی ٢٠ ملیۆن بوو، لەبری ئەوە ناچار بوون خۆیان لەگەڵ ئەو شێوازەی دەوڵەت بگونجێنن كە عێراق وایلیهاتبوو، لەسەر ئاستی نێوخۆیی و لەسەر ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەكان وەكو یەك. نرخەكەش بوو لەهەر دوو حاڵەت زۆر گەورە بوو. ئەو هێزانەی كە ئێستا بەرپرسن لە تەنگژەكەی دەوڵەتی عێراق وەریانگرت. بەڵام ئەو هێزانە، هەروەكو ڕژێمەكە، تا سەر بەردەوام نابێت.

سەدام حوسێن بە ئەنقەست هەندێك ناكۆكی لە مێژووی عێراق بەهێزكرد. دەزگایەكی پتەوی بنیاتنا كە هیچ بوارێك بۆ ئۆپۆزسیۆن یا هەر چالاكییەكی سیاسی ناهێڵێتەوە لە دەرەوەی ئەو مەرجانەی كەخۆی دایناوە. دوورخستنەوەی ئەو چینە فراوانەی عێراقیەكان. سەرباری تۆڕەكانی مەحسوبیەت كە پاڵپشتی ڕژێم و ئەو دەوڵەتەی كرد كە، یارمەتیدەر بوو لە دامەزراندنیدا دەوڵەت. هەموو ئەوانە هاوكار بوون بۆ دابڕانی لە ناوچەكەو لە دوورخستنەوەی كەرتی گەورە لەكەرتەكانی گەلی عێراق. دواتریش ڕەنگە ئەو ملكەچیە بەردەوام نەبێت تەنیا بەبەردەوامبوونی ناوەند، ئەمەش كارێكی چەسپاو نیە بەهۆی بەردەوام نەبوونیی جەستەیی تاكە كەس. لەگەڵ لە ناوچونیشی ڕێگە خۆش دەبێت بۆ بیركردنەوە لە

ئاسۆی نوێ بۆ عێراق، و رەنگە دەست پێشخەریەکە سەربوردەی دیکە لەخۆ بگرێت ، کەسەر لەنوێ دارێژراوەتەوە تاکو کۆمەڵگەیەکی تایبەت و مێژوویەکی پر لە سەرکوتکردن و چەندین ساڵ لە جەنگ و گەمارۆی ئابووری لە خۆ بگرێت.

رەنگە ئەوە ئەو هیوایە بێت کە ئەو کەسانەی ئەو گێرانەوەیەیان رەتکردەوە کە سەدام حوسێن و لایەنگرانی هەوڵیاندا بەسەر عێراقی بسەپێنن ، بۆی دەژین. بەڵام پرسیاری سەرەکی لەبارەی ئەو ئەلتەرناتیفەی کە خۆی دەسەپێنێت یا ژمارەیەکی زۆر لە عێراقیەکان بۆ لای خۆی رادەکێشێت دەبێ بەکراوەیی بمێنێتەوە. چونکە پەرەسەندنەکانی چەند ساڵەی رابردوو نیشانەی زۆرمان لە بارەی ململانێکارە سەرەکیەکان ناداتێ. لەو بارەوە دەکرێ بڵێین دەزگای سەربازیی بەگیانە نێوخۆیی و هاوکێشە دەرەکیەکەی لەگەڵ رژێم. بریتیە لە ئەڵتەرناتیڤێکی پیشەیی بۆ ئەو رژێمە کەسیەی کە سەدام سەپاندی. بەڵام بە پشت بەستن بە مێژووی عێراق، ئەفسەرانی سوپای عێراقی هەر بەتەنها ناسنامەی سەربازیان نیە ، بە پێناسە پیشەییەکەی، کاتێك پرسەکە پەیوەست دەبێت بە روو بەرووبوونەوەی کێشەکانی وڵات. بە پێچەوانەوە، تێروانینی جودایان هەبوو کە وایلێکردن ببنە یاریکەری ترسناك و زۆرجاریش بێبەزەیی.

لە رەگەزە گرنگەکانی دیکە کە لەماوەی حوکمی سەدام حوسێندا پتەوکرا تۆرەکانی خزمایەتی کۆمەڵایەتی بوو. رژێم ئەو تۆرانەی وەکو کەناڵێك بۆ پەیرەو کردنی سیاسەتی پاداست و سزا بەکار دەهێناو بەهۆی ئەوەشەوە جۆرێك لە سستەمی بۆماوەیی پاراست و پێگەی سەرکردەکانی لە بەرامبەر پاشکۆو بەکرێگیراوەکانیان پتەوکرد. لەبەر کارایی ئەو سیاسەتەش لەدەیەکانی رابردوودا زۆر کەس لەوانەی کە چیدیکە ئینتیمایان بۆ ناسنامەیەکی هۆزگەری کلاسیکی روون و ئاشکرا نەما بوو هەوڵی هاتنە ریزی هۆزی دیکەی ناسراویان دەدا بۆ سود

وەرگرتن لەو پاراستنەو هەستکردن بە ئارامیە وەربگرن کە ئەوە بۆی دابین دەکردن. رەنگە تێك هەڵکێشانی ئەو تۆرانە لە دەوڵەتی عێراق پێویستی بە سەدام حوسێن نەبێت تا بیپارێزێت، بەڵام لەوانەیە پرۆسەکانی پێکهێنانی هاوپەیمانیە ناکەسایەنیەکان کە زیاتر کراوەن والێبکات لە ئایندەدا جێپێ قایمکردنیان ئەستەمبکات.

رەگەزێکی دیکە لەسیاسەتی عێراقدا حکومەت لە زۆر کاتی جیادا دەیویست بینوێنێت، بەڵام هێزێکی بەرهەڵستکارانەی هەبوو کە لە کۆتنرۆڵی حکومەت بەهێزتر بوو ئەو رەگەزەش تێروانینی ئیسلامیە بۆ دەوڵەتێکی عێراقیی ئەلتەرناتیف و ئەو پێکهاتانەی کە هەردەم پاڵپشتی بووە، بەتایبەتیش لە نێو شیعەکاندا لە عێراق. بنکە تایەفیە شیعیە بەهێزەکەی رێگەی بۆ خۆشکردبوو تا گەشە بکات بەپشتبەستن بەهەستی مێژوویی بەو زوڵمەی کە زۆر لە شیعەکانی عێراق پێی، دڵتەنگن بەو پێیەی زۆرینەی دوورخراوەن لە شانۆی سیاسی عێراق. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەستکردنە بە دابران پاڵی بەسەرجەم شیعەکانەوە نەنا کەوا مەزندە بکەن ناسنامە و بەرژەوەندیەکانیان لە بونیادنانەوەی دەوڵەتی عێراقدایە لەسەر دەستی پیاوانی ئایینی کە کار بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی ئیسلامی دەکەن. بەپێچەوانەوە بەشێکی زۆریان ئارەزووی عێراقێکیان دەکرد کەتیایدا رێگە بۆ سەرجەم زۆرینە دوور خراوەکان بکرێتەوە کە بەشداری لەژیانی سیاسی لەوڵاتدا بکەن. لەوکاتەنەشدا هەندێك لە شیعەکان رێگەیەکی دیکەیان گرتە بەر و هەوڵیاندا بەشداری لەو رژێمە بۆماوەییەدا بکەن کە لەسەر تۆرەکانی خزمایەتی و عەشایەری دەژیێت. دواتر هەروەك چۆن سیاسەتی عێراق یەك سەربوردەی نیە بەهەمان شێوەش تەنیا یەك سەربوردەی شیعەشی نیە.

پرسـیاری هاوشـێوە لـەبارەی کـورد و ڕۆڵیـان لەمێـژووی عێـراق دەخرێتـەروو. سەرەڕای ئەوەی لە ڕواڵەتدا تـوخمێکی کـەم بایـەختر پێکـدەهێنن لەسـەربوردەی دەوڵەتی عێراق بەڵام ئەو مامەڵەیەی لەگەڵیانداکراو ئەو مافانەی پێیاندرا یـانکۆڵی لێکرا وەك هاوڵاتی عێراقی و دانیشتوانی ناوچەیەکی کوردیی جودا هەر هەموویان نیشانەیەکی بـەهێزبوون لەسـەر سروشـتی ئـەو دەوڵەتـە. جیاوازییەکـەش ئەوەیـە کەئەو ڕووداوانەی هەردوو دەیەی ڕابـردوو بەخۆیـەوە دیـت و ئـەو پێکهاتـە و ئـەو پرۆسـانەی لـە بـاکووری عێـراق لێـی کەوتـەوە بـووە مایـەی زێـدەکردنی تووندی کێشـەکان لـە نێـوان خـودی کوردەکـان هـەروەها ڕشـتبوونی کـوردی لەسـەر پارێزگـاریکردن لەشـێوەکانی سـەربەخۆیی زاتـی کـە لەوماوەیـەدا دروسـتبوو بـەهێزترکرد. لەگـەڵ ئـەوەش جێـی دڵنیـایی نییـە کـە ئایا مەرجـە ژێرخانـەکانی پێشـووی حـوکمی زاتـی دەسـتەبرکرابوو، ئـەوەش بـواری بـەکراوەی هێشـتەوە لەبەردەم پەیوەندییەکان لەنێوان حکومەتی ناوەندی بەغدا و سەرکردەکانی کـورد لەسەر بنەمای شـێوازە کۆنەکـەی ترسـاندن و هەوڵـدان بـۆ ڕازیکـردن کـە بـۆ ئـەو مەبەستە داهێنراوە.

لەوکاتانەدا، پێویستە دان بـەوە بنرێـت کـە هـەروەکو لـەڕابردوو هـیچ کامێـك لـەو تێڕوانینە ڕکابەرانە بۆ سەرلەنوێ پێناسـەکردنی دەوڵـەتی عێـراق لـە بۆشـاییەکی هەرێمیی کارناکات. هەروەك لە ڕابردوودا هێـزە دەرەکییـەکان هەوڵـدەدەن ڕۆڵێـك ببیـنن و ڕەنگـە بـە کـردەییش بـۆ ئـەوە بانگکرابێـت لەلایـەن هەنـدێك لـە گروپـە عێراقییەکانـەوە کـە هەوڵـدەدەن لایـەنگیری پاڵپشـتی دەرەکـی بکـەن. ئـەو پرسیارەش کە دێتە ئاراوە ئەوەیە ئایا بەدواداچوون بۆ تێڕوانینە بیانیەکانی ڕژێم دەکرێت بەهۆی ئەو دەوڵەتە عێراقیەی کـە بونیادنراوەتـەوە؟ لـە ڕاسـتیدا ئـەو نـا ئومێدیەی کە لەماوەی چەندین ساڵی ڕابردوودا کۆبۆتەوە پاڵی بەزۆر لە یاریکـەرە

سیاسیە چاوەروانکراوەکان نا بۆ گەران بەدوای رزگاربوونیان لە دەرەوەی عێراق لەبەر ئەم هۆیە بە تەئکید سەربووردەی مێژووی عێراق بە تەنها عێراقیانە نابێت.

لەراستیدا دیکتاتۆرییەتی سی ساڵی رابردوو تارادەیەك دەرەنجامی ئەو ململانێ رکابەرییە توندەیە کە ئامانجەکەی دوورخستنەوەو سەرکوتکردنی سەربوردە ئەلتەرناتیڤەکان بوو لە پرۆسەی دارشتنی مێژووی عێراقدا، نەك ئەوە بەڵکو هەندێك گرووپی قووتدا لەوانەی کەچینەکانیان زۆر پێشخرابوون و کاریگەریشیان زۆر خراپ بوو بەسەر ئابووری و دەوڵەتی عێراقدا، لەسەر هەردووئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی. رەنگە ئەوەش هانی وەستانێکی تێرامان بدات و هانی رشتبوون لەسەر پێویستی بیرکردنەوە لە توانای نوێ و خوڵقاندنی بوارێك بۆ دەربرین و پاراستنی بدات. بەلام رەنگە ئەوەش لەسایەی قەیرانێکی هەرێمی و نێوخۆیی زۆر ترسناك روویدات کە ــ هەروەك لەو بۆنانەی پێش خۆی ــ والەوانە دەکات کە پێگەی باشتریان هەیە بۆ جموجۆڵکردن هەست بە ترسنۆکی بکەن و پتەوکردنی رژێمەکەی ئێستا هەڵبژێرن هەرچەند ستەمکار و رێگر بێت لە دروستبوونی پێشبینیکانی دیکە. ململانێکردن لەسەر کۆنترۆڵکردنی سەربوردەی دەوڵەتی عێراق ناوەستێت، بەلام لەسایەی ئەم رەوشەدا ئەگەرێکی گەورە لە ئارادایە کە دەستکەوتەکانی ئێستا بچەسپێت و عێراقیەکانیش هۆیەکی ماقوڵیان هەبێت بۆ ئەوەی جارێکی دیکە مەترسیان لە ملکەچکردن بۆ رژێمێك هەبێت کە دەسەلاتی بەزۆرو جودابوونەوەو خیانەت لای ئەو وەکو یەکە .

❑

# پێرست

وەکو هەر هەموو مێژوو، مێژووی عێراقیش
چۆن دەنووسرێتەوە دروست دەکرێت. ئەمە
ئەوە مێژووی بەدوایەکهاتنی ڕووداوەکان کەم
بایەخترە لەو گێڕانەوەی کە بەشێک لەو
ڕووداوانە پێکدەهێنێت. لەو گێڕانەوەیە دا
نموونەکانی ڕابردوو هەڵبژێردراون بەقسە
دەکرێنیان لە سەر ئێستا. هەروەها تێیدا
دەتوانرێت بیرەکەرە مێژووییەکان بیسەلمێنن
لەسەر ڕۆشنایی ئەو سنوورەی کە کاریان تێیدا
دەکرد. هەروەها لە کاتێکدا کە گەلی ئیراق و
دەوڵەتی ئیراق بەڕووداوی زۆر مەترسیدار
داتێدەپەڕێ باشتر وایە بیر لەوە بکرێتەوە ئەو
ڕووداوانە دەکرێ چیمان پێ بڵێن لەبارەی ئەو
هێزانەی کە مێژووەکەی دادەڕێژن

# صفحات من تأريخ العراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
ڕۆژهەڵات